# ئایندەی عیراق

## دیکتاتۆری، دیموکراسیی یان دابەشبوون؟

نووسینی:
لیام ئەندەرسن

وەرگێرانی:
کامیار (خەتاب) سابیر

# ئاییندەی عێراق

## دیکتاتۆریی، دێموٚکراسیی، یان دابەشبوون؟

Liam Anderson
And Gareth Stansfield

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

کامیار سابیر( خەتاب سابیر)

دڵشاد حەمە

. **ناوی کتێب:** ئایندەی عێراق

. **نووسینی:** لیيام ئەندەرسن و کاریث ستانسفێلد

. **وەرگێڕانی:** کامیار سابیرو دڵشاد حەمە

. **تیراژ:** ۲۰۰۰ دانە

. **نرخ:** ٦۰۰۰ دینار

. **بەرگ:** ئەبوبەکر عەبدوڵڵا

. **ژمارەی سپاردن:** ۲۲۱۹ی ساڵی ۲۰۰۸ی پێدراوە

. **چاپ و بڵاوکردنەوە:** چاپخانەی (رەنج).

# پێشکەشە بە( دایک و باوک) مان

Liam Anderson and Gareth Stansfiled

دەقی کوردیی ئەم وەرگێڕانە

پێشکەشە بە ئەنفالکراوەکان، کە تەنها لەبەر

کوردبوون خۆیان و نەتەوەکەیان، جینۆساید

کران

**"وەرگێڕەکان"**

# ناواخن

## پیرۆکەی وەرگێڕانی ئەم کتێبە

لەساڵی 2005 دا، لەرێی گەڕان بە ئینتەرنێتدا، بۆ هەندێ باسی سیاسیی و ئەکادیمیی لەسەر ئایندەی عێراق، بەندی هەشتەمی ئەم کتێبە و پاشەکییەکەیم بەرچاو کەوت. دیارە بەشی هەشتەم و پاشەکییەکەی بۆیە دانرابوون، وەک ناوەڕۆک و کۆکردنەوەی سەرجەم مەبەستەکانی کتێبەکە، بەتەنێ بوونیان هەبوو. هەر ئەوسا ئومێدم خواست ئەو هەموو دەزگا و ئینستیتیوتە کوردییەی لە کوردستاندا هەن، هەزاران کەسی وەک منیش هەیە، حەزو خولیایان هەیە ئەم کتێبە وەربگێڕن، ئەو حەزەم سپارد بەو ئیرادەیەی لەناو رووناکبیر و نووسەرانی کورددا هەیە.

لەساڵی 2007 دا جارێکی تر وەک بەشێک لە سیستەم و رێچکەی خوێندن کەوتمەوە بەسەریداو ئەمجارە بۆ هەندێ توێژینەوە کتێبەکەم بەقووڵیی خوێندمەوەو سوودم لێوەرگرت. بەداخەوە پرسیارم لە دەیان نووسەر و مامۆستای زانکۆ و سکۆلار و رووناکبیری کورد کرد، چ لە کوردستان و چ لەهەندەران، نە وەرگێڕدراوی ئەم کتێبەیان دیبوو، نە زۆربەیشیان هەر زانیبوویان کە کتێبێکی لەم چەشنە لەسەر ئایندەی عێراق و کوردستان نووسرابێ. ئەوەبوو لە ژمارە 82 ی ئاوێنە، رۆژی 14ی ئۆگۆستی 2007 دا کورتە وتارێکم لەسەر بایەخی ئەم کتێبە نووسیی لەژێر سەردێڕی ( گوڵاو لەخوێناودا: کتێبێک یەکپارچە لەداهێنان ) و داواشم کرد هەرکەسێ توانای بەسەر هەردوو زمانی ئینگلیزیی و کوردییدا دەشکێ، کارێکی باشی دەکرد، هاوکاریی بکردمایەو پێکەوە وەرمانبگێڕایە.

خۆشبەختانە زۆر کەس لەکوردستان و هەندەرانەوە بەئیمەیڵ پێوەندییان پێوەکردم و ئامادەیی خۆیان نیشاندا. بەڵام جێگەی داخە کاتێ دەقە ئینگلیزییەکەیان بینی، لەسەختیی زمانەکەی وردبوونەوە، هەزارو یەک بیانوویان دۆزییەوە کە کاتیان نییەو ناتوانن و ناپەرژێن .....تاد. لەنێو هەموو ئەو دۆستانەدا، تەنێ دڵشاد حەمە ( بریتانیا) بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر و نیوەی ئەم کتێبەی وەرگێڕا. راستە وەرگێڕانی دەقێکی لەم چەشنە سەختە، وێڕای زمانی سادەو روونی کتێبەکە بەگشتیی، کەچیی ناوبەناو زمانێکی قووڵی فیکریی، سیاسیی و کولتووریی تێدا بەکارهاتووە.

دروستە وەرگێڕانی ئەم کتێبە سەخت بوو. بەڵام بەڕاستیی کتێب وەرگێڕان هەمووی سەختە. ئەوانەی ئەمە پیشەیانە. دەبێ 7 پەراسوویان لەمرۆڤی ئاسایی زێتر بێت.

## وەرگێڕانی بەشەکان( بەندەکان) بەمجۆرەیە:

بەندی1.2. 3 من وەرمگێڕاون. بەندی 4. 6.7.5 دڵشاد حەمە وەریگێڕاون. بەندی هەشتەم و پاشەکییەکییەی بە هاوکاریی ئارام رەفعەت( ئوسترالیا). واتە پێکەوە وەرمانگێڕاوە. لەبەر ئەوەی چیتر دوا نەکەوێ. داوام لە ئارام رەفعەت کرد. سەرە پەتێکمان لەگەڵدا بگرێ. نزیکەی نیوەی بەندی هەشت. ئارام رەفعەت وەریگێڕاوە بەکورتییەکەی وەرگێڕانی کتێبەکە هەرەوەزییەو جێگەی خۆیەتی زۆر زۆر سوپاسی دڵشاد حەمە و ئارام رەفعەت بکەم بۆ بەئاکام گەیاندنی وەرگێڕانی ئەم کتێبە. بەتایبەتیی دڵشاد حەمە رۆڵێکی زۆری بینی لە بەسەرەنجام گەیاندنی ئەم کارەدا.

کتێبەکە. هەندێجار هەڵەی مێژوویی تێداکراوە. یان تەنانەت هەندێ ناو بەهەڵە نووسراون. ئەوەش بۆ کولتوور-جیاوازیی و زمان-جیاوازیی نووسەرەکان. لەگەڵ زمانی عەرەبیی و کولتووری عەرەبیی و عێراقییدا دەگەڕێتەوە. کە ناکرێ وەک عەرەبێک. یان کوردێک ناوەکان و تێرمۆنۆلۆجییەکان وەک خۆیان بنووسنەوە. بەڵام بەهەمووکەموکوڕییەکی کتێبەکەوە. پێموایە. یەکێکە لەباشترین کتێبەکانی تا هەنووکە لەسەر عێراق نووسرابێت.

**کامیار سابیر ( خەتاب سابیر)**

# پێشەکیی بەقەڵەمی هەردوو وەرگێڕەکە

هەموو ئەو نووسینانەی لەنێوان ئەم جۆرە کەوانەیەدان{ }. لەلایەن وەرگێڕەکانەوە بۆ روونکردنەوە نووسراون.
گرنگیی و بەهای ئەم کتێبە. بۆ کورد هێشتا وەک ئەوسا وایە کە تێیدا نووسراوە. هێشتا نەچووە بچێ. کورد بە دیدی سۆسیۆکولتووریی و سۆسیۆئایدێنتیتیی و سۆسیۆسیاسییەوە لە عێراق بڕوانێ. نووسەرانی ئەم کتێبە زۆر سێناریۆی جیاواز جیاواز دەدەنە بەر لێکۆڵینەوە. سەبارەت بەکوردستان. پرۆژەی فیکریی و سیاسیی زۆر وردو سەلیقەدار دەدەنە بەرباس و لێکۆڵینەوە. ئەوە بەدەر لەوەی گەندەڵیی وەک مۆرانە لەچەندین ساڵی رابردوودا ستراکتۆری ئەم هەلومەرجە دیفاکتۆیە دەخواتەوەو بێزاریی خەڵکی کوردستانیش رۆژبەرۆژ دەچێتە سەر. بەڵام هێشتا ئومێدێکی زۆر هەیە کە کوردستانی سەربەخۆ ( کوردستانی باشوور) لەسەر لاشەی رزیوی عێراق دروست بێ.
ئارگیومێنتەکانی ئەم کتێبە. بۆ ئەجێندا سیاسییەکانی گەلی کورد، دەکرێ هەردوو باری پۆزەتیڤ و نەگەتیڤی تێدا بێ. راپۆرتەکەی بەیکەر-هامیلتۆن لەسەر کورد،. لایەنی نەگەتیڤیی ئەم کتێبەکان خستووەتە خزمەت ئارگیومێنتەکانی خۆیانەوە. بەتایبەتیی دەرهەق بە کەرکوک. بۆیە بۆ سیاسییەکانی کورد زۆر گرنگە بزانن. ئەم کتێبە لەسەر عێراق و کوردستان. چەند قورسایی داناوە بە هەردوو دیوە پۆزەتیڤ و نەگەتیڤەکەیدا. ئایا سیاسییەکانی کورد دەزانن. کەرەسە و ئارگیومێنتەکانی ئەو راپۆرتەی بەیکەر هامیلتون. بەتایبەت ئەوانەی لەسەر کورد و کەرکوکە. بەپلەی یەکەم لەم کتێبەوە سەرچاوەی گرتووە؟
ئەوەی زۆر گرنگە جەختی لێبکرێتەوە. ئەم کتێبە بەهەردوو باری خراپ و باشییدا قورسایی سیاسیی و کولتووریی خۆی داناوە. لەتەواوی نێوەند و ئینستیتوتە سیاسییەکانی جیهاندا. خوێندنەوەی رووداوەکانی عێراق بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەم کتێبە. زۆر نهێنیی شاراوەو زۆر چەمکی لێڵ هەیە. تێگەیشتنیان ئاسان نییە. یاخود دروستتر بڵێین سیاسەتمەدارانی کورد و زۆربەی ئەوانەی رەنگرێژی سیاسەتی کوردیی دەکەن، ئارگیومێنتەکانی ئەم دوو نووسەرە لایان نامۆیە. کە ئەم کتێبە چۆن ئەو ئۆڵتێرنەتیڤ و

باسانەی تێیدایەو لەقازانجی کورد نین. چۆن لەڕژی کورد بەکارهێنراون. کەچیی سیاسییەکانی کورد نەیانتوانیوە هیچ سوودێ لە گفتوگۆ یان ئەوەی پێی دەگوترێ دیبەیت و ئۆڵتێرنەتیڤە باشەکانی ناو ئەم کتێبە وەربگرن و بۆ سوودی کوردستان و خەڵکی کوردستان بەکاری بهێنن!

پاش هەڵبەزو دابەزی سیاسەتەکانی ئەمێریکا. زۆر روون و ئاشکرایە. ئەمێریکا دەستی گرتووە بەیەکێک لەو ئۆڵتێرنەتیڤانەی ئەم کتێبە دەیخاتە روو. بەداخەوە زۆر کەم لە قازانجی کوردستاندایە و زۆر کەمیش لە شارەزایانی سیاسیی کورد. ئاگاداری وردەکارییەکانی هەن.

ئەم دوو سکۆلارە رۆژئاواییە. زۆر بەویژدانانە. زۆر ئەکادیمییانەو زۆر بێلایەنانە. رەخنە لەسیاسەتە ئیمپریالیستییەکانی ئەمێریکا و جیهانی عەرەب و ئیسلام لەمەڕ عێراق دەگرن. بەئاشکرا لەگەڵ چێکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردییدان. بەڵام قۆناغ بەقۆناغ و زۆر بەوردیی و بەوریاییەکی زۆر زۆر ئاگایانەوە. ئاگاییەک کە جێگەی هیچ سنگ دەرپەڕاندن و قسەی سەر مایکرۆفۆن و دیسکۆرسی حیزبیی و ختوکەدانی شەقامی کوردیی و فیکوفاکی پانکوردیزمیی تێدا نابێتەوە. بەڵکوو کاری جدیی و خەباتی سیاسیی و دیپلۆماسیی وجەماوەریی سەختی دەوێ.

ئەو تێرمە ئینگلیزیانەی بە کوردیی نووسراونەتەوە. هەوڵدراوە رێنووسەکەی لەفۆنەتیکە ئینگلیزییەکەوە نزیک بێت. لەچەشنی ( ئۆڵتێرنەتیڤ. ئێسنیک. سێناریۆ. ئەمێریکا. ریفەرێندەم. جیۆگرافی...تاد). بەڵام جێنەراڵمان بە ژەنەراڵ داناوە. لە فۆنەتیکە باوە فرانسییەکەوە. مانگەکانمان بە ئینگلیزیی نووسیوە. ئەوەش لەبەرئەوەی مەی. ئۆگۆست. سێپتەمبەر. ئۆکتۆبەر. نۆڤەمبەر. دیسەمبەر. مارس. بەتەواویی لەکوردییدا جێکەوت بوونە. بۆیە مانگەکانی تریشمان( جەنیوەری. فێبریوەری. ئەپریل{ ئەیپل}. جون و جولای) بە ئینگلیزیی داناون. ئەوەش لەبەرئەوەی مانگەکان کە هەر بەعەرەبیی دەنووسرێن. باشترە بە ئینگلیزییەکە بنووسرێن!

هەندێجار لەبری ئەمێریکا هەر وڵاتە یەکگرتووەکان بەکارهاتووە. واتە بەپێی کتێبەکە. NDP وەک کورتکراوەی پارتی نیشتمانیی دیمۆکراتیی

بــەکار هــاتووە. زۆربــەی ئەوانەی کورتکراوەکانمان دانــاوە. یەکــەمجار وشــە ئینگلیزییەکــەمان بەتــەواویی نووســیوە. وشـــەی هێجــەمۆنی hegemony هەروەک فۆنەتیکە ئینگلیزییەکە دامانناوە. نەک داتاشراوە فارسـییەکەی ( هــەژموون) کــە لەفڕانســییەوە وەرگیــراوە. هەنــدێجار، نووسەران هەندێ وشە و ناوی عەرەبییان بەکارهێناوە. یـاخود هەنـدێجار سـەرێڕەکانیان بەعـەرەبیی {سـکریپتی لاتینیـی} نووسـیوەتەوە. بۆیــە ئێمەش هەمان وشەمان بەعـەرەبیی داناوەتـەوە و بەخـەتی لار( ئیتالیـک ) نووسـیومانەتەوە. هەنـدێجار، هــەر بــە نووسـینی عـەرەبیی وەک خـۆی نووسیومانەتەوە.
دەمانتوانی ئەم دەقە، زۆر نەرم ونیانتر، زۆر خۆشـتر و مڵتـر بکـەین بـۆ خوێندنەوە، بەڵام لە دۆخێکی وادا، لە ناوەڕۆکی کۆنتێکستەکە(سیاق) دوور دەکەوتینەوە. ئەمە قسەی ئەوانەمان بیر دەهێننەوە، کە هەندێ کەس دەڵێن، هەندێ کتێبی وەرگێڕاو، هەرگیز لەوە ناچن، کە بەزمانێکی تـر نووسرابن و بـۆ کـوردیی وەرگێـڕدرابێتن. راسـتییەکەی هەنـدێ لـەو وەرگێڕانانــە، ساختەو کڵاولەسەرنانی زۆر تێدایە. ناکرێ بەهیچ شێوەیەک کۆنتێکسـت و کولتـووری زمـانێکی تـر سـەد لەسـەد خۆمـاڵیی بکـەیت ( مەبەسـتمان لـە بەکوردییکردنە) . ئێمە پێمانوایە، ئەو جۆرە وەرگێڕانانــە، دەچنـە خانـەی کوردانـدنەوە تا وەرگێڕانێکی بەویژدانانە.
هەر لەم روانگەیەوەیە، ئەم وەرگێڕانە، ویسـتوویەتی باڵانسـێک لـە نێـوان وەرگێڕانــی حــەرفیی و کوردانــدا بکــات. تــا توانیبێتمــان هەوڵمانــداوە مەبەستی نووسەرەکان وەک خۆی بگەیەنین. زۆر کەم رێکەوتووە، تەنانەت وشەیەکیشیان بپەڕێنین. بەڵام هەندێجار، بەناچاریی وشـەیەکی ئـەوان لـە رستەیەکدا یـان پارەگرافێکـدا، نـەدەتوانرا جێگـەی بگرێتـەوە، بۆیـە لـەم بارەدا، هەوڵمان داوە مەبەسـتی کۆنتێکسـتەکە بـەدەربڕینێکی زۆر نزیـک، وەربگێڕین. هاوکات زۆر کەم رێدەکەوێت وشـەیەکی سـەربارمان هێنابێتـە نـاو کۆنتێکسـتەکەوە، مەگـەر تـەنها بـۆ دەربڕینـی ئیدیـەمێکی کـوردیی، رستەکە پێویستی بە وشەیەکی کوردیی هـەبووبێ، بـەبێ ئـەوەی بـەبوونی ئەو وشەیە کەم و زۆریی تێ بکەوێ.
سـەبارەت بــە ئیدیــەمی هەنــدێ رســتەو واتــای کۆنتێکســتێک، نــاکرێ وەرگێڕانی "وشەبەوشە" یی پێڕۆ بکرێ، بۆ نموونە کاتێ نووسیویانە( it

drenched in blood is a road). زۆر سەقەت دەردەچێ ئەگەر وەربگێڕدرێ بە (رێگایەکە لەخوێندا خوساوە). بەڵکوو دروستر و جوانتر وایە لە ئیدیەمە کوردییەکەوە نزیک بکرێتەوە، بەبێئەوەی گیانی رستەکە بکێشی. دەکرێ بنووسرێ ( رێگایەکە لەخوێن هەڵکێشراوە) یان ( رێگایەکە بەخوێن ئاودراوە ) یاخود (رێگایەکە بە خوێن سوور بووە ). تەنانەت باشترە لەبری خوسانەکە بنووسرێ (رێگایەکە خوێنی لێ دەچۆڕێتەوە).

هاوکات هەندێجار، وەرگێڕ ناتوانێ لەچوارچێوەی رستەو بابەتەکە دەرچێ و بەئارەزووی خۆی ئیدیەم و تاموچێژی کوردیی ( کوردانـدن) بکات بەبەریدا. بۆ نموونە ئەم رستەیە کاتێ وەردەگێڕدرێ( Finally severing the deeply unpopular umbilical cord linking Iraq to Britain. ). دەبێ نزیک بێ لەم ستایڵەوە (سەرەنجام ئەو ویلاشە نەفرەتلێکراوەی عێراق و بریتانیای پێکەوە دەبەستەوە، پچڕاند). هەندێ کەس وا بیر دەکەنەوە کە کوردانـدنی زێتری تێدا بکرێ و وەک شلەمەنیی هەڵقوڕێنرێ و بکرێ بەدەقێکی کوردیی تەواو عەیار، رەنگە بیکەن بە( سەرەنجام هەموو ئەو سەرەداوانەی عێراقی گرێ دەدایەوە بە بەریتانیاوەو مایەی نەفرەتی قووڵی خەڵک بوون، قرتاند) رستەی دووەم، بۆ زمانی کوردیی رەنگە تێگەیشتنی خۆشتر بێ، بەلام بێویژدانیی زۆری تێدایە، چونکە بەو گریمانەیە بێ، وشەگەلێکی نامۆ و دوور لەدەقەکە، هێنراوەتە ناو رستەکە کوردییەکەوەو بەسەر خوێنەردا ساغ دەکرێنەوە. ئەمەش لەوەرگێڕاندا، دەستپیسیی پێ دەگوترێ.

کەواتە دەبێ بالانسێکی لۆژیکانە هەبێ لەنێوان هەردوو ستایلی وەرگێڕاندا ( حەرفیی نەبێ و واتای گشتیی کۆنتێکستەکەش بەلاڕێدا نەبات). بەلام یەک شت زۆر گرنگە، کولتوور و بیرکردنەوەو داڕشتن و ستراکتۆری نووسینی خەڵکی رۆژئاوا، زۆر جیاوازە لە خەڵکی رۆژهەلاتیی و بەتایبەتیی لە نەتەوەیەکی ژێردەستی وەک کورد، کە دەکرێ بڵێین لەچاو رۆژئاوادا، تازە فێری نووسین بووینە. بۆیە کۆنتێکستی ئەم کتێبە لەهەندێ دەربڕین و رستەدا، هەندێجار رەنگدانەوەی ئەو دیاردەیەی پێوەیە.

بەشـــێوەیەکی گشـــتیی هەوڵـــــدراوە مێتـــــافۆری metaphor وەرگێڕانەکـــە لـــە ڕەوتـــی ســـەرجەم کۆنتێکســـتەکە دەرنـــەچێ. هاوکـــات ئەوەنـــدەش بـــە خێرایـــی و جرپنـــی نەگوشـــراوە. نـــەکا پەرێزەکـــەی زۆر پیس بێ و لێـرەو لـەوێ پەڵـە بـەجێبمێنێ. چونکـە وەرگێـڕ نوێنەرایـەتی دانـەری کتێبـەکـە دەکـات. بـەڵام مێتـافۆری زمـانی ئینگلیزیـی لـەکوێ و مێتافۆری زمـانی کـوردیی لـەکوێ؟ لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا. هەوڵـدراوە فیگـەری رســـتەکان، دەربڕینـــەکان و ئەجێنـــدای پارەگرافـــەکان. لـــەڕووی سیاسـیی، کولتـووریی و سوسـیۆی هەردووکیشـیانەوە بـە مێتـافۆرێکی کوردیی کەم تا زۆر ڕەوان و مڵ و کەم تاسە دابڕێژرێنەوە.

سەرەنجام، وەرگێڕی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە، کەبتوانێ، دەنگـی ڕەسـەنی دانەر، واتای دەقە سەرەکییەکە بەخوێنەر وەک خۆی بگەیەنێت. هیوادارین توانیبێتمان بەهەر ناتەواوییەک و کێماسییەکەوە بێ، دەنگ و مەبەستی ئەم دوو سکۆلارە، بە خوێنەری کـورد بگەیـەنین. بـاوترین کۆنسـێپت لەسـەر وەرگێڕان ئەوەیە، ئایا وەرگێڕان "هونەرە یان کارامـەیی- Art or Craft ". ئەم وەرگێڕانە پێیوایە، لەیەک کاتدا هونەریشـەو داهێنانیشـە. بۆیـە تـا تـــوانرابێ، هەوڵـــدراوە لـــە پێودانـــگ و کرایتێریـــای هونـــەری وەرگێـــڕان نەترازێ، هاوکات هەوڵیش دراوە دەربڕینەکان لەگەڵ ئیدیەمە کوردییەکاندا لێک نزیک بکرێنەوە، بەبێ ئەوەی لە دەقەکە کەمبکرێتەوە یان بپەڕێنرێ و مەبەستەکان بشێوێندرێن.

بۆdemocracy "دیمۆکراسـیی" و بـۆ democratic "دیمـۆکراتیی" مـــان دانـــاوە. هەنـــدێجار، وشـــە ئینگلیزییەکـــەمان لـــەناو کۆنتێکســـتەکەدا داناوەتەوە، بۆ ئەوەی بەلای خوێنەرە ڕوونتر بـێ. ئـەوەش لەبـەر ئـەوەی ئەگەر نەمانتوانیبێ وشەو دەربڕینێکـی گونجـاو بـەکار بهێنـین. هاوکـات، زۆرجـــار لـــەبری وشـــەی قبـــووڵکردن، "پەژرانـــدن" ی کـــوردیی" زاراوەی کرمانجیی" بەکارهێنراوە.

سەرەڕای ئەوەی نووسەرانی ئەم کتێبە، هەندێ هەڵەیان کردووە لە مێـژوو، و شوێنەکانی عێراقدا، یان ناوەکانیان بەهەڵە نووسیوە، بەڵام ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە بۆ دوو نووسەری ڕۆژئاوایی لەسـەر کولتـووری میزۆپۆتامیـا بنووسـن و بکەونـە هەڵـەی سـادەوە. بـەڵام وێـڕای هـەر کەموکورییـەک، دەکرێ بڵێین بەبێ خوێندنەوەی ئـەم کتێبـە، هـیچ کەسـێ نـاتوانێ تـەواو

دەردەسـەرییەکانی عێـراق وردبکاتەوەو سارێژیان بکات و ئۆڵتێرنەتیڤی دروستیان بۆ دابنێ. عێراق کەلاوەیەکە خوێنی هەموو نەتەوەو ئێسنیک و مەزهەبـەکانی تێـدا ڕژاوە. ئـەو کەلاوەیـەی هـەموو جیهـانی عـەرەبیی و ئیسلامیی لەسەر ئایدێنتیتییـە فانتەسـییەکەی( وەهمییەکـەی) شـەڕ دەکـەن. کەلاوەیـەک بـۆ یـەک سـات چییـە. هـەڵگری ئایدێنتیتییـەکی نیشـتمانیی نەبووە و هەرگیزاو هەرگیزیش نابێ.
هیواداریـن. کەسێکمان لێ رانەپەڕێ و رەخنەی ئەوەمان لێبگرێ. گوایە دەقە عەرەبییەکـەی جیـاوازە. چونکـە وەک ئـارام رەفعـەت { سـەرەتای بەشـی هەشتەم ئەو وەریگێڕاوە} گوتەنی. دەقە عەرەبییەکە ئەوەندە قۆڕە. ئەوەندە بێکەڵکە. دەڵێی بـە گوگـل و فەرهـەنگی ئیلکترۆنیـی وەرگێـڕدراوە. بۆیـە خۆشحاڵ دەبین. بەهەر رەخنەیەک کە ئەم وەرگێڕانە بە دەقـە ئۆریجینالـە ئینگلیزییەکە بەراورد بکات. دڵنیاشین. کەموکوڕیی تێدایە. بـەڵام ئەوەنـدە ماندوو بووینە پێوەی. کە دەتوانین بڵێین کارێکی خراپمان نەکردووە. ئەو هەموو ماندووبوون و چەندینجار پێداچوونەوەو بەراوردکردنەش. هەمووی لەبەر خاتر و رێزو خۆشەویستیی خوێنەری بەئاگای کورد بووە.
لەکۆتاییـدا. زۆر سوپاسـی هـەموو ئـەو کـەس و دۆسـتانە دەکـەین کـە یارمەتییان داین. بۆ بەچاپگەیانـدنی ئـەم وەرگێڕانـە. بەتایبـەتیی شـێرزاد حەسـەن. بـەحوکمی دووریـی ئێمـە لەکوردسـتانەوە. ببـوو بـە کـەناڵی پێوەندییگرتن .سوپاس بۆ ئەبوبەکر عبداللە کە دیزایینی بەرگی پێشەوەی بـۆکردین هـەروەها سوپاسـی بـەهرۆز قـادر دەکـەین. گرفتـی فۆنـت و رێنووسی چەند بەندێکی ئەم کتێبەی دەستکاریی کـرد و پێیـدا چـووەوە. جێگەی خۆیەتی لێرەدا بـەزمانی کـوردیی سوپاسـی خوێنـدکاری کۆریـای باشـوور – میجـەنگ لیـی Mi Jung LEE( لـە زانکـۆی مـاکواری- ئوسـترالیا) بکـەین. کـە تـەواوی ریفرێنسـەکانی بـەزمانی ئینگلیزیـی بـۆ نووسـینەوە. تـەنها لەبـەر ئـەوەی دۆسـتێکی مەسـەلەی کـوردە و لەگـەڵ سەربەخۆیی کوردستاندایە.

**کامیار سابیر( خەتاب سابیر) دڵشاد حەمە**

# Acknowledgement سوپاس و پێزانین

پاڵنەری سەرەکیی بۆ نووسینی کتێبێ کە سەرنج بخاتە سەر میراتی ناجێگیریی لەعێراقدا، لە نیوەی دووەمی ساڵی 2001ەوە، بەتایبەتییش لەدوای رووداوە داخورپێنەرەکەی یانزەی سێپتێمبەرەوە پەیدابوو . لەم کاتەدا چەندین ساڵ بوو لێکدانەوەمان لەسەر عێراق و پێشهاتەکانی دەکرد، لە ئاراستەی تێڕوانینی کوردەوە بگرە بۆ یەکێکمان و ئاراستەی زانستی سیاسیی بۆ ئەویترمان. بۆچوونمان لەسەر بەکارێکتەربوونی ئایدێنتیتیIdentity بەهێزی ئێسنیکیی و مەزهەبیی شتێکی نوێ نەبوو. بەلام بەدڵنیاییشەوە"دەستی بۆنەبرابوو" لەبەر ئەوەی ئەکادیمستەکان، بەتایبەتیی لەسەر ئایدێنتیتی بەهێزو یەککگرتووی "عێراقیی" قورساییان دانابوو. پێشنیاری ئێمە بەمشتومڕەوە دەستی پێکرد و بەدڵنیاییشەوە تا ئەمڕۆش لە 2004 دا درێژەی هەیە. بەلام ئێستا دەکرێ بگوترێ کە ئالوودە بووە بە پلەیەکی بەرز لە ریالیزم، لەکاتێکدا عێراق زۆر بێئومێدانە بەرەنگاری ئەوە دەبێتەوە کە دۆخێکی ئارام و جێگیر دەستەبەر بکات. لەبەر ئەوەی هێزگەلێکی زۆر لەناو دەوڵەتەوە بەرنامەرێژکراون، بۆئەوەی هەر لایەنەو وێنەیەکی جیاواز بەعێراق بدات. هەروەک هەردوو وێنەی جیاوازی شیعەو سوننە. یان بۆ هەر بەدەستهێنانێکی نوێ، هەروەک چۆن کوردەکانیش، بۆیان هەیە هەمان کار بکەن.

لەکاتی توێژینەوەو نووسینی ئەم کتێبەدا، کۆمەکێکی زۆری تاک تاکی خەڵکمان پێگەیشت. لەڕاستییدا سروشتی مشتومڕهەڵگری ئارگیۆمێنتەکان و ئەتمۆسفیری بارگاویی هەرشتێک کە بتویستایە لەسەر عێراق بیکەی لە 2001 بەدواوە، واتای ئەوەبوو کە دەبێ راوێژێکی زۆر ژیرانە بکەین و هاوکات پەرچەکردارەکانیان بەهەند وەربگرین. ئەمە بەو واتایە نییە کە پاڵپشتکەرانمان، گرنگە لەگەڵ رەوتی ئارگیومێنتەکانی ئێمەدا بێنەوە، بەڵکوو بۆ ناسینەوەو هەستکردن بە پێداویستیی ئەم ئارگیومێنتانە بوو لە چوارچێوەی رای گشتییدا بۆ بەشدارییکردن لەو دیبەیتانەی پێوەندییان بە پاشەڕۆژی عێراقەوە هەیە. کە پێشبینیی دەکرێ تا ماوەیەکی تر بەسەر رەوشی جیهانییدا زاڵ بێت. بەتایبەتیی دەمانەوێ سوپاسی بەڕێوەبەری نووسینDavid Pervin لە Palgrave Macmillan، بکەین کە

ئاســـانكاريی بـــۆكردين بۆئەوەی باشتر جەخت لە جێبەجێكردنی ئـەم پرۆژەیە بكەینەوە.

هەروەها باوەڕێكی پتەوی نیشانداین لە بڕوابوون بەخۆو بڕینی ئەو كۆنسێپتە تەمومژاوییانەی كە جارجار هەڕەشەی لە تێڕوانینەكانمان دەكرد بە لۆژیكێكی توندەوە. بەهەمان شێوە پرۆفیسۆران Ewan Anderson و Tim Niblock، سەرچاوەیەكی بەردەوامی ڕێنوێنییكردنمان بوون، سەرەڕای ئەوەی لە لایەنگریی بۆچوونەكانماندا ڕۆڵی دوو ئەهریمەنیان دەبینی. لە UK یش سوودێكی زۆرمان لەوە بینی كە تێكەڵییمان لەگەڵ یەكێك لە پێشرەوترین سێنتەری لێكۆڵینەوە لەسەر عێراق، لە پەیمانگای لێكۆڵینەوە عەرەبیی و ئیسلامییەكان، لە زانكۆی Exeter هەبوو، لەكاتێكدا زۆرێك لە ستاف و خوێندكارانی زانكۆ( بەتایبەتیی Lise Storm Grundon و John Measor و Hassan Abdulrazak ) دەوروبەرێكی بەپیتیان بۆ دەمەزەردكردنەوەی بیروڕاكانمان دەستەبەركرد. هەروەها لەلایەن ئەندامانی پرۆگرامی ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە پەیمانگای پاشایی بۆ كاروباری نێودەوڵەتیی ( Chatham House ) . بەدیارییكراویی Ali Ansari, Toby Dodge, Mai Yamani و Rosemary Hollis رەخنەی دەگمەن و دانسقەیان خستە خزمەتی ئەو هەوڵانەی لەپشت ئەم كتێبەوە ڕاوەستاوە. دواتر بەڵام كەمتر نا لەوانی تر، دەمانەوێ سوپاسی هەموو ئەوانە بكەین كە باكگراوندی ئەم توێژینەوەیەیان دابینكرد و یارمەتییان داین بۆ تەواوكردنی كتێبەكە، سوپاس بۆ شیكردنەوەی بلیمەتانەی هەریەك لە
Heather Wiehe, Rosemary Baillon, Lise Storm Grundon و Azos Rashid كە هەمیشە ئامادەبوون دواهەمین هەواڵمان پێبگەیەنن ، هەروەها Alan Bradshaw لە Palgrave Macmillan بۆ كۆكردنەوەی ئەم كارە.

لە كۆتاییدا، سوپاس و ڕێزی بێ پایانمان بۆ دایک و باوكمان، Sian and Ewan Anderson و Lynn and Roy Stansfield هەیە، ئەوانێک هەمیشە یارمەتییدەری سەرەكییمان بوون و ئێمەش ئەم كتێبە پێشكەشی ئەوان دەكەین و بۆ ئەوانە.

# پێشەکیی

"پرۆسەی ئازادیی عێراق" وەک داگیرکارییەکی سەربازیی ئەمێریکیی و بریتانیی بۆ لابردنی رژێمی سەدام حوسێن لەدەسەلات. لە رۆژی چوارشەممە 19 ی ئاداری 2003 دا دەستپێکرد. هەر سێ هەفتەی برد هێزەکانی هاوپەیمانان گەیشتنە دەروازەکانی بەغداد و بینیان هێزەکانی سەدام توانەوە. رووبەڕووبوونەوەی سەربازیی کۆتایی پێهات: ئەوەی مایەوە لەبەرەنگارییەکی ترسناک، داگیرکاریی و بنیاتنانەوەی عێراق بوو، کە بەدەست شەرگەلی چەندین دەیە پێشتر و ئابلۆقەی ئابوورییەوە دەینالاند.

پێنج مانگ پێشتر لە نۆڤەمبەری 2002 دا، لایەنگریی بۆ بەکارهێنانی هێز بۆ لابردنی رژێمی سەدام حوسێن لە 70-75% ەوە بۆ 68% دابەزی. بەوشێوەیەش هێشتا هەر رێژەیەکی بەرچاو بوو. لەهەمانکاتدا، ئامارێکی دژوار، لەلایەن گۆڤاری ( National Geographic ) ەوە بلاوبووەوە و ئامازەی بەوە دەکرد، لەنێوان هەر حەوت کەسێکدا، تەنها یەک کەس ( تەمەنیان لەنێوان 18-24 ساڵ بێت). توانیویانە دەستنیشانی عێراق لەسەر نەخشەی جیهانیی بکەن. بۆ خۆتێهەڵقورتاندنیش، رۆژنامەی Dialy mirror "ئاوێنەی رۆژانە"ی بریتانیی، پەیامنێرێکی بۆ نیویۆرک نارد و لە راپرسییەکی سەد کەسییدا، دەرکەوت هیچ شارەزاییەکیان لەسەر عێراق نەبووە[1]

یەکێک لە پۆلیسەکانی نیویۆرک، ولاتی Austria ی بەعێراق دانابوو. هەندێکیتر عێراقیان لەسەر فرانس و و ئەلبانیا و باکووری ئیتالیا و باشووری ئەفریکا دانابوو. یەکێکی تر لەوەلامدەرەوەکان "کرێکارێکی بیناسازیی کاری قورس" بوو. سەرنجی زۆرکەسی بەلای خۆیدا راکێشابوو. کاتێ دەیگوت" نازانم، گوێ نادەمێ، بەلام لەوانەیە بەزووترین کات، داری بەسەر بەردیەوە نەمێنێ".

گومانی تێدا نییە، رەنگە ئەنجامی لەم چەشنە لەهەر شارێکی رۆژئاواییدا بەدەست بهێنرێ. بەلام ئەوەی زۆرینەی ئەمێریکاییەکان، نازانن عێراق

کەوتووەتە کوێوە. کەچیی لایەنگریی سەرەوژێرکردنی رژێمەکەی بن، ئاماژەیەکە بۆ راستییەکی قووڵتر. زۆربەی ئەمێریکاییەکان لەسەر عێراق وەک دەوڵەت، کەمترین شتیان زانیوە. بەڵام بەدڵنیاییەوە ناوی سەرۆکی پێشووی باش دەناسنەوە. بەئەهریمەنکردنی" قەسابەکەی بەغداد" بەرەنگارییەکی سامناک بوو؛ جبەخانەیەکی گەورەی هەبوو لە چەکی کیمیایی کە بەشێوەیەکی بەردەوام دژی ئێرانییەکان لەسالانی شەڕی هەشتاکاندا بەکاریهێنابوو. لە ساڵی 1988 دا هاوڵاتیانی وڵاتەکەی خۆی، کوردەکانی باکووری عێراق لەشاری هەڵەبجە، ژاربارانکرد: بەکارهێنانی دەستدرێژیی سێکسیی و ئامێرەکانی ئەشکەنجەو ئازار بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ کۆنترۆڵکردنی عێراق لەرووی سیاسییەوە: بەم شێوەیە ئەم زنجیرانە هەر درێژ دەبنەوە.

سەرگوزەشتە قێزەونەکان کە مەرج نییە باوەڕپێکراوبن. لە ژیانێکدا و لەژێر چەپۆکی رژێمی سەدامدا، بەنزینی دەکرد بەسەر ئاگردا. ئەمانە بۆ دیارییکردنی ئەو ناکۆکییە تایبەتییانە بوو کە سەدامیان کردبووە ئەهریمەن بۆ برەودان بەم کێشەیەو ساغکردنەوەی لای جەماوەرێکی زۆر کە گومانیان هەبوو. ئامانجی هەڵکوتانی سەربازیی بۆسەر عێراق، بۆ رزگارکردنی جیهان بوو لەدەست دیکتاتۆرێکی شەڕانگێز و ئازادکردنی خەڵکە چەوساوەکەی، ئەم هێرشە و ئامانجەکەی بۆ سەر هاووڵاتییان و خودی وڵاتەکە نەبوو. بەڵکوو بۆ سەر تاکەکەس و رژێمەکەی بوو. بەڵام وێنەکردنی کێشەکە بەشتێکی تایبەتیی دوو بەربەستیی هەبوو.

یەکەمیان، پێویستە ئەهریمەن پێش راگەیاندنی سەرکەوتنی کۆتایی دەستگیر بکرێ. تا ئێستاش ئوسامە بن لادن" بەزیندوویی یان مردوویی داواکراوە". بەڵام تا بەدەستهێنانی لاشەی ئوسامە دوولەسەر سێی ئەمێریکاییەکان پێیانوایە شەڕی دژە تێرۆر براوە نییە. دووەم، کە گرنگیی زۆرترە ئەوەیە کە سەرنجی رای گشتیی راکێشراوە بۆ سەر تاکەکەس. بەو واتایەی کە لابردنەکەی سەرکەوتووانە کۆتایی پێهاتووە.( یان، تەفروتووناکردن) کە سەرەکییترین دەسمایەی سەرکەوتنەکەیە. هەمیشە گرفت و کێشەکانی عێراق بەمشێوەیە لەلایەن ئیدارەی بوشەوە بەخەڵک دەفرۆشرا. بەرپرسانی ئیدارە، بەتایبەت ئەوانەی لە وەزارەتی بەرگریی بوون، پێیانوابوو هەر گەلی عێراق رزگاری بێ لە جڵەوی دیکتاتۆریی.

ئــــاوێزانی دیمۆکراســـیی دەبـن و بــەهاکانی دیمۆکراسـیی کۆمەڵگــەی ڕۆژئـاوایی بەهەنـد وەردەگـرن و جێگـەی شـیاوی خۆیـان لـە کۆمەڵگـەی سیڤیلدا دەکەنەوە.
عێـراق لـەچاوەڕوانیی دیمۆکراسـییدا. تـەنها کێماسـیی لەنـەبوونی هـەلی پێویست بۆ دەربڕین و نمایشـکردنی خـۆی هـەبوو. یـان گریمانـەی لـەم چەشنە. ڕاستیی. بەدڵنیاییەوە زۆر لەوە ئاڵۆزترە. سـەختترین بەشـی ئـەم شــەڕە هــەرگیزاو هــەرگیز ســەربازیی نــەبووە. بــەڵکوو تــا ئاســتێکی دیارییکراو سیاسیی بووە. بەڵگەش ئەوەیە کەسانێکی زۆر کەم لایـەنگری بەهێزکردنی سـوپای شەقوشـڕی عێراقیـان دەکـرد لەبەرامبـەر بـەهێزترین سوپای مێژوودا. پرسیاری سەرەکیی ئەوە نەبوو کە چـۆن ڕژێمـی سـەدام هەڵدەپێچرێت. بەڵکوو لەشوێنەکەی چیی دادەنرێ.

## (پلان)ەکە

لەکاتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئـەمێریکادا لەسـاڵی 2000 دا. مەسـەلەی عێراق زۆر بەکەمیی لەسەر شـانۆی سیاسـیی پێشـان دەدرا. پێشـتر ڕوون بوو بۆ زۆرکەس کە بەزووترین کـات لەســەر عێـراق دەبـێ شـتێ بکـرێ. ئیدارەی کلینتۆن سیاسەتی هاوسـەنگڕاگرتنی عێراقـی شـێواندبوو. دیـارە بەشـێوەیەکی سـەرەکیی قورسـایی خسـتبووە سـەر مانـەوەی ئابلۆقــەی هەمەلایەنە لەسەر ڕژێم و سەرەتای شکستەکانیشی دەرکـەوتبوو. بیـانووی مانــەوەی ئابلۆقـە. بـۆ تێکشـکاندنی توانـا سـەربازییەکانی عێـراق بـۆ بەرهـەمهێنانی چـەکی کۆکـوژ( WMD ). بـوو. هـەر زوو بـە سیاسـەتی گۆڕینی ڕژێـم جێگـەی گیرایـەوە. هەڵوێسـتی فـەرمیی ئیـدارەی کلینتـۆن ئەوەبوو کاتێ ئابلۆقەی ئابووریی لەسەر عێراق هەڵدەگیردرێ. کـە ڕژێمـی عێــراق چیتــر لەدەســەڵاتدا نــەمێنێ. بــەبێ لەبــەرچاوگرتنی ئاســتی بەدەنگەوەهاتنی ڕژێمی عێراق بۆ تیمەکانی پشکنینی چـەک. لـەم ئاسـتەدا هەموو خولیاکانی ڕژێم بۆ گوێڕایەڵیی پشکنێنەرەکان و داواکارییـەکانیان. بەبادا چوو.
ئەنجامگیرییە چاوەڕوانکراوەکان ئـەوە بـوو. ڕژێمـی عێـراق گوێڕایـەڵیی ناکـات. تیمـی یونسـکۆمUNSCOM گەڕایـەوەو دەسـتکرا بـە لێدانی شێنەیی. بۆمبارانی ئۆپەراسیۆنی ڕێوی بیابـان لـە دیسـەمبەری 1998 دا

دەستی پێکرد. لەم ئانوساتانەدا. ریپۆرتەکان ئاماژەیان بە مردنی میلیۆنیی خەڵکی سیڤیلی عێراق دەکرد لەئەنجامی راستەخۆی سزا ئابوورییەکانەوە. ئەمەش نارەزایەتییەکی گەورەی لەجیهانی عەرەبییدا بەرهەم هێنا. ئەمە بووە هۆی ترسێکی هەڵکشاو و کاریگەر لەسەر پێوەندییە گشتییەکانی ئیدارەی کلینتۆن. دەستەوەستان لەهەر بیروبۆچوونێکی نوێ، ئیدارەی کلینتۆن. جڵەوی دەسەڵاتی دایە دەست ئیدارەیەکی تر کە خاوەنی تێروانینێکی روونتر بوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ رژێمی بەغدادا. وێڕای هەموو ئەمانەش، مەسەلەی عێراق ئەو گرنگییەی پێنەدرا لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەدا. لەکاتێکدا بەروونیی لەخشتەی کارەکاندا بوو لە کاتی وەرگرتنی دەسەلاتدا لەلایەن بوشەوە لە جەنیوەری 2001دا. هەروەها لە سێپتێمبەری 2000دا پرۆژەی چەرخی ئەمێریکیی نوێ ( PNAC) کە بیرۆکەی گرووپێ لە پسپۆرەکانیThink Tank نیۆکۆنسێرڤەتیڤەکان بوو کە نزیکایەتییەکی بەرچاویان لە گەڵ ئیدارەی نوێی ئەمێریکادا هەبوو، داکۆکییان لە " رۆڵی هەمیشەیی زۆرتر "ی ئەمێریکا دەکرد لەناوچەی کەنداودا.

گفتوگۆی ئەوەیان دەورووژاند" کاتێ کێشەی عێراق کۆتایی پێنەهاتووە. پاکانەیەکی دەستوبرد دەدات بەئەمێریکا بۆ ئامادەباشیی هێزی سەربازیی زۆرتر لەناوچەکەدا. بۆ بالادەستیی بەسەر سەدام حوسێندا"[2] لەهەموویشی سەرنجراکێشتر ئەم گرووپە دەستنیشانی یەکێک لە ئەرکەکانی ئەم میلیتاریزەکردنەی بە " سەقامگیریی و فراوانکردنی ناوچەکانی ئاشتیی دیمۆکراسییانە" ناوزەد کرد. بەهەرحاڵ کێشەی عێراق ئەو گرنگییە بەرچاوەی نەبوو تا 11 ی سێپتامبەری 2001. دەرهەق بە هەلومەرجی وتاری یەکریزیی، سەرۆک، وڵاتی عێراقی خستە ناو تیشکۆی بایەخ پێدانەوە. هەولێدا پێوەندییەکی بەهێز لەنێوان شەڕ لەدژی تێرۆر و ئەو دەوڵەتانەدا ببەستێتەوە کە لەسەردەمی کلینتۆندا بە دەوڵەتە سەرکێشەکان Rouge State{لاسارەکان} ناسرابوون. هەروەها عێراق دانرا بەیەکێک لەو وڵاتانەی کە ئێران و کۆریای باکووریشی دەگرتەوەو بە ئەندامانی تەوەرەی شەڕانگێزیی axis of evil ئەژمارد دەکران، ئامانجی دروست بەئاشکرایی دیاربوو. ئەو تایبەتمەندییانەی لەم تەوەرەیە داواکراو بوو تا ئاستێکی بەرچاو تەمومژاویی بوو. لەکاتێکدا وای

دەخواســـــت هـــــەردوو خواستی پەیداکردنی چەکی کۆکوژ WMD و پشتگیرییکردنی تیرۆری تێدابووایە. لەکاتێکدا ئێران تاکە وڵات بوو هەردوو تایبەتمەندییەکەی تێدابێت، بەڵام هەر لەسەرەتاوە دیار بوو. ئیدارەی بوش ئامانجی گۆڕینی رژێمی عێراق بوو.
هەوڵگەلێکی بێسەمەر درا بۆ تێوەگلانی عێراق بۆ شەڕێکی بەرینتر لەدژی تیرۆر. بەلام بەڵگەی ناتەواو لەسەر بوونی پێوەندیی نێوان سەدام و تیرۆریزم. کەمتریش لەنێوان رژێمی بەغداو ئەلقاعیدەدا. ئەم هەوڵانەی پەکخست. ئوسامە بن لادن. کینەی خۆی لە رژێمی سێکیولاری عێراق ناشاردەوە. تەنانەت توانستییەکانی خستە خزمەتی سعودییەوە بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت لەساڵی 1991دا. بێ بەڵگەیی وایکرد زۆربەی جیهان. تەنانەت هەندێ لە چاودێرە ئەمێریکاییەکانیش بەگومان بوون لەوەی چۆن رژێم-گۆڕین جگە لەکاری نەگەتیڤکاری باش ناکات. پەلاماردانی دەوڵەتێکی عەرەبیی و ئیسلامیی لە نێودڵی رۆژهەڵاتی ناقیندا. پرسی مەترسییەکان و ناحەزیی بەرامبەر ئەمێریکا گەورەتر کردەوە تا ئەوەی کەمی بکاتەوە.
لە رووی بەهاوە. ئەو روونکردنەوانەی لەلایەن ئیدارەی بوشەوە دەدرا. جێگەی متمانە نەبوون. بەهەرحاڵ. چاودێرانی سیاسیی وریا. (پەی)ان بەوە برد. ئەو ستراتیژە نوێیەی لەعێراقدا. گیراوەتەبەر بۆ گۆڕینی رژێمی عێراقە. ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی NSS لە سێپتەمبەری 2002 دا دەرچوو. یارمەتی زۆرکەسی دا پارچە بزربووەکانی ئەو نهێنییە بدۆزنەوە. ستوونووس Mark Danner لە نیویۆرک تایمزدا کە پێچەوانەی-بۆچوونی-سەرنووسەرە Op-ed دەستنیشانی" ئەو بۆشاییەی کربوو لە نێوان پاکانەکانی شەڕو ئەو پرۆژە ئاڵۆزە جیۆسیاسییەی هەندێک کەسی ناو ئیدارەی بوشی لەپشتەوەیە"[3]. بەپێی Danner بێت. سروشتی ئەم پرۆژە سادەیە: بنیاتنانەوەی سەرمایەدارییانەی سەرجەم رۆژهەڵاتی ناقینە. چێکردنی" یەکەمین دیمۆکراسیی عەرەبیی " لە عێراقدا هانی میانڕەوەکانی ئێران لەدژی سەرانی توندڕۆ. بۆکرانەوەی زۆرتر بەرووی دەرەوەدا دەدات. تەنانەت دابینکردنی کۆمەڵگەیەکی دیمۆکراسی لە رۆژهەلاتی بەغدادا. لەهەمانکاتدا. کۆنترۆڵکردنی نەوتێکی زۆری یەدەک لەعێراقدا. ئەو پشتبەستنەی رۆژئاوا

بـه نـــەوتی عەرەبســـتانی ســعودییە هەیـــەتی. لای کـــەم لـــە کورتمـــاوەدا ناهێڵێ و ڕێگەش خۆش دەکات بـۆ کشـانەوەی هێزەکـانی ئـەمێریکا لـە" خاکی پیرۆز" و بەمـەش یـەکێک لـە گرفتـە سـەرەکییەکانی بـارگرژیی لـە جیهانی عەرەبییدا رادەماڵرێ.

لەمـەش گرنگتـر. بڵاوکردنــەوەی دیمۆکراسـیی و گەشـەکردنی ناوچەکـە یارمەتی" وشکردنی زۆنگاو" ەکانی تیرۆر دەکات. بە لابردنی رەگوڕیشەی هۆکارەکانی تیرۆریزم لەچەشنی هەژاریی و سەرکوتی سیاسیی. بەپێی ئەم تیڕوانینـە بێـت. سیاسـەتەکانی ئـەمێریکا لەهەمبـەر رۆژهـەڵاتی ناڤینـدا. هۆکاری بەرایی تیرۆر نین. بەڵکوو رۆڵی بەربەستکەری هەورە برووسـکە دەگێـڕن کـە چاویـان خسـتووەتە سـەر ئـەو وەڕەسـبوونەی لەلایـەن ستراکتۆری هێزە فەندەمێنتالیستەکانەوە بەرهەم دەهێنرێ. تیشـک خسـتنە سەر ئەم هێزە تیرۆریست و توندڕۆیانە و چارەسەرکردنیان. بۆی هەیە تا رادەیـەکی بـەرچاو کـارگوزاریی تیـرۆر لەسـەرچاوەکەیەوە بکوژێنێتـەوە. بەمشێوەیە. داگیرکردنی عێـراق. بەسـتراوەتەوە بـە شـەڕی تیـرۆر. بـەڵام لەئاستێکی زۆر باڵاتر لەوەی ئیدارەی بوش رەنگرێژیی بۆ کردبوو.

Danner لە شیکردنەوەی بایـەخی راسـتەقینەی سـتراتیژی ئاساییشـیی نەتەوەییدا NSS تەنها کەس نەبوو. مێژوونووسی مەزن John Lewis Gaddis یـش بەهـەمان ئـەنجامگیریی گەیشـت. ئـەم NSS ەی بـەوە وەسفکرد " پلانێکە بۆ وەرچەرخانی هەموو رۆژهەڵاتی ناڤینی ئیسـلامیی: بـۆ بەیـەکجاریی چوونـە نـاو دنیـای مۆدێرنـەوە"[4] بـەپێی تیڕوانینـی Gaddis ئەم " ستراتیژییە گەورەیە... بـۆی هەیـە جوڵـەی پرۆسێسـێک دەست پێبکات. بەلاوازکرن و راماڵینی یەکجاریی رژێمـە کۆنەپەرسـتەکان لە شوێنەکانی تری رۆژهەڵاتی ناڤیندا. بەمشێوەیەش ئەو زەمینە سـەرەکیی و لەبارەی گەشەکردنی تیرۆریزم بنبڕ دەکرێ"[5].

گریمانەی سەرەکیی لەپشـت سـتراتیژی ئاساییشـیی نەتەوەییـەوە NSS. ئەوەیە. لە ئێستادا ئەم ستراتیژییە دەستنیشانی ئەوە دەکات" تاکە مـۆدێلی سـەرکەوتن و پێشـکەوتنی گەلانــە: ئـازادیی. دیمۆکراسـیی و پـرۆژەی ئازاد.....ئەم بەهایانەی ئازادیی راست و دروستن بۆ هەموو کەسێ. لەهـەر کۆمەڵگەیەکدا بێت"[6] لە ناوەڕۆکیشدا ستراتیژییەکەی ئیدارە. شـەڕێکە بـۆ مسـۆگەرکردنی" دڵ و هـۆش" ی خـەڵکانی ناوچەکـە. ئەمـەش لای کـەم

پرۆژەیـــــــــــــــەکی ئومێدخوازانەیە. هـەروەک Gaddis روونـی دەکاتەوە" پتر لە نیو سەدە لەمەوپێش لەو کاتەوەی ئەمێریکاییەکان شانیان دایە بەر دیمۆکراتیزەکردنی ئەڵمانیا و ژاپۆن. شتێکی لەم چەشنە لـەرووی ئازایـەتیی، مکـۆمیی و تێڕوانینـەوە نییـە"[7] هاوکـات پرۆژەیـەکی زۆر مەترسییداریشە. دەتوانرێ بگوترێ ئەمـەش سـەختترین پاسـاوهێنانەوەیە لـەمێژوودا. ئیـدارەی بـوش بەشـێوەیەک لەشـێوەکان، پێویسـتی بـە رازییکردنـی جیهـانی عـەرەبیی هەیـە، بـەوەی کـە سـتراتیژییە مەزنەکـەی ماراسۆنێکی گاڵتەئامێزانەو کۆنترۆڵکردنی نیۆئیمپیریالیستانە neo نییـە. بەڵکوو لەراستییدا لە قازانجی خەڵکی ناوچەکەیە.

هەندێ ئایدیا لەم بوارەدا دەکرێ لەبەرچاوبگیرێ و بە هەڵسەنگاندنی ئـەو ئەنجامانەی Gallup بـۆ راپرسـیی کردبـووی لـەنێو نـۆ وڵاتـی زۆرینـە موسڵماندا[8]. کەسی سەرسام نەکرد، کاتێ سـەرۆک بـوش تـەنها 11% ی خەڵک لایەنگرییان کردووە. ئەوەی سنووری شۆکبوونیشـی بەزانـد ئـەوە بوو، پتر لە 60% ی ئەوانەی راپرسیەکە گرتنییـەوە، بڕوایـان وانـەبووە، عەرەب تەقینەوەکانی 9/11 ئەنجام دابێت. لەکاتێکدا ئەمـە 89% ی ئـەو کوەیتییانەن بەشداری راپرسیەکەیان کردووە. ئەوەی لەلایەن چـاودێرانی" شـەقامی عـەرەبیی"ەوە سـەرنجی خرایـە سـەر، بۆچـوونی بـاو لـە نێـوان عەرەبەکاندا ئەوەیە، ئیسرائیل بە هاوکاریی CIA نەخشەداڕێژەری 9/11 بوونە، بۆ بیانوویەکی پێشوەخت بۆ هەر شەڕێکی چاوەڕوانکراو لـە دژی جیهانی ئیسلامیی، رای گشتیی خەڵک، پێچەوانەی بەڵگەکانی ئەمێریکایـەو ئەمەش قامک دەخاتەوە سەر ئەو بێزارییەی لە هەمبەر سیاسەتەکانی وڵاتـە یەکگرتووەکان دا رەگوڕیشەیەکی قووڵی هەیە. لایەنی پۆزەتیڤیش ئەوەیە، ناوبـانگی وڵاتـە یـەکگرتووەکان لـە جیهـانی عەرەبـدا دەشـێ باشـبکرێ، سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر راگیرییەکە گوتی" گومان لەوەدا نییـە کـە دەبـێ کـاری باشـتر، بـۆ گەیانـدنی میهرەبـانیی و سەرگوزەشـتەی ئەمێریکاییەکان بکەین."[9] بەدڵنیاییەوە،

ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان نەتوانێ ئـەم کەلێنـە پڕبکاتـەوە بەشـێوەیەکی کـارا، هەوڵـەکانی بنیاتنانـەوەی عێـراق بـە رەنگرێژیـی لیبراڵیـی و دیمۆکراسیی سەرکەوتوو نابێ، سەپاندنی دەسەڵات و سیسـتەمێکی نـامۆ، بەسەر گەلێکی بێچارەدا، نەک هەر کارێکی لێوانلێـو قێزەونـە لـە عێراقـدا،

بەڵکوو لە تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناڤینیشدا. جیاوازیی هەیە لە نێوان گریمانەی ئەوەی کە خەڵکی عێراق" ئازادیی. دیمۆکراسیی و پرۆژەی ئازاد"یان دەوێ لەگەڵ گریمانەی ئەوەی گوێی پێ نادەن ئەگەر بەسەریاندا و بەزەبری چەک بسەپێنرێ. لەکاتێکدا ئیدارەی بوش هەڵمەتێکی گەورەی مۆراڵیی بۆ دارشتنەوەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین دەست پێکردووە. هاوشان لەگەڵ ئەم هەڵمەتەدا. لەم ناوچەیەدا مێژوویەکی دوژمنایەتیی دوورودرێژ بەرامبەر ولاتە یەککگرتووەکان هەیە. هەروەها هەڵبژاردنی کەیسی عێراق بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە. پێدەچێ ولاتە یەککگرتووەکان سەختترین کەیسی هەڵبژاردبێ.

## ماددەی خاو

مێژووی عێراق وەک قەوارەیەکی مۆدێرنی سیاسیی. ڕاستەوخۆ بۆ دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی Post-WWI دەگەڕێتەوە. کاتێ بریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤینی وێرانەدا بەغدادو بەسرەی پێکەوەلکان[10]. دواتر ناوچەکانی باکوور کە بەهەرێمی موسڵ ناسرابوو لەساڵی 1925 دا. هاتە سەریان و پێکەوە ئەم جیۆگرافیایەی دەولەتی عێراقیان دروستکرد. تا ئێستاش ماوەتەوە. عێراق سەربەخۆیی فەرمیی خۆی لە بریتانیا لە ساڵی 1932 دا وەرگرت. دواتریش لەلایەن بنەماڵەی پادشایی سەپێنراو لەلایەن بەریتانیاوە بەڕێوەدەبرا تا بەزەبری کوودەتای سەربازیی ساڵی 1958 لە دەسەلات هێنرایە خوارەوە. دەیەیەک لە پاشاگەردانیی(کەیۆس) سیاسیی ( 1958-1968 ). بواری بۆ بەعس. حیزبەکەی سەدام حوسێن رەخساند. لەساڵی 1979 شەوە بۆ دیکتاتۆریی تۆتالیتاریی لەژێر چەکمەی ئاگرو ئاسنی خودی " سەرکردەی مەزن" دا. لەم ماوەیەدا عێراق وەک دەولەت یەکێتیی خاکەکەی پاراست. بەلام ئەوەی هەمیشە عێراق شکستی تێداخواردووە. ئەوەیە هەرگیز بەنەتەوە Nation نەبوو. بەشێک لەم شکستە پێوەندیی بەو توندوتیژییە قووڵ و دابڕانە ئێسنیکیی،خێڵایەتیی. ئابووریی و مەزهەبییەکانی خەڵکی عێراقەوە بووەو تا ئەمرۆش بوونیان ماوە. لەولاشەوە شکستی دەسەلاتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق بووە. کە نەیانتوانیوە چوارچێوەیەکی گشتگیر و ئایدێنتیتیی کۆدەنگیی نیشتمانیی رەنێو بێنن.

لـــەم تەونـــە ئـــالۆزەی کۆمەڵگەی عێراقییدا. ترائیسیۆنی دابەشبوونە جیۆگرافییەکان باشتر جێکەوتبوونە لـە ئـەنجامی جیاوازییـە ئێسـنیکیی و مەزهەبییەکانـــدا. بەســـرە، هـــەرێمی پێشـــووی عوســـمانییەکان، پێشـــترو (هەنووکـــە) ش زۆرینـــەی دانیشـــتووانی موســـڵمانی شـــیعەن: بەغـــداد و موسڵیش سوننەن. بەگشتیی، شیعەکان نزیکـەی 60% ی خـەڵکی عێـراق پێکدەهێنن. سوننەکانیش 35%. ئەو 5% ی دەشمێنێتەوە، تێکەڵەیەکە لـە فەلـەکان و گرووپـە بچووکـە ئایینییـە هەمـەجۆرەکانی تـر. دابەشـبوونی مەزهەبیی، لەبـەر هۆکـاریی سیاسـیی و ئـایینیی، لەئەگـەری تەقینەوەدایـە. لەسەردەمی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە، دەسـەڵاتی سیاسـیی و سـەربازیی بەشـێوەیەکی دەستبەسـەرداگیراو لەلایـەن سـوننەکانەوە بـەڕێوەبراوە. کـۆنترۆڵکردنی دەسـەڵات و دابەشـکردنی دەسـتکەوتەکان، بێزارییـەکی پێشخواردووی لەناو شیعەکاندا لێکەوتبووەوە. ناوبەناویش دەرەتانیان بـۆ هەڵبکەوتایە یاخیبوونی خوێناوییان ئەنجام دەدا.
وێـڕای دابەشـبوونی مەزهـەبیی، عێـراق کەرتکـەرت بـووە بەسـەر هێڵـی ئێســنیکییدا. ناوەڕاســت و باشــوور لــەڕووی ئێســنیکییەوە عــەرەبن. لەکاتێکـدا باکوورەکـەی، کوردەکـان لێـی نیشـتەجێن لەگـەڵ ئێســنیکی بچـووکتر لەچەشـنی تورکمانـەکان و ئاشـوورییەکان. لـەڕووی ژمـارەوە، عەرەبەکان نزیکەی 80% و کوردەکانیش لە نێوان 15_20% خـەڵکی عێراقن. بەیەکەوەلکاندنی موسڵ بە دەوڵـەتی عێراقـەوە لەسـاڵی 1925 دا لای کەم دەکرێ بگوترێ بۆ کەمکردنەوەی ژمـارەی شـیعەکان بـوو[11]. لـە پراکتیکیشـدا ئـەم بڕیـارە رەنگدانـەوەی چارەنووسسـازی لێکەوتـەوە. کوردەکانی باکووری عێراق هەرگیز حوکمی ناوەندیان قبـووڵ نـەکردووە. بە کورتیی، لە مێژووی شـێواویی دەوڵـەتی مـۆدێرنی عێراقـدا یـەکێک لـە نەگۆڕە دەگمەنـەکان، سـیمای بـەرگریی کـوردیی دژی دەوڵـەتی عـەرەبیی سەنتەر بووە. زۆرجاریش، ئـەم بەرهەڵسـتکارییە دژی دەسـەڵاتی بەغـداد، خۆی لە راپەڕینی توندوتیژدا دیوەتـەوە. ئـەم یاخیبوونانـەش بەوپـەڕیی دڕندایەتییەوە سەرکوتکراون و تا هاتووشە تونـدتر سـەرکوتکراون. ئـەم نموونەیەش دووبارە بـووەوە لـە دوای جـەنگی دووەمـی کەنـداو لەسـاڵی 1991 دا. شـەپۆلی شۆڕشـێکی سەرتاسـەریی لـە دژی رژێمـی قێـزەون و بـەزییوی سـەدام، بـووە هـۆی دەستبەسـەرداگرتنی زۆربـەی شـارە

سەرەکییەکان لە باکووری عێراقدا، لەکاتێکدا هێزەکانی ڕژێم بەوپەڕی دڵڕەقییەوە لەهەوڵی تەفروتوناکردنیدابوون. لە ئەنجامیشدا، لەژێر چاودێریی و پشتیوانیی بریتانیاو وڵاتە یەکگرتووەکان دا، ناوچەی نژەفڕین هاتە کایەوە. هەروەها بەهۆی ڕژانی پارەیەکی بێشوومارەوە لەئەنجامی مامەڵەکردن بەنەوتی قاچاغەوە لەسەر سنووری تورکیا. جگە لە داهاتی 13% ی نەوتی عێراق بەشێوەی یاسایی. کوردەکان بەردەوامن لەو خۆشییەی بە " چەرخی زێڕین" ناسراوە لەدەرەوەی دەسەڵات و کۆنترۆڵی دەوڵەتی عێراق، ئەمانەش، بێگومان بەبێ شەڕ نایکەنە قوربانیی و لەدەست خۆیانی نادەن.

بەرەچاوکردنی قووڵایی ئەم دابەشبوونە کۆمەڵایەتییانە، ئەستەمێکی سەیرە، هیچ دەسەڵاتدارێکی عێراق نەیتوانیوە ئایدێنتیتی نیشتمانیی بۆ خەڵکی عێراق بە ڕوونیی دابڕێژێت. هەرکاتێکیش هەستکردن بە ئایدێنتیتی عێراقیی بەرجەستەبووبێت، وەک هێزێکی نەگەتیف نەک پۆزەتیف ناسرێنراوە - وەک داردەستی نەیارە ناوخۆییەکانی عێراق " دوژمنەکانی دەوڵەت" یان دێو و درنجە دەرەکییەکان لەچەشنی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم سەیرکراوە. لەباری مێژووییەوە وزەیەکی زۆرتر لە دروستکردنی ئایدێنتیتی پانعەرەبییدا خەرجکراوە. تا ئایدێنتیتییەکی عێراقیی ڕووت[12]. لەکاتێکدا قبووڵکردنی پانعەرەبییزم بۆ کەمایەتیی کورد ئەستەمترە. ئەوانەی هەوڵیاندا بۆ دامەزراندنی تێڕوانینێکی نەتەوەیی شکستیان هێنا، کەسانێکیش هەوڵیان نەدا و پێیان باشتر بوو دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکانی عێراق بەکاربهێنن بۆ پاراستنی دەستکەوت و دەسەڵاتەکانیان. زۆربەی ڕژێمەکان، بەتەواویی پشتیان بە دەستنیشانکردنی پۆستە باڵاکان و بەکارهێنانی توندوتیژیی بەستبوو، بۆ پارێزگارییکردن لە یەکێتیی جیۆگرافیای دەوڵەت، لەکاتێکدا بۆ دابینکردنی ئایدێنتیتیی نەتەوەیی، دەرگیری ئەرکێکی سەخت و ئەستەم بووبوون.

دەکرێ بگوترێ سەدام حوسێن، توانیویەتی بەکارهێنانی توندوتیژیی بکاتە هونەر. لە ڕاستییدا وەک دواهەمین سەرداری عێراق، ئەمیش لەوە گەیشت، هەر هێز دەتوانێ ئەم وڵاتە پێکەوە گرێ بدات. لەم ئاقارەشدا، سەدام لەمێژووی عێراقدا فیگەرێکی دەگمەن نییە، بەڵکوو بەرهەمی ئەو

لۆژیکـــــــه قورســــــــه‌یه. ده‌وڵه‌تێکی سه‌رکه‌وتوو به‌ شێوازیی ئاشتییانه‌ به‌ڕێوه‌ ببات.

## میراتی سه‌دام حوسێن

لـه‌ 16ی ئۆکتۆبـه‌ری 2002 دا عێراقییـه‌کان بـۆ ده‌نگـدان چـوون، بـۆ ئه‌گه‌ری درێژکردنه‌وه‌ی ماوه‌ی سه‌رۆکایه‌تی سه‌دام بـۆ حـه‌وت ساڵی تـر. جێگـه‌ی سه‌رسـوڕمان نییـه‌. عێراقییـه‌کان بـه‌ 100%متمانـه‌یان پێـی به‌خشـییه‌وه‌. هـه‌روه‌ک ژۆرناڵیسـتی بریتـانیی Mark Steel Wryly سه‌رنجی دابوو " سه‌دام پێویسته‌ به‌ تایبه‌تیی شادمان بێـت، پـاش ئـه‌وه‌ی جاری پێشووتر نیگه‌ران بوو به‌ ده‌ستهێنانی 99.96% ی ده‌نگـه‌کان"[13] هه‌رچه‌نـده‌ ئـه‌م شـانۆگه‌رییه‌ی دیمۆکراسـیی بـه‌ سـتایلی سـه‌دامیی بـۆ ژۆرناڵیسـته‌ رۆژئاواییـه‌کان گاڵته‌جارییـه‌ farcical بـه‌ڵام چیرۆکـی راسته‌قینه‌ی ئـه‌م بابه‌تـه‌ به‌تـه‌واویی پشـتگوێ خرابـوو. لـه‌ دوای بـه‌زینی سه‌ربازیی له‌ دووه‌م شه‌ڕی که‌نداودا. به‌ هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی 15 پارێزگا له‌ کۆی 18. که‌ عێراقی ته‌نییـه‌وه‌، ژماره‌یـه‌ک کوودەتـای سـه‌ربازیی و هه‌وڵـه‌ی تیرۆرکردن، پتر له‌ ده‌یه‌یه‌ک ئابلۆقه‌یه‌کی ئابووریی تونـد. کـه‌چیی هێشـتا رژێمه‌کـه‌ی سـه‌دام، کـۆنترۆڵی تـه‌واوی به‌ده‌سته‌وه‌ بـوو. تـوانی زۆربـه‌ی عێراقییه‌کان بنێرێته‌ سـه‌ر سـندووقه‌کانی ده‌نگـدان. بـۆ ئـه‌وه‌ی به‌ڕێگـه‌ی "راست" ده‌نگ بده‌ن. بێ له‌به‌رچاوگرتنی ئه‌وه‌ی بۆچیی خه‌ڵک به‌وشێوه‌یه‌ ده‌نگیان دا. خـه‌ڵک هه‌ڵسـوڕاندن و جـه‌مکردنی مێگـه‌لیی، خـۆی له‌خۆیـدا کارێکی سه‌رنجڕاکێش بوو. ئه‌مه‌ش واتای ئه‌وه‌بوو. سه‌دام تا ئۆکتۆبـه‌ری 2002 زۆربه‌باشیی کۆنترۆڵی عێراقی به‌ده‌سته‌وه‌ بوو.

دیـاره‌ سـه‌دام چیتـر لـه‌ ده‌سـه‌ڵاتدا نـه‌ماوه‌. بـه‌ڵام لابردنه‌کـه‌ی بـه‌زه‌بری گه‌وره‌ترین هێزی سه‌ربازیی له‌مێژوودا. جێبه‌جێکرا. هه‌روه‌ک فیگـه‌ره‌کانی له‌چه‌شنی ستالین و کاسترۆ. سـه‌دام ده‌چێتـه‌ ریـزی ئه‌وانـه‌ی لـه‌ چـه‌رخی بیسته‌مدا به‌زیندوویی ده‌رباز بوون. به‌هه‌ر پێوه‌رێک له‌ پێوانه‌( ئـابووریی، کۆمه‌ڵایـه‌تیی، سیاسـیی و سـه‌ربازیی) ه‌کـان، ده‌سـه‌ڵاتی سـه‌دام بـۆ عێراقییه‌کان کاره‌سـات بـوو. بـه‌ڵام بـه‌پێوه‌ری سـه‌قامگیریی درێژخایـه‌ن، سه‌دام سه‌رکه‌وتووترین سه‌رداری عێراقی مۆدێرن بووه‌. توانسـتی سـه‌دام بۆ مانه‌وه‌ جێگه‌ی سه‌رسوڕمانه‌. تێگه‌یشـتن لـه‌وه‌ی چـۆن سـه‌دام بـۆ 35

ساڵ لەدەسەڵاتدا مایەوە، زۆر گرنگە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ تێبگەن لە قەبەیی ئەو ئەرکەی دووچاری دەبن لە بنیاتنانەوەی عێراقدا.
بەدڵنیاییەوە، ترس فاکتەرێکی گرنگ بوو. ناوبانگی سەدام بە بێبەزەیی و دڕندایەتیی، ئەگەر زیادەشی پێوەنرابێت، گومانی تێدا نییە شایستەی بووە، بەڵام ئەمە تەنها فاکتەر نییە. هیچ ڕژێمێ هەرچەندە دڕندەش بێت، تەنها بەفاکتەری ترس ناتوانێ ئەوەندەی سەدام درێژە بەژیانی بدات. هەڵسەنگاندنێکی زۆر وردتر، ئاماژە بەوەدەکات، سەدام یارییکەرێکی زۆر بەتوانا بووە لەگەمە سیاسییەکانی عێراقدا. هەروەک سەدام لە زووەوە تێیگەیشت، تەنانەت تا ئێستاش، هۆکارە سەرەکییەکانی دەربازبوونی سیاسیی لە کۆمەڵگەی پرکێشەی عێراقدا، ترس و ڕێکخراوبوونە. لەژێر دەسەڵاتی تاکرەوییدا، سەدام لەدوای 1979 ەوە، حیزبی بەعسی دامالّی لە خەرمانەی ئایدۆلۆژیی، گۆری بە ماشینێک بەویستی خۆی سوکان بەدەستەوە بگرێ. لە مۆدێلی حیزبی شیوعیی یەکێتیی سۆڤیەتەوە نزیک بوو. توانرا ستراکتۆرو هەرەمی حیزبی بەعس، لەهەموو بوارەکانی ژیاندا شۆڕبکرێتەوە و کۆنترۆڵی خەڵک بکات. سەرەکییترین هەوڵەکان لە حەفتاکاندا بۆ بنبرکردنی نەخوێندەوارییی، لە ڕێگەی فراوانکردنی هۆکانی دەستگەیشتن بە خوێندن، بەیەکێک لە دەستکەوتە گرنگەکانی حیزبی بەعس دێتە ئەژمارىن. لەهەمان کاتیشدا بەعس توانی مێشکی چەندین نەوە بئاخنێ و بە دۆگمای بەعس، گرنگیی و پاراستنی "شۆڕش" لەهەمبەر دوژمنە ناوخۆیی و دەرەکییەکاندا پڕچەکیان بکات.
دوابەدوای ئەمانەش، سەدام دەستی دایە دامەزراندن و بێلایەنکردن ، یان بە سادەیی لەناوبردنی ستراکتۆری نەیارەکانی لەناو دەوڵەتدا. حیزبی شیوعیی عێراقیی تاکە حیزبێک بوو لەدوای حیزبی بەعسەوە لەگەورەیی ڕێکخراوبووندا لەمێژووی گرژی سیاسیی عێراقدا. یەکەمجار لەقاڵبدراو و دواتریش لێیان درا. هێزی سەربازیی، وەک بڕیاردەری کلاسیکیی دەسەڵاتی سیاسیی بووە لە پێش بەعسیشەوە. بەناو بێلایەن کرا. زۆربەی پۆستە باڵاکانی ئەم دەزگایە بەدەست پیاوانی حیزبی بەعسەوە بووە، یان چ وەک بنەماڵەیی، یاخود بە عەشیرەت نزیکایەتییان لەگەڵ سەدامدا هەبووە.

پاکسازییە ناوبەناوەکان. پەیامی ئەوەی بە هێزە سەربازییەکان دەدا. کە کێ عێراق بەڕێوە دەبات. بۆ باشتر پاراستنی خۆیشی لەهەر کوودەتایەکی سەربازیی. سەدام ژمارەیەک سوپای" نا تەقلیدیی" سەربازیی تری لەدەرەوەی زنجیرەی فەرماندەییە سەربازییەکاندا دروستکردبوو. ئەمانەش خۆیان لە نێوان میلیشیای شاریی فیدائییەکانی سەدام( پیاوانی قوربانییدەر) و مەرگچێنەکانی گاردی کۆماریی و گاردە تایبەتەکاندا دەبینییەوە.

بە ڕژانی دەرامەتێکی زۆر بەسەر ئەم هێزانەدا لەسەر حیسابی هێزە نیزامییەکان. سەدام ئەوپەڕی وەفاداریی ئەمانەی کڕیی و گەرەنتیی مانەوەی خۆیشی زامنکرد لەهەمبەر هەر ڕاپەڕینێکی ناوخۆییدا. چاودێرییەکی زۆر ورد دەکرا بۆ کۆنترۆڵکردن و پاراستنی سەدام. ئەمەش بە تۆڕێکی چڕوپڕ و ئاڵۆزی ئاسایش سپێردرابوو. هەر لە بەڕێوەبەرایەتیی هەواڵگریی گشتیی ( موخابەراتی ناوزڕاو) ەوە بگرە تا بە دەزگای ئاساییشی کەمتر ناسراو ( جیهازی ئەمنی تایبەت ) دەگات. ئەم هەموو ئاژانسە جۆراوجۆرانە. چاودێریی هەڕەشە نێوخۆیی و دەرەکییەکانیان لەسەر ڕژێم دەکرد و بەچاوی گومانیشەوە چاودێریی یەکتریان دەکرد.

لەپشت کارایی سەدامەوە وەک ڕێکخەرێک. توانستە دیار و پتەوەکانی لەسەر بەکارهێنانی دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکانی عێراق. خستبووە خزمەتی مەبەستەکانی خۆیەوە. لەسەردەمی شەڕی لەگەڵ ئێراندا. سەدام دژی هێرشی فارسەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە. پەنای بۆ ئایدیۆلۆژیای عەرەبیی برد. لەدوای شەڕی دووەمی کەنداویش. لە باشووردا دەرگیری ڕاپەڕینێکی گەورەی شیعەکان بووەوە.

هاتوهاوارەکان بە شەڕی مەزهەبیی ڕەنگرێژ کرابوو. ئەوەیشی کە ڕژێمی ڕزگارکرد لە سەغڵەترین ساتەکانیدا. ترسی سوننەکان بوو لە شۆڕشێکی گەورەی شیعەکان. ترسێک کە بەمەبەستەوە لەلایەن ڕژێمی بێ ئاسۆوە دەست لەپشتی دەدرا. سەدام کارامەیی خۆی لەوەشدا سەلماند. کە توانی دابەشبوونە ئێسنیکییەکان ( عەرەبیی. کوردیی ) بەقازانجی خۆی بقۆزێتەوە. تەنانەت توانی لە دابەشبوونی باڵە جیاوازەکانی نێو کوردەکانیشدا سوودمەند بێت. لە نەوەدەکاندا. ڕژێم هەوڵێکی ئاگایانەی

دا. بـــه پـــه‌نابردن بـــۆ خۆنزیککردنـــه‌وه لـــه عه‌شـــیره‌تچییه‌تیی، به‌تایبه‌تیی لـه باشـووردا. سـه‌دام بێوچـان به‌هه‌نـدێ سـه‌رۆک عه‌شـیره‌تدا هه‌ڵیـده‌دا. پاداشـتی هه‌نـدێکیان له‌سـه‌ر حیسـابی ئـه‌وانی تـر ده‌کـرد. به‌مشـێوه‌یه، سـه‌رۆکی عه‌شـیره‌ته شـیعییه‌کان که‌وتنـه یارمه‌تییـدان بـۆ گرتنـه‌وه‌و توندوتۆڵکردنـه‌وه‌ی چـه‌پۆکی رژێـم لـه دژی شۆڕشـگێڕه‌کانی باشـوور. به‌زمه‌کـه لـه‌وه‌دا بـوو بـه ڕاکێشـانی هه‌نـدێ هـه‌ڵبژارده‌ی سه‌رۆکه‌کانی شیعه، رژێـم خوویـه‌کی بـاوی چه‌نـدین ده‌یـه‌ی پێشـووتری زینـــدوو کـــرده‌وه بـــه‌وه‌ی شـــیعه‌کانی لـــه ده‌ســـتکه‌وته‌کانی ده‌ســـه‌ڵات دوورخسـته‌وه. وێنـه‌کردنـی سـه‌دام وه‌ک شـێخی شـێخه‌کان ( گـه‌وره‌ی گه‌وره‌کان)، سنووری په‌رتبوونه مه‌زهه‌بییه‌کانی به‌زاندبوو. بـڕوای لـه‌سـه‌ر ئایـــــدێنتیتیی تیره‌گـــــه‌ریی خســـــتبوو[14]. بـــــه‌پێی پێویســـــتیش مۆدێکی"هه‌مه‌لایه‌نـه‌ی ده‌سـه‌ڵات، بـه‌دانی بـاجێکی بـه‌رچاو په‌یـدابووبوو. سیسـته‌می سیاسـیی و کۆمه‌ڵایـه‌تیی له‌عێراقـدا به‌شـێوه‌یه‌کی سـه‌ره‌کیی داهێزرابـوو، کـه‌متر توانـای کـارکردنی تێـدامابوو. لـه‌م بارودۆخه‌شـدا، ئه‌نـدازیارانی دوای شـه‌ڕی بنیاتنانـه‌وه‌ی عێـراق، لێیـان ده‌خـوازرێ ئـه‌م دۆژدارییه operate بکه‌ن.

چه‌نـد مه‌سـه‌له‌یه‌کی ئـاڵۆز دێنـه‌پێش له‌مـه‌ڕ سروشـتی ئـه‌و ڕێوشـوێنه دیمۆکراتییانه‌ی که ده‌کرێ لـه عێراقـی شکسـتخواردوودا جێبـه‌جێبکرێن، به‌پێناسه بێت. دیمۆکراسیی ستراکتۆری سیاسیی رژێمی دامه‌زراوی عێراق سه‌ره‌وژێر ده‌کاته‌وه. لێره‌دا ته‌نها ژماره کار ده‌کات. عه‌ره‌بـه ده‌سـه‌ڵاتداره سوننه‌کانی عێراق، به‌درێژایی مێژووی مۆدێرنی عێراق که‌متر لـه 20% ی دانیشتوانه‌که‌یان پێک هێنـاوه. له‌کاتێکـدا شیعه‌کان نزیکـه‌ی60% پێـک ده‌هێنن. له‌هه‌ر سیسته‌مێکی دیمۆکراتی ماقوڵدا، شیعه‌کان باڵاده‌ست ده‌بـن. سوننه‌کانیش ده‌بێ بڕوا به‌وه بێنن کـه شـیعه باڵاده‌ستیی خۆیـان بـه‌کار ناهێنن بۆ تۆڵه‌سـه‌ندنه‌وه( بـه توونـدوتیژیی بێـت یـان نـا ) لـه‌بری ئـه‌و ژێرده‌سته‌ییه‌ی له‌سه‌ر ده‌ستی سوننه خواردوویانه.

هه‌روه‌ها کورده‌کانیش(15 بۆ 20 له‌سه‌دی دانیشتوان) ده‌بێ ره‌زامه‌ندیی نیشان بده‌ن له‌سه‌ر په‌یمانگه‌لێک که زۆرینه‌ی ره‌هـای عـه‌ره‌ب رێـزی مافـه ئۆتۆنۆمییـه‌کان، کولتـوور و زمانیـان ده‌گـرن، وێـڕای ئـه‌وه‌ی به‌ڵگـه مێژووییـه‌کان پێچه‌وانـه‌ی ئه‌مـه ده‌سـه‌لمێنن. بێگومـان پسـپۆڕه

دەستوورییەکان لەرۆژئاوا سەرقاڵ دەبن بە دارشتنی سیستەمێکی تێکپرژاو لە پشکنین و باڵانسراگرتندا بۆ مسۆگەرکردنی نوێنەرایەتی کەمایەتیەکان: بەشی بەڕێوەبردن دەبێ لە سەرۆکایەتییەکی بەکۆمەڵدا رەچاوبکرێ کە هەرسێ گرووپەکە خۆیانی تێدا ببیننەوە، پارلەمانیش گومانی تێدانییە. دەبێ بەپێی رێژەی نوێنەرایەتییەکان هەڵببژێردرێ، بۆ دڵنیاکردنەوەی گرووپە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە، کە بەدڵسۆزییەوە نوێنەراتییان بکەن: هەر گرووپێکی سەرەکیی لەسەر بڕیارە گرنگەکان مافی ڤیتۆی هەبێ: بەمجۆرە، لیستەکەش درێژەی هەیە.
یەکەمین دەستووری دیمۆکراتیی عێراق، هاوشێوەی تەڵەزمی ئەو دەستوورە زەبەلاحەی بۆسنەیە کە بەسەریاندا سەپێنرا وەک بەشێک لە رێکەوتنی ئاشتیی Dayton لە ساڵی 1995 دا. نە لەوێ سەرکەوتنی بەدەست هێناو نە لەعێراقیش کاری پێدەکرێ، لەبەر بزربوونی دوو پێکهاتەی سەرەکیی.
یەکەم، لەئاستێکی پڕبایەخدا، دیمۆکراسیی پێویستی بە بوونی کۆدەنگییەکی تەواو هەیە لەسەر رەوابوونی سیستەمە سەرەکییەکە. بەساکاریی، هەموو گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم وڵاتە، دەبێ دان بنێن بە دەوڵەتی عێراقدا وەک قەوارەیەکی یاسایی و هەرێمیی، جێگەی پرسیارە ئایا کوردەکان هەرگیز بەتەواویی ئەم یاساییبوونە قبووڵ دەکەن بۆ دەوڵەتێک کە ئەوانیش بخاتە نێو سنوورەکانییەوە.
دووەم، هەر فۆرمێکی دیمۆکراسیی پێویستیی بە متمانە هەیە. دانی ڤیتۆ بەکەمایەتییەکان، داهێنانی فۆرمگەلێکی ئاڵۆز، لە پشکنین و باڵانسراگرتندا {زەوابت وە تەوازنات- complex forms of checks and balances، هاوسەنگیی لە دامودەزگاکاندا}، هەموو ئەمانە دەتوانن ئەو هەلانە کەمبکەنەوە کە زۆرینە بتوانێ کەمینە بچەوسێنێتەوە. بەڵام سەرئەنجام بەپێی ویستی زۆرینە هەندێ بڕیار دەبێ بدرێ، ئەگەر نا دەوڵەت ناتوانێ کاری خۆی رایی بکات. لەم دۆخانەدا، دەبێ کەمینە بڕوا بەوە بهێنێ کە زۆرینە دەسەلاتەکەی، خراپ بەکار ناهێنێ. مێژووی عێراقی مۆدێرن ئاماژە بەوە دەکات، کە متمانە لەنێوان گرووپە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەدا کەموکورت بووە. لەئەنجامی نەبوونی هیچ هەستێکی گەشەکردوو بۆ ئایدێنتیتیی نیشتمانیی و کۆدەنگییەکی

سەرەکیی بۆ یاساییبوونی دەوڵـــەتی عێــراق و متمانـــەی هاوبەشـــی کەڵەکەبوو. هەروەها نـەبوونی لێکتێگەیشـتن. لەراسـتییدا زۆر قورسـە بـۆ رۆنانی دەوڵەتێکی لیبراڵ و دیمۆکراسیی لە عێراقێکی بەم شێوەیەدا.

## ئۆڵتێرنەتیڤەکان

ئۆڵتێرنەتیڤی راستەقینە و ئارەزوومەندانە بۆ عێراقییەکان ئەوەیـە. خۆیـان چـارەنووس و پاشـەڕۆژی خۆیـان دەستنیشـان بکـەن. لـە هەنووکـەدا. مەبەستی بەرچاو و راگەیەندراوی ولاتە یەکگرتووەکان کە سەرلەبەر خراپ نییــە ئەوەیــە" لــە عێراقییــەکان بگــەڕێن. بــا خۆیــان بڕیــار لەســەر سەرکردەکانیان بدەن". وەلێ لە راستییدا. واتای چییە. عێراقییەکان هـەلیان بـۆ بڕەخســێ بـۆ دیـارییکردنی نوێنـەرەکانیان. لـەناو چوارچێوەیـەکی قەتیسی confine سیاسیی و ئابووریی لەدەرەوە سەپێنراو بەسەریاندا .
ئەگەر بەڕاست مەبەست لە مافی چارەنووسە. کەواتە خاڵی سـەرەتایی بـەم پرسیارە بنەڕەتییە دەست پێدەکات. ئایا خەڵکی عێراق. دەیانەوێ دەوڵەتی عێراق بەم پێکهاتەیەی ئێستایەوە درێژە بکێشـێت؟ بـەبێ پابەنـدبوونێکی بنەڕەتیی سـۆزدارانە emotional بـۆ پاراسـتنی یەکپارچـەیی دەوڵـەت. دیمۆکراسی رەگ داناکوتێ. ئەگەر هەروەک دیارە. کوردەکـان بڕیاریانـدا بەشوێن خولیا مێژووییەکانیانەوە بن. دوای دەوڵەتی سـەربەخۆی کـوردیی بکــەون. لــەم ساتەشــدا ئــەم پێشــڤەچوونە دەبــێ لەلایــەن کۆمەڵگــەی نێودەوڵەتییەوە قبووڵ بکرێ و رێزی بگیردرێ. بەگشتیی. ئەمەش شـتێک نییە جگە لە بەدیهێنانی ئەو بەڵێنەی ساڵی 1920 بەکوردەکان درا.
هەندێ دەوڵەتی ناوچەکە. بەدیارییکراوییش تورکیاو ئێـران. وای دادەنـێن دامەزرانــدنی کوردســتانی ســەربەخۆ تێکــدانی ئــارامیی ناوچەکەیــە. ئارگومێنتی فرەبەهێز و پێچەوانەش دەکرێ زۆر بەوردیی گەشەی پێبـدرێ. نەبوونی دەوڵەتی کوردیی. وا لەکوردەکان دەکات بەهەمیشەیی هێزێک بـن

بــۆ ناهاوســـەنگیی لـــە ڕۆژهەڵاتی ناڤینــدا. بـەلابردنی کوردەکـان لـە دەوڵەتی عێراق، ژمارەی شیعەکان باڵادەستتر دەکـات بەسـەر سـوننەکاندا لەو بەشەی دەمێنێتەوە. شیمانە هەڵدەگرێ ئایدێنتیتیی عەرەبیی، جیاوازییە مەزهەبییەکان ببـەزێنێ و ئـەو بەشـەی عێـراق بەیـەککگرتوویی بمێنێتـەوە. هـــەروەها هەڵـــدەگرێ جیاوازییـــە مەزهەبییـــە لەمێژینـــەکان زاڵبـــبن ، بەمشێوەیەش، دابەشبوونی زێدەتری عێراق، بۆ ناوچەی سوننیی و شیعیی لێدەکەوێتەوە.

لێـرەوە ئەگـەر خـەڵکی عێـراق بەڕاسـتیی مـافی ئـەوەیان بـدرێتێ بـۆ دارشتنەوەی پاشەڕۆژی خۆیان، بۆی هەیە بەرهەمی ئەم عێراقی هاوچەرخە دەرکـەوتنی سـێ قـەوارەی لێکجیـاواز بێـت. هەریەکـەیان، کـەم تـازۆر یـەکانگیر{ هۆمۆجینییـەس} homogeneouss بـن. هـەروەها هـەر کامەیان بگریت گونجاوترە-بۆ گوزەران وەک دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ. تـا بەم دەوڵەتەی ئێستای عێراق دەگات[15] . بێگومـان زۆرکـەس پێیانوایـە کـە لابردنی رژێمی سەدام لەدەسەلات، لەکۆتاییدا هەر هەڵوەشاندنەوەی عێـراق دەبێت. جیاوازیی گرنگ لێرەدا ئەوەیە چۆن ئەمانە روودەدەن، لە ئەنجامی پرۆسەیەکی ڕێکخراو و بەدوای یەکدا. یان لەرێگەی خوێنرشتن و شـەڕی نێوخۆوە. رێگەچارەی "دابەشـبوونی پلانـدانراو" دەبـێ زۆر بـە وردیـی-بیری-لێبکرێتەوە_contemplated. بەدڵنیاییشەوە بـە بـێ سەریەشـەو گرفت نابن.[16] وەک بەدیار دەکەوێ، چارەسەرێکی" ئایدیال" نییە بۆ ئـەو گرفتانەی دوای سەدام بەدەردەکـەون. بـەڵام نـابێ وابێـت. بـەڵکوو دەبـێ چارەسەرێکی زیندوو بۆ پێڕۆکردن هـەبێت. تـا بـە ئۆڵتێرنـەتیڤی ئێسـتا دەگـات. ئەمـەش بابـەتی ئـەم باسـەیە و ئـەم کتێبـە لـە بەشـەکانیدا بـە شوێنییەوە دەبێت.

## بەندی یەک

# عێراق 1920-1958
# پادشایەتیی هاشمیی

### پێشەکیی

شەڕی نەگریسی ناشیرینکردنی سەدام حوسێن بەدرێژایی دەیەی ڕابردوو یان زیاتر، تاموبۆیەکی شەخسیی قوڵی دا بە ململانێکە لەگەڵ عێراقدا. شەڕ لەگەڵ عێراقدا بۆ دەربازکردنی جیهان لە زۆردارێکی نەگریس و رزگارکردنی خەڵکی عێراقیش لە جڵەوی دیکتاتۆرێکی بکوژ. پەلامارێکی مۆراڵیی بوو. بەڵام ئەو ڕاستییەی کە ئیدارە یەک لەدوای یەکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان یەدەکێکی لەبن نەهاتوویان هەبوو لە هاوواتاکانی وشەی"نەگریس" بۆ ساغکردنەوەیان بەسەر سەرۆکی عێراقدا، ئەو راستییە ناگۆڕێ، لابردنی ئەو بۆی هەیە گرفت لە چارەسەر زۆرتر بەرهەم بهێنێ.
بەدانانی رژێمی سەدام لەرەوشی مێژووییدا، پێدەچێ کەمتر سەرپێچیی بێ و زۆرتر کەڵەکەبوونیکی لۆژیکانەی ئەو نەخۆشیيانە بێت کە توند بە دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە لە ساڵی 1921 ەوە بەستراونەتەوە.
عێراق بەپێی پێوەرە ستراتیژییەکانی هێزەگەورەکان پێکەوەنرا ( بەتایبەت بریتانیا)، نەک بە مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێکی کارا(functional) و خۆژێن self sustain و یەکگرتوو. حوکمکردنی ئەم بەرهەمە شەپریوەی Fractio وڵاتە یەکگرتووەکان بە ئەندازیاریی جیۆپۆلیتیکی بریتانیا هەر لە کۆنەوە پێگیری بە کارامەیی بەکارهێنانی پەرش و بڵاویی عەشیرەتیی و ئیسنیکیی و مەزهەبییەکان بووە( تەکنیکێکی کلاسیکیی بۆ

زاڵبـــــــــــــــــــوونی کۆلۆنیالیستەکان"پەرت بکەو زاڵ ببە") بـوو. ناوبـەناویش ئـەم زاڵبوونـە بەبـەکارهێنانی توندوتیژییـەکی بێئـەژمار پاڵپشتیی دەکرا . لابانی رژێمـی سـەدام هـیچ لەمانـەی نـەگۆڕی، بـەڵکوو دۆخی بەرهەم هاتوو بەسادەیی داوای پیادەکردنی تونـدوتیژیی دەکـردەوە لەلایەن کەسێکی ترەوە، دەکرێ ئەوکەسە وڵاتە یەکگرتووەکان یش بێت.

## پەیدابوونی عێراق

لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانییدا WWI، کاتێ ئیمپراتۆریای لـەخۆبایی عوسـمانیی هەرەسـی هێنـا[17] و شـەرکەرانی هاوپـەیمانانی سـەرکەوتوو، بەتایبەت فرانس و بریتانیای مـەزن کـۆنترۆڵی زۆر پارچـەی ناوچـەکانی ئیمپراتۆریـای پێشـوویان کـرد لـە رۆژهـەڵاتی ناڤینـدا. بەشبەشـکردنی Carving up کۆلۆنیاڵیانەی وڵاتـی عوسـمانییەکان، پـێش تـەواوبوونی شـەڕ، دەسـتی پێکردبـوو. لـە جـەنیوەریی 1916دا ئەنـدامی پارلـەمانی بریتانیـا و شـارەزا لـە رۆژهـەڵاتی نـاڤین، بـەڕێز Mark Sykes و نوێنـەری دەوڵـەتی فـرانس François Georges Picot بـۆ دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ لە داهاتوودا لە لەندەن پێکگەیشـتن. لـە ئـــەنجامی رێکەوتنامـــەی ســـایکس پیکـــۆوە{Sykes- Picot} کۆنترۆڵکردنی لوبنان و سوریا بـەر فـرانس کـەوت، لەکاتێکـدا بریتانیـا کۆنترۆڵی هەر دوو هـەرێمی پێشـووی عوسـمانییەکان، بەسـرەو بەغـدادی بەرکـەوت. رێکەوتنەکـە بـۆ دووسـاڵ بـەنهێنیی پـارێزرا، بەشـێوەیەکی سەرەکیی لە ترسی پەرچەکرداری رای گشتیی عەرەب بوو. کە لـەو کاتـەدا بـۆ یەکلاییکردنـەوەی هێـزی سـەربازیی دژی عوسـمانییەکان گرنـگ بوو[18]. دامەزراندنی گۆڕەپـانی خـاوەن نفـوز influence بەشـێوەیەکی شاراوە covert و جێگەی پەژراندنی هەردوولا لـە رۆژهـەڵاتی نـاڤین دا، بارێکی یاسایی وەرگرت، لە کاتێکدا ئەنجومەنی باڵای کۆمەڵەی نەتەوەکان لە San Remo ساڵی 1920 کۆبووەوە.

برگەی 22 لە بەندی دامەزراندنی کۆمەڵـەدا League's ( پەیماننامەکـە- the Covenant ) دەستنیشـانی سیسـتەمی مانـدەیتی Mandate { لێرەدا بەمانای ئینتیداب دایات، بە عەرەبیی حیمایـە یـان ویسـایەی پـێ دەڵێن، کە پێمانوایە زۆر هەڵەیە، بەهەر حاڵ من پێمان باشە ئـەو وشـانەی

بە کوردیی سەختە وشەی گونجاویان بۆ بدۆزرێتەوە. وشە ئینگلیزییەکە وەک خۆی بنووسرێتەوە. باشترە} کردووە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ" ئەو کۆڵۆنیی و ناوچانەی لە بەرئەنجامی دوایین شەڕەوە دەستیان بەسەرداگیرا و پێشتر لەژێر دەسەلاتی ئەو دەوڵەتانەدا بوونە کە بەفەرمیی حوکمڕانییان دەکردن و بەو خەڵکانە نیشتەجێن کە هێشتا ناتوانن. لەژێر هەلومەرجی سەختی strenuous جیهانی مۆدێرندا لەسەر قاچی خۆیان رابوەستن".

ئەم "چاودێریی tutelage "{ دەکرێ ویسایەی عەرەبییش دابنرێ} ەی هەندێ یەکەی سیاسیی دەبوو بخرایەتە سەر ماندەیتی " دەوڵەتە پێشکەوتووەکان" کە ئامادەباشیی بۆ خۆبەڕێوەبردنیان دەکەن. بە شێوەیەکی ئایدیالیی( یان بە لووتبەرزییەوەpatronizing ) مەبەست لە سیستەمی ماندەیت لە پراکتیکدا کەمترە لەوەی کە زامنی بالادەستیی کۆلۆنیالیی بەسەر دەوڵەتێکی تێکشکاودا بکات. بالادەستیی ئەنگلۆ-فرانسیی بەسەر کۆمەڵەی نەتەوەکاندا زامنی دابەشکردنی گونجاوی دەستکەوتەکانی شەڕی کردبوو. فرانسییەکان ماندەیتی لوبنان و سوریایان درایەو بریتانیاش واژۆی ئەو چاودێرییکردنەی کرد بەسەر ئەو بەشەی بە شێوەیەکی فەرمیی لە 1921 دا بە عێراق ناسرا.

بریتانیا بۆ سەرپەرشتیی دەستکەوتە نوێکانی، پێویستی بە سەرکردەیەکی گوێ لە مست pliant و و سیستەمێکی حوکمڕانیی گونجاو هەبوو. بۆ باشتر زامنکردن و پاوانکردن. بێ ئەوەی لە رووی ئابوورییەوە شتێکی ئەوتۆی تێ بچێ. بەمشێوەیە دەسەلاتدارییەتی بریتانیا رووی کردە ئەمیر فەیسەڵی هاشمییەکان، کە لە شۆڕشی عەرەبەکاندا دژی عوسمانییەکان، جەنگاوەرێکی عەرەب بوو. فەیسەڵ لای کەم سێ خاڵی بەهێزی تێدا هەبوو: بەشداریی چالاکانە لە شۆڕشی عەرەبییدا. دابینکردنی جێگەورێگەیەکی سروشتیی لەجیهانی عەرەبدا؛ بەشێوەیەکی گشتیی پێوەندییەکی باشی بەبریتانییەکانەوە هەبوو: هەروەها لە 1920 بەدواشەوە. لەبەردەستدا بوو. پاش ئەوەی بەشێوەیەکی نەشیاو لەلایەن فرانسییەکانەوە لە شانشینی لەبارچووی سوریا دەرکرا[19].

بەرپاکردنی یەکەمین هەڵمەتی دیمۆکراسیی ساختە لە عێراقدا لەسەردەمی سەدام حوسێندا نەبووە. بەڵکوو لەساڵی 1921دا بریتانییەکان بەناو

ریفەرێنـــدەمێکیان بـــۆ سەپاندنی رەوایی دەسەڵاتی فەیسـەڵ سازدا. ئەنجامی دەنگدانەکە کە بەعەقڵدا نەدەچوو. ئامـاژەی بـە ڕێژەیـەکی بـەرز دەکـردو بـە 96% قـەبڵێنرا. پەسـەندی وەرگرتنـی عەرشـی دەسـەڵاتیان لەلایەن فەیسەڵەوە زامنکرد. بەمشێوەیە. لە ئابی 1921 دا. ئـەو پیـاوەی لەژیانیدا بە سەردانیش ڕێی نەکەوتبووە عێراقـەوە بـە یەکـەمین سـەرۆکی نەتــەوەی عێـراق دامــەزرێنرا. لــە ئاهــەنگێکی ســوریالیی بێوێنــەدا بــۆ وەرگرتنی پلەوپایەکەی، ئـاڵای نـوێی عێـراق بەشـانازییەوە بەرزکرایـەوە. بەڵام لەبـەر نـەبوونی سـروودی نیشـتمانیی، تیپـی مۆسـیقای سـەربازیی، سروودی" خودا پاشا بپارێزێ"یان ژەنیی. ئەمـەش ئاماژەیـەکی گونجـاو بوو کە کێ بەڕاستیی دەسەڵاتی لەدەستدایە. لە دەوڵەتی تـازە دروسـتبووی عێراقدا[20].

## لکاندنی کوردەکان

هێشتا بەتەواویی پێکهاتەو سنووری ناوچەیی دەوڵـەتی نـوێ دەسـتنیشـان نەکرابوو. هیچ کێشـەیەک لەسـەر ئـەوە نـەبوو کـە بەسـرەو بەغـداد، دوو هەرێمی دەوڵەتی ساوای عێراقن. بەڵام بەشی باکووری ئەم وڵاتـە لـە سـێ هەرێمەکـەی عوسـمانییەکان- ـموسـڵـ- هەنـدێ نیگـەرانیی گرنگـی سـتراتیژیی ورووژانـد[21]. بەتایبـەتیی ئـەو هەڵسـەنگاندنە بەراییانـەی بریتانیا. ئاماژەیان بە بوونی نەوتی یەدەک بەقەبارەیـەکـی زۆر لەموسـڵدا دەکرد. بەدڵنیاییەوە فاکتەرو هەنگاوی سەرەکیی لەپشت بڕیاری بریتانیاوە بۆ ئەوەی موسڵ بە دەوڵەتی نوێی عێراقـەوە بلکێـنن. دەسترِاگەیشـتن بـە نـەوتی یـەدەک بـوو. بڕیارێـک کـە دەرئەنجامگـەلێکی تراژیدییانـەی لێکەوتەوە بەخاتری یەکپارچەیی عێراق لە دەیەکانی داهاتوودا.
گرفتەکە زۆر سـادە بـوو. بەپێچەوانـەی بەسـرەو بەغـدادەوە کـە لـەڕووی ئێسـنیکییەوە عـەرەب بـوون( سـەرەڕای دابەشـبوونی مەزهـەبیی شـیعەو سـوننە). هـەرێمی موسـڵ ئێسـنیکی کـوردی تێـدابوو. لـە پـاش جـەنگی جیهانیی یەکەم. گریمانەی ئـەوە هـەبوو کـە کوردەکـان. وەک ئێسـنیکێکی گـەورە لـە رۆژهـەڵاتی ناڤینـدا. بـەخاوەنی دەوڵـەتی خۆیـان دەبـن. ئـەو پەیماننامەیەی ئەمەی پشتڕاست دەکـردەوە. پەیماننامـەی سـیڤەر بـوو، لـە ئۆگەستی1920 دا لەنێوان ئیمپراتۆریای شکستخواردووی عوسـمانییەکان

و هاوپـــــــــــــەیمانانی ســەرکەوتوودا، دەوڵــەتی کــوردیی رەنگرێــژ کرابوو. ئەو دەوڵەتــە. کوردەکــانی تورکیــای ئێســتاو ئەوانــەی بــاکووری عێراقــی پێکــەوە دەنووســان. بەرهــەمی ئــەم قەوارەیــە کــە کوردســتانی سەربەخۆ دەردەچوو. رێگەی پێدەدرا بچێتــە نێــو کۆمەڵــەی نەتەوەکانــەوە پاش ساڵێک لە ئیمزاکردنی پەیماننامەکە.

بەداخەوە. بوونی خەونی سەربەخۆیی بۆ کوردەکان. بــەهۆی هەلومــەرجی جیۆپۆلیتیکەوە هەر زوو لەبارچوو. سەرکەوتنی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستیی لەتورکیا بەسەرکردایەتی کەمال ئەتاتۆرک، بــاڵی کێشــا بەســەر تورکیــادا. پاش رامــاڵینی پاشــماوەی عوســمانییەکان، دووبــارە کــۆنترۆڵی تورکیــای بەســەر ناوچــەکانی باشــووری رۆژهــەڵاتی تورکیــادا ســەپاندەوە. دواتــر ئــەتاتۆرک داوای موســڵی وەک بەشــێکی تورکیــا دەکــرد، پاڵپشــتی ئــەم داوایەشی بــە دەستبەســەرداگرتنی موســڵ دەکــرد. لــە ترســی لەدەســتدانی هەرێمی موسڵی دەوڵەمەند بەنەوت، بریتانییــەکان. ســەرکەوتووانە پێشــیان بە پێشڕەوییەکانی تورکیا گرت، تورکەکانیان گێڕایەوە بــۆ ئــەو شــوێنەی دواتر بە سنووری دەوڵەتی عێراق و تورکیــا ناســرا. لــە ســاڵی 1925 دا کۆمەڵەی نەتەوەکان بەفەرمیی دانــی نــا بەیاســاییبوونی ئــەم ســنوورەدا. بەمشێوەیەش، موسڵ ( لەگەڵ بەغــداد و بەســرەدا) بەبەشــێک لــە دەوڵــەتی مۆدێرنی عێراق ئەژمارد کرا.

ئەم بڕیارە سەرجەم نەتەوەی کــوردی لــەنێوان تورکیــا. ئێــران و ســوریاو عێراقدا دابەشکرد. لەم ئاقارەشەوە، هیوای دەوڵــەتی ســەربەخۆی کــوردیی وەک ئاردی ناو درکی لێهات. نەتەوەی کورد کە نەبوو بە خاوەنی دەوڵەتی ســەربەخۆ. لەبەرئــەوەی بەشــێوەیەکی ســەرەکیی، کوردســتانی ســەربەخۆ، جێگەی بایەخپێدانی ستراتیژیی هێزە گەورەکان نەبوو.

## بەڕێوەبردنی دەوڵەتە نوێیەکە

گفتوگــۆکردن لەســەر پەیماننامــەی ئــەنگلۆ_عێــراق بــۆ دیــاریکردنی پێوەندییەکانی نێوان بریتانیاو عێراق لەســەردەمی مانــدەیت و لــە کۆتــایی 1921دا دەســتپێکرد و لەلایــەن پارلــەمانی عێراقیشــەوە( ئەنجومــەنی دامەزراندن) لەساڵی 1924 دا پەسەند کرا. لەهەمان کاتیشدا دەستوور و یاسای هەڵبژاردنی نوێ دانــران و پەســەندکران. لای کــەم لەســەر کاغــەز.

سیستەمی سیاسیی هەموو رەنگورووییەکی دیمۆکراسیی لەخۆگرتبوو. یاسای هەڵبژاردن دوو قۆناغی لە هەڵبژاردنی پارلەماندا جێکەوت کرد. هەموو نێرینەیەکی باجدەر لەسەروو 21 ساڵییەوە بۆی هەبوو بۆ دەنگدانی ناوەندیی دەنگ بدات. لەیەکێک لە سێ بەشەکەی ناوچەکانی دەنگدان کەعێراقی بەسەردا دابەشکرابوو. دەنگدەرانی ناوەندییش نوێنەرانی پارلەمانیان هەڵدەبژارد. پاشاش دەسەڵاتی دامەزراندنی بە نوێنەرانی کابینە، بۆجێبەجێکردنی هەموو یاساکان. هەڵوەشاندنەوەی پارلەمان و بانگهێشتی هەڵبژاردنی گشتیی دەدا.

شتێکی زۆر گرنگ لەروانگەی بریتانییەکانەوە. پاشا بۆی هەبوو بەتەواویی پارلەمان پشتگوێ بخات و بریاری جێبەجێکردن لەسەر پابەندبوونەکان بە پشتئەستووری پەیماننامەکە بدات. دەسەڵاتی بریتانییەکان رۆڵی گەورەی هەبوو لەپشت پەردەوە لە سیستەمی سیاسییدا." راوێژکاران" دەستنیشان دەکران بۆ زۆربەی نێوەندەکانی دەوڵەت بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لەناو سیستەمەکەدا لەبەرچاو بگیرێن. لەتەنگژەشدا بریتانییەکان بازووی هێزیان دەردەخست بۆ گەرەنتیی ئاسایش لە نێو دەوڵەتی تازە پەیدابوودا. ئەمەش لەلایەن سوپای خۆماڵیی ئاشوورییەکانەوە کە پتر لە 5000 بوون لەگەڵ هێزی ئاسمانیی پاشایی ( RAF ) جێبەجێ دەکرا[22]. کۆنترۆڵی ئابوورییش زامن کرابوو. چونکە لەسەر عێراق بوو نیوەی خەرجییەکانی ماندەیت بدات. ئەمەش لەرێگەی دەستبەسەرداگرتنی پیشەسازیی نەوتی عێراقەوە.

رووخساری دیمۆکراتیی نەیتوانی تەواو دەمامک بخاتە سەر کۆلۆنیالیی بریتانییەکان و پاشا فەیسەڵیش جێگەورێگەیەکی وای هەبوو، کەس ئێرەیی پێ نەدەبرد. لەهەموو دەسەڵاتێک داماڵرابوو. ئەرکی سەرەکیی پاشا تەنها وەک سیمبۆلێک بۆ یەکپارچەیی عێراق بوو. بەلام لێوەشاوەیی ئەو لە دابینکردنی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی یەکانگیر لە کۆمەڵگەیەکی تەواو پەرتەوازەو پارچەپارچەدا. سەلماندی لە شارەزایەکی سیاسیی بەولاوترە و بەهەموو پێوانەکانیش فەیسەڵێکی خاوەن توانا بوو.

ئەو دوو هێزەی فەیسەڵ بۆ یەکێتیی گەلەکەی توانی بەکاریان بهێنێ. بوونی هەستی ئەنتی_بریتانیاییەکی رەگورپشە داکوتراو لەناو خەڵکدا

لەگـــــەڵ هەســــــتێکی گەشەکردوو بە ناسیۆنالیزمی عـەرەبیی بـوو-
کـە هــەردووکیان پێچەوانــەی ئــەو دیفاکتۆیــە بــوون، کـە فەیســەڵ
بووکەشووشەی{ بادەستی} بریتانییەکان بێت. فەیسەڵ کـەوتبووە نێـوان
ئاواتەکانی خەڵکی عێراقەوە بۆ رزگاربوون لە دەست بریتانییەکان لەلایەک
و ئـەو راسـتییە رەق و زەقـەی دەسـەلاتی بریتانیـاش لەلایـەکی تـرەوە.
لەکۆتاییدا شکستی ئەو لە دابینکردنـی زەمینـەو دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی
بەهێز و ئارام و یەکگرتوو دەبـێ بخرێتـە کۆنتێکسـتێکی شیاوەوە. بـەم
پێودانگە فەیسەڵ لەتەواوکردنی ئەرکێکی ئەستەمدا شکستی هێنا.
ئەم شکستەش لەلایەن خودی پاشاوە لە دوایین ساڵەکانی ژیانیدا دانـی
پێدا نرا . بەماوەیەکی کەم بەر لەمەرگی لەساڵی 1933دا، فەیسەڵ هەنـدێ
شـیکردنەوەی هەسـتیارو پێشـهاتی دا بەدەسـتەوە لەسـەر ئـەو گرفتانـەی
رووبەرووی میراتی شەپرێوی دەبنەوە.
لەعێراقدا..... تا ئێستا شتێک نییـە گـەلی عێراقـی پـێ بگـوترێ، بـەڵکوو
چەند کۆمەڵە خەڵکێکن لە ئەندێشەدا هەن، لەهەموو ئایدیالێکی نیشـتمانیی
داشۆراون..... هیچ پێوەندییەکیان بەیەکەوە نییە. شـەڕانیین، حـەزیان بـە
ئانارشیبوونە، هەمیشەش ئامادەن بۆ رابوون دژی هـەر دەسـەلاتێک، جـا
هەرچییەک بێت. لەناو ئەم مێگەلەدا، دەمانەوێت گەلێک دروست بکـەین بـە
پرۆڤەکردن و بژارکردن و پەروەردەکردن................. لەهەلومەرجێکی وا
دژواردا، بەئەندێشەش ناکرێ قەبارەو گەورەیی ئـەو هەولانـەی پێویسـتن،
لەبەرچاو بگیردرێن[23] .
ساڵێک پێش مردنی فەیسەڵ، عێراق سەربەخۆیی فـەرمیی بەدەسـت هێنـاو
بە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان وەرگیـرا. بـەلام عێـراق هێشـتا قـەرزاری
کۆمەڵێ وابەستەیی بوو بە بریتانییەکان لە ئـەنجامی پێداچوونـەوەی ئـەو
ڤێرژنــەی بــە پــەیمانی ئــەنگلۆ-عێــراق لەســالی 1930 ناسـرابوو. لـە
بەندەکانیــدا، راوێژکــارە بریتانییــەکان کــە پێشـتر لـەعێراق بوونــە( لــە
1931دا ئەمانــە ژمارەیــان نزیکــەی 260 کــەس دەبــوون) دەبووایــە
بمێننەوە، بریتانیا مافی هەبوو دوو بنکەی ئاسمانیی لەعێراقدا بەکار بهێنێ
و لەنزیکیشەوە هەردوو ولات راوێژ لەسەر سیاسەتی دەرەوە، هەروەها بـۆ
دەستەبەرکردنی کۆمەکی هاوبەش لە کاتی جەنگدا بکەن[24] .

لە کاتێکدا پەیماننامەکە بەشێوەیەکی کارا، گەرەنتیی سەربەخۆیی عێراقی دەکرد. بەڵام شتێکی کەمی بۆ هێورکردنەوەی هەستی ئەنتی بریتانیایی لە عێراقدا کرد. تەنانەت هەر هیچی نەکرد چونکە رەچاوی درێژکردنەوەی دەوری بریتانیای لەداهاتوویەکی بەرچاودا (پەیماننامەکە ماوەکەی 25 ساڵ بوو) دەکرد.

## پووکانەوەی دەسەڵاتی سیستەمی پادشایەتیی

دوای مەرگی فەیسەڵ لە ساڵی 1933دا، غازی کوڕی، جێگەی گرتەوە. ئەو کارامەییەی باوکی هەیبوو، ئەم نەیبوو. خۆشحاڵ بوو بە جەماوەرییبوونی لەناو خەڵکدا، بەهۆی ئەو کەمە بێزاریی و رقەی لە بریتانییەکان هەیبوو. رۆڵێکی باشی وازیی کرد لەنێو سیاسەتمەدارە پانعەرەبیست و عێراقییەکاندا[25]. پڕبوونی بریتانییەکان تا دەهات لە غازی زۆرتر دەبوو. غازی ئایدیای پانعەرەبیی و هەستی ئەنتی بریتانیایی لەسەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناڤیندا بڵاودەکردەوە. بۆ ئاسانکاریی ئەم پرۆسەیە، غازی تا ئەو جێگەیە رۆیشت، بیر لە دامەزراندنی رادیۆیەکی تایبەت بەخۆی بکاتەوە، لە کۆشکی *ئەلزهوری* پاشایی، کە رۆژانە پڕوپاگەندەی تێدا پەخش دەکرا[26]. غازی حەزینەدەکرد رۆڵی پاشایەکی ملکەچ ببینێت. ئەمەش وایکرد شانوشەوکەتی باشتر دەربکەوێ لەناو هاوڵاتییانی ئاسایی عەرەبدا، بەڵام نیگەرانیی بۆ ئەو باڵانسە سیاسییە لەرزۆکە پەیداکرد کە لە سەردەمی باوکیدا چێکرابوو.

بەهۆی نەمانی کاریگەریی ئەو سەقامگیرییەی سەردەمی فەیسەڵی پێشوو، ئەو هەڵچنینە سیاسییەی لەسەر عێراق کرابوو، بە خێراییەکی ترسناک دەستی بە هەڵوەشاندنەوە کرد. لە 1936 ەوە تا 1941 چەندین کوودەتای سەربازیی بەرپاکران کە ئاڵوگۆڕیان لەدەسەڵات و دەرەوەی چوارچێوەی دەستوردا دابینکرد. یەکەمینی ئەم کوودەتایانە، پێدەچوو غازی لەپشتییەوە بێت، بەڵام ژەنەراڵ بەکرد سدقیی و سوپای عێراق جێبەجێیان کرد، ئەمەش لەمێژووی عێراقدا خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو. لابردنی سەرۆک وەزیران، یاسین ئەلهاشمیی و سەرجەم کابینەکەی بەزەبروزەنگ، بەروونیی ئاماژەی بە رۆڵی یەکلاکەرەوەی هێزی سەربازیی لە سەر سیاسەت دەدا. کوودەتای 1936 هاوکات ئاماژەش بوو

بەسەرەتایەک کە کۆتایی بە سیستەمی دەستووریی لەعێراقدا هێنا.
وێڕای خاڵە لاوازەکانی پاشا فەیسەڵ، بەپێی بنەما دەستوورییەکان،
هەڵبژاردنی نوێ کرایەوەو سەرۆک وەزیران و کابینەی نوێ دەستبەکار
بوون. لە دوای 1936ەوە ئاڵۆگۆڕی دەسەڵات بەتوندوتیژیی و
لەدەرەوەی دەستوور وەک ڕێسای لێهاتبوو. نیشانەکانی غلۆربوونەوەی
عێراق بەرەو پەشێویی سیاسیی بە تیرۆرکردنی ژەنەراڵ سدقیی لە
1937 دا( لەلایەن گرووپێک لەئەفسەرانی بێزارەوە) دەستپێکرد.
بەدوای ئەم رووداوانەشدا مەرگی لەپڕی غازی لە هەلومەرجێکی
گومانلێکراودا(1939). کوودەتایەکی سەربازیی تر لەلایەن ئەفسەرانی
سوپای عێراقەوە(1941). خۆتێهەڵقورتاندنێکی تری سەربازیی لەلایەن
سوپای برتیانیاوە ( ئایاری1941). بەڕێوەبردنی پلانێکی دڕندانە
دەرهەق بە جوولەکەکان ( جونی 1941)، کە 150 جوولەکە بەبەرچاوی
هێزە داگیرکارەکانی بریتنیاوە رەشەکوژییکران، درێژەی هەبوو.
لەنێو ئەم رووداوانەدا، گرنگترینیان مەرگی غازی بوو. ڤێرژنی
بریتانییەکان ئەوەبوو کە غازی دەستبەجێ مردووە( بەسەرخۆشیی و
لەخۆچوون ). کاتێک ئۆتۆمبیلەکەی بەخێراییەکی تیژ بەر ستوونێکی
تەلەفۆن کەوتووە. زۆرکەس بڕوایان بەم چیرۆکە فەرمییەی بریتانیا نەکرد،
بەڵکوو غازی لەهەموو ئەگەرەکاندا بەپلانی بریتانییەکان تێرۆرکرابوو[27].
دەرخستنی راستیی، لە دەڵێن و گوتیان کەمتر جێگەی بایەخە، زۆربەی
عێراقییەکانیش لەو بڕوایەدا بوون کە غازی قوربانییە و بەئەنقەست
کوژراوە. بەگوێرەی یەکێک لەچاودێرەکان گرنگیی مەرگی غازی
بەمشێوەیە بوو
ئەوە سەلمێنرا کە بریتانییەکان، جگە لە پادشای"خۆیان" یان "نوێنەریان"
هەرگیز شتێکی تر ناپەژرێنن . خەڵکی عێراقیش پێچەوانەی ئەمەیان
دەویست، پادشایەک نەک هەر سیمبوڵ بێت، بەڵکوو بۆ یەکێتیی و
یەکپارچەیی وڵاتەکەیان قسەی دڵی ئەوان بکات. پادشایەکیان دەویست
جیاوازییەکانیان لێک نزیک بکاتەوە، سارێژی برینە کۆمەڵایەتییەکانیان
بکات و سەرنجی هەموو عەرەبەکانی رۆژهەڵاتی ناڤین راکێش بکات[28].
هەرچەندە رژێمی پادشایەتی 18 ساڵی تریش تەمەنی درێژبووەوە،
لەسەرەتاوە بەدانانی( عەبدولئیللاە خاڵی غازی لە 1939 تا 1953)،

دواتریش ماوەیەکی کەم لە حـوکمی کـوڕە تاقانەکـەی غـازی، فەیسـەڵی دووەم لـە 1953 تـا 1958 فـەرمانڕەواییانکرد. پـاش ئـەوەی گومـانی دەستی بریتانیا لە کوشـتنی غازیـدا ئاشـکرابوو، دەسـەڵاتی هاشـمییەکان لەعێراقدا بەرەو ئاوابوون دەچوو. عەبدوئیللاە پایەی کۆمەڵایەتیی زۆرکـەم بوو. بەجۆرێک ئەم بێزراوییە لەناوخەڵکدا تەواو بەدەرکەوتبوو. کاتێک لـە 1958دا بەچارەنووسی رەشی خۆی گەیشت.

کۆمەڵێک لە ئەفسەرانی سوپا( ناسرابوون بە"ئەفسەرانی ئازادییخواز"). لە رێگـەی کوودەتایـەکی سـەربازییەوە، زۆربـەی بنەماڵـەی فـەرمانڕەوایان رامـاڵی. هەرچەنـدە لاشـەی بێگیـانی فەیسـەڵی دووەم بـۆ بەخاکسـپاردن بۆشوێنێکی نەزانراو راگوێزرا. بەڵام لاشەی عەبـدولئیللاە خرایـە بـەردەم خـەڵک، پـاش ئـەوەی بەشـەقامەکاندا راکێشـرابوو. ئەندامـەکانی لەشـیان کەرتوپەرت کردبوو. پاشماوەی لاشەکەیشی لەشوێنێکی گشتییدا بۆ بینـین لەدەرەوەی وەزارەتی بەرگریی لەبەغداد بۆ دوو رۆژ هەڵواسرا.

چارەنووسـی حـوکمی هاشـمییەکان لـە عێراقـدا رەنگـە هـەر بەمشـێوەیە خوێناوییـە کۆتـایی بهاتایـە. بنەماڵـەی هاشـمییەکان داهێنـانی دەسـەڵاتی بریتانییـەکان بـوو. یـان لای زۆربـەی عێراقییـەکان بەمشـێوەیە لـە هاشمییەکانیان روانیوە. لەماوەی 38 ساڵدا دەسـەڵاتدارە یـەک لـەدوای یەکـەکانی هاشـمییەکان، نـەیانتوانی ئـەو ناکۆکییـە سـێنتراڵییەی لـە بۆچوونیاندا بەرجەستە بووبوو چارەسەر بکەن. ئەرکی سەرەکیی رژێمـی پاشـایەتیی ئـەوەبوو، کـە بـبن بـە سـمیبۆڵی یـەکێتیی عێراقییـەکان. بـۆ کۆکردنەوەو یەکخستنی چین و توێژە جیاوازەکان لـە دەوری پرۆژەیـەکی هاوبەش بۆ بنیاتنانی نەتەوە (nation-building) .

بەهـەرحاڵ لەکۆتاییـدا نـاواخنی پەیامـە سیاسـییەکان بـۆ کـۆنترۆڵ و چاودێریی جیاوازییە مەزهـەبیی و مۆراڵییـەکان کرچوکـاڵ بـوون. زۆرتـر بەلای ئەو ئارەزووەدا دەچەرخا کە یەکسانیی لە دابەشکردنی دەسـەڵات و دەستکەوتەکاندا بەهەند وەربگـرێ، یـان بـرەوی هەنـدێجۆر لـە بیـروڕای پانعەرەبیی دژی بریتانییەکان دەربخات. بەڵام بنەماڵەی پادشـایی هـەرگیز نـەیانتوانی ئـەم خولیایانـە لـە مەبەسـتێکی هاوبەشـدا کۆبکەنـەوە.. هاشـمییەکان چونکـە دروسـتکراوی دەسـتی بریتانییـەکان بـوون، سیستەمێکیان بەڕێوەدەبرد. بـۆ راگرتنـی سیسـتەمەکە، کەمینـەیان لەسـەر

حیسابی زۆرینە باڵادەست دەکرد. هەوڵەکانی پاشا غازی، لای کەم لە روانگەی خەڵکەوە بۆ رابوونی هەست و نەستی عەرەب دژی بریتانیا بوو. بریتانییەکان زۆر زوو ئەم هەوڵانەیان کلک وگوێ کرد. مایەی پێکەنینە پاش 38 ساڵ لە حوکمی هاشمییەکان، کە زۆر هەوڵیانداو تێکۆشان بۆ دروستکردنی ئایدێنتیتییەکی گرێدراوی نیشتمانیی. بەلام سەرچاوەی سەرەکیی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی عێراقیی، لە ئۆپۆزیسیۆنبوونی خەڵکدا دژی بنەماڵەی فەرمانڕەوا خۆی دەبینییەوە.

## میراتی حوکمی رژێمی پادشایەتیی

## سەردەستیی سوننەکان

سەرەڕای ئەوەی نزیکەی تەنها هەر 20 لەسەدی خەڵکی عێراق پێک دەهێنن. عەرەبە سوننەکان کۆنترۆڵی شادەمارە ئابووریی و دەسەلاتە سیاسییەکانیان، بەدرێژایی مێژووی مۆدێرنی عێراق کردبوو. لە ژێر دەسەلاتی عوسمانییەکاندا. سوننەکان ئیدارەی هەرسێ هەرێمی موسڵ و بەسرەو بەغدایان بەڕێوە دەبرد. بریتانییەکان بەئەنقەست دەستکارییەکی ئەوتۆی ئەم ترادیسیۆنە باوەیان نەکرد. بالادەستیی سونیی نەک هەر لە بنەماڵەی هاشمییدا بەڵکوو لەناو دەستبژێری (ئیلیت)ی سیاسییەکانیشدا بەرنامەڕێژ کرابوو. بۆ نموونە. لە نێوان سالانی 1921 و 1936 دا. لە 57 پیاو بۆ بەڕێوەبردنی کابینەکانی حکومەت. تەنها 5 کەسیان شیعەو کورد بوونە. لەسەرانسەری دەسەلاتی بنەماڵەدا(1921-1958) پێنج وەزارەتە بەهێزەکان. بەدانەبڕاویی بەدەست سوننەوە بووە[29]. ئەم بالادەستییەی سوننە لەئاستی ناوخۆشدا رەنگی دابووەوە. بۆ نموونە لەساڵی 1933 دا. سوننەکان لە 14 هەرێم. حوکمی 13یان دەکرد. هەروەها 43 قائیمقام لەکۆی 47 یان بەدەستەوە بوو[30]. بەگوێرەی

قەبلانــــدنێک ســــەرکردە سیاسییە گرنگەکانی عێـراق لـەماوەی1920-1958. نزیکەی 60 لەسەدی عەرەبی سوننە بوونە، 25 لەســەدی شـیعەو 15 لەسەدیشی کورد بوونە[31]. لەهەمان مـاوەدا، سـوننەکـان نزیکـەی 20 لەسەدی خەڵکی عێـراق و شـیعەکان 55-بـۆ 60 لەسـەدو کوردەکـان 20 لەسەدیان پێک هێناوە. بەمشـێوەیە سـوننەکان نـەک هـەر کەڵـەگا بوونـە، بەڵکوو لە ئاست ڕێژەی جیاوازی ژمارەکانیشدا کەڵەگا بوونە.

هەمان شێواز لەناو هێزە چەکدارەکانیشدا دەبینـرا. لـە کاتێکـدا شـیعەکان بەڕێژەیەکی زۆر نوێنەرایەتییان هەبوو لەئاستەکانی خوارەوەدا( بەتایبـەت دوای سەپاندنی خزمەتی سەربازیی زۆرەملێ لەسـاڵانی سـییەکاندا). بـەڵام ئەفســەرە پایەبــەرزەکان زۆربــەی هــەرەزۆریان لــە ســوننەکان بــوون. باڵادەستیی سوننە بەســەر ســوپادا. گرنگیــی خــۆی هــەبوو لــەو ماوانــەدا. لەکاتێکدا هێزە چەکدارەکان لە ڕەوشی سیاسیی عێراقـدا ڕۆڵـی چـالاک و یەکلاکەرەوەیان هەبوو.

پەراوێزخستنی شیعەو کورد لەدەسەڵاتدا بێ هیچ ئەملاولایەک تەواو ڕەهـا بوو. لەسەردەمی ڕژێمی پاشایەتییدا. بـەرفراوانبوونی هێـزە چەکـدارەکان هەندێ پێشکەوتنی مەیدانیی بەدەست هێنـابوو. لـەرووی ژمـارەوە.. سـوپا ساڵی 1933 لە 12.000 هەزارەوە بوو بە 15.000 لەساڵی 1935 دا. ئـەم ژمارەیــەش. لــەکاتی کوودەتــا ســەربازییەکەی ســاڵی 1958 دا بــە 20.000 گەیشت. هۆکاری سەرەکیی بۆ گەشـەی سـوپا. دەگەڕێتـەوە بـۆ سیاســەتی خزمــەتی ســەربازیی زۆرەملــێ کــە لەســاڵی 1934 بڕیــاری لێدرا( هەروەها بۆ ڕۆڵی بـەربلاوی سـوپا لـە ڕەشـەکوژیی ئاشـوورییەکان لەســاڵی 1933 دا): لێــرە بــەدواوە شـیعە لــەرووی ژمــارەوە لەســوپادا زۆرینەیان پێک دەهێنا. هەروەها بۆ کوردەکان. دەیانتوانی بچنە سوپاوەو ئەگەری پێشقەچوونی سیاسییشی پێ بەخشین. ئەو دە کـوردەی ڕۆڵێکـی سیاسیی دیاریـان لـە مـاوەی 1920-1958 دا بینـی، ئـەم جێگەوڕێگـە شیاوانەشیان بەهۆی پلەوپایە سەربازییەکانیانەوە بوو[32].

بریتانییەکان. بـەپێی جۆرەهـا پێـوەر. بـۆ بـەهێزکردنی هەنـدێ سـەرۆک عەشـیرەت سیاسـەتێکی زۆر ئاگایانـەیان پێڕۆ کـرد. لەوانـە دانـان بـە خاوەندارییەتیی ئــەو زەویانــەی لەبەردەسـتیاندا بـوو. پـارەدان بەشـێوەی کــاش. چــەک و تفــاق پێــدان. دانــانی سیســتەمێکی تایبــەت بەکێشــە

عەشایەرییەکان کە سەرۆک هۆزەکـــــان بتــــوانن لــــە دادگـــا ناوخۆییەکانی ناوچـەکانی خۆیانـدا دەستیان بـە دادوەریـی بگـات. ئـەم سیاسەتە، هەر یەک لـە سـوننەو شـیعەو کـورد، وەک یـەک سـوودیان لـێ بینی( سەرەڕای ئەوەی، وەک تاک، ڕێژەیان کەم بـوو ئەوانـەی سـوودیان لێـی بینـی). هـەروەها بریتانییـەکان زامنـی ئـەوەیان کـرد، کـە سـەرۆک عەشـیرەتە گـەورەکان، لـە پارلەمانـدا نوێنەرایەتییـەکی باشـیان هـەبێت. نزیکەی یەک لەپێنجی کورسییەکانی پارلەمان بـۆ سـەرۆک عەشـیرەتەکان دانرابوو. لـە دەوروبـەری 1945 دا ئـەم نوێنەرایەتییـە بـۆ 38 لەسـەدی کورسییەکان بەرزبووەوە[33].

ئەم قۆرغکردنانە لەئەنجامی بۆچوونی بەیەکسانیی دابەشکردنی دەسەڵات، سامان و کاریگەریی دەسەڵات بەسەر دابەشبوونە مەزهەبییەکانـدا نـەبوو. بەڵکوو کڵاولەسـەرنان بـوو. بـەڵام زۆر کاریگـەر بـوو، بەلەبـەرچاوگرتنی تـاکتیکی پـەرت بکـەو زاڵ ببـە. بـە لایـەنگرییکردنی هەنـدێ سـەرۆک عەشـیرەت لەسـەر حیسـابی ئـەوانیتر، بریتانییـەکان و ڕژێمـی سـوننەی باڵادەست، دەرکەوتنی ئۆپۆزیسـیۆنی یـەکگرتووی شـیعەیان لـەو دۆخـەی ئەوسادا پێشوەخت پووچـەڵکردەوە . لەمـەش گرنگتـر، توانیـان پوازێـک لـەنێوان هـەردوو جەمسـەری بـەهێزی شـیعەکانی باشـوور، سـەرۆک عەشیرەتەکان و سەرکردە ئایینییەکاندا بچەقێنن[34].

زۆرێک لە شیعەکان بـارودۆخی ئابوورییـان بووژایـەوە، لەکاتێـدا پێشـتر، چوونە نـاو سـوپاو و ئیلیتـی سیاسییان لـێ قەدەغـە کرابـوو. هەڵکشـانی جوستییەکانی شیعە زۆرتر لە ڕێی خاوەندارییەتیی زەویـی کشـتوکاڵیی و پـرۆژەی بازرگانییـەوە بـوو. بەمشـێوەیە لـە سـاڵی 1958 دا عەرەبـە شـیعەکان نزیکـەی 50 لەسـەدی خاوەندارییـەتی زەویـی لـە عێـراق و 7 ملیـۆنێر لـە کـۆی 15 ملیـۆنێری وڵاتیـان پێـک دەهێنـا[35]. سـەرەڕای ئەوانەش، نموونەی ڕوون و ئاشکرا لە تەواوی ئەو ماوەیەدا، بـەرفراوانیی باڵادەستیی سوننە بوو لەچاو ژمارەیاندا. ئەم باڵادەسـتییەش بـێ دەسـت بۆبردن، بەدرێژایی چەرخی بیست درێژەی کێشا.

## حوکمکردنی عێراق

رەگ-دانـــــــەکوتان و شکستی دیمۆکراسیی یەکێکە لە ئاکامە دیارەکانی هێجەمۆنیی بریتانیا و باڵادەستیی سوننە لە عێراقدا. بەدەستەواژەیەکی ساناتر، نوێنەرایەتیکردنی راستەقینەی دیمۆکراسیی لە عەرەبی سوننەی دەخواست دەستبەرداری دەسەڵاتی سیاسیی ببن بۆ شیعەکان، کە لەرووی ژمارەوە زۆرتر بوون. بەدڵنیاییەوە بریتانییەکان پشکیان هەبوو لەم گۆڵمەزەدا، ئەوان پێیان باش بوو، حوکم لەدەست ئەو ئیلێتە سیاسییەی عەرەبی سوننەدا بێت کە بە پرۆ_بریتانیایی ناسرابوون. سیستەمێکی کراوەو هەمەلایەنە، بێگومان واتای ئەنتی سیاسەتەکانی بریتانیای بەدواوە دەبوو، ئەمەش شتێک نەبوو کە بریتانییەکان رێگەی پێ بدەن.

لێرەوە، ئەوەی لە تیۆرییدا بوو بۆ دەستوورێکی دیمۆکراسیی، بۆ هەڵبژاردن و هەندێ هەوڵ بۆ جیاکردنەوەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە دەسەڵاتی یاسادانان، لەپراکتیکدا بوونەوەرێک بوو هەرلە بنەڕەتدا بەمردوویی لەدایک ببوو. پلەوپایە گرنگەکان لە دەسەڵاتی جێبەجێکردندا، خۆی لە سەرۆک وەزیران و وەزارەتە بەهێزەکاندا دەبینییەوە، بەشێوەیەکی سەرەکییش سەر بەو ئیلێتە کەمە پاوانخوازەی عەرەبی سوننە بوون. وەک نموونەیەکیش کارنامەی بەپێزی سیاسیی نوری سەعید، وەک عەرەبێکی سوننە و پرۆ_ بریتانییەکی جێی بڕواو یاریزانێکی سیاسیی لێهاتووdexterity 47 جار پۆستی جیاوازجیاوازی لەکابینەکانی ( 14 جار وەک سەرۆک وەزیران) سەردەمی رژێمی پاشایەتییدا وەرگرت. نوری چاوەڕوانیی سەرکەوتنی لەو دۆخە سیاسییەدا لێدەکرا، چونکە ئایدۆلۆژیی هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو لەکاتێکدا ئەو کەسایەتییەکی سیاسیی هەمەکارە بوو.

کێبەرکێی سیاسیی، پێوەندیی بەجیاوازیی بیروڕای سیاسییەکانەوە نەبوو، بەڵکوو پێوەندیی بە لایەنە رەقیبەکانەوە هەبوو، کە بەدەوری تاکە سیاسییە بەهێزەکانەوە گردببوونەوە. نیگەرانیی هاوبەشی ئەمانەش بۆ راگرتنی رەوشی هەنووکە Status quo ی ئەوسا بووە، بەمجۆرە زامنی دەرفەتەکانیان بۆ دەستڕاگەیشتن بە دەستکەوتەکان بۆ خۆیان و بنەماڵەو لایەنگرەکانیان مسۆگەر دەکرد. هەروەک شارەزای سیاسیی Charles Tripp دەڵێ" توندبوونەوەی رکابەرایەتیی لەسەر خزمخزمێنەو پێشبڕکێی

ســـــەخت لـــــە نێـــوان دەســتوپێوەندەکانیان بــۆ بەکارێکتــەرکردنی کاریگەرییەکانیان لەسەر ئەم دەسەڵاتە سیاسییە بوو."[36]
چەقی قورسـایی هەرســێ لایــەنی دەســەڵاتدار لەســەردەمی هاشـمییەکاندا. بریتانییەکان و رژێمی پاشایی و کۆمەڵێکی کەم لە سیاسییەکانی سوننەی عەرەب بوون. بایەخدان بە ڕاگرتنی رەوشــەکە گرنگتــرین ئــەرکیان بــوو. لیبراڵیی پرۆسەی سیاسیی. جێگەی بایەخی کەس نەبوو. زۆربەی کاتەکان. هەڵبژاردنــەکان زۆر بــاش ئامادەکــاریی بــۆ دەکــرا. بــەڵام ئەنجامــەکانی پێشــوەخت برِیــاری لەســەر دەدرا. [37] لــە رەوشــێکی وادا لایەنــەکانی ئۆپۆزیسیۆن چەند خاڵێکی هاندەریان هەبوو بۆ پابەنــدبوون بــە رێســای گەمەی هەڵبژاردنەوە کە هیچ ئومێدێکی بردنەوەشیان نــەبوو. لــەناو ئــەو حیزبــە سیاســییانەی لــەو ســەردەمەدا دەرکــەوتن. تــەنها ســێ حیــزب جێدەستیان بە پرۆسەی سیاسییەوە دەبینرا. لەمانەش دووانیــان مۆڵــەتیان هــــەبوو: حیزبـــی ئیســـتیقلال ( ســـەربەخۆیی) وەک داکۆکییکـــەرێکی سەرسەختی پانعەرەبیی و ئــەنتی-بریتــانیی. هــەروەها پــارتی نیشــتمانیی دیمۆکراتیی. وەک لایــەنگریی لــە لیبرالیزەبــوون دابەشــکردنی ســامان بــە شێوەی یەکسان دەناسرانەوە. لەکاتێکدا هەردوو حیزب بەشداریی چەندین هــەڵبژاردنیان کــرد لــە ســییەکانەوە. خولیایــان بــۆ بەشــدارییکردن لــە سیستەمێکدا. کە بەئاشکرا دژایەتیی دەکــردن وردە وردە کــەم دەبــووەوە. ئەگەر سیستەمی سیاسیی رێگەیانی بدایە. ئەم دوو پارتە. کرۆکی پارتێکی میانرِۆ و پێشکەوتوویان دادەمەزراند. هەروەک چاوەڕوان دەکرا. ئــەم دوو پارتە سیاسییە مەودایەکی تەواو لەرژێــم دوورکەوتنەوە.
سێیەمین هێزی سیاسیی رێکخراو. حیزبی شیوعیی عێراق ICP { حشع } بوو. رێگەپێدراو نەبوو بۆ بەشــداریی لەهەڵبژاردنەکانــدا. بۆیــە هەوڵیشــی نەدا کار لەگەڵ رژێمدا بکات. وێڕای ئــەوەی لەرەچەڵەکــدا ئــەم حیزبــە لــە رۆشــنبیرانی شــارو چینــی نێوەنــد پێکهــاتبوو. بــەڵام گەشــەیکردو بــووە یەکەمین هێزی مەیداندارو کۆمەڵایەتیی لەناو هێزە سیاســییەکاندا. ئــەوەی رژێم زرِوای چووبوو لێی. ئەو پەیامە سیاســییەی حشـع بــوو—لــە ئــەنتی ئیمپیریالیســتیی و بانگــەواز بــۆ دابەشــکردنی ســامان و دەســتکەوتەکان بەیەکسانیی دەبینرایــەوە. دەنگدانــەوەی ئەمانــەش سنووری ســوننەکانی تێپەڕانــدو کــورد و شــیعەو کەمەنەتەوەییــەکانی تریشــی لــەئامێز گــرت.

سـەركوتكردن و چەوساندنەوەی رژێم، وای لـە حشـع كـرد، زۆرتـر ئومێـد لەسـەر ئایـدۆلۆژیای سـەركردایەتییەكەی و پاپەندبوونـە توندوتۆڵەكانیان هەڵچنێ، بۆ رێكخستنی تـۆڕێكی پێكەوەگرێـدراو، كـاری پڕ لەدیسپلین، بەكارهێنانیشیان وەک سەری رم بۆ هێرشی سیاسیی دژ بە شـەرعییـەتی سیسـتەمی سیاسـیی. لـە كۆتـایی چلەكانـدا حشـع بـوو بـە رێكخراوتـرین هێـزی سیاسـیی لەعێراقـدا. هـەروەها بـۆ دامەزرانـدنی سیستەمێكی سیاسیی، بـوو بـە پێشـڕەوی ئـەو هەوڵانـەی خـەڵكیان بـۆ بەگژداچوونەوە دژی دەوڵەت سازدەدا.

چاپووكیی حشع لە رێكخراوەییدا و لێوەشاوەییان لە هەڵخراندنی خەڵكدا، لە ژمارەیەک خۆپیشاندان و ناڕەزایەتییدا كە عێراقـی هەژانـد لـە دوایـین ساڵەكانی رژێمی پاشایی هاشمییدا بەڵگەی بەهێزیی ئەو حیزبە بوون.

سەركەوتنەكانی حشع تیشكی خستە سەر خاڵە لاوازەكانی ئـەو ئەزموونـە دیموكراسییە كرچوكاڵە. ئۆپۆزیسیۆن تا ئەو جێگەیە رێگەی پێـدەدرا، كـە هیچ مەترسییەكی بۆ سەر بـارودۆخی سـەقامگیر نـەبێ. ئـەم نموونەیـەش لەلایـەن بریتانییەكانـەوە داهێنـرا. دواتـریش لەلایـەن ئۆلیگارشـیی سەرەكییەوە، كە خـۆی لـە ئیلێتـی عـەرەبیی سـوننەدا دەبینییـەوە دەسـتی پێوەگیرا، چونكە چێژیان وەرگرتبوو لە دەستكەوتی ماددیی بەهۆی پۆستە سیاسییەكانیانەوە. لایەنەكانی ئۆپۆزیسیۆن چونكە لە بارودۆخەكە( بەهـەر هۆیەكەوە بووبێت) رازی نەبوون، مایەی پەژراندنی دەسەڵات نەبوون و لـە پرۆسەی سیاسیی "شەرعیی" دا پەراوێز خرابوون. لەئەنجامیشدا، ئامانجی ئەم ئۆپۆزیسـیۆنە بـوو بـە سـەرەوژێركردنی رژێـم لـەدەرەوەی پرۆسـەی سیاسیی، نـەک بەشـێوەی گـۆڕینی رژێـم بـە ئاشـتیی لـەناو پرۆسـەكەدا. لەئـەنجامی شكسـتییەوە كـاتێ نـەیتوانی خـۆی بگـونجێنێ لەگـەڵ ئۆپۆزیسـیۆندا، رژێـم بـەنائاگایی تـۆوی وێرانكردنـی خـۆی دەچانـد. هەروەها، گیانی كرد بەبەر داینامیكێكی نوێدا لە ژیانی سیاسـیی عێراقـدا. لێرەوە كـۆنترۆڵكردنی میكـانیزمی سیاسـیی دەوڵـەت گـۆڕا بـۆ ئەوانـەی توانـای جولانـدنی "شـەقام"یـان هەیـە ( وەک حشـع ). یـان ئەوانـەی كۆنترۆڵی دامودەزگای داسەپاندنیان كردبوو( هێزە چەكـدارەكان). یـاخود ئەوانەی هەردووكیان پێكەوە هەڵبسوڕێنێ ( حیزبی بـەعس لـەژێر دەسـتی سەدام حوسێندا).

## بەکارهێنانی توندوتیژیی

بەبێ تێگەیشتن لە مەودای ئەو زەبروزەنگەی سەدام بۆ سەپاندنی دەسەڵاتەکەی بەکاری دەهێنا. جێی تێڕامانێکی گوماناوییە ئەگەر سەیری درندایەتیی رژێمی سەدام حوسێن. وەک ناوازەیەک لە مێژووی مۆدێرنی عێراقدا بکەین. نکۆڵیی لەوە ناکرێ بەکارهێنانی هێز بۆ لابردنی رژێم، یان دانانی رژێمێک، یان بۆ زامنکردنی یەکپارچەیی دەوڵەت. بەدڵنیاییەوە لەخۆوە نەبووە و پێشینەی رووداوگەلێکی هاوشێوە لەمێژووی عێراقدا هەبوونە. ئەوانەی سەرنجیان دەخەنە سەر "نەگریسیی" سەدام، هەمیشە ئاماژە بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە دژی کوردەکانی عێراق لە کەمپەینی {شاڵاو} ئەنفالی ساڵی 1998 دا دەکەن. ئەوەی سەرۆکێک چەکی کیمیایی دژی گەلەکەی خۆی بەکاربهێنێ، کرابوو بە چەقی ئەو ئارگیۆمێنتە مۆراڵییەی بانگەشەی هەڵپێچانی بۆ بەکارهێنانی هێز دەکرد. رێی تێدەچێ، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بەشێوەیەکی خەست لە بیستەکاندا دژی هۆزە کوردییە یاخییەکان لەلایەن بریتانییەکانەوە نموونەی کەمپەینی ئەنفالی بەرهەم هێنابێت. بەدڵنیاییەوە ئەوە Winston Churchill بوو نەک سەدام حوسێن، کاتێ باسی کاریگەریی چەکی کیمیاویی لە بیستەکاندا دژی عێراقییەکان بە " کاریگەریی مۆراڵیی نایاب" دەچوێنێ. هەروەها هێزی ئاسمانیی بریتانیا بوو نەک عێراق، دەستپێشخەریی کرد لە بەکارهێنانی بۆمبی فۆسفۆریی و ناپاڵمی بەرایی بۆ ئەوەی کوردستانی عێراق ملکەچ بکات.[38] بەکارهێنانی توندوتیژیی، چ ناوبەناو و چ بەبەردەوامیی بۆ پاراستنی دەسەڵاتی سیاسیی، وەک رێسای لێهاتبوو. هەروەک مێژوونووسێک دەنووسێ" بەدەستپێک لە بۆچوونی بریتانییەکانەوە لەسەر پاراستنی سیستەم، بەکارهێنانی توندوتیژیی بۆ سەرکوتکردنی رای بەرامبەر جێکەوت بوو. هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە. ئەم توندوتیژییە لەلایەن حکومەتەکانی سێنترالەوە لەبەغداد لەسنووری خۆی دەرچوو."[39]

هەر لە زووەوە، سروشتی" بۆچوونەکانی بریتانیا بۆ پاراستنی سیستەم" روون و ئاشکرا بوو. لەسەرەتای بیستەکاندا، پێش ئەوەی پارچەکانی عێراق بەفەرمی لێکبدرێن، شۆڕشێکی گەورە دژ بە بریتانییەکان بەرپابوو.

ئەم شۆڕشە بەشێوەیەکی سەرەکیی عەشیرەتەکانی شیعە لە ناوچەکانی ناوەڕاست و خوارووی فورات پێی هەڵسان ( بەڵام لەلایەن عەشیرەتەکانی سوننەو دامەزراوە ئاییینییەکانی شیعەوە پاڵپشتیی دەکرا) بەشێوەیەکی زۆر درندانە سەرکوتکرا. لە ئۆکتۆبەری 1920 دا تەنها چوار مانگ دواتر. شۆڕشەکە دامرکێنرایەوە. 500 بریتانیی و هیندیی{ بەسەربازیی هێنرابوون} لەلایەک و 6000 یش لە شۆڕشگێڕەکان تێیدا کوژران. لە نیوەی یەکەمی بیستەکاندا. بریتانییەکان زۆر ئومێدیان لەسەر هێزی ئاسمانیی. بۆ دەستەبەرکردنی دیسپلین لەهەمبەر شۆڕشە بەردەوامەکانی عەشیرەتە کوردەکان لەباکووردا هەڵچنیبوو. Gale یەکێک لە سەرکردەکانی هێزی ئاسمانی پاشایی RAF. باسی ئەوەی کردبوو" ئەگەر کوردەکان. وانە فێر نەبوونایە لێمانەوە. کە چۆن بە شێوازی شارستانییانە هەڵسوکەوت بکەن ، دەبوواَیە ڕمبازێنیان پێ بکەین. ئەمەشمان بە تۆپ و فڕۆکە دەکرد."[40]

سەرکوتکردنی کوردە"ناشارستانییەکان" لەڕێگەی بەکارهێنانی زەبروزەنگەوە بەشێوەیەکی ڕەها. بوو بە پرۆڤەیەکی نیشتمانیی لە عێراقداو بەدرێژایی 80 دانە ساڵ پیرۆ کرا. هەر کوردەکان بەتەنها قوربانیی نەبوون. لەسییەکاندا بێ پسانەوە بەهۆی چەندین فاکتەرەوە ناارامیی لە باشووردا هەبوو. بەڵام بڕیاری پەراوێزخستنی شیعەکان هەمیشە جەختی لێکراوەتەوە بە دوورخستنەوەیان لە ئاستە باڵاکانی بەرپرسیاریەتیی دەسەڵاتی سیاسییدا.[41] هەلی دەربڕینی ناسۆرییەکانیان بە شێوازی دیمۆکراسیی لێ زەوتکرابوو.. بۆیە زۆربەی کات پەنایان بۆ شۆڕشی ئاشکرا دەبرد.

گرنگترین شۆڕشەکانی شیعە لە ساڵانی 1935 و 1936دا ڕوویاندا. لەهەر حاڵەتێکدا وەڵامی حکومەتی تازە سەربەخۆی عێراق. بەکارهێنانی هێزی چەکداریی بوو بۆ تێکشاندنی شۆڕشگێڕەکان بەوپەڕی بێبەزەییەوە. ئەرکی سەپاندنی دیسپلین بەسەر عەشیرەتەکانی شیعەدا بە ژەنەراڵ بەکرد سدقیی سپێردرا. پیاوێکی هەڵچوونەناس لە تەنگانەدا . هەمان پیاوی ناوبانگ زڕاو( و خاوەن پایەیەکی جەماوەریی ) کە سەرپەرشتییکردنی کۆمەڵکوژییەکەی ئاشوورییەکانی لەساڵی 1933دا کە سەدانی تێداچوون لەئەستۆ گرت. ئەم ڕەشەکوژییەی ئاشوورییەکان بە

هەوڵ و دەست لەپشتدانی دەوڵەت بوو بۆ ئەوەی کەمایەتییەک ببێتە "قۆچی قوربانیی scapegoat". کە بە دوژمنی دەوڵەت سەیر دەکران. لەسەروبەندی توندوتیژییەکاندا. کوردەکان. عەرەبەکان و ئێزیدییەکان بۆ چەوساندنەوەی ئاشورییەکان. خاڵێک کۆی دەکردنەوە. لە دەستەواژەی یەکێک لە کۆمێنتارەکاندا بەمشێوەیە هاتبوو" بەکورتیی. هاوینی 1933. بۆ ئاشورییەکان لەعێراقدا. ساڵێکی نەهات بوو "[42]

رۆڵی هێزە چەکدارەکان لە مەسەلەکەدا ناموڕاڵیی بوو. لە11 ئۆگۆستی1933 دا. یەکەیەکی سەربازیی پڕچەک لە ژێر فەرماندەیی ژەنەراڵ سدقییدا چووە شارۆچکەی سیمێلەوە. بەشێوەیەکی سیستەماتیک دەستکرا بە رەشەکوژیی لە پیاوان و ژنان و منداڵان. کە دانیشتوانەکەی لە ئاشورییەکان بوون. لە جیاتی ئەوەی ئەم کۆمەڵکوژییەی ئاشورییەکان ببووایە بە ریسواییەکی نیشتمانیی. کەچیی بووە سمبۆڵ بۆ یەکێتیی خاک و شانازیی نیشتمانیی. کەوانە ئارمی سەرکەوتن لەسەر شەرەفی سوپا لەشاری موسڵ چەقێنرا: لەکاتی گەڕانەوەی سوپاش بۆ بەغداد. لە نمایشێکی سەربازییدا لەشەقامەکاندا گوڵباران کرا: هەروەها بەشێوەیەکی دراماتیکی سەربازگیریی پەرەی سەند لەئەنجامی ئەو هەڵمەتە پڕ لە "قارەمانیی" ەدا بۆ نەهێشتنی هەڕەشەی ئاشورییەکان.[43] هەروەک کۆمێنتارێک دەیگوت " بەرنامەی ئاشورییەکان یەکەمین دەربڕینی رەسەنانە بوو بۆ سەربەخۆیی نیشتمانیی لە هەرێمێکی عەرەبیی کە پێشتر سەر بە ئیمپراتۆریای عوسمانیی بووە."[44]

پەنابردن بۆ توندوتیژیی لەدژی کەمە نەتەوەکان. ئاماژەیەکی روون بوو بۆ سیستەمێکی سیاسیی شەپرێو و داهێزراو. ئۆپۆزیسیۆنبوون دژی رژێم گەرموگوڕیی بەخۆیەوە بینی لە کۆتایی چلەکاندا. زۆرداریی و بەکارهێنانی هێز تا دەهات گەشەی دەکرد. ببوو بەوەڵامی ستاندەرد دژی هەر رایەکی سیاسیی پێچەوانە. لە 1946 دا. خۆپیشاندانێک لەلایەن حشع ەوە لەنێو کرێکارانی نەوتی کەرکوکدا بەرێخرا. بووە هۆی ئەوەی پۆلیس گوللەبارانی کرێکارەکان بکەن و 8 یان لێ بکوژن و نزیکەی 50 شیان لێ زامدار بکەن. ئەوەی بە " رەشەکوژییەکەی کەرکوک" ناسراوە. راپەڕینی وەسبەی لە 1948 دا بەدوادا هات. خوێندکاران وەک سەرپەرشتییکارانی خۆپیشاندانەکان دژی رۆڵی بەردەوامی بریتانییەکان.

5 کەسیان بەدەستی پۆلیس لێکوژرا.[45] دوای 11 رۆژی تر، پێکدادانی بەربلاوتر لەنێوان پۆلیس و خۆپیشاندەراندا روویدا— لەمێژووی کورتی عێراقدا دژوارترین رووداو بوو— 77 خۆپیشاندەری تێدا کوژراو سەدان کەسیش بریندار بوون. پەشێوییەکی بەربلاو لەساڵی 1952 سەری هەڵدایەوە( بە راپەڕین ناوبانگی دەرکرد). سەرئەنجام زۆر بەخێرایی بەهەموو نێوەندی شارەکاندا تەشەنەی کرد.
بەهەمان شێوەش زۆر بەتوندیی بەرپەرچ درایەوە. بەبەراورد لەگەڵ مەسەلەی ئاشوورییەکاندا، لەم کێشانەدا کەمتر رادەی توندوتیژیی بەکارهێنرا. بەڵام وەڵامدانەوەی رژێم بۆ ئەم پێشهاتە سیاسییانەو سروستی بەرەنگاربوونەوەکان( کە هەموویان بە توندوتیژیی دەربڕینیان لەخۆیان دەکرد) جەختی لەوە دەکردەوە. رژێم چەندێک لە پێڕۆکردنی سیستەمێکی سەقامگیری دیمۆکراسییەوە دوورە. لایەنەکانی ئۆپۆزیسیۆنی رژێم بەهۆی دەستنەگەیشتنیان بەشێوازی یاسایی، پەنایان بۆ خۆپیشاندانی توندوتیژ برد بۆ ئەوەی رژێم بنکۆڵ بکەن؛ وەک چاوەڕوان دەکرا، رژێمیش بەنزینی کرد بەسەر ئاگرەکەدا و بە زەبروزەنگ وەڵامی دایەوە. ئەم زنجیرە توندوتیژییانە کۆتاییەکەی بە سەرەوژێرکردنی خوێناویی رژێم لەساڵی 1958 دا گیرسایەوە و وانەیەکی گرنگی لێ بەرهەم هات. کە توندوتیژیی، کاریگەرترین هۆکارە بۆ بەدیهێنانی ئاڵوگۆڕی سیاسیی، نەک شێوازی ئاشتیی و دیمۆکراسیی. یەکێک لە میراتە بەجێماوەکانی رژێمی پادشایەتیی، بەدامەزراوەکردن و یاساییکردنی توندوتیژیی بوو وەک هۆکارێکی سیاسیی، ئەم پرۆسەیەش بە " بیرۆکەی سیستەم پاراستن" ی بریتانییەکان دەستی پێکرد و گەیشتە لوتکەی لۆژیکیی خۆی لە سەردەمی سەدام حوسێندا.

## یەکێتیی نیشتمانیی National Unity

لەکاتێکدا هەستێکی قووڵ بە ئایدێنتیتیی نیشتمانیی لە عێراقی 1958 دا هەبوو لەچاو 1921دا کە جێگەی گومان بوو. بەهێزترین هێزی یەکگرتوو لەم ماوەیەدا، ڕەزامەند نەبوو بەرامبەر دەسەڵاتی بریتانییەکان و دژی ئەو ڕژێمەی لەلایەن بریتانیاوە سەپێنرابوو. بەگردکردنەوەی رقوکینەیان لە دژی دوژمنێکی هاوبەش، گرووپە پەرتوبڵاوەکان دەیانتوانی لە دەوری مەسەلەیەکی هاوبەش کۆببنەوە. بەڵام ئەم یەکێتییە لە بناغەوە نەگەتیف بوو. گرووپەکان دەیانتوانی ڕێکبکەون لەسەر ئەوەی نەیاندەویست عێراق لەو دۆخەیدا بێت. بەڵام تێڕوانینێکی هاوبەش و پۆزەتیڤیان بۆ ئایدێنتیتیی نیشتمانیی عێراق نەبوو.

بارهێنانی هەستێکی گشتگیر لەهەمبەر دروستکردنی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی، هەمیشە بەرەنگاربوونەوەی لێدەکەوتەوە بە هۆی بوونیادی ئێسنیکیی و مەزهەبیی عێراقەوە. چەندین هەڵەی کەڵەکەبوو لە کۆمەڵگای شەقوشڕی عێراقدا هەیە. دابەشبوونە ئێسنیکییەکانی کورد و عەرەب هەمیشە ئەوەی سەلماندووە کە چارەسەری ئاسان نییە. کوردەکان هەرگیزاو هەرگیز نەیانویستووە بەشداریی لە دروستکردنی دەوڵەتی نوێی عێراقدا بکەن. بەڵکوو بێ پسانەوە، هەندێ جاریش بە شێوازی توندوتیژیی، بەرهەڵستکاریی دەسەڵاتی سەپێنراویان لەلایەن بەغدادەوە کردووە. ناسنامەی دەسەڵات لە نێوەند زۆر کێشە نەبوو: کوردەکان لە دژی دەسەڵاتی بریتانییەکان لەساڵی 1919 یاخیی بوون و ئەوەیان سەلماند بە درێژایی بیستەکان، مایەی بێزاریی RAF بوون. وەڕسبوونێکی resentment بێ ئەندازە، ناوبەناو لە شۆڕشە یەک لەدوای یەکەکاندا دەنگی دەدایەوە، هەروەک ئەوانەی لە 1930 و 1945 دا ڕوویاندا. هەردوو شۆڕشەکە بە هێزی سەربازی زۆروزەوەند تێکشکێنران. بەڵام گرفتی سەرەکیی هەرگیز چارەسەر نەکرا. کوردەکان، ئایدێنتیی جیاوازیان هەیە لەهەرێکە لە مێژوو، کولتوور، زمانناسییدا کە سووربوون لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەوەی کە لە پانتاییەکی بەرینتردا گومبکرێن. لێرەوە وێڵبوون بەدوای ئایدێنتیتییەکی نیشتمانیی گشتگیردا بۆ عێراق، چارەنووسی بە شکست نووسرایەوە، لەبەر سادەترین هۆ. ئەم کەمایەتییە ( کوردەکان 15 تا-20 لەسەدی سەرجەم دانیشتوانەکەین )

بەرژەوەندییەکی ئـەوتۆیان لە سەریەشەی بەشدارییکردن لەم ئایدێنتییـەدا نەبوو.
تایەفەگـەریی نێـوان عـەرەبی سـوننەو شـیعە بەگشـتیی زۆر ئـاڵۆزەو لـە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بەشێوەیەکی قووڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ. بۆ ئێستا گرنگە ئاماژە بدرێ کە هەڵبەزوودابەزەکانی نێوان سوننەو شـیعە، هەر بەتەنها بـە جیـاوازیی مەزهـەبیی ناناسـرێتەوە. بەدڵنیاییـەوە رژێمـی سێکیولاری سوننەکان، بەکـەمێک نیگەرانییـەوە رۆڵـی پیـاوانی ئاییـنییـان لەباشووردا بەهەند سـەیر دەکـرد؛[46] بـەلام گرفتـی سـەرەکیی رێککـەوتنی congruence جیاوازییە تایەفییەکان بوو لەسەر دابەشکردنی سـامان و دەسەلاتی سیاسیی. کـۆنترۆڵی سـوننەکان بەسـەر دەسـەلاتی سیاسـیی و هێزی ئابووریی‌دا، بەتەواویی زۆرینەی شیعەی دوورخستبووەوە لەدەسەلات و ژێردەستەییەکی بـەردەوامیان بـەخۆوە دەبینـی. بـۆ خۆقوتـارکردن لـەم جیاوازییانـە، ئێسـنیکبوونی عـەرەبیی هاوبـەش (لای کـەم بەگریمانـەوە) بەکارهێنرا.
بەهـەرحاڵ ڤێرژنـی ئایـدۆلۆژیای ناسـیۆنالیزمی عـەرەبیی جێکـەوتکراو لەلایەن رژێـمی سوننەوە دەستی پێوەگیرا . ئەمەش بەربەستێکی تـر بـوو، چونکە جەختی لە مێژووی شکۆمەندی ئیمپراتۆریای عـەرەبیی دەکـردەوەو شیعیزم shi'ism یشی وەک گومڕا heretical و هانـدراوی فارسـەکان و مەترسـیی بـۆ سـەر یـەکێتیی جیهـانی عـەرەب سـەیر دەکـرد.[47] ئـەم دەسـتپێوەگرتنە بـە ناسـیۆنالیزمی عەرەبییـەوە لەروانگـەی سـوننەوە. گومانێکی دووسەریی لە جیاتی یەکێتیی ناوخۆیی، بەرهەمهێنا. لەسیاسـەتی دەرەوەشدا، جیهانبینی باوی سوننە، ئەوە بـوو کـە جیهـانی عـەرەبیی لـە یەک قەوارەی یەکگرتوودا یەکبخات. ئەم روانگەیە بۆ شیعەکان بەمشێوەیە نەبوو. لەکاتێکدا زۆرینەی رەهایان لە عێراقدا پێک دەهێنا. بەلام لـە یـەک دەوڵەتی عەرەبییدا کە هەموو ولاتە عەرەبییەکانی رۆژهـەلاتی نـاڤین لـەخۆ بگرێـت، لـە ژمـارەدا دەدۆڕان، چونکـە یـەک کـەس بەرامبـەر نـۆ کـەس رادەوەستا. بەمشێوەیە شیعەکان دوورخرانـەوەو بـوون بـە هـاوولاتی پلـە دوو یـان لـەوەش خراپتـر، سـوننەکان بـە درێژکـراوەی فارسـەکان ( ئێرانییەکان) و تابوری پێنجەمی چاوەڕوانکراو لەناو عێراقـدا، سـەیریان دەکردن.

ئەم تێڕوانینە بۆ یەکێتیی پانعەرەبیی. لەڕاستییدا بەشێکە لە دیبەیتگەلێکی پانوپۆڕ لەسەر ئاراستەو پاشەڕۆژی سیاسەتی دەرەوەی عێراق دەکرێ. لەناو ئەم پۆلێنکارییەدا، ناتەباییەکی تەواو لەسەر چارەنووسی ئایدێنتیتی دەوڵەتی عێراق هەیە. ناسیۆنالیستەکانی عێراق دەڵێن، عێراق وڵات و نەتەوەیەکی سەربەخۆیەو خاوەن ئایدێنتییەکی عەرەبییە، لەکاتێکدا پانعەرەبیستەکان پێیانوایە چارەنووسی عێراق ببێ بە قەوارەیەکی ئیداریی لە ناو نەتەوەی گەورەو یەکگرتووی عەرەبدا. ئەم دیبەیتە لە ساڵی 1958 دا هێشتا چاوەڕوانی چارەسەرێکی ریشەیی دەکرد. لە کاتێکدا روانگەی پانعەرەبیستەکان بۆ ماوەیەکی زۆر زاڵبوو، کە یەککرتوویی نەتەوەی عێراق لەناوخۆدا کەمتر جێگەی بایەخ بوو لە ئاست ئامانجی دوورتریان کە یەکێتیی عەرەب بوو.

لەسەروبەندی 1958 دا، بۆ زیاتر لە چارەکە سەدەیەک عێراق دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، بەڵام لە بەدەستهێنانی نەتەوەیەکی یەکانگیردا شکستی خوارد. هیچ گرێدەرەوەیەکی"گلوو" ئایدۆلۆژییانە نەما بۆ ئەوەی لایەنە جیاوازەکانی عێراق پێکەوە کۆبکاتەوە. لە گەورەترین بەشیدا ئەمە رەنگدانەوەی ئەو کارە سەختە ( یان ئەستەمە ) بوو، بۆ پێکەوەنانی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی، هاوزەمان بتوانێ سنووری جیاوازییە تایەفیی و ئێسنیکییەکان ببەزێنی. لە بەشێکی تریشدا ئەو راستییە رەنگ دەداتەوە کە دیبەیت لەسەر سروشتی ئایدێنتیتیی عێراق هەرگیز هەمەلایەنە نەبووە.

پاوانکردنی سیستەمی سیاسیی، لە جیاتی کۆدەنگیی و یەکێتیی، بێزاریی و تەرەبوونی لێکەوتەوە. لەوانەیە نزیکترین دەزگایەک بە ئاگاییەوە هەستی یەکێتیی نیشتمانیی، رەچاوکردبێ، سوپا بووبێت ؛ بەڵام بەشدارییکردنی سوپا لەم هەستەدا، هەمیشە وەک شمشێرێکی دوو دەم بووە. لەسەرێکەو سوپا یەکێک لەو دەزگا دەگمەنانە بوو، کە لەسەردەمی پادشایەتییدا دامەزرێنرا بۆ خزمەتکردنی یەکێتیی، نەک دابەشبوون. لەسەرێکی تریشەوە وەک لە زۆربەی دەزگا نیشتمانییە گرنگەکاندا دیارە، دابەشکردنی دەسەڵات لە ناو هێزە چەکدارەکاندا نەیتوانی رەنگدانەوەی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی عێراق بێت. بەهەڵاواردنی هەندێ دۆخی تایبەت نەبێ وەک( ژەنەراڵ بەکرد سدقیی، لەرووی ئێسنیکییەوە کورد بوو، هەروها بەڕێوەبەری کوودەتای 1958 سوپاسالار Brigadier

( عەبدولکەریم قاسم بوو).. عەرەبە سوننەکان بەسەر دەستەی corps ئەفسەراندا زاڵبوون. لەڕاستییدا داهێنانی خزمەتی سەربازیی زۆرەملێ، لە زۆربەی باشووری شیعەنشین و باکووری کوردنشیندا زۆر بەتوندیی نارەزایەتیی لێکەوتەوە. زیاتر لەبەر ئەوە بوو ( بە گشتیی و بە وردیی) هەستیان بەوە کردبوو. کاتێک عەرەبی سوننە بڕیارگەلی گرنگ دەردەکەن، کورد و شیعەش دەبنە سووتەمەنیی شەڕcannon fodder.
لەسەرەتادا بایەخی سیاسیی بۆ سوپا زۆرتر شتێکی سیمبۆلیی بوو. لەکاتێکدا دەزگا سیاسییەکانی تری رژێم هەمیشە بەچاوی میراتی زاڵی ئیمپریالییەوە سەیر دەکران. وەک دەربڕینی دەزگایی. سوپا یەکەمین دەزگا بوو کە دەربڕیی لەدەوڵەتی سەربەخۆی عێراق کردەوە. بەمجۆرەش، بووە جێگەی رێزلێنانی خەڵکی عێراق، لەکاتێکدا نە رژێمی پادشایەتیی و نە پارلەمان ئەمەیان پێنەکرا. بەدەرلەوەی رەشەکوژییەکەی ئاشوورییەکان روونییکاتەوە کە رۆڵی سوپا وەک سەرچاوەی یەکێتیی گەل، رۆڵێکی بێوەی نەبووە. دەستبەسەرداگرتنی هەردوو ئامرازی بەزۆر سەپاندن و وەفاداریی بەرفراوانی خەڵکی عێراق لەلایەن سوپاوە لەساڵی 1958دا قۆسترایەوە و کردی بە بەناوبژیوان لەدەسەڵاتی سیاسیی عێراقدا. کاتێکیش قڵیشایەوە، هەروەک لە 1958 دا روویدا دەیان هەزار لە عێراقییەکان کەوتنە سەر شەقامەکان بۆ پاڵپشتییکردنی کوودەتا سەربازییەکە. هیچ بەرگرییەکی میللی دژی ژێرەوژوورکردنی رژێم لەئارادا نەبوو. ئەم راستییە نوێیە. ئەگەری دەرکەوتنی سیستەمێکی سیاسیی دیمۆکراتیی و ئاشتییخوازی لە رووخساردا نەبوو.
بەنیگەرانییەوە، یەکێک لە بەهێزترین سەرچاوەکانی یەکێتیی عەرەب، کە لەماوەی 1920 بۆ-1958 دروست بوو، کینەو بوغزی هاوبەش، لە دژی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو. پاش دروستکردنی ئیسرائیل لە 1948 دا، یەکێک لە باوەڕپێکراوترین رێگە بۆ یەکێتیی عەرەبەکانی عێراق، جەختکردنەوە لە نەیاریی بەرامبەر ئیسرائیل بوو. بەشدارییکردنی بەربلاوی سوپا لە شەڕی عەرەب و ئیسرائیل لە 1948 دا، زۆر جەماوەریی بوو لەناو عەرەبەکانی عێراقدا. ئەو شەرمەزارییە گەورەیەی بەسەر هێزەکانی عەرەبدا هات، شانوشەوکەتی رژێمی لەناوخۆدا خستە ژێرپرسیارەوە، کە نەدەکرا هەموار بکرێت. بۆ سەرکردەکانی داهاتووی

عێـراق. پەیامەکـە ڕۆشـن بوو. کە عەرەبەکانی عێراق دەکرێ یـەکبخرێن بۆ هەڵوێستێکی بەرجەستە لـە دوژمنایـەتیی و ئـەنتی زایـۆنیزم. پشـتیان پێبەسترێ.

## بەرەنجام: شێوازی ئایینده داڕێژرا

دەستنیشـانکردنی نەخۆشـییە_pathologies هاوچەرخـەکانی عێـراق. سەرکوتی نێوخۆیی. بەکارهێنانی توندوتیژیی بەشـێوەیەکی سیسـتەماتیک و بەربڵاو. هـەروەها بـوون بەسـەرچاوەی هەڕەشـە لـە دەوروبەراوسـێکان و کۆمەڵگـەی نێونەتـەوەیی. بـە قـووڵی ڕەگوڕیشـەیان لـە مێـژووی هەڵبەزودابەزی عێراقدا داکوتیبوو. زیانی سەرەکیی بـەر ژێرخـانی عێـراق کەوت. بەماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی سەدام حوسێن دەستی لەکورسی گیـر بێـت. دوو بڕیـاری چارەنووسسـاز درابـوو کـە بۆچـوونی بریتانیـای لەپشـتەوە بـوو. یەکـەمیان بڕیـاری پێکەوەلکانـدنی هـەرێمی موسـڵ بـە هەرێمـەکانی بەغـداد و بەسـرەوە بـۆ دروسـتکردنی دەوڵـەتی عێـراق کـە عەرەبنشـین بـوون. ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی سـەرکردەکانی دواتـر ڕووبەڕووی چەڵەمەیەک dilemma ببنەوە کە دەربـازبوون لێـی سـەخت بوو: چۆن کەمایەتیی کورد کە یـاخیبوون و هەڵگەڕانـەوەی بـەردەوامیان تێداهـەبوو لـە قەوارەیـەکی عـەرەبیی پـانوپۆڕدا ڕێکـدەخرێ. هـەموو سەرکردەکانی عێراق دەرگیری ئەم گرفتە بوونـەوە. لـەدوا شیکردنەوەشـدا هەموویان گەیشتن بەوەی لەڕێگەی توندوتیژییەوە مامەڵەی لەگەڵـدا بکـەن. دووەمین بڕیاریش، بڕیاڕی بەئەنقەستی بریتانییـەکان بـۆ لایـەنگریی لـە سوننەکان لەسەر حیسابی زۆرینەی شیعەکان بوو. ڕاستەوخۆ ڕێگربوو لـە پێکهێنانی حکومەتێکی کارا کە نوێنەرایەتی خەڵک بکات.
عەرەبـە سـوننەکان بریکـاری هـەڵبژێردراوی حـوکمی ناڕاسـتەخۆی بریتانییەکان بوون. هەلومـەرجی ئـەوان وەک کەمایـەتیی سـەلماندی. ئـەو فرۆفێڵـە دەسـتوورییانەی بـۆ دیموکراسـیی کـرا.. جگـە لـە چاوبەسـتیی هیچیتری لێ بەرهەم نەدەهات. پاراستنی دەسەڵاتی سوننەکان پێویستی بە جێبەجێکردنی تـاکتیکێکی کلاسـیکییانەی پـەرت بکـەو- زاڵ ببـە بـوو. بەسیستەماتیکیی لایـەنگریی هـەندێ سـەرۆک عەشـیرەتی شـیعە لەسـەر حیسابی ئەوانیتر دەکرا. ئەمەش ڕاستەخۆ ئیلێتی شیعەی خۆبەخۆ دابەش

دەکـرد. کـاتێکیش هـەموو تاکتیکـەکان شکسـتیان دەهێنـا، مانـەوەی ئۆلیگارشیی سوننە لە دەسەڵاتدا لەرێی زەبروزەنگەوە بەرجەستە دەکـرا. ئەمەش بەدرێژایی 1920- 1958 نموونەیەکی بناغەیی بووە.

## بەندی دوو

# عێراق 1958-1968
# شۆڕش، کۆماریی و ڕێنیسانس

### پێشەکیی

کوودەتای سەربازیی 1958 لەمێژووی عێراقدا خاڵی وەرچەرخان بوو. ئەم"شۆڕش"ە دوایەمین پاشماوەی باڵادەستیی دامودەزگاکانی کۆلۆنیالیی ڕامالی. سەرئەنجامیش ئەو ویلاشە umbilical cord نەفرەتلێکراوەی عێراق و بریتانیای پێکەوە دەبەستەوە، بەتەواویی پچڕاند. شۆڕش کەسێکی تەنیابالی هێنایەسەر شانۆی دەسەلات_ سوپاسالار عەبدولکەریم قاسم_ وادەرکەوت کە تەواوی هەمەڕەنگیی ئێسنیکیی و تایەفییەکانی تێدا بەرجەستەبووەتەوە. باوکی قاسم عەرەبی سوننەو دایکیشی کوردی شیعەبوو. بەمجۆرە بەکەمێک ڕەنگوڕووی یاساییەوە دەتوانرێ بگوترێ یەکەمین ڕابەری ڕاستەقینەیە کەنوێنەرایەتیی عێراقی کردبێ.
جێگەی پەژارەیە. یەکەمین دەیەی کۆماری عێراقی تازەدامەزراو بەتوندوتیژیی، کێشمەکێشی ناوخۆیی و ناسەقامگیرییەکی سیاسیی بێئەندازە ڕەنگرێژ کرا. زنجیرە کوودەتاکان و دژەکوودەتاکان (counter_coup)، کۆمەڵێک سەرکردەیان بەرهەم هێنا. نەیاندەتوانی بەسانایی کۆنترۆڵی ئەو هێزانە بکەن کە لەهەناوی شۆڕشی میللییەوە هاتبوونەدەرێ: لەجەرگەی ئەو هەراو گۆڵمەزەدا هێزێک سەری دەرهێنا

ئەویش حیزبی بەعس بوو. تـوانیی شایسـتەیی خـۆی لەسـەپاندنی دیسپلیندا بەسەر سیستەمی سیاسیی بێسەرەوبەرەی عێراقدا بسـەپێنـێ.[48] ئەم دیسـپلین سـەپاندنە فۆرمێکی زۆر دڵڕەقانـەی لـەخۆگرت. بـەڵام زۆر کاریگەربوو. بەڕادەیەک کاریگـەر بـوو. کـەدوای 1968، حیزبـی بـەعس بەتەنیا کۆنترۆڵی دەوڵەتی عێراقی کرد. هیچ هێزێکی سیاسیی نەیـدەتوانی نزیک بێتەوە لەوەی سەرکەوتووانە بەگژ هێجەمۆنی بەعسدا بچێتەوە.
ئەم باڵادەستییە، سەرەتا لەتاکرەویی دەسەڵاتی یەک حیزبییدا خۆی نواند: دوای 1979، کاتێـک سـەدام حوسـێن بەفـەرمیی رابەرایـەتیی حیزبـی گرتەدەسـت، بـەعس وەک ماشـێنێکی زۆربـاش چـەورکراو بـۆ خزمـەت بەمەرامـە بـەرزخوازە تایبەتـەکانی سـەدام لەئیشـدا بـوو. بـەعس سەرکەوتووانە توانی هێجەمۆنی دەسـەڵات بپارێزێ، لەکاتێکـدا زۆری تـر شکستیان تێیدا هێنا. تێگەیشتن لەمکوڕبوونی بەعس و رابەرایەتییـەکـەی تێگەیشتنێکی تەواومان لەسەر داینەمیکی مێژووی سیاسیی عێراق دەداتێ.

## کوودەتای 1958: پەیدابوونی کۆماری عێراق

ئەو کوودەتا سەربازییەی، رژێمی پاشایی هاشمییەکانی ژێرەوژوور کـرد، بەهەموو پێوانەکان، وێرای جەماوەرییبوونی هاوکات توندوتیژیش بـوو.[49] کوودەتاکـە لەلایـەن دوو ئەفسـەری شۆرشـگێڕی سوپاسـالارەوە، قاسـم و ژەنەراڵ عەبدولسەلام عارف رابەرایەتیی دەکرا. هەروەها لەلایەن کۆمەڵێک ئەفسـەری تـرەوە کەزۆربـەیان عـەرەبی سـوننەبوون ( ناسـرابوون بە"ئەفسەرانی ئازادییخواز" )، سەرەڕای کۆمەڵێ حیزبی سیاسیی هەمەجۆر ( حیزبی شیوعیی عێـراق ICP، پـارتی نیشـتمانیی دیمـۆکراتیی NDP ، پارتی سەربەخۆ و حیزبی بەعس ). بەگشتیی ئەم هێزە جۆراوجۆرانە هەر بەناو یـەککرتوو بـوون لـەچاو ئـەوەی کەئۆپۆزیسـیۆنی بـەهێزی رژێمـی پێشوو بوون. یەکدەنگییان هەبوو بۆ رەشکردنەوەی هەموو پاشـماوەکانی رژێمی سیاسیی پێشووتر. بـەڵام ناتەباییـەکـی زۆریشـیان هـەبوو لـەوەی چیتر لەجێی دابنێن.
شۆڕش هـەلی بـۆ هەنـدێک، بەتایبـەت بـۆ ئەفسـەرانی ئـازادییخواز، بـۆ چـاودێرییکردنی کەڵکەڵـەی خولیاکانیـان لەپانعەرەبییـدا رەخسـاندبوو. گرووپەکانی تر، پێیان باش بـوو عێـراق بخرێتـەپێش هـەموو شـتێکەوەو

جـــــــــــــــەخت لەگرفتـــە ئابوورییـــــە نێوخۆییـــــەکان و کێشە کۆمەڵایەتییـەکان بکرێتـەوە. هـەروەها پێشـڤەچوونی عێـراق بـەرەو دەوڵەت و نەتەوەیەکی سـەربەخۆ جێگـەی بایـەخی زیـاتر بێـت. یـەکێتیی لەناو ئەم گرووپانەدا لەسـەردەمێکدا پێکهـات. کەدوژمنایەتییـەکی بێئـەژمار بەرامبەر دوژمنێکی هاوبەش کۆی کردبوونەوە. ئەم یەکێتییـە دوای 1958 بەخێراییـــەکی سەرســـوڕهێنەر کۆتـــایی پێهـــات. سیاســـەتکردن. بـــوو بەخەباتێکی ئاشکراو زۆر دڕێو بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەوتی سیاسیی عێـراق لەئاییندەدا.

خـــودی کوودەتاکـــە بەتونـــدوتیژیی ئـــاوێزان بـــوو. ئەمـــەش ئاماژەیـــەکی شوومهێنەرominous بوو بۆ ئەو شـتانەی دەهاتنـە پێشـەوە. لـەجولای 1958 دا. لەکاتێکدا ئەفسـەرانی ئـازادیخواز قورسـایی هێزەکانیـان بـۆ دەستبەســـەرداگرتنی شـــوێنەگرنگەکانی پایتـــەخت و لـــەناوبردن و پاکتـــاوکردنی بنەماڵـــەی فـــەرمانڕەوا تـــەرخانکردبوو( کۆتاییهێنـــان و بنبڕکردنـــی یـــەکجاریی دەســـەڵاتی هاشـمییەکان ). حیزبەسیاسـییەکان بـۆ بەرگرییکردن لەشۆڕشە ساواکە خـەریکی مۆبـەلایزەکردنی mobilizing شـەقامەکانی بەغـداد بـوون. لەپێشـەنگی ئەمانـەدا حشـع بـوو. کـەتوانای مۆبـەلایزکردنی ژمارەیـەکی بێئەنـدازە لەلایـەنگرانی خـۆی لەماوەیـەکی زۆرکەمدا هەبوو.

پاش کۆنترۆڵکردنی بارەگای ڕادیۆ. ژەنەراڵ عارف. بەیاننامەیەکی کورتی پەخشـکرد و کۆتـایی ڕژێمـی پاشـایی و سـەرەتای عێراقـی کۆمـاریی ڕاگەیانـــدو داوای لەخـــەڵک کـــرد بڕژێنـــە ســـەر شـــەقامەکان. لـــەڕۆژانی داهاتوودا. سەدان هەزار کەس. ڕژانە سەر شـەقامەکان. هەنـدێک هـەروەک بەزم. دەیانویست چاودێریی یەک بەیەکی پەرەسەندنی ڕووداوەکان بکەن. بەڵام زۆرینەی خەڵک بۆ ئەوە کەوتبوونە سەر جادەکـان. تـا زەبـری ئـەو تۆڵەئەستاندنەوانە ببینن کەدووچاری فیگەرو سیمبۆڵە بێزراوەکانی ڕژێمی پێشوو دەبێتەوە.

هێزە چەکدارەکان چاودێرییان دەکرد. لەکاتێکدا هەست و نەستی خـەڵکیی نمایشی خۆی لەشێوەی تاڵانیی و تێهەڵـدان و تۆڵەئەسـتاندنەوەدا دەکـرد. وەک دەرئـــەنجامی کوودەتاکـــە دوو ڕاســـتیی لـــەژیانی سیاســـیی عێراقـــدا بەرجەســـتەبووەوە. یەکـــەمیان. ســـوپا بـــوو بەیـــەکێک لەرکابـــەرەکان

لەنێو هێزەسیاسییەکاندا و هاوکات بوو بەکانگەی سەرەکیی دەسەڵاتی سیاسیی لەعێراقدا. لەم ئاقارەوە گرووپێکی بچووک لەئەفسەرە هەڵچووەکانی سوپا توانیان تەواوی سیستەمی سیاسیی بسڕنەوە. دووەمیان، ئاسەوارەکانی کوودەتاکەو ڕۆڵی مۆبەلایزکردنی جەماوەری دەرخست وەکو هۆکارێک بۆ کۆنترۆڵی سیاسیی. ئەفسەرانی ئازاد هانی خەڵکی عێراقیان دەدا بۆ ئەوەی بڕژێنە سەر شەقامەکان. بۆ دەرخستنی ئەوەی کەکوودەتاکە جەماوەریی بووەو لەم ڕێگەیەشەوە شەرعییەت بەشۆڕشەکە بدەن، هەروەها بۆ ئەوەی بەباشیی ڕێگە لەدەستێوەردانی دەرەکیی و دژەکوودەتای چاوەڕوانکراو لەلایەن ئەفسەرانی دڵسۆزری بنەماڵەوە بگرن. لێرەوە تەرازووی هێزی پارتە سیاسییەکان، بەزۆریی و بۆریی ئەندامەکانیان و پەیامە ئایدیۆلۆژییەکانیان دەستنیشان نەدەکرا، بەڵکوو بەتوانای مۆبەلایزکردنی جەماوەر دەپێورا.

## کۆماری نوێ

هەر لەسەرەتاوە، گوتاری سیاسیی ئەم کۆمارە نوێیە، باڵی کێشا بەسەر رووداوەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا. بۆ ناوچەکە، دەیەی دوای 1948 سەردەمێکی پڕ لەئاشووب turbulent بوو. پێشبڕکێی شەڕی سارد لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤێت لەترۆپکدا بوو: چێکردنی دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕاگوێزانی سەدان هەزار عەرەبی فەڵەستین تووڕەییەکی بێسنووری لەجیهانی عەرەبدا لێکەوتەوە؛ لە 1952 دا، کوودەتایەک لەمیسر، تەختی دەسەڵاتی پاشا فاروقی هەڵاوگێڕ (تاڕادەیەک بەهێمنیی) کردو جەمال عەبدولناسری بەدەسەڵات گەیاند؛ هەروەها لەساڵی 1956 سەرۆک ناسر لێوەشاوەیی خۆی نیشاندا، لەکێشەی کەناڵی سوێسدا رووبەڕووی هێزە چەکدارەکانی بریتانییەکان و فەرەنسییەکان و ئیسرائیلییەکان بووەوە. کارامەیی ناسر جێگەوڕێگەی ئەوی بەڕادەیەک بڵند کردەوە، لەناو جیهانی عەرەبدا بە قارەمانێکی بێوێنە ستاییش دەکرا. لەفێبریوەری 1958 دا، میسر و سوریا بەفەرمیی یەکیانگرت و کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو(UAR)یان چێکرد. لەڕووی

جیۆگرافییەوە ئەمە ناوێزە بوو ( دوو وڵات هاوسنوور نەبن ). بۆیە کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو بەلای زۆرکەسەوە، هەنگاوی یەکەم بوو لە ئامانجی پانعەرەبیستەکان بۆ چێکردنی قەوارەیەکی هەرێمایەتیی بەرفراوانو یەکگرتوو. کەهەموو جیهانی عەرەب لەئامێز بگرێ.
دوابەدوای کوودەتاکە. پانعەرەبیستەکان لەلایەن عارفەوە. ژەنەراڵی کوودەتا دەست لەپشتیان دەدرا. بۆ ئەوەی عێراق بچێتە ناو کۆماری عەرەبیی یەکگرتووەوە بەبێ دواکەوتن. ئەوانەی دژی ئەم پانعەرەبیستانە بوون. لەحشع و NDP و دارودەستەکەی قاسم پێکهاتبوون: ئەم کۆمەڵەیەی دوایی. جەختیان لەسەر گەشەکردنی کۆمەلایەتیی و ئابووریی عێراق. لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا دەکردەوە. عێراق نەیدەتوانی هاوکات بچێتە ناو کۆماری عەرەبیی یەکگرتووەوەو بەسەربەخۆش بمێنێتەوە. بەمشێوەیە گۆڕەپانەکە بۆ خەباتێکی دوورودرێژ protracted و بەئازار لەنێوان ئەم جیهانبینییە جیاوازانەدا بۆ ئایندەی عێراق. راهێنرا. ئەم کۆششە باڵی کێشا بەسەر تەمەنی کورتی رژێمەکەی قاسمدا و لەکۆتاییشدا ئەو هەنگاوە بوێرو نوێیەی بۆ نەتەوەی عێراق لەسەرمەشقدا بوو. تێکوپێکدا sabotaged.
فەرمانڕەوایی قاسم بەڵێنی زۆردەدا و کەمی جێبەجێ دەکرد. هەوڵێکی زۆر تەرخانکرا بۆ دامەزراندنی دەزگایەکی حکومیی. کەڕەنگدانەوەی راستەقینەی گرووپە هەمەجۆرەکانی عێراق بێت. ئەنجوومەنی سەروەریی لەسێ پیاو ( لەبنەڕەتدا ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی ). لەهەرسێ گرووپە سەرەکییەکەی عێراق- کوردەکان. عەرەبەسوننەکان و عەرەبەشیعەکان چێکرا و کورسییەکانیان دابەشکرد. یەکەمین کابینەی رژێم کەم تازۆر بەیەکسانیی هەمووانی لەخۆگرتبوو. پۆست بەهەموو پارتەسیاسییە سەرەکییەکان درابوو. تەنها یەک کورسی( پۆستی کەم بایەخی وەزیری کاروباری کۆمەلایەتیی ) بەر ئەفسەرانی ئازادییخواز کەوت.[50] بەلام زۆرینەی دەسەلاتەکان لەدەستی قاسم ( وەک سەرۆک وەزیران، وەزیری بەرەڤانیی، فەرمانددەی گشتیی هێزەچەکدارەکان) و عارف ( وەک بریکاری سەرۆک وەزیران، وەزیری ناوخۆ، جێگری فەرماندەی گشتیی هێزەچەکدارەکان) دا مایەوە. بەم هەلومەرجەشەوە، لای

کەم لەسەر پەڕاوی کاغەز. ئەم سیستەمە بەرفراوانترین سیستەمی نوێنەرایەتییکردن بووە وەک حکومەت کەعێراقییەکان لەمێژووی کورتی عێراقدا بەخۆیانەوە بینیبێتیان.

بۆ نیازپاکیی لەسەر ئەوەی عێراق بەرەو ئازادیی سیاسیی هەنگاو دەنێ، مۆڵەتی کارکردنی بەو حیزبانەدا کەلەسەردەمی پێشوودا قەدەغەکرابوون، هەروەها رایگەیاند، هەڵبژاردنی ئازاد لەماوەی ساڵێکدا دەکرێ. جێگەی داخە ئەم هەڵبژاردنە نەکرا. ناکۆکییەکی دژوار و باڵکێش تانوپۆی هەلومەرجی سیاسیی داتەنیبوو لەسەر ئایدێنتیتی دەوڵەتی عێراق، کە ئێستایشی لەگەڵدابێت هەر چارەسەر نەکرا. ئەم ناکۆکییە لەسەرەتادا بوو بەململانێ لەسەر دەسەڵات. لەنێوان قاسم و عارف هەردوو رابەری کوودەتاکەدا؛ ئەنجامەکەیشی وڵاتیان بەرەو هەڵدێری شەڕێکی ناوخۆیی سەرتاسەریی برد.

عارف وەک سەرکردەی باڵی پانعەرەبیی، گوشاری دانابوو، بۆ چوونە ناو کۆماری عەرەبیی یەککگرتووەوە. بێگومان ئەم گوشارە رەنگدانەوەی پابەندبوونێکی توندوتۆڵ بوو لەهەمبەر مەسەلەی یەکێتیی عەرەبییدا بەلام لەگەڵ ئەمەشدا. لەسەر پاوانکردنی دەوڵەت، مەبەستی هەڵشاخانێکی راستەوخۆی بەرامبەر قاسم تێدابوو. قاسمیش ئەم هەڵشاخاندنە تایبەتییەی زۆر بەپەلە چارەسەرکرد. عارف یەکەمجار بەرەو Bonn لەئەڵمانیای رۆژئاوا دەرپەڕێنرا. بەبیانووی ئەوەی وەک باڵوێز دایدەمەزرێنن. کاتێکیش عارف گەڕایەوە بۆ بەغداد، دەنگۆی ئەوەهەبوو، کەبۆ ژێروژوورکردنی دەسەڵاتی قاسم پیلانی لەژێرسەردایە. بۆیە قاسم گرتی و ویستی سزای مەرگی بەسەردا بدات( دواتر کەمکرایەوەو کرا بەزیندانیی تاهەتایی). بەڵام لەکۆڵبوونەوەی رکابەرێک، هیچی لەکرۆکی مەسەلەکە چارەسەر نەکرد.

هێزەکانی پانعەرەبیی لەدژی قاسم خۆیان رێکخست. قاسم توانی لەنەیارییکردنی توێژێکی بەهێز لەدەستەی ئەفسەران سەرکەوتوو بێت، بەهۆی بێپەرۆشیی لەهەڵوێستیدا بەرامبەر کۆماری عەرەبیی یەککگرتوو لەلایەک و دانەمەزراندنی ژمارەیەکی زۆر لەئەفسەرانی ئازادیخواز لەشوێنە هەستیارەکانی ناو دەسەڵاتدا. هاوکات دوژمنایەتیی سەرکردایەتیی بەعسیشی دەکرد. بەعسییەکان بڕوایان بەوە نەمابوو

کــه قاســم پاڵپشــتیی لــەگوتاری پانعــەرەبیــی بکــات. بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی ئــەم هەڕەشــەیە، قاســم پــەنای بــۆ لێوەشــاوەیی ڕێکخستنەکانی حشع برد. ئەمە پێشهاتێکی مەترسییدار بــوو. سیاســەت لەعێراقدا بەشێوەیەکی زیاد لەپێویست پشتی بە" قەرەباڵغیی دروستکردن" بەستبوو، هەرچۆن حشع لەکاتی پێویستدا خۆپیشاندانیان بـۆ لایـەنگریی لەقاسم ڕێکدەخست. لەم نێوەندەشدا" تاکوتەنها سەرکردەی تاقانە "Sole" نمایشــی تێــدا دەکــرد و خۆشەویســتیی و وەفــاداریی جــەماوەری بــۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکار دەهێنا.[51] بـەڵام قاسـم یـاری بـەئاگر دەکـرد. " هەڕەشەی شەقام" شتێکی لەو ئانارشییە سیاسییە زیـاتر بـوو کەبـەربینی گرتبوو.[52]

تا 1960 حشع 25000 ئەنـدامی دڵسـۆزی هـەبوو، ئەنـدامانی خـاوەن ئەزموون بـەژمارە کـەمتر بـوون. لەکاتێکـدا حشـع نفـووز و ئەندامـەکانی لەگەشەکردندابوون، ترسی لەدڵی زۆرکەسـدا چانـد( خـاوەن زەوییـەکان ). کەئەم نفـووزە بـەکاربهێنرێ وەک سیاسـەتگەلێکی رادیکـاڵیی بـۆ ئـەوەی سامانەکان دابەشبکرێنەوە. لەئەنجامی پشتبەسـتن بـەبازووی حشـع، رژێـم کەبەڵێنی خۆتەرخانکردنی دابوو بۆ مەسەلەی نیشـتمانیی. ئێسـتا حـوکمی کۆمەڵگەیەکی چەند جەمسەریی دەکات.

هەنــدێجار وا دەردەکــەوت، لــەبواری یاسـا و سیسـتەمدا. عێـراق بـەرەو هەرەسهێنانێکی سەرلەبەر بچێ. یاخیبوونەکەی موسڵ لەبەهاری 1959 دا پێوەنــدیی بــەم دۆخــەوە هــەبــوو. هۆکــاری ئــەم هەڵگەڕانەوەیــە، خۆپیشـاندانێکی گـەورەی دۆسـت و لایـەنگرانی حشـع بـوو لـەباکووری موســڵدا. نزیکــەی 250,000 لەلایــەنگرانی شــیوعییەکان رژانەســەر شەقامەکان، ناڕاستەوخۆ پلانـی کوودەتایـەکیان هەڵوەشـاندەوە، کەیـەکێک لەفەرماندەکانی بنکەیەکی سـەربازیی لەموسـڵ لەگـەڵ دوو ئەفسـەری تـردا لەبزوتنــەوەی ئەفســەرانی ئــازادیخواز بــەنیاز بــوون بیکــەن. ئــەم ئەفسەرە پانعەرەبیستانە بەکۆمـەکی بەشـێکی زۆر لەلایـەنگرانیان لەگـەڵ هەنـدێ سـەرۆک عەشـیرەتی کـوردیی ئـەم دەڤـەرە( بەکۆمـەکی مـاددیی لەکۆماری عەرەبیی یەکگرتووەوە) بڕیاری ئەو کوودەتایەیان دا. گـەمارۆی هەنــدێ لەســەرکردە پایەبــەرزەکانی شــیوعییەکانیان دا و دەســتیان بـەیاخیبوون کـرد. ئـەم هەڵمەتانـە تونـدوتیژیی لـەنێوان شـیوعییەکان و

پانعەرەبیستەکاندا بەخۆوە بینی. هەر زوو تەشەنەی کرلو نیمچەشەڕێک بەرپابوو. قاسم بڕیاری ناردنی هێزی ئاسمانیی دا، بۆ بۆمبارانی بارەگا سەرەکییەکانی ئەم یاخیبووانە لەم موسڵ. بەسەختیی یەکێک لەسەرکردەکانی ئەم کوودەتاچییانە بریندار بوو. پاش ماوەیەکی کورت، یاخیبوونەکەش شکستی هێنا.

دواتر و لەهەمان ساڵدا، لەشاری کەرکوک، حشع رێپێوانێکی گەورەی تری رێکخست، بۆ بیرەوەریی یەکەمین ساڵرۆژی شۆڕشەکە. دووبارە ئەم نمایشەی شیوعییەکان رووبەڕووبوونەوەی توندوتیژی لێکەوتەوە. ئەمجارە لەنێوان لایەنگرانی شیوعییەکان لەکوردەکان و تورکمانەکاندا ( لەرووی ئێسنیکییەوە تورکن ) بوو. کوژراوەکان کەمتر بوون لەچاو ئەوەی موسڵدا( 30 کوژراو و لەسەروو 100 کەسێکیشەوە بریندار بوون ). بەڵام دڵەڕاوکێ پەیدابوو. قاسم رووبەڕووی بڕیارێکی ستراتیژی قورس بووەوە؛ لەسەرێکەوە پشتی بەتوانستی حشع بەستبوو. بۆ سازدانی خۆپیشاندانی جەماوەریی بۆ پاڵپشتییکردن لەرژێمەکەی. لەسەرێکی تریشەوە زیادەڕۆیی شیوعییەکان، ریزی ئۆپۆزیسیۆنی دژی رژێم بەهێزتر کرد. قاسم بۆ توندوتۆڵکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی، هەستا بەلێدانی شیوعییەکان. لەدوای رووداوەکەی کەرکوک، چەندین شیوعیی تاوانبارکران بەهاندانی توندوتیژیی و دەستبەسەر کران. لەدادگای سەربازییدا دادگاییکران و بڕیاری مەرگیان بەسەردا سەپێنرا. میدیای شیوعییەکان بێدەنگ کرا، ئەو شیوعییانەی لەپۆستە گرنگەکاندا بوون لەناو رژێمدا، وردەوردە بژارکران. ئەوەندەی دەسەڵاتەکەی قاسم مایەوە، حشع بەتەواوی ملکەچکرا، لەگەڵ ئەمەشدا، هێشتا هەر لایەنگرییان لەرژێم دەکرد.[53]

وێڕای ئەو ئاژاوانەی لەلایەن سەرەڕۆییەکانی حشع یەوە دروست دەکرا، سەقامگیریی رژێمەکەی قاسم لەلایەن پانعەرەبیستەکانیشەوە لەژێر هەڕەشەدا بوو. تا ساڵی 1960، سێ جار هەوڵ بۆ ژێروژوورکردنی رژێم درا- هەوڵێک بۆ کوودەتا لەدیسەمبەری 1958 دا، هەڵگەڕانەوەکەی موسڵ لەبەهاری 1959 و هەولی تیرۆرکردنی قاسم لەئۆکتۆبەری 1959دا لەلایەن بەعسەوە. ئەمەی دواییان، زۆر بەلاوازیی پلانی جێبەجێکردنەکەی داڕێژرابوو، جێگەی سەرنجە، کەبۆیەکەمین جار، سەدام حوسێنی تێدا

دەربکەوێ( وەک بەشداربوویەکی هەوڵەکە) و جێبەنجەی بەشانۆی سیاسییەوە دەربکەوێ.
ئەو راکردنە پڕ لە" قارەمانێتییە"ی سەدام پێی هەڵسا لەدەستبەسەربوونییەوە، بووە کرۆکی ئەو هەموو کتێبە ڕێگەپێدراوانەی کەژیاننامەی سەدامیان دەگێڕایەوە. چیرۆکی فەرمیی رووداوەکان، وەک تۆمار کراوە لەبایۆگرافییەکەی خۆیدا( رۆژە دریژەکان)، وا دەگێڕێتەوە چۆن سەدام پێکراوەو گوللەیەکی لەلاقی خۆی بەگوێزان دەرکردووەو لەرووباری فورات بە مەلە پەڕیوەتەوە( رووەو سوریا رۆیشتووە). دواتر قۆناغی کۆتایی بەگەشتێکی حەوت رۆژیی بەئەسپسواریی لەبیابانی سوریاوە بەئەنجام گەیاندووە. پێدەچێت، بەهاتنەوەی لەسوریاوە وەک پاڵەوان پێشوازیی لێکرابێت لەلایەن ئەندامانی حیزبی بەعسەوە.

## حیزبی بەعس دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێ

لەسەروبەندی روخاندنی رژێمی پادشایەتییدا لەساڵی 1958 دا، حیزبی بەعس هێزێکی بچووک بوو لەناو سیاسەتی عێراقییدا. بۆ نموونە لەساڵی 1956 دا لقی عێراقی حیزبی بەعس، بە 300 کەسەوە شانازیی دەکرد. لەساڵی یەکەمی کۆمارییدا لەژێر حوکمی قاسمدا، ئەندامگیریی پەرەی سەند و بوون بە نزیکەی 2000 لایەنگری "رێکخراو" و جەماوەرێکی 10000 کەسیی پاڵپشتیی دەکرن.[54] ئەم هێزە بچووکە بەهێزی خاراو و یەکدەستی حشع بەراورد نەدەکرا. دەتوانرێ بگوترێ لەو کاتەدا حشع زۆرتر لەیەک ملیۆن لایەنگری هەبوو. حشع لەو سەردەمەدا، کۆنتڕۆڵی جادەکانی بەغدادی لەمەی 1959دا بەخۆپیشاندانی پتر لەنیو ملیۆن بەشداربوو کردبوو. ئەمەش خاڵێکی پرشنگدارە لەجەماوەرییبوونی حشع دا؛ لەساڵانی دواتردا، ئەندامی نوێ، زۆر هاتە ریزی بەعسییەکانەوە. بەئەندازەی ئەو ژمارەیەی لە حشع دەتەکینەوە.
سێ فاکتەری سەرەکیی هەن لەهەڵتۆقانی حیزبی بەعسدا. لەسەر حیسابی حشع. یەکەم، وەک ئاماژەی پێدرا لەسەرەوە، دوودڵیی قاسم لەمەڕ لە ئامێزگرتنی ئەو بۆچوونەی کەپێیوابوو دەبێ یەکسەر بچنە ناو کۆماری عەرەبیی یەککگرتووەوە، ئەمەش مۆبەلایزکردن و پاڵپشتیی بۆ

عەرەبە ناسیۆنالیستەکان زۆرتر کرد. دووەم، کاری تێکدەرانەو پڕ لەتوندوتیژیی حشع لەموسڵ و کەرکوک، هانی زۆرکەسی دا، بچن بەلای هەر هێزێکی سیاسیی تربا کەدژی نفووزی شیوعییەکان بێت. سێیەم سەرەڕای هەوڵی سەرنەگرتووی بەعس بۆ تیرۆرکردنی قاسم لە 1959 دا، وەک نوکتەی لێهات، بەلام هەر دوای رووداوەکە، جێگەوڕێگەی بەعس لەچاوی زۆرکەسدا بەرز بووەوە.

رژێم 57 کەسی لەناسیۆنالیستە عەرەبەکان"دوژمنانی دەوڵەت" کۆکردەوە( زۆربەیان ئەندامی حیزب بوون ) و دایانی بەدادگای گەل، بەدادگاییکردنێکی سەرپێیانەو فۆرمییانە. مەبەست لەم هەنگاوە، ئامادەکردنی سەکۆیەکی جەماوەریی بوو بۆ سووکایەتییکردن و تۆقاندن، بەرامبەر هەموو ئەوانەی کەدژایەتی رژێم دەکەن. بۆ ئەم مەبەستە، دادگاییکردنەکەیان، بەسەرجەم جیهانی عەرەبدا راستەوخۆ پەخشکرا. ئەم تاکتیکە لەسەری رژێمدا شکایەوە، تاوانبارەکان هیچیان لەهەڵوێستی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، بەپێچەوانەوە هەلەکەیان قۆستەوەو ئازایانە هێرشیان کردەسەر رژێمو بەدرێغییکردن لەمەسەلەی عەرەبیی تاوانباریانکرد. هەروەک ئەبوریش دەڵی" باشترین ساتەکانی حیزبی بەعس بوون."[55] سەرئەنجام 17 یان سزای لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو، بەسەدام حوسێنیشەوە.

زنجیرەی هەوڵە شکستخواردووەکان بۆ گۆڕینی رژێم، لەلایەن پانعەرەبیستەکانەوە، بوو بەرێگر لەهەمبەر مەسەلەی عەرەبییدا، بەلام کاتیی بوو، حیزبی بەعس خۆی کۆکردەوەو لەسەرەتای شەستەکاندا، وزەی خۆی لەسەر پتەوکردنی رێکخستنەکانی حیزب و تاقیکردنەوەی توانای خۆیان بۆ مۆبەلایزی خەڵک لەسەر جادە بۆ بەرەنگاربوونەوەی حشع سازدا . یەکێ لەهەڵە کوشندەکانی حشع، بێتوانایییان بوو لەدزەکردن و سووسەکردنە Infiltrate ناو هێزە چەکدارەکانەوە. لەم ئاقارەدا حیزبی بەعس زۆر کاریگەرتر بوو.

لە1962 دا، سێکرێتێری حیزب عەلی سالح ئەلسەعدی، بیرۆی سەربازیی حیزبی بەعسی دامەزراند، بەمەبەستی سەربازگیریی ئەو ئەندامانەی ناو دەستەی ئەفسەران بۆ خزمەتکردن بەمەسەلەکە. کاریگەریی ئەم هەنگاوانە بەڕوونی لە 1963 دا دەرکەوت، کاتێ هاوپەیمانییەک

لــەچالاكوانانی ســـیقیلی بـــەعس و ئەفســـەرە بەعســـییەكانی ســـوپا، لـــەژێروژووركردنی رژێمـــی قاســـمدا ســـەركەوتووبوون. لەكاتێكـــدا یەكە سەربازییەكانی ژێر دەست ئەفسەرە بەعسییەكان ئابلۆقەی وەزارەتـی بەرگرییان دا، لایەنگرانی پڕچەكی حیزبی بەعس چوونەسەر جادەكان، بۆ خاڵییكردنەوەی هەر هەڕەشەیەكی چاوەڕوانكراو لـەمۆبالیزەكردنی خـەڵك لەلایەن حشع ەوە. پاش دوو رۆژ شەڕی قـورس و دەسـتەویەخە لـەدەوری وەزارەتی بەرگریی، یاخیبووەكان، هێڵەكانی بـەرگرییان بەزانـد، قاسـمیان دەستگیركردو گوللەبارانیان كرد، پاش سـەركەوتنی ئـەم كوودەتایـە، ئـەم لێشاوە لـە خـەڵكی سیقیل، بـوون بـەبڕبڕەی پشـتی هێزێكـی میلیشـیایی نیمچەسەربازیی- گاردی نەتەوەیی{ حەرەس قەومیی} – كەجێگـەی هێـزی بەرگریی میللییەكەی قاسمی گرتەوە. رژێمی قاسـم لـەژێر رێژنـەی گوللـەدا لـــەدایك بـــوو. بەهـــەمان چارەنووســـیش بـــەلاوەگێڕ بـــوو. بـــۆ جەختكردنەوە لەمەرگی قاسم، كوودەتاچییەكان چەندین وێنـەی بێگیـانی " سەركردەی تەنها" یان لەرێی تەلەفزیۆنی نیشتمانیی عێراقەوە پەخشكرد.

## بەعس لەدەسەڵاتدا

بۆ حوكمكردنی رژێمێكی نوێ، كوودەتاچییـەكان، ئەنجومـەنی نیشـتمانیی سەركردایەتی شۆڕشیان( NCRC ) دامەزرانـد، لەلایـەن ژەنـەراڵ عـارفی تازە ئازادكراوەوە بەڕێوە دەبرا. حیزبی بەعس 16 كورسیی لـەكۆی 18 كورسـیی ئەنجوومەنەكـەو 12 پۆسـت لـەكۆی 21 پۆسـتی كابینـەی حكومەتی بەركەوت- بەسەرۆك وەزیرانیشەوە، كـە بـەر ئەحمـەد حەسـەن ئەلبەكر كەوت.[56] ئەم حكومەتە بەتەواویی حیزبی بەعس بەسەریدا زاڵبوو- دەسەڵات بەشێوەیەكی یەكسان لەنێوان هەردوو باڵی سیقیل و سـەربازیی حیزبی بەعسدا دابەشكرا.[57] بەڵام تەنها نـۆ مـانگی خایانـد. بـۆ حیزبـی بـەعس ئەمـە ماوەیـەكی بـاش بـوو بـۆ تەخشـانكردنی بێسـەرەوبەرەیی لەشـەقامەكانی بەغـدادا. شـەپۆلی تۆقانـدن و راوەدوونـان دەسـتپێكردو سەرانسەری پایتەختی گرتەوە. گاردی نەتەوەیی لەلوتكـەی ئـەم شـەپۆلەدا راوەستابوو. ژمارەی ئەم هێزە گەیشـتە نزیكـەی 15000 كـەس، ئـەركی پاراستنی شۆڕش خرابووە ئەستۆی، وێـرای لەرەگوڕیشـەوە هەڵتەكانـدنی

دوژمنەکانی دەوڵەت. ئەم ئەرکەش بە ئەوپەڕی رادەی توندوتیژییەوە جێبەجێکرا.
ئەو نێچیرانەی بەر ئەم شەپۆلە توندوتیژییە کەوتن. زۆربەیان لەئەندامانی حشع و ئەندامانی ئەو میلیشیایانەی کەحشع سەرپەرشتی دەکردن، چەپەکان و سەندیکا کرێکارییەکان بوون. ئەنجامەکەی خوێنرشتنێکی زۆری لێکەوتەوەو کوشتوبڕی نزیکەی 3500 کەس لەلایەنگرانی رژێمی پێشووی پێوەبوو. ئەشکەنجەدان لەم ماوەیەدا ببوو بەشتێکی زۆر ئاسایی. بەتایبەت لە قەسرلنیهایەی ناوبانگزڕاو" پالاسی کۆتایی". دواتر ئەم پالاسە بوو بەشوێنێکی ناسراو لەئەشکەنجەداندا لەسەردەمی دەسەلاتی سەددامدا.
قورسایی خرایە سەر تێکشکاندنی حشع و بنکە جەماوەرییەکەی، حیزبی بەعس لەماوەی نۆ مانگی دەسەلاتدارییەتییدا. کاتی تەواوی بۆ رۆنانی پرۆژەی سوودبەخش نەبوو. لەئەپریلی 1963دا وتوویژ لەگەڵ میسردا سەبارەت بەشێمانەی یەککگرتن، دەستپێکرد. بەلام بەهیچ شوێنێک نەگەیشت. دواتر لەجوندا هێرشێکی نوێ بۆ سەر کوردەکان دەستی پێکرد، تا رادەیەک ناوەز بوو. چونکە کوردەکان تا کۆتایی لەگەڵ رژێمی قاسمدا جەنگان، لەراستییشدا لایەنگرییان لەکوودەتاکە کرد.
ئەم هەوڵەی دوایی بۆ تێکشکاندنی بەرخۆدانی کوردیی، وێرانکردنی گوندەکانیشی گرتەوە. بەبەکارهێنانی تانک و فڕۆکەی جەنگیی. لەم پرۆسێسەدا سەدان کەسی بێتاوان کوژران. ئەم شالاوە دڕندانەیە دژی کوردەکان. بۆ مەرامی دوژمنکارانەی رژێمی بەعس و ئەو ئەفسەرانەبوو. کەلەسەردەمی رژێمی پێشوودا. لەبەر بێتواناییان بۆ تێکشکاندنی کوردەکان. تووشی بێئومێدیی بووبوون. رەوشی{کۆنتێکست} ی ئەو هێرشە لەگەڵ نموونەی هێرشەکانی سەردەم چوونیەکییان هەیە. کوردەکان، بەپانوپۆریی پلانی ئۆتۆنۆمییان بۆ باکوور دارشت. لەدیدی رژێمەوە بەدەنگەوەهاتنی داواکاریی کوردەکان، یەکپارچەیی دەوڵەت دەخاتە ژێر پرسیارەوە. بۆیە رژێم بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە پەنای بۆ زەبروزەنگ برد. بێ لەبەرچاوگرتنی ئایدێنتیتی، رژێم لەبەغداد. زنجیرەی بەکارهێنانی توندوتیژیی دژی کوردەکان بێپسانەوە درێژەی کێشا.

لـــه 1963 دا حیزبـــی بەعس توانای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی نەمابوو. ڕژێم لـەناوخۆیا شـەق ببـوو. لـەنێوان بـاڵی سۆشیالیسـتە رادیکاڵـەکان و کۆنسێرڤەتیڤە { پارێزگاران} پانعەرەبیستەکاندا کەرتببوو. ئەمەی دوایـین. لـەتبوونێکی تریشـیان تێـدابوو. لـەنێوان یـەککگرتنێکی دەسـتبەجێ لەگـەڵ میسـردا ( پـرۆ ناسـرییەکان) و ئەوانـەی مەسـەلەی یـەکێتیی عـەرەبیان لەتەوەرەی بەعسییەکانی عێراق و سـوریاوە سـەیر دەکـرد.[58] دوولـەتبوون لەنێوان باڵی سەربازیی و سیڤیلی سەر بەبەعسدا بەئاشـکرا دەرکـەوتبوو. ئەمـەش زیـاتر گەشـەی کـرد، کـاتێ گـاردی نەتـەوەیی شـوولی زیـاتری لێهەڵکێشاو کەمپەیینی تۆقاندنی بەئاستێکی بەرز گەیاند، دەرهـەق بـەتیمی سەربازیی. گاردی نەتەوەیی بەشێوەیەکی خێـرا. بـۆ سـەقامگیریی رژێمـی نوێ جێگەی مەترسیی بوون.

لەم هەراو گۆڵمەزەدا، سەرۆک عارف، مۆبەلایزی یەکە سەربازییەکانی کرد. بەتایبەت ئەوانەی دڵسۆز و جێگەی متمانـەبوون. شـوێنە سـتراتیژییەکانی بەغدادی گرت. دواتر هەڵمەتی بۆ سەر بارەگای سەرەکیی گاردی نەتەوەیی برد. لەماوەی چەند کاژێرێکدا. عارف سـەرکەوتووانە کوودەتایـەکی تـری جێبـەجێکرد. جـارێکی تـریش. شـوێنپێی هێزەچەکـدارەکانی. وەک سەرچاوەیەکی رەهای دەسەڵاتی سیاسیی لەوڵاتدا توندوتۆڵ کردەوە.

وێڕای دوورکەوتنەوە لەهەڵسوکەوتە نابەجێکانی ڕژێمـە تەمـەن کورتەکـەی بـەعس، رژێمـی عـارف هـەر لەسـەرەتاوە روونیکـردەوە کەدیمۆکراسـیی چارەسـەرێکی گونجـاو نییـە. عـارف خـۆی بـوو بەسـەرۆکی کۆمـارو بەفەرمییش سەرکردایەتیی هێزەچەکدارەکاانی لەئەسـتۆ گـرت. عـارف تـا تێداچوونی بەهۆی کەوتنەخوارەوەی هێلیکۆپتەرەکـەی لەئـەپریلی 1966دا حوکمی عێراقی وەک دیکتاتۆرێکی سەربازیی کرد.

وەک جەنگاوەرێکی دێرینی کوودەتاکەی 1958. عارف لەهـەموو ئـەوانی تـر بـۆ پارێزگـاریی لەدەسـەڵات لـەجیهانی سیاسـەتی عێراقـی شـەپڕێودا سـەرکێش و بـەرچاو رۆشـنتر بـوو. بـۆ راییکردنـی appease چەپـەکانیش، لـەجولای 1964 فـەرمانی خۆمـاڵییکردنی بانکـەکان و دامودەزگـا پیشەسـازییە سـەرەکییەکانی دەرکـرد. بـۆ هێورکردنـەوەو دڵدانەوەی placate هەستی پانعەرەبیسـتەکانیش. لەدەسـتووری 1964 دا یەکێتیی عەرەبیی وەک ئامـانجی سـەرەکیی دەوڵـەتی عێـراق جێکـەوت

کـــرا. بـــۆ لابردنــــی ڕەقیبەکانی بێئەوەی میلیشیا بەگژیانــدا بکـات و تۆڵەیان لێبسەنێتەوە( عارف گاردی تۆقێنەری نەتەوەیی هەڵوەشاندەوە). عـــارف بێپیســـانەوەو لەپشـــت پـــەردەوە دڵڕەقانـــە دوژمنـــەکانی لەڕەگەوە هەڵدەکەنی( بەتایبەت حیزبی بەعس). بۆ ئەم مەبەستەش پشتی بەپۆلیسی نهێنیی بەستبوو. یان تیرۆری سەرەگەورەکانی بەعس بکەن. یان بیانخەنــە کــونجی زیندانەکانــەوە. بــۆ خۆپاراستنیش لــەدژە کوودەتــای چاوەڕوانکراو لەناو هێزەچەکدارەکانەوە. لایەنگران و دڵسۆزانی بەعسی لەپۆستەکانیان لابرد( لەناویشیاندا بەکر. کەزیندانیی کـرا ). لەهەنگاوێکـدا کەدەنگدانەوەی سامناکی بەدواوە بوولەدەرەوەی ریزبەندییەکانی سوپا. بۆ پاراســتنی خــۆی و لەترســی ســوپاکەی خــۆی. ســوپایەکی بچــووک و دەســتەبژێری( گــاردی کۆمــاریی ) دامەزرانــد. ئەمــەش بــووە دیمــەنێکی سروشــتیی بــەردەوام. لەبــەدامودەزگاییکردنی سیاســەتی عێراقییــدا - ئــەم هێزە دەستوەشـێن و دڵسـۆزە. هەڵبژاردەیـەک بـوون لەهێزەچەکـدارەکان. بەرژەوەندییەکی تایبـەتییان لەپاراسـتنی رژێمـدا هـەبوو. بـۆ دابینکردنـی وەفاداریی. عارف پشتی بەخزم و کەسوکاری عەشیرەتەکەی بەسـت. ئـەم هێــزە لەلایــەن کۆلۆنێــڵ{ عەقیــد} ســەعید سـلێبییەوە سەرپەرشــتیی دەکرا ئەمیش هەروەک عارف سەر بەهۆزی ئەلجومەیلـەبوو. ناوچانـەکانی ئەم هۆزە سـەرچاوەی سـەرەکیی سـەربازگیریی بـوون. بـەمجۆرە گـاردی کۆماریی ناوزڕاو. لەداهێنانی سەدام حوسێن نەبوو. دواتـر هـەمان ئـەرکی لەژێر دەسەڵاتی رژێمەکەیدا دەبینی.

لەرێگەی کۆمەڵە فرتوفێڵێکی لەم چەشنەوە. عارف توانیی نیـزام بسـەپێنی لەعێراقدا. باکوور دۆخێکی نائاسایی هەبوو. سەرەڕای بەڵێندان بـەکۆتایی هێنــانی شــەڕی کوردەکــان بەشــێوەیەکی ئاشــتیی. گفتوگۆکــان لــەنێوان حکومــەت و ســەرکردەی کوردەکانــدا. مــەلا مســتەفا بـارزانیی. بـەخێرایی شکستی هێنا. شەڕێکی سەرتاسەریی لەهاوینی 1964 دا دەستپێکردەوە. هەروەک جارەکانی پێشـوو. هێزەکـانی حکومـەت بەئاسـانییەکی رێژەیـی دەیــانتوانی کــۆنترۆڵی شــارە ســەرەکییەکان بکــەن. بــەڵام هــەرگیز نەیاندەتوانی کوردەکـان لەسـەنگەرە سـەختەکانی ناوچـە شـاخاوییەکاندا دەرپەڕێنن. ئەنجامی چاوەڕوانکراو هەر بنبەست stalemate بوو.

ئەو ئارامییە رووکەشەی سەردەمی عارف کەبەسەر رەوتی رووداوەکاندا سەپێنرابوو پاش مەرگی، لەئەپریلی 1964 دا بەخێرایی بەئاسماندا چوو. ئەنجوومەنی بەرگریی نیشتمانیی کەجێی NCRC ی گرتەوە، وەک دەزگایەکی سەرەکیی حوکمڕانیی، برای ژەنەراڵی کۆچکردوو، عەبدورەحمان عارفی بەسەرۆک هەڵبژارد. دەرکەوت زۆر دەستوپێ سپییە لەچاو براکەیدا. لەقۆرغکردن و راگرتنی هێزەسیاسییەکانی عێراقدا. نەخشەیەکی ئاشتیی پێکهاتوو لە 12 خاڵ، بەکوردەکان درا بۆ کۆتاییهێنانی شەڕ لەباکووردا. ئەم پلانە لەوانەیە بەباشترین پلان دابنرێ کەبەکوردەکان درابێت، بەڵام دەستبەجێ راکێشرایەوە لەژێر گوشاری توندی ئەفسەرە سەربازییەکانی عارفدا. بۆیە تێکهەڵچوونی چەکداریی لەباکووردا درێژەی هەبوو.
لەهەوڵێکدا کەسەرتاپا شایانی ستاییشە، بۆ دوورخستنەوەی رژێم لەدیکتاتۆریی سەربازیی، عارف هەڕەشەی هەڵبژاردن و دارشتنەوەی پارلەمانی کرد. زیندانییانی سەرانی ناوداری بەعس ئازاد کران- هەنگاوێک کە سەرەنجامەکەی بەخراپ شکایەوە. لەدوای شەڕی عەرەب و ئیسرائیل لەساڵی 1967 دا، زەنگی ئاوابوونی رژێم لێدرا. لە"شەڕی شەش رۆژە" دا، ئیسرائیلییەکان هێزەکانی میسرو سوریاو ئوردنیان تێکوپێکدا بەسانایییەکی بێوێنە. ئەمەش ریسوایییەکی گەورەبوو بۆ شکۆداریی جیهانی عەرەب، بەتایبەتییش بۆ ئەو حکومەتە سەربازییانەی کەزۆرێک لەولاتەکانی ناوچەکەیان لەپەنجاکاندا بەڕێوە دەبرد.
سەرکەوتنی ئیسرائیلییەکان ئەوەندە خێرا بوو، هێزەکانی عێراق چانسی بەشدارییکردنیان لەم شەڕەدا بەرنەکەوت. کەچیی رژێمی عارف باجی ئەم تێکشکاندنەی عەرەبەکانی دایەوە. چەند مانگ دوای شەڕەکە، ژاوەژاو و پشێویی شەقامەکانی بەغدای تەنییەوە. لەگەرمەی رووداوەکاندا، حیزبی بەعس گیانی بەبەرداکرایەوەو هاتەوە سەر شانۆ. کاتێ کۆتایی عارف هات، شێوازێکی هێمنانەی بەخۆوەبینی، کە شتێکی باو نەبوو.
هاوپەیمانییەک لەنێوان ئەفسەرانی هەواڵگری سەربازیی، گاردی کۆماریی، فەوجی تانکی تایبەت بەگاردی کۆماریی پێکهات و باڵی سەربازیی حیزبی بەعس بارەگای تەلەفزیۆن، وەزارەتی بەرگریی و بارەگاکانی گاردی کۆمارییان لەبەغداد داگیرکرد. ژەنەراڵ حەردان ئەلتکریتیی سوپاسالاری

بەعس. داوایەکی شەخسیی بـــەڕێزەوە لـــەعارف کـــرد، کـــەوازبهێنێ و بەفرۆکە بچێ بۆ لای ژنەکەی لە لەنـــدەن. پاش چاخواردنەوەیـــەک لەگـــەڵ ژەنەراڵی ناوبراودا. عارف گوێڕایەڵی داواکە بوو.[59]
جـارێکی تـــر حیزبـی بـــەعس کەوتـــەوە رابەرایـــەتی سیاســـەت لەعێراقـــدا. ئەمجارە سەلماندی کەلابردنی زۆر سەختە.

# میراتی کۆماری عێراق

## باڵادەستی سوننە

بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لەلەلایەن سوپاسالار قاسمەوە ئامـاژەی بـــەوەدا بـــۆ یەکـــەمین جـار لـــەمێژووی عێراقـــدا. ســـەرداریی ســـوننەکان بەســـەر دامودەزگاکانی دەوڵەتدا بەرەو کزی دەڕوات. قاســم کەلـــەباوکێکی عـــەرەبی سوننەو دایکێکی کوردی شیعە بوو وێنەیـــەکی دیمـــۆگرافیی دروســـتیی بـــۆ حوکمکردنی عێراقی پـڕ لـــەئاژاوە تێـدا بـــوو. دروســـتکردنی ئەنجوومـــەنی ســــەروەریی لەســـــێ پیـــــاوی کــــورد، عـــــەرەبی شــــیعەو عـــــەرەبی سوننە کە بەشێوەیەکی یەکسان نوێنەرایەتیی بکات، ئەمـــەش ( پێیـــدەچێ) هـــەنگاوێکی ســـەرەکیی بـــووبێ بـــۆ دۆزینـــەوەی سیســـتەمێکی سیاســـیی کەبەڕاســـتیی نوێنەرایـــەتیی خـــەڵک بکـــات. لەمـــەش زیـــاتر، گرنگتـــرین هاوپـــەیمانی سیاســـیی قاســـم کـــە حشـــع- بـــوو، حیزبێـــک بـــوو جیاوازییە ئێسنیکیی و تایەفییەکانی تێپەڕاندبوو.
لەراستییشدا، حشـع بنکـە جەماوەرییەکـەی لـەناو شـیعەدا بـوو، بەتایبـەت چینـە نـــەدارەکانی شـیعە لەگەڕەکـە هەژارنشـینەکانی بەغـدادو شـیعەکانی باشوور. هەروەها کوردەکانیش توانیان سەرنجیان بەلای حیزبێکدا بچـێ، کەجـەخت لـە سـەرلەنوێ دابەشـكردنەوەی سـامان و دارایـی دەکـردەوە. هـــەروەها هەًقـــدژ t و نـــەیاری پـــرۆژەی بەرچاوتـــەنگیی و کەشوفشـــی grandiose پانعەرەبیستەکان بوون. بۆ یەکـەمین جـار لەدروسـتکردنی دەوڵـەتی عێراقـەوە. لـەژێر حـوکمی قاسـمدا. ئیلێتـی سـوننە سیسـتەمی

سیاسییان بەتەواوی قۆرغ نەکردبوو. بەڵام گرفت ئەوەبوو، دەسەڵاتی راستەقینەنە بەدەستِ ئەنجوومەنی سەروەرییەوە بوو، نە بەدەست حشع و تەنانەت بەدەست خودی قاسمیش نەبوو. لەدەیەی یەکەمی کۆمارییدا، دەسەڵاتێک کەچارەنووسی رژێمی یەکلا دەکردەوە سوپا بوو. سوپاش باسک و هێزی سوننەکان بوو. لە ماوەی دە ساڵی یەکەمدا هێزە چەکدارەکان لەگۆڕینی رژێمەکاندا خاوەنی بڕیار بوون. بەساکاریی، لەسەردەمی پاشایەتییدا دەسەڵات لەدەست ئیلیتی سیقیلەوە، گواسترایەوە بۆ دەست ئیلیتی سەربازیی لەسەردەمی کۆمارییدا. دەستبەرسەرداگرتنی دەسەڵات لەلایەن ژەنەراڵ عارفەوە، وەک پانعەرەبیستێکی سەرسەخت و " ناسیۆنالیستێکی سوننیی" دڵسۆز staunch، جەختی لەوەکردەوە، کەهێشتا عێراق لە ناوجەرگەی دەقەرە سوننییەکانەوە بەڕێوە دەبرێ.[60] لەراستییدا لەژێر چەکمەی چەندین رژێمدا، لەیەکەمین دەیەی کۆماری عێراقدا، باڵادەستیی سوننەکان بەسەر پۆستە گرنگەکانی ناو دەسەڵاتی سیاسییدا بەترۆپکی خۆی گەیشت. لەماوەی 1958-1968 دا، لەگرنگترین 38 سەرکردە سیاسییەکان، 30 کەسیان لەسوننەکان بوون،6 یان عەرەبی شیعەو، تەنها دووانیان کورد بوون.[61] لەئاستەکانی خوارەوەی حکومەت باڵادەستیی عەرەبی سوننە کەمتر بەدیار دەکەوت. بەڵام سیستەمەکە بەگشتیی بۆ نوێنەرایەتییکردنی خەڵک لەعێراقی هەمەڕەنگدا، هەرگیز لەوەپێش ئەوەندە پانوپۆڕ نەبووە.

## حوکمکردنی عێراق

یەکەمین ئەزموونی عێراق بۆ سەربەخۆییەکی راستەقینە، بەبەڵێندان دەستی پێکرد. سەرکردەیەکی گەلیی بەباکگراوندێکی ئێسنیکی تێکەڵەوە، بەبەرچاو رۆشنییەوە جەختی زۆرتر لەیەکێتیی نیشتمانیی دەکردەوە تا بە پرۆژەی تەمومژاویی یەکێتیی عەرەب دەگات. پابەندبوونی خۆیشی بۆ سارێژکردنی برینە مێژووییەکان راگەیاند. ئەو حکومەتێکی پارلەمانیی پانوپۆڕی دامەزراند، دووبارە رێگەی کارکردنی بەحیزبە سیاسییەکان دا و بەڵێنی هەڵبژاردنێکی پێشوەختیشی راگەیاند. لە 1958 دا هەلومەرجی سیاسیی بەسیمای ژمارەیەک حیزبی سیاسیی، کەلەرووی

ئایدۆلۆژییەوە میانڕۆ بوون، دەناسرایەوە. لەو حیزبانە( وەک NDP ) کەچینی ناوەڕاست رووی تێدەکردو پابەندبوونی خۆیشی بەپرۆسەی دیمۆکراسییەوە مکۆم کردەوە.
لەدەوروبەری 1963 دا، زۆربەی ئەم حیزبە سیاسییانە پووکانەوە، بەدوو رێکخراوی سەرەکیی جێگەیان گیرایەوە( حشع و حیزبی بەعس). کەسەرتاپا دوو باکگراوندی جیاوازیان هەبوو. هەرگیز پێشبڕکێی سیاسیی لەنێوانیاندا لەسندووقەکانی دەنگداندا خۆی نەبینییەوە. بەڵکوو ئەم کێبڕکێیە بەیەکدادانی دوو رێکخراوی ژێرزەمینی clandestine بوو، کە سەنگی مەحەک بۆ سەرکەوتن تێیدا بەمۆبەلایزکردنی " شەقامەکان"[62] دەپێورا. لەرووی ئایدۆلۆژییەوە هیچیان میانڕۆ نەبوون و حەزیان بەپلورالیزمی دیمۆکراسیی نەدەکرد. رژێمی قاسم ئەم حیزبانەی دروست نەکرد، بەلام ئەو زەمینەی بۆ سازکرن، کەبەشێوازێکی سیاسیی فەندەمێنتالانەو ناتۆلێرانسانە هەڵسوکەوت بکەن.
لەپشت پەردەشەوە، هێزەچەکدارەکان لەپلەکانی سەرەوەدا، دابەش بووبوون و بە قاچ کێشانەوەی یەکترەوە سەرقاڵ بوون. کارێزمایی قاسم پاڵپشتییەکی باش بوو بۆ مانەوەی، بەلام سەرئەنجام بەدەردی نەخوارد بۆ قوتاربوونی لەدەست کوودەتایەکی توندوتیژ کەسەری خۆی خوارد.
لەلایەکی ترەوە، رژێمی قاسم لەپەککخستنی ژیانی سیاسیی لەعێراقدا بەشدارییەکی بەرفراوانی کرد. دامەزراندنی دادگای گەلی{خەڵکیی} لەئۆگەستی 1958 دا، نموونەیەکی زەقی ئەو دۆخەبوو. لەسەرەتاوە دروستکرا بۆ دادگاییکردنی سەرانی رژێمی پاشایی، وەک کردنی تاوانی قەبە( هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەو گەندەڵیی رژێم ). دادگاییەکە هەر زوو بێتام کرا. کۆنترۆڵی دادگا بەتەواویی لەلایەن قاسمەوە، زامنی رزگابوون لەدوژمنە سەرەکییەکانی بەکەمترین دادپەروەرییەوە مەیسەرکرد. دادگاییکردنە رووکەشەکان، بەتایبەت بۆ فریودانی جەماوەر بەکار دەهێنران و متمانەی دادپەروەریی دادگاکانیان دۆڕاند. بەپێچەوانەوە بوون بەئامراز بەدەستی دیکتاتۆرییەوە.[63]
یەکێکی تر لە ئیشەکانی قاسم کەجێگەی گومان بوو. دامەزراندنی میلیشیایەک بوو کەلەلایەن دەوڵەتەوە کۆمەک دەکرا. هێزی نیمچەسەربازیی" هێزی بەرگریی میللیی". هەر قاسم دەسەڵاتی

بەدەستەوەگرت، دامەزرا. ئەرکی سەرەکیی ئەم هێزە، بۆ دڵسۆزیی نیشاندان بوو بەرژێم لەشەقامەکاندا. لەکاتی پێویستدا ترس و تۆقاندنی بۆ هەڵتەکاندنی چالاکیی رێکخستنە نهێنییەکانی ئۆپۆزیسیۆن و سڕینەوەیان بەکاردەهێنا. داهێنانی قاسم لەدوو بواردا. دادگای رووکەش، داپۆشراو بەماسکی دادپەروەریی، لەگەڵ میلیشیای نیمچەسەربازیی، خزمەتی بەعسیان کرد، لەئەنجامیشدا بەتوخمگەلێکی گرنگ لەژێرخانی سیاسیی حیزبی بەعسدا هاتنە ژماردن.
لەژێر سەرپەرشتیی قاسمدا، سیاسەت لەعێراقدا، تاڵیی و توندوتیژیی و مەترسیی لێکەوتەوە. لەساڵی 1958 دا، گریمانەی دروستبوونی سیستەمێکی دیمۆکراتیی و سەقامگیر لەعێراقدا رێی تێ دەچوو؛ بەڵام ئەم گریمانەیە لە 1963 دا بەبادا چوو. لەبەرامبەردا رژێم هەلومەرجی باشی بۆ پرۆڤەکردنی هێزێکی سیاسیی ( حیزبی بەعس) دابینکرد. کەهەر زوو خۆی باڵکێشکرد بەسەر تەواوی بوارەکانی ژیان لەعێراقدا. حشع و حیزبی بەعس، تێدەکۆشان بۆ دەسەڵات بەدەستەوەگرتن، ئەم خەباتەشیان، کارێکتەری سیاسیی دە ساڵی بردبوو، بۆیە هەرگیز داکۆکییان لەدیموکراسیی لیبراڵیی نەدەکرد. سەرئەنجام حیزبی بەعس زاڵبوو، بەشێکی لەبەر پەیامە ناسیۆنالیستییە عەرەبییەکەی بوو، کەسەرنجی زۆرێک لەدەستەی ئەفسەرانی راکێشا( تا ئێستاش دەروازەیە بۆ دەسەڵاتی سیاسیی). بەشێکی تریشی لەبەر ئەوەی ئەم حیزبە زۆر بێبەزەییانە مامەڵەی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆندا دەکرد.
بیرتیژیی و پراگماتیکیی ژەنەراڵ عارف، کەحوکمی عێراقی بۆ سێ ساڵ کرد(1963-1966)، توانیی بەڕووکەشیی کەمێک ئاساییش بۆ ژیانی سیاسیی لەعێراقی نغرۆ لەکەیۆس و توندوتیژییدا بگێڕێتەوە. ئەم هێمنییە مۆلەقە، تەمەنی کورت بوو. برا بێدەسەڵات و هیچ لەبارانەبووەکەی کەجێگەی گرتەوە، بەسادەیی توانای ئەم بێنەوبەردەیەو کۆنترۆڵکردنی رووداوەکانی نەبوو. هەوڵی دڵسۆزانەی عارفی دووەم بۆ لیبراڵییکردنی سیستەمی سیاسیی، کەلەو کاتەدا هێزێکی سیاسیی فەندەمێنتاڵ و نالیبراڵ بەسەریدا زاڵبوو ( وەک بەعس)، هەر لەسەرەتاوە شکستی هێنا. بەواتایەکی تر سەردەمی دیمۆکراسیی لەعێراقدا لەدێرزەمانەوە بەسەرچووە.

## بەکارهێنانی توندوتیژیی

لەدوایین ساڵەکانی رژێمی پاشایەتییدا، دەوڵەت بەکارهێنانی توندوتیژیی، کردبــووه ئــامرازی بــەداموەزگاییکردن بــۆ مامەڵــەکردن لەگــەڵ بەرهەڵســتکاراندا dissent . جێگــەی داخــە هــەر ئــەم ســتایڵی توندوتیژییەش بۆ لەگۆڕنانی پاشایەتیی لـە 1958 دا بـەگونجاو زانـرا. ئەو رووداوانەی هاوزەمان بوون لەگـەڵ کوودەتاکـەی 1958، ئاماژەیـەکی شومهێنەریان دا کە چۆن تونــدوتیژیی شـۆڕبووەتەوە بـەپانتایی بونیـادی عێراقدا. ئەو مامەڵەیەی لەگـەڵ بنەماڵـەی پاشـا کـرا (لەلایـەن ئەفسـەرانی ئازادییخوازەوە نزیک بەتەواویان پاککرانەوە). هێشتا نەرم ونیـانتر بـوو لەوەی دەرهەق بەجێنشینی پاشا، عەبدولئیلاە و ئێسکگران نـوری سـەعید وەک سیمبۆڵی حوکمی بریتانییەکان کرا. عەبـدولئیلاە توورڕدرایـە بـەردەم خـەڵک و پارچەپارچـەیان کـرد، بـەشـێکی زۆر لەئەندامـەکانی لەشـی بـۆ چەندین رۆژ لەبەردەم وەزارەتی بەرگرییدا هەڵواسـرا. مامەڵـەکردن لەگـەڵ عەبدولئیلاهـدا لەلایـەن خەڵکـەوە، هاوشـێوەی ئـەو مامەڵـە دڕندانەیـەبوو کەلەگــەڵ نــوری ســەعیدا کــرا. نــوری ســەعید لەیەکــەم کاردانــەوەی تۆڵەسەندوە دەرباز بوو، بەڵام رۆژی دواتر بــە جلوبـەرگی ژنانــەوە گیـرا کەدەیویست قوتار بێـت. بـۆ شـەوەکەی کـوژراو سـنگەوبەرد نـرا. رۆژی دواتــر لاشــەکەی لەلایــەن خەڵکــەوە هەڵدرایــەوەو بەشــەقامەکاندا راکــێش راکێش دەکرا، چەندین جار بەئۆتۆمۆبیل بەسەریدا دەهاتن و دەچوون، تا وایلێهات لاشەکەی بـوو بـە" گۆشـتی هـەنجنکراوی عێراقیـی"{ قییمـە}.[64] دواتر لاشەکەیان پارچەپارچەکردو کوتە گۆشتەکانی بەدەسـت جـەماوەری سەرکەوتووەوە بڵند دەکرانەوە.[65]

لەرۆژەکانی دوای کوودەتای 1958، فۆرمێکی نـوێ لـەدەربڕینی سیاسـیی جەماوەریی هاتە ئاراوە. کۆنترۆڵکردنی شەقام ئـامرازێکی هەسـتیار بـوو بۆ حوکمڕانیی و قەرەباڵغیی دروسـتکردن" ئاشـووبچییەکان mob" بـوو بەسەرەکییترین ئەکتەری سیاسیی . ئەمەجۆرێک لەفۆرمی بەشـدارییکردنی جـەماوەریی بـوو، کـەگومان هـەڵناگرێ زۆر خولیـای تونـدوتیژیی بـوو. "خۆپیشاندان"ە مەزنەکانی حشع کـەمۆرکیان بەسـاڵی یەکـەمی حـوکمڕانی قاسمەوە دیاربوو وردەوردە بەرەو نوشوست دەچوون و دەبـوون بـەکاری

توندوتیژیی هەڕەمەکیی لێرەولەوێ. یەکسەر پاش هەڵگەڕانەوەکەی موسڵ، ساڵی 1959، هێزی شیوعییەکان بەلەسەبوون و وروژان لەموسڵداو سەدان پانعەرەبیستیان سەربڕیی، جگە لەوەی چەندین خێزانی دەوڵەمەندیش بەرکەوتن. دادگای ساختەیان mock چێکرد، سەرپێیانە خەڵکیان دادگایی دەکرد و 17 کەسیان لەسێدارەدا.
ڕووداوگەلی هاوچەشن لەکەرکوک لەهەمان ساڵدا ئاماژەی بەوەدەکرد کە حشع هەرچییەک بوویێت، بەڵام بۆ ئاڵۆگۆڕی سیاسیی هێزێکی ئاشتییخواز نەبووە. لەڕاستییدا، حشع زۆر بەوردیی کۆمەکی بەبارهێنانی کەشێکی سیاسیی ئاشووباویی و توندوتیژیی کرد کەبەعس تێیدا گەشەی کرد. بەهەرحاڵ بەعس هەمیشە چەلەنگترو شارەزاتربووە لەبەکارهێنانی توندوتیژییدا. ئەمەش لەماوەیەکی کورتی حوکمڕانیی ئەو حیزبەلەدا روونبووەوە. ئەو شەپۆلە لە تۆقاندن کە بەغدادی گرتەوە لە نۆمانگ دەسەلاتی حیزبی بەعسدا. لەڕاستییدا کەمپەینێک بوو کەم تازۆر بەباشیی داڕێژرابوو بۆ لەناوبردنی کەسە ناودارو چالاکەکانی حشع و سەرپەڕاندنی decapitating ئەو شیوعییانەی سەرپەرشتیی ڕێکخراوە سیڤیلییەکانیان دەکرد.[66]
چارەنووسی سێکریتێری یەکەمی حشع- حوسێن ئەحمەد ئەلرازیی زۆر بەشێوەیەکی دڕندانە تێداچوو. پاش دەستگیرکردنی، ئەلرازیی بۆ ماوەی 15 ڕۆژ لەکۆشکی کۆتایی بەر لەکوشتنی ئەشکەنجەدرا.[67] حشع، ژمارەی ئەو ئەندامانەی خۆی کەتێداچوون بەپتر لە 5000 کەس دەقەبلێنێ. ئەمە لەماوەی 9 مانگدا ژمارەیەکی کەم نییە. ئەمەش بەڵگەیەکی بەردەوامە لەسەر توانستی بەعس بۆ بەکارهێنانی توندوتیژیی بەشێوەیەکی کاریگەر. بەپێچەوانەی ئەو توندوتیژییانەی لەئەنجامی کوڕوکۆبوونەوە جەماوەرییەکانی حشع دەکەوتەوە، ئەمەی بەعس، مەبەستی لەژێر سەردابوو، بۆ تۆقاندن و سڕینەوەی یەکجاریی ڕەقیبە سیاسییە بەهێز وسەرسەختەکانی بوو.
ئەم توانست و جەختکردنەوەیە لەسەر توندوتیژیی بوو کە حیزبی بەعسی لە حشع جوێ دەکردەوە. هاوکات وایکرد کە هێزێکی سیاسیی خاوەن ژمارەیەکی کەم، بەسەر یەکەمین جولانەوەی سیاسیی پانوپۆڕی عێراقدا زاڵ ببێ. دەرکەوتنی بەعس وەک هێزێکی سیاسیی

گـــــــەورە لەعێراقـــــــدا نیشاندەری ئەو بارودۆخەی سیاسییەی عێراق بوو. عێراق هەروەک بەڕێوەبەری سی ئـای ئـەی Allen Dulles .CIA لەســالّی 1959 دا رایگەیانـــدبوو کـــە" پڕمەترســـییدارترین شـــوێنی جیهانە".[68]

بەدڵنیاییـــەو ەدەرهـــەق بـــەکوردەکان. مەترســـییدارترین شـــوێن بـــووە. لەڕاستییدا دەیەی یەکەم لەکۆماری عێراقـدا. گـەواهیی لەسـەر پەرەسـەندنی خــەباتی کوردەکـــان دژی دەســـەڵاتی ســـێنترالّ بەچەنـــدین بەیەکـدادانی سەربازیی دەدات. بەشەڕی ناوخۆ دەستی پێکـردو جارجـارەش بەشـێوەی نەشــەڕ نەئاشـــتی. ئـــەم شـــەڕە تـــا 1991 درێـــژەی هـــەبوو. شـــایانی باســـە لـــەماوەی دەســـاڵدا. چـــوار رژێمـــی جیـــاواز لەســـێنترالّ لەهـــەوڵی چارەســـەرکردنی" کێشـــەی کـــورد"دا بوونـــە. لەســـەرەتاوە بـــەگفتوگۆ. سەرئەنجامیش بەتوندوتیژیی.

هەوڵەکانی قاسم بۆ گەڕان بەدوای چارەسەرییەکی ئاشتییانەدا بۆ کێشـەی کـورد بەنابـەدڵیی half-hearted پەرۆشـیی پێوەدیـاربوو. بـەڵام ئـەم هەوڵانە لەسێپتەمبەری 1961 دا بەبنبەست گەیشـت. پێوەنـدیی سیاسـیی نێوان رێبەری کوردەکان مـەلا مسـتەفا بـارازنیی و رژێـم کۆتـایی پێهـات. کـاتێ قاسـم فـەرمانی بۆمبـارانکردنی مـاڵی بـارزانیی لەگونـدی بـارزان دەرکرد. شەڕێکی سەرتاسەریی هەڵگیرسا و تا لەناوچوونی رژێمـی قاسـم درێژەی هەبوو. زیـانی کوردەکـان. 500 گونـد بۆمبـاران کـران. سـەدان کوژراو. نزیکەی 80000 کەسیش لەشـوێنەکانی خۆیـان راگـوێزران.[69]

بێتوانایی رژێمـی قاسـم لـەتۆمارکردنی سـەرکەوتنێکی سـەربازیی بەسـەر کوردەکاندا. لەکۆتاییدا بوو بەفاکتەرێکی سەرەکیی بۆ ژێروژوورکردنی. بەعسییەکان زۆرترین کۆششی گونجاویـان بـۆ سـەرکوتکردنی بـەرگریی کوردەکـان لـەرێی هێـزەوە بەرێخسـت. دوای کوشـتوبڕی هـەزاران کـەس لەشیوعییەکان هـەلیان بـۆ رەخسـا بەدەسـتپێکردنی گـەورەترین هەڵمـەتی ســـــــەربازیی دژی هێزەکـــــــانی کـــــــورد لەئـــــــەپریلی 1963 دا. هەڵمەتەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان و بێ هەڵاواردن گوندە کوردنشـینەکانی گرتەوە. لەئاسمان و زەوییەوە بەهۆی تۆپخانەی قورسەوە دادەبێژران ئـەو لادێیانـەی دەکەوتنـە ژێـر دەسـەڵاتی حکومـەتی سـێنتراڵەوە بەبولـدۆزەر تەخت دەکران. هەروەها ناوچە ستراتیژییەکان لەباکووری عێراق"تـەعریب"

کران. بەرگریی کوردیی لەوەلآم بەم هێرشە درندانەیەدا onslaught نەک هەر خاوخلیچک نەبووەوە بەڵکوو توندوتۆڵتر بووەوە. دواتر هەردوو عارفی برا بەشوێن چارەسەرییەکی سەربازیی فێڵبازانەوە بوون. بەڵام لە 1966 دا کوردەکان کۆمەکی سەربازیی بێشوماریان لەئێرانەوە پێدەگەیشت. زۆر جوامێرانەو سەرسەختانە لەناوچە هەڵەتاوییەکانی terrain خۆیاندا دەجەنگان. توندوتیژیی نەیتوانی چارەسەر بۆ کێشەی کوردیی بدۆزێتەوە. تەنانەت ( وەک پێدەچێ) گفتوگۆش نەیتوانی.

## یەکێتیی نیشتمانیی

گەیشتنی قاسم بەدەسەلآت، ئومێدی ئەوەی لێهەڵکرێنرا. کەسەرئەنجام بۆی هەیە عێراق ببێ بەدەوڵەتێکی یەککگرتوو لەژێر رژێمێکی دیمۆکراسییدا. ئەوانەی کۆمەکی قاسمیان دەکرد بریتیبوون لەهەندێ کەرتی گرنگی هێزە چەکدارەکان، جەماوەرییبوونی خۆی وەک تاکێک لەناو خەڵکی عێراقداو حشع وەک بەهێزترین رێکخراوی سیاسیی ئەو سەردەمەو تاکەحیزبی سیاسیی. خاوەن بەرنامەیەکی ئایدۆلۆژیی. کەتوانیبووی جیاوازییە ئێسنیکیی و تایەفییەکان تێپەڕێنێ.[70]
لەڕاستییدا هەندێ لە بەڵێنە بنەڕەتییەکان. لەبواری کۆمەلآیەتیی و ئابووریدا بەدیهێنرابوون. لەژێر رێبەرایەتیی قاسمدا هەوڵێکی ئاگایانە درا بۆ راستکردنەوەی ئەو نایەکسانییەی لەئاستی ئابووریی و لەسەردەمی رژێمی پاشایەتییدا هەبوو. پارە بۆ بواری پەروەردە دوو بەرامبەر زیاتر خەرجکرا.[71] خەرجکردن لەخۆشگوزەرانیی کۆمەلآیەتییدا بەدراماتیکیی چووەسەرەوە. هەلومەرجی کرێکاران باشتربوو.[72] لەساڵی 1958 دا یاسای چاکسازیی کشتوکاڵیی بە بەرزخوازییەوە( هەرگیز بەتەواویی جێبەجێ نەکرا ) لەدابەشکردنەوەی سەرلەنوێی زەویی و زار بەسەر جوتیارەکاندا لەسەر حیسابی خاوەن زەوییەزۆرەکان. رامابوو .
هاوکات جێگەوڕێگەی ژنان لەکۆمەڵگەدا بەرەو باشی رۆیشت لەئەنجامی چاوخشاندنەوە بەیاسای باری کەسییدا. لەوانە وەرگرتنی میراتی یەکسان بەدەر لەرەگەز. کۆتوبەند خستنە سەر رێی فرەژنیی polygamy و هەروەها دانانی 18 ساڵیی وەک کەمترین تەمەن بۆ هاوسەرگیریی.[73] ئەم

جۆره ریفۆرمانه کـه بەپێشـکەوتوو، میـانڕەو دەناسرانەوه بۆ کەمکردنەوەی ئـەو زێـدەمافیی و سـامانەزۆرەی لەدەسـت دەسـتەیەکی کـەم، لەسـەردەمی پاشـایەتییدا کۆببوونـەوە. بەپێچەوانـەوه ئەمـە ئۆپۆزیسـیۆنی دژی رژێـم لێکەوتـەوە. وەک پێشـبینییەکی شـووم، دوژمنایـەتیی دامـەزراوەی ئـاییینی لەباشـوور زەقکردەوە. ئەم دوژمنایەتییه لەدەوری دوو خـاڵ دەخولایـەوە. یەکـەمیان، ئەو ریفۆرمانەی لەرژێمی قاسمدا کـرا، جێدەسـتی شـیوعییەکانی پێوەدیـار بوو( بەتایبەتیی گۆڕینی باری کەسیی ژنان ) وەک هەڕەشەیـەک بۆسـەر ترادیسیۆنی کۆمەلایەتیی بـاو سـەیر دەکـرا؛ دووەمیـان، حشـع هـەنگاوی بەرەو گەشەکردنێکی باش هەڵهێنابوو لەرووی ئەندامگیرییـەوە نـەک هـەر لەگەڕەکە هەژارنشینەکانی بەغداد بەڵکوو تا بەشاره پیرۆزەکـانی نەجـەف و کەربەلاش دەگات.

ئەندامگیریی حشع ی بێباوەڕ{ئەیسییەست}بەسەرکەوتوویی لەناو جەرگـەی شـیعەکاندا بەیەکداهەڵشـاخانێکی گاڵتـەئامێز نـەبوو لەگـەڵ دامـەزراوه ئاییینیـەکانی باشـووری ولاتـدا. سـەرچاوەی ئـەم بەربەرەکانییـه رێکخـراوه دژ بەگەشـەکردنی کۆمـۆنیزم دەگەڕێتـەوه بـۆ کۆتایی پەنجاکانی سەدەی رابردوو، کاتێ جەماعەتولوعولـەما(بـە وشـەیی، کۆمەڵەی زانایان) دروسـتبوو بـۆ بردنەسـەری هۆشـیاریی ئـاییینی لـەناو کۆمیونیتی شیعەدا دژ بەبێباوەڕیی{ ئەیسـییەزم} لەچەشـنی ( کۆمـۆنیزم). ئەم گرووپه هەر بەبلاوکردنەوەی بەربلاوی ئەلدەعوەی ( گورزی رۆشنایی) وەرزییەوه نەوەستان، بەڵکوو بزوتنەوەی ئەلـدەعوەی نهێنییشـیان(هەنـدێ جار توندوتیژ بوون) راگەیاند.

دامـەزراوەی ئـاییینی باشـوور لـەژیانی سیاسـیی عێراقـدا لەشۆڕشـەکەی 1920 ەوه دژی بریتانییەکان هیچ رۆڵێکی ئەوتۆی نەبینی. ئەمـە لـەدوای 1958 ەوه گـۆڕا. "بێبـاوەڕانی کۆمـۆنیزم" ی رژێمەکـەی قاسـم دواتـر شیرەشـــــــیری strident پانعـــــــــــــەرەبیزم و سوننه نەتەوەپەرسته کەفوکوڵدارەکان"جینگـۆیزمی jingoism سـوننە"ی بەعس و رژێمەکانی عارف، بۆ بەرزبوونەوەی دەنگی ناڕەزایەتیی رابەره ئاییینییەکانی شیعه بەشێوەیەکی رێکخراو و راشکاو هاندەربوون.[74]

راســـــانی ئـــــایینیی بارگـــــاوییکراو بەسیاســــەت و توانـــــای لــەخراپترکردنی exacerbate دابەشــبوونە تایەفییەکانــدا. یــەکێک لەپڕمەترســییدارترین میــرات بــوو لەدەیــەی یەکــەمی کۆمــاری عێراقــدا. پێشــبڕکێیەک لــەنێوان رژێمــە ســێکیولارەکان و دامــەزراوەی ئــایینیی شیعەدا بــۆ راکێشــانی ســەرنجی "جــەماوەر" ی شــیعە دەســتیپێکرد کــەتا ئەمڕۆش درێژەی هەیە.

ســەرەنجام، وا مەزەنــدەکرا. گــەورەترین کۆســپ لەبــەردەم تێڕوانینێکــی یەکگرتووانە بۆ دروستکردنی یەکێتیی نیشــتمانیی و ئایــدێنتیتی، کێشــەی کوردەکانــە لــەباکووردا. لــە 1961 بــەدواوە ئومێــدی بەیەکــەوە ژیــانێکی سەرکەوتووانەو ئاشتییانە لەنێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا تا دەهــات کــەمتر دەبــووەوە. یــەکێک لەگرفتــە ســەرەکییەکان، بەنێونەتــەوەییبوونی خەباتی کوردەکان بوو لەدژی حکومەتی سێنترال. لە 1961 دا تێکۆشانی کوردەکــان دژی رژێمــی قاســم لــەڕووی مــاددیی و ســەربازییەوە لەلایــەن ئەمێریکاوە پشتیوانیی دەکــرا. وێــڕای ئیسـرائیلیش؛ لــەدوای 1963 ەوە ئێــران بــوو بەســەرچاوەی ســەرەکیی چــەکوچۆڵی ســەربازیی و کۆمــەکی دارایی.

شێوازێکی نوێ هاتەکایــەوە، کوردەکــان دەیانویســت هاوپــەیمانیی لەگــەڵ هێزە دەرەکییەکاندا بکەن بۆ ئەوەی ئۆتۆنۆمی دەستەبەر بکەن. لەکاتێکــدا هێــزە دەرەکییــەکان زێتــر مەبەســتیان بــەکارهێنانی کــورد بــوو. وەک سوپایەکی بریکار surrogate بۆ لاوازکردن و بنکۆڵکردنی رژێمــەکانی نێوەنــد. گرنگیــی ئــەم دەســتێوەردانە دەرەکییانــە لــەکاروباری نــاوخۆی عێراقدا، بووە هۆی ئــەوەی کەرێگــەچارەی ســەربازیی بــۆ کێشــەی کــورد ئەستەم و سەخت بێ.

شــــەڕکردن لەناوچەشـــاخاوییەکانداو وەرگرتنـــی کۆمـــەکی مـــاددیی لەهێزەدەرەکییەکانــەوە. وایکردبــوو کوردەکــان لەلایــەن هێزەچەکــدارەکانی عێراقەوە بەتەواویی نەبەزێنرێن، بــەمجۆرە کوردەکــان چەنــد پاڵنــەرێکیان هەبوو بۆ یەکدەستیی لــەداواکردنی ئۆتۆنۆمییــدا. ئــەم جــۆرە ئۆتۆنۆمییــە جێگــەی پەژراننــدن نــەبوو، لەلایــەن هــەردوو ســوپای عێــراق و ئــەو رژێمــە پانعەرەبیســتە یــەک لــەدوای یەکانــەی حــوکمی عێراقیــان دوای رووخــانی قاســم بەدەســتەوەگرت. وێــڕای ئــەوەش ناوبــەناو شــەڕی

دوژمنکارانـــــــــــەی سەرتاسـەریی هەڵدەگیرسـا. دەرئـەنجام هـەر بەبنبەست گەیشتن بوو.
ڕێنیسانسی شیعەگەرایی{ shi'ism} سیاسـیی و زۆرتـر گرژبوونـەوەی کێشەی ئێسنیکیی ( کورد-عەرەب) هێما دیارەکانی ئەو ئەرکە سەختانەبوو کەرووبەڕووی پێکەوەلکانـدنی پارچـە جیاوازەکـانی عێـراق لەقەوارەیـەکی یەکگرتوودا دەبووەوە. لەناواخندا زۆر روون بوو، کـە عێـراق نەتەوەیـەک نییـــە لەناوخۆیـــدا لەتەباییـــدا بێـــت. یـــەکێک لەبەڵگـــەکانی ئـــەم ناتەباییە لەراپەڕینە شکستخواردووەکەی 1959 ی موسڵەوە بەدەرکـەوت. ئەو وروژانەی شیوعییەکان رابەرایـەتییان دەکـرد دژی پانعەرەبیسـتەکان لەموسڵ، بووە هۆی هەرەسهێنانی یاسـاو رێسـا لەشـاردا. دواتـر بـەڕیز. سـندووقەکەی پانـدۆرا{ ژنێکـی جادووگـەرە لەئەفسـانەی گریکـدا} کرایـەوە کـە پـڕی بـوو لەرقوکینـەی گـەنیوfestering. پـەنگخواردوو و وەرسـبوونێکی بێئـەژمار، کـە شـار لەبێسـەرەوبەرەیی و توندوتیژییـدا شەپۆلی دەدا.
بـۆ چـوار شـەووڕۆژ کوردەکـان و ئێزیدیـەکان لەبەرامبـەر عەرەبەکانـدا راوەسـتابوون: ئاشـــوورییەکان و ئەرمەنییـــە کریســـتیانییەکان دژی عەرەبـە موسـڵمانەکان: عەشـیرەتی ئـەلبوموتیات دژی عەشـیرەتی شـەمەر: عەشیرەتی گەرگەڕیی کوردەکان دژی ئەلبوموتیاتی عەرەبیی: جوتیارەکـانی موســـڵ دژی خـــاوەن زەوییـــەکان: ســـەربازەکانی تیپـــی پێـــنج دژی ئەفسەرەکانیان: خەڵکی دەوروبەری شـار دژی نـاو شـارەکە: رەشـوڕووتی plebian عـــــەرەب لەگــــەڕەکی مـــــەکاوی و وادی حیجـــــار دژی عەرەبە ئاریستۆکراتەکانی گەڕەکی دەواسە: هـەروەها لـەناو گـەڕەکی بـاب ئەلبیزدا بنەماڵەی رەجەبۆ دژی نەیارە ترادیسیۆنەکانی خۆیـان لـەئاغاوات راست بوونەوە.[75]
رووداوەکـــانی موســـڵ لەبنەڕەتـــدا، شـــەڕی نـــاوخۆ بـــوو بەشـــێوەیەکی بچـــووکراوەmicrocosm هـــــەروەها" روونتـــــرین بەڵگـــــەبوو کەدابەشبوونەکان چۆن عێراقی داهێزراندووە."[76] جگەلـەوەی نزیکـەی 40 ساڵ بەیەکەوە مێژوویەکی هاوبەشـیان هـەبوو، چەنـدین جـۆر لەئێسـنیک، ئایین و عەشیرەت کەژێرخانی کۆمەڵایـەتیی پـڕ لەدەردەسـەریی عێراقیـان

پێک دەهێنا. هەرگیز لەوە نزیک نەبوونەوە کە هەستێکی هاوبەش بۆ ئایدێنتیتیی نیشتمانیی پێک بهێنن.

## بەرەنجام

لەدەوڵەتی عێراقدا دەیەی 1958 بۆ-1968 دەیەی خەستوخۆڵترین ئاشووب و توندوتیژیی بووە. بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی پێشووی رژێمی پاشایەتییدا کەوەک دەریایەک لەئارامیی و سەقامگیریی بەدەردەکەوت. پاشایی شکستی هێنا لەدروستکردنی ئایدێنتیتییەکی گشتگیردا بۆ دەوڵەت، ئایدێنتیتییەک عێراقییەکان بەهەموو جیاوازییەکیانەوە لەیەکتر بەشداریی تێدا بکەن. هەنووکە پاش دەیەیەک لەدەسەلاتی کۆماریی، پێکەوەنانی ئەم ئایدێنتیتییە دەستەجەمعیە collective، لەهەموو کاتێک زۆرتر دوورە کە جێکەوت بێت.
لەزۆر لاوە، کۆماریی هەنگاوی بۆ دواوە Regression ناوە لەجیاتی بۆ پێشەوەی بنێ. لەبەر ئەوەی باڵە رکابەرەکان بەزەبروزەنگ لەهەوڵی بەدەستخستنی ماشێنی فەرمانڕەوایی دەوڵەتدا بوون. باشترینیان ئەوانەبوون کەتێڕوانینی خۆیان لەمەڕ ئایدێنتیتی عێراق بەسەر تەواوی خەڵکییدا بسەپێنن. هیچکام لەم روانگانە ئارەزووی کوردەکانی مەیسەر نەدەکرد. ئەنجامەکەیشی ئەوەبوو کوردەکان بەردەوام بوون لەخەباتی دژواری چەکدارییدا دژی هێزەکانی سێنترالْ بەدرێژایی ئەو دەیەیە. هەروەک فەرمانڕەواکانی پێش خۆیان سەرکردە کۆمارییەکان، نەیانتوانی شێوازێک{ فۆرمیلە formula } بدۆزنەوە بۆ تێکەڵکردنی کوردەکان لەدەوڵەتی عێراقدا کەپەسەندی کوردەکان بێت.
لەگەڵ ئەوەی پرسی کورد چارەسەر نەکرا، دەیەی یەکەمی کۆماریی، میراتی سیاسەتی یەکتر نەخوێندنەوە و نەخشەی blueprint دیکتاتۆریی بۆ نەوەکانی داهاتوو جێهێشت. بەشێوەیەکی سەرەکیی، پارتە سیاسییە میانڕەوەکان لەبەر چاو بزربوون و بەگشتییش بەچەندین جۆرە رێکخراوی سیاسیی تر جێگەیان پڕکرایەوە. ئەو تەکنیکگەلەی لەدوای

1968 ەوە بـــــــــــــۆ فـەرمانڕەوایی لەلایـەن بەعســەوە خــاڵ لەســەر پیتەکانی دادەنـرا و دواتـریش سـەدام حوسـێن وەک خـۆی لەســاڵی 1979 بەدواوە، داهێنەر نـەبوون. زۆرێـک لـەم تـەکنیک و دەزگایانـە پـێش 1968 یش بوونیان هەبووە.
بەم پێیە بەکارهێنانی دادگا ساختەکان بـۆ نیشـاندانی بازارگـەرمیی خـەڵک، تاکپەرسـتیی، بـەکارهێنانی ئـەو میلشـیا سـیڤیلیانەی دەوڵــەت سەرپەرشـتیی دەکردن و گاردی کۆماریی، هەر هـەموویان لەرژێمـەکانی پێشـووەوە بـەمیرات مانــەوە. دامودەزگــا کاراکــانی دیکتــاتۆریی پێشــتر هــەبوون و هــەموان دەیانبینی: تەنها کەسـێکی دەویسـت، هەنـدێ فێڵبـازیی cunning سیاسـیی تێدابووایــە، بــۆ پێکەوەلکانــدنی ئــەم پارچانــەو بیانکــات بەگورزەیــەکی یەکگرتوو.

# بەندی سێ

# عێراق 1968-1988
# ڕژێمی بەعس

## پێشەکیی

دەیەی یەکەمی کۆماری عێراق، چوار کودەتای سەربازیی بەخۆوە بینی، دووانیان خوێنی لێ دەچۆڕایەوە. بارودۆخی سیاسیی لەعێراقدا گەشەی کرد بۆ جەنگەڵێکی داروینیی لەپێناوی مانەوەدا. لە 1968 دا حیزبی بەعس وەک هێزێکی سیاسیی پڕچەک بەباشترین تفاقەوە. لەو هەلومەرجەدا دەرکەوت. ترسناکترین ڕووبەڕووبوونەوە، چێکردنی ڕژێمێک بوو، بتوانێ بمێنێتەوە. لەرەوشێکدا کەتێکڕای تەمەنی ڕژێمەکان لەدوو ساڵ کەمتر بوو. سەرباری ئەمانەش، گرفتی سەپاندنی فۆرمێکی یەکێتیی و ئایدێنتیتییەکی هاوبەش بەسەر کۆڕوکۆمەڵە ئێسنیکیی و تایەفییەکانی عێراقدا کە هەمیشە لەکێشەدابوون. گرفتێک بەتایبەتیی لە کەیسی کوردەکاندا بەزەقیی دەردەکەوت. ئەمەش پێوەند بوو بەڕووبەڕووبوونەوەی سێیەمەوە کە چۆن ڕێگریی لەهێزە دەرەکییەکان دەکرێ، بەتایبەتیی ئێران و ئەمێریکا لەبەکارهێنانی جیاوازییە قووڵەکانی عێراق بۆ دەستێوەردان و تەنانەت بۆ ڕژێم سەرەونگونکردنیش. بەرپەرچدانەوەی ئەم بەرەنگارییانە، لۆژیکی حیزبی بەعسی لەدەیەی یەکەمی دەسەلاتیاندا گەلاڵە کرد.

ئامانجی سەرەکیی، بەرهە مهێنانی رژێمێک بوو "بەرگەی کودەتا" بگرێ، دەرئەنجامەکەیشی رژێمێکی داپڵۆسێنەری لێ بەرهەم هات. ئەمەش بووە هۆی توندوتیژییەیەکی بێسەرەوبەرە کە هەلومەرجی سیاسی عێراق لە کۆتایی 1960دا بەخۆیەوە بینی، سەخت بوو پێشبینی ئەوەبکەی کەچۆن دەرباز بوونی رژێم بەرێگەی جۆراوجۆر دێتەدی. جڵەوگرتنی دەسەڵات لە لایەن حیزبی بەعسەوە، وەڵامێکی لۆژیکانەبوو بۆ ئەو رەوشە سیاسییە دە قگرتووە، نەک لادانێکی سیاسیی. ئەم تاکتیک و تەکنیکانەی بەعس بۆ فە رمانرەوایی دەیگرتەبەر، جێگیرکردن و تەواوکردنی پراکتیککەلێکی پێشووتر بوون. جیاوازیی سەرەکیی، رادەی بەکارهێنانی زۆرداریی بەعس بوو بۆ ئەوەی لەدەسەڵاتدا بمێنێتەوە. لەکاتێکدا هەڕەشە ناوخۆیی و دەرە کییەکان لەسەر مانەوەی رژێم لەزێدەبووندا بوو. بەهەمان ئاستیش توندوتیژیی زێتر بوو، چونکە بۆ راگرتنی دەسەڵات پێویست بوو. کاتێ جڵەوی حیزبی بەعس کەوتە دەست یەک کەسەوە لەدوای 1979، "رژێم" بووە جێگەی خولیا تایبەتییەکانی سەدام و کەمێک ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات، بەڵام هێشتا ستراتیژی مانەوەی دەسەڵات هەر بڕیاری بەکۆمەڵ بوو. کوودەتای جولای 1968، بەیارمەتیی چوار کەسایەتی گرنگی نێو رژێمە کەی عارف، حیزبی بەعسی دووبارە بۆتەختی دەسەڵات گەڕاندەوە: کۆلۆنێل ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داوود( کۆماندەری گاردی کۆماریی)، کۆلۆنێل عەبدولڕەزاق نایف( سەرۆکی هەواڵگریی سەربازیی)، کۆلۆنێل حامید شیهاب ( کۆماندەری قشڵەی بەغداد) و کۆلۆنێل سەعدون غێدان( کۆماندەری یەکە زرێپۆشەکانی گاردی کۆماریی). جارێکتریش، هێزەچەکدارەکان، سەلماندیانەوە، کە بڕیاربەدەستی سەرەکیین لەژیانی سیاسیی عێراقدا.

## دەستەمۆکردنی سوپا

هاوکارییکردنی نایف و داوود لە" شۆڕشی جولای"دا لەگەڵ حیزبی بە عسدا بەخۆڕایی نەبوو. بەرێککەوتنێکی پێشوەخت، سەرۆک وەزیران بۆ نایف و وەزیری بەرگریی بۆ داوود تەرخانکرابوو. بۆ ئەم دووانە روون و ئاشکرا بوو، کەکودەتای جولای، تەنها سەرەتایەکە بۆ درێژکردنەوەی دیکتاتۆریی سەربازیی. بەدڵنیاییەوە ئەفسەرە سەربازییەکان بەتەواویی

کۆنترۆڵی شوێنە گرنگە کانی دەسەڵاتیان، لەنێو رژێمی نوێدا کردبوو. جگە لەناییف و داوود، ژەنەراڵ بەکر، سەرۆکایەتی بەدەست خست. هەروە ها سەرجەم حەوت ئەندامەکەی ئیدارەی نوێی دەستەی باڵای جێبە جێکردن- ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش( RCC) ئەفسەری سە ربازیی بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەحەوت کەسەکە، تەنها سێ کەسیان ( بەژەنەراڵ بەکریشە وە) سەر بەحیزبی بەعس بوون. وا پێدەچوو، قۆناغێکی تر لەکێشەی دە سەڵات لەنێوان بەعسییەکان و سوپادا، بەهەمان شێوەی ساڵی 1963، بە ڵام لەرەوشێکی جیاوازتردا دەست پێبکات. بەعسییەکان لەئەزموونی پێشتردا لەساڵی 1963، وانەیەکی باش فێربوون، بەهیچ شێوەیەک دەسە ڵات دابەش نەکەن. راستەوخۆ پێش کودەتاکە، سەدام نیازی خۆی بۆ دوای کودەتاکە بەڕوونیی راگەیاند. بۆ ئاماژەکردن بەناییف و داوود، گوتبووی" پێویستە لەسەرمان هاوکاریی بکەین لەگەڵیاندا بەڵام پێویستە لە کاتی یان دوای کودەتاکە، یەکسەر لەناویان بەرین، منیش خۆم بۆ جێبە جێکردنی ئەم ئەرکە تەرخان دەکەم"[77] بۆ بردنەسەری قسەی خۆی، سە دام، لەجیاتی حیزب، زوو دەستی بەکارەکە کرد. لەجولای 1968 دا، پاش ئەوەی داوود رێی کەوتە گەشتێکی دەرەوەی وڵات( بەگێلییەتیی خۆی)، بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو هێزانەی لەئوردن جێگیرکرابوون، هاوکات ناییفیش لەگەڵ بەکردا لەکۆشکی سەرۆکایەتییەوە، بانگهێشتی خواردنی نیوەڕۆ کرا. لەکۆتایی ژەمەخواردنەکەدا، سەدام بەدارودەستەی سەربازییەوە خۆی کرد بەژووردا و لەژێر زەبری چەکدا ناییفی هەتا فڕۆکەخانە راپێچکرد. لە وێ پێی راگەیاند، کەپۆستی نوێی، لەمۆرۆکۆ{ مەغریب} یە وەک باڵوێزی عێراق و کرایە ناو فڕۆکەوەو بۆ هەتا هەتایە نەگەڕایەوە.

سەبارەت بەداوود، فەرمانی پێدرا کەلەئوردن بمێنێتەوە، دوو ساڵ دواتر بە یەکجاریی خانەنشین کرا. ئەمیش بەهەمان شێوە، هەرگیز بۆ عێراق نەگە ڕایەوە. لەراستییدا سەدام لەماوەی دوو هەفتەدا، کودەتای دووەمی کرد. سە رەڕای ئەوەی سەدام کاری کودەتاکەی رادەپەڕاند، بەڵام کەسایەتی گرنگ لەم رووداوانەدا، ژەنەراڵ بەکر بوو. بەکر وێڕای کەسایەتییەکی قسەخۆش و گەرموگوڕ، لەچاوی خەڵکدا وێنەیەکی شەرعیی بەرژێمی بەعس بەخشی

بوو، لەکاتێکدا سەدام لە پشتی پەردەوە. کاری دەکرد. بەدڵنیاییەوە ئە مە ڕاستیی تێدایە. بەڵام لەبنەڕەتدا بوونی بەکر. گرنگیی خۆی سەلماند. وەک ئەفسەرێکی خاراو و خۆبەختکەر لەکودەتای 1958 دا. بەکر لایە نگیریەکی زۆریی هەبوو لەناو هێزەچەکدارەکاندا. بەڵام کاتێ بێتەسەر ئە وەی بەکر بڕیاری یەکلاکەرەوە بدات، ئایا بۆ سوپا یان بۆ بەعس دڵسۆزترە، ئەمەی دواییانی هەڵبژارد. تەنها و تەنها لەڕێی ئەوەوە، حیزبی بەعس توانیی ئەرکێکی ئەستەم بەدیبهێنێ، ئەویش گەڕاندنەوەی سوپا بۆ ژێر کۆنترۆڵی سیڤیلی( بەعس) بوو. هەروەها ئەستەم بوو بڕوا بەوە بکرێ کەسەدام چۆن بەرز بووەوە بۆ لوتکەی دەسەڵات. بەبێ ئاماژەدان بە

سروشتی ئەو پێوەندییەی نێوان ئەو و بەکر.

دوو تکریتیی، بەخوێن خزمایەتییەکی دوور هەبوو لەنێوانیاندا ( ئامۆزازا). هەردووکیان بەوە قایلبوون کەلەناو سیاسەتی پڕ لەسپڵەی عێراقییدا. تەنها دڵسۆزیی بۆ گەرانتیی لەنێوانیاندا. خزمایەتییە. بەمجۆرە، دوای لادانی نایف و داوود لەپۆستەکانیان (لەعێراقیش) لەدابەشکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا. سەدام بوو بەجێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشRCC که دووەمین پۆستی بەهێزی دەوڵەت بوو. بەکر خۆیشی دوو پۆستی تری بۆ خۆی زێتر کرد. سەرۆک وەزیران و سەرکردەی گشتیی هێزەچەکدارەکان، حەردان تکریتییش بەوەزیری بەرگریی دانرا، ساڵح مەهدی عەماش( جێی متمانەی حیزبی بەعس). وەک وەزیری ناوخۆ مایەوە.

لەپشت پەردەوە. سەدام دەستیکرد بەکۆکردنەوەی هێز لەدەستی خۆیدا. بە خۆبەخشیی (و زیرەکیی ) ەوە کۆنترۆڵی حیزب و دەزگای ئاسایشی کرد- نووسینگەی پێوەندییە گشتییەکان-_ ناوێکی بێ وەی-_ ئەمەش ئەو ئارەزووە دووردرێژەی سەدامی بەدیهێنا. کەچەند ئەم دەزگایەی لە دڵدا شیرین بوو. کۆنترۆڵکردنی ڕەوتی هەواڵگرییە ناوخۆییەکان لەلایەن سەدامەوە، دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساند. چەندینجار پلانی کوودەتا دژی ڕژێم پەی پێ بەرێت و پووچەڵیان بکاتەوە. هەروەها دەرفەتی ئەوەیشی بۆ ڕەخساند، چەندین پلانی کوودەتای دروستکراوی مێشکی خۆی بەرهە م بهێنێ، بێ ئەوەی بوونیشیان هەبووبێت. بەڵام هۆکارێکی باشی دەدا بە دەستەوە بۆ ئەوەی نەیارە سامناکەکانی لەکۆڵ بکاتەوە.

یەکێ لەو کەیسانەی پێوە ندیی بەم پیلانانەوە هەبوو. رژێم ئاشکرای کرد. لەکاتێکدا وا دەردەکەوت کەبەڵگە هەیە تۆڕێکی سیخوڕیی لەلایەن ئیسرائیلەوە، لەدەوروبەری بەسرە لەباشووری عێراق. سەرپەرشتیی دە کرێ.[78] هەروەها تێرۆرکردنی یەکێ لەبەکرێگیراوەکانی مۆساد لەهۆتێلی شەتوورە لەبەغداد. دەفتەرێکی بەرگیرفانی پێبوو کەناوی هەندێ لەئەندامانی تۆڕەکەی لەخۆی گرتبوو، سەدام هەندێ ناوی تری خستەسەر. لە بەر هەرهۆیەک بێت. بۆ ئەوەی لایان بەرێت. گرتن و دادگاییکردنی خێرا دەستی پێکرد. لە27ی جەنیوەری 1969 دا. لەناو دروشم و چەپڵەرێزانی خەڵکدا. 14 کەس لەوانەی تاوانبار کرابوون ( 9 جوولەکەیان تێدابوو). لە گۆڕەپانی ئازادیی { ساحەی تەحریر} ملیان بەپەتدا کرا. دوای لەسێدارە دانەکە. هەنگاو دژی حشع – سەرەکییترین رکابەری سیاسیی بەعس نرا. لەفێبریوەری 1969 دا سەرکردەی ناوداری لێژنەی ناوەندیی حشع عەزیز ئەلحاج دەستگیر کرا. پاش مانەوەیەکی کەم sojourn لەکۆشکی کۆتاییدا. ئامادەبوو بۆ دانانان بەپلانگێڕیی شیوعییەکاندا. بیست سە رکردەی حشع. پێچرانەوەو دادگایی کران و بەسزای مەرگ سپێردران.

کارامەیی سەدام بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات و رژێم لەسەرەتای حەفتاکاندا بەدەرکەوت. کاتێ ئاساییش دزەی کردە infiltration ناو سوپاوەو پلانێکی ئاشکراکرد. ئەمجارە گومانی هەڵبەستراوی لێ نەدەکرا. دەستێوە ردانی ئێران لەپلانەکەدا روون وئاشکرا بوو. بۆ زانینی، وەردەکاریی و رۆژ و کاتی پلانی کودەتا. سەدام دەیتوانی پیلاندارێژەکان لەخشتەبەرێت و بیانخاتە ناو بۆسەوە. lure دادگایی رووکەش و سەرپێیی بڕیاری مە رگی بەسەر 37 ئەفسەری سەربازییدا سەپاند. بەو چەکانەی خۆیشیان کوژران. کەگومان دەکرا ساواکی ئێرانیی پێی بەخشیبن. لەئەنجامدا باڵوێزی ئێران لەعێراق دەرکرا. قونسوڵخانەکانی consulate ئێران لە بەغداد و کەربەلاو بەسرە داخران.

## دەستەمۆکردنی کوردەکان

سەرەڕای ئەو ئەرکە بەپەلەیەی لەرۆژەکانی یەکەمی رژێمی نوێوە وەک بار بەسەرشانەوەبوو. رژێمی بەعس بۆ بەهێزکردنی خۆی و خۆڕاگرتن لە بەرامبەر دژەکوودەتاو هەڕەشەی سوپادا- گرفت و سەریەشەی بەمیرات بۆ

مـــابووەوە. لـــەنێویانـــــدا گرفتی کێشەی کوردیی. هەر لـەسـاڵی 1958 ەوە ناوبەناو کوردەکان شەڕی دەوڵەتی سێنتراڵیان دەکرد. بەرگریـی سـە رسەختانەیان، بەجۆرێک لەجۆرەکـان بـووە هـۆی تێـداچوونی دوو رژێـم ( ژەنەراڵ قاسم و عارفی دووەم ). سەدام وەک خۆی راستەوخۆ رەفتـاری لەگەڵ ئەم کێشەیەدا کرد. سەرەتا هەستا بەگەشتێک بۆ یـەکێتیـی سـۆڤێت، بۆ ئەوەی قایلیان بکات بەوەی یارمەتییە سەربازییەکانیـان بـۆ چـەکدارە کوردەکان کەمبکەنەوەcurtail . پاش ئەوەی لەلایەن کۆسیگن kosygin ەوە ئاگایی بەسـەدام درا لـەمـەڕ دەستپێکردنەوەی کەمپـەیینی شـەڕ دژی کوردەکان، بەنیـازێکی ئاشـتییخوازانەوە بـۆ بـەغـداد گـەڕایـەوە. لـەراگـە یاندراوێکی ئاشتییخواز و چاوەڕواننەکراودا. سـەدام رایگـەیانـد" ئـەگـەر کێشەی کوردیی بـەشـێوەیـەی سـەربـازیی لـەبنـەڕەتـەوە چارەسـەربکـە ین........ئەوسا هەموومان دۆڕاو دەبین"[79]
ئەنجامی ئەمەش ئەوەبوو کەبـەمانیفێستۆی مـارس { بـەیـانی ئـازار} ی 1970 ناسرا. کەبۆ یەکەمین جار ئاماژەی بە"ئۆتۆنـۆمی" بـۆ کـوردەکـان کرد، بەکارهێنانی زمانی کوردیی لەو ناوچانەی کـورد زۆرینـەن، هاتـە پـە ژراندن، گەرەنتیی هاوبەشییکردن لەداهاتی نەوتی زۆروزەبەندی کەرکـوک، هەروەها بەڵێنی چێکردنی دیمۆکراسیی( بەهەڵبژاردن ) بـەکوردسـتان درا. بەتەواویی نەدەزانرا و ڕێی تێ نەدەچوو، دیمۆکراسیی لەکوردستان، چـۆن هەڵدەکات لەگەڵ تۆتالیتێریانیزمی بەشەکانی تری عێراق. لەگەڵ ئـەوەشـدا، ئەو مانیفێستۆیە باشترین پێشنیار بوو کەکوردەکان هەرگیز لەوەپـێش وە ریانگرتبێ.
ڕێککەوتنی مارسی 1970، وەک هەموو ڕێککەوتنەکانی پێشوو، هـەرگیـز جێبەجێ نەکرا. مەرجەکانی ئەو مانیفێستـۆیە بڕیـار بـوو لـەمـاوەی پێـنج ساڵدا جێبەجێ بکرێ، لەخاڵێکدا دەبووایە سەرژمێری کوردستان بکرایە بۆ دیارییکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنـۆمیی کوردسـتان، کـەکـوردەکـان تێیدا زۆرینەن. ئەمەش ئەو گریمانەیەی هێنایە پێشەوە، کەکێڵگە نەوتییـە سەرەکییەکانی عێراق لەکەرکوک( کەکوردەکان زۆرینەبوون). بـۆی هـەبـوو بکەوێتە ژێر دەستی کوردەکان. بۆ گۆڕینی راستییەکان لەسەر زەویی، سـە دام زۆر ئاگایانە دەستی بەپرۆسەی"تەعریبکردنی" شـارەکـە کـرد- بـەهـە ڵڕشتنی پارە بۆ ئەو عەرەبانەی دەچن بۆ گۆڕینی باری ئێسـنیکیی شـارە

کە. بارزانیی، سـەرکـردەی کوردەکان هانی کوردەکانی دا هەمان کار بکە
ن. سەرەتای حەفتاکان لای کەم دوو هەوڵی تێرۆرکردنی بارزانیی بەڕێـوە
چوو. گومانێکی زۆر لەوەدەکرا سەدام دەستی تێیدا هەبووبێ.
وەک بەشێک لەرێککەوتنەکەی مارس، بارزانی قایل بوو بەپچڕاندنی پێوە
ندییەکان بەئێرانەوە. پێشبینی دەستپێکردنەوەی شـەڕو تێهـەڵچـوونی سـە
ربازیی دەکرا. بۆیە بارزانیی لە 1972 دا چووەوە ناو لیسـتی دەوڵـەتـی
ئێران بۆ یارمەتیی وەرگرتن، هەروەها یارمەتیی لەئەمێریکا و ئیسرائیلیش
وەردەگرت. بەمجۆرە کێشەی کورد، مەودایەکـی ئینتـەرناسیۆنالیسـتیی گـە
ورەو مەترسییداری وەرگرت.

## دەستەمۆکردنی شیعە

شیعە وەک گرووپێک هەمیشە لەکورد هەمەچەشنتر بووە- بۆیـە پێویسـتی
بەهـەڵـوەسـتەیـەکـی وردتـر nuance هـەبـوو. سـەدام سـتراتیژییەکـی
کلاسیکیی ناسراو بە *تەرهیب و تەرغیب* " ترساندن و فریودان" یان کوتـە
ک و گێزەری پێڕۆ کرد. هەڕەشەی راستەقینە بۆ سەر رژێم، لەگردبوونەوە
ی هێزی سەرکردە ئایینییە رادیکاڵەکان و جەماوەری رەشورووتی شیعەوە
سەرچاوەی دەگرت. ئەو کاتەی حیزبی بەعس دەسەلاتی گرتەدەست، بەتـە
واویی حیزبێکی عەرەبیی سوننیی بوو: جارێکی تریش زۆرایەتی شیعە بە
سیستەماتیک پەراوێزخران لەدەسەلات و دەستڕۆیشتووییدا . هەروەک لـە
گەڵ کوردەکاندا هەمان کار کرا. ئەو گرفتانەی بۆ بەعس لەلایەن شیعەکانە
وە بەپێش دەهاتن، لەمیراتی رژێمەکانی پێشووەوە مابوونەوە. لـەتـەمـەنـی
کورتی رژێمی قاسمدا، کەرێگەپێـدانی حیزبـەسیاسـییەکـان یاسـایی کـرا،
حیزبی دەعوە دامەزرا. لەژێر سـەرکردایـەتـی محـەمـەد بـاقر ئـەلسـەدر –
لاوێکی چالاک و سکۆلارێکی ئایینیی ناوبانـگ باش- حیزبی دەعـوە بـە
خێرایی تەشەنەی سەندو خەباتی چەکداریی رێکخست. ئامـانجی حیزبـە
کە زۆر سادەبوو: ژێـرەوژوورکردنـی رژێـم و دامـەزرانـدنی دەوڵـەتێکـی
ئیسلامیی، ئەمەش بەئاشکرا، بۆ بەعسی سێکیولار جۆرێک لەهەڕەشەبوو.
پاش هەندێک تێکهەڵچـوونی تونـدوتیژ لـەهـاوین و پـاییزی 1969دا لـە
نێوان رژێم و دامەزراوەی ئایینیی شیعەدا، رژێم یاسایەکی ئەنتی ئەلدەعوە
ی دەرکرد، دواتر ئەمەی بـۆ سـەرکـوتکردنی ئـەنـدامانی ئـەو حیزبـە بـە

کارهێنا . لەساڵی 1974، پێنج ئەندامی ئەل- دەعوەی لەسێدارەدا. لە کۆتایی حەفتاکاندا ئەم ژمارەیە بەرەو سەرەوە هەڵکشا. لەماوەی دەیەیە کدا، رژێم پشتی بەرووبەڕووبوونەوە، لەسێدارەدان و دەرپەڕاندن لەوڵات بەستبوو، بۆ ئەوەی مەترسیی شیعە کۆنترۆڵ بکات. لەکاتێکدا رژێم بە کوتەک کەوتبووە گیانی دامەزراوەی ئایینیی. لەهەمان کاتیشدا دانیشی ( گێزەر) بۆ جەماوەری رەشوڕووتی شیعە رۆ دەکرد.
هۆکارێک بۆ کەمکردنەوەی بارگرژیی لەنێوان سوننەی سێنتەر و زۆرایە تی شیعەدا، دابەشکردنی دەسەلات و سامان بوو بەشێوەیەک یەکسانیی تێدا بێت. لەماوەی زۆربەی ئەو دەیەیەدا، رژێم پرۆگرامێکی شۆڕشگێڕانەو راستەقینەی بۆ بنیاتنانەوەی تەواوی ژێرخانی ئابووریی و کۆمەلایەتیی پێڕۆ کرد. لەو پرۆسەیەدا، عێراق بوو بەپێشکەوتووترین جڤاکی مۆدێرن لەجیهانی عەرەبدا. ئەم پرۆسێسە بەریفۆرمی زەویی { چاکسازیی کشتوکاڵیی} بەشێوەیەکی رادیکالانە دەستی پێکرد، لەساڵی 1970 تۆرێک بۆ کێڵگەی هەرەوەزیی دامەزرا کەدەوڵەت سەرپەرشتیی دەکرد.
خاوەندارییەتی زەوییەگەورەکان دابەشکرا بەسەر ئەو جووتیارانەی کە کاریان لەسەر پارچەزەوییەکان دەکرد. ئەمانە بەهەردوو سەر کارگوزار بوون، لایەنگریی جەماوەریی بۆ رژێم دروستکرد و هاوکاتیش دەسەلاتی خاوەندارە گەورەکانی کەمکردەوە. بەرئەنجامی ئەمە کەرتێکی تێکەڵ لە کشتوکاڵ بوو، زەوییە بچووک و مامناوەندییەکان تایبەت بەجوتیارەکان مایەوە، زەوییە گەورەکانیش بە" خاوەندارییەتی گشتیی" کران. ئەم خواستانەی بەعس پێویستی بەسەرچاوەی داهات بوو. ئەمەش واتای دە ستڕاگرتنی راستەوخۆ و کۆنترۆڵکردنی نەوتی بێئەژمار و یەدەکی عێراق بوو.

## خۆماڵییکردنی نەوت

لەسەرەتای حەفتاکاندا. بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق لەلایەن کۆمپانیای پێترۆڵیۆمی{نەوتی} عێراقەوەIPC. کە کۆمپانیایەکی-گەورە بوو بە خاوەندارییەتی هاوبەشی بریتانیی، فرانسیی، هۆڵەندیی و ئەمێریکایی، لە گەڵ کۆمپانیای نەوتی بەسرەBOC دا وەک پرۆژەیەکی بچووکی بیانیی، دەستی بەسەرداگیرابوو. زۆربەی بەرژەوەندییە بیانییەکانی وابەستە بە

IPC، مافی تایبەتیان لە ولاتانی تری عەرەبدا هەبوو. لەئەنجامیشدا زۆر بەمەبەستەوە ریژەی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق بۆ بەرزڕاگرتنی نرخەکەی، لەوپەڕی کەمییدا راگیرابوو. بەکورتیی ویڕای ئەوەی عێراق لە فرۆشتنی نەوتدا سوودمەند بوو، بەلام کۆنترۆڵی ریژەو نرخی ئەم سە رچاوە سروشتییەی لەدەستدا نەبوو.
بەلام هەر هەوڵێک بۆ کۆنترۆڵکردنی بیرەنەوتەکان و دەرهێنانیان لەدە ست بێگانە، مەترسییەکی کوشندەبوو.[80] سەدام خۆی ئەرکی خۆماڵییکردنی پیشەسازیی نەوتی لەئەستۆ گرت. بۆ مسۆگەرکردنی بازارێکی هەمیشەیی بۆ نەوتی عێراق و دابینکردنی تەکنەلۆژیای پێویست بۆ گەشەدان بەکێڵگە نوێکانی نەوت، سەدام لەساڵی 1972 دا گەشتی بۆ سۆڤێت کرد. گەشتی- بەرامبەر reciprocal لەئەپریلی 1972دا لەلایەن کۆسیگن، سەرۆک وەزیرانی سۆڤێتەوە کرا. پەیمانی دۆستایەتیی و هاوکارییکردنی نێوان هەردوو ولاتی بۆ 15 ساڵ لێکەوتەوە. پەیمانەکە زامنی دەستڕاگەیشتنی سۆڤێتی کرد بۆ بەندەرەکان و فرۆکەخانەکانی عێراق و دابینکردنی فرۆشتنی چەکوچۆڵی سۆڤێتیی بەعێراق بەبەردە وامیی، لەهەموویشی گرنگتر، گەرەنتیی پەیداکردنی بازاڕی سۆڤێت بۆ نە وتی عێراق. پاش ماوەیەکی کەم، لەیەکی جونی 1972 دا، یاسای 69 بە فەرمیی IPC خۆماڵیی کرد. ساڵی دواتر BOC یش خۆماڵیی کرا.
ئەم خۆماڵییکردنەوە بۆ سەدام سەرکەوتنێکی تاکەکەسیی{شەخسیی} بوو. ئەم هەنگاوە زۆر بەبەربلاویی پێشوازیی لێکرا( یەکی جونیان بەفەرمیی ناونا"رۆژی سەرکەوتن"). سەرەنجام عێراق کۆنترۆڵی سەرچاوە سروشتییەکانی کەوتە دەست و پاشماوەی بالادەستیی کۆلۆنیالیی بەیە کجاریی کۆتایی پێهێنرا. لەم پرۆسەیەدا، عێراق لایەنێکی لەشەڕی سارد هە لبژارد. سوودەکانی بێئەژمار بوون- چەکوتفاقی سۆڤێتیی بەلێشاو، یارمە تی تەکنیکیی لەپیشەسازیی نەوتدا، بازاڕی مسۆگەر بۆ هەناردنی نەوت. لە لایەکی ترەوە بۆ دڵنەوایی سۆڤێت، سەدام پەیمانی دابەشکردنی دەسە لاتی( لەجیاتی چەوساندنەوەیان ) لەگەڵ حشع دا راگەیاند. ئەم بەڵێنەی کە بەبیری کەسدا نەدەچوو بەرەی پێشکەوتووخوازیی نیشتمانیی لێ دروست بوو. هاوپەیمانییەکی سیاسیی لەنێوان " هێزە شۆڕشگێڕەکان"ی عێراق، لەوانە، بەعس، حشع، تێکەڵەیەکی motley هەمەڕەنگ لەگرووپە

کوردییەکان بەئاگایانە هـە ڵبژێردرابوون. دوو ئەندامی حشع لـەکابینـەی وەزارەتدا دامەزرێنران و تەنگەتاوکردنی شیوعییەکانیش لـەو کاتـەدا کـەم ببووەوە. ئەم بەشدارییپێکردنەی حشع لەدەسەڵاتدا پرۆڤەیەکی هەڵخەڵەتێنە رانە بوو. بەڵام لەڕووکەشدا بۆ رازیکردنی سۆڤێت بەشێوەیەکی کاتیی، بـە س بوو. دەرئەنجامی پڕمەترسیی بۆ عێراق لەلۆژیکی جەنگی ساردەوە پـە یدابوو. بەکەوتنەژێر چاوەدێریی و بوون بـەکڕیـاری سـۆڤێت، عێـراق بـە ئۆتۆماتیکی دوژمنێکی نوێی( وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا) بۆ پـەیـدا بوو. کاری نایابی سەدام، هەر زوو پشـکی ئـابووریی باشـی لێچنرایـەوە. کاتێ کێشەی عـەرەب- ئیسـرائیل لـەسـاڵی 1973 دا دەسـتی پێکـردەوە، نرخی نەوت فڕیی، عێراق بەشێوەیەکی ئایدیالیی پارەو سامانە نیشتمانییە کەی بەکار هێنا.

## هەوڵی کودەتـای کەزار

سەرنەگرتنی thwart کوودەتا سەربازییەکان ببوون بەبەشێک لەڕووداوی ساڵانەی رژێمی بەعس، سـاڵی 1973 شـتێکی جیـاواز نـەبـوو. هـەوڵـی 1973 کەلەژێر سەری ناززم کەزازدا بوو( یەکێ لـەپیـاوانی بـاڵی راسـتی سەدام بوو. لەئاساییشدا، یەکێ لەشیعە دەگمەن وپایەبەرزەکانی ناو رژێـم بوو ). بەگاڵتەبازاڕیی Farce کۆتـایی پێهـات. بـەڵام بـەردەوامیـی شـە قوشلۆقیی رژێمی نوێی سەلماند. پلانە فێڵبازییەکـەی کـەزاز، فڕانـدنی هـە ردوو وەزیری بەرگریی و ناوخۆیی لـەخـۆ گرتبـوو. بـۆ ئـەوەی لـەلایـەن پۆلیس و سوپاوە، هیچ وەڵامدانەوەیەک دروست نـەبـێ. دواتـر دانـانی دە ستەی تێرۆرکردنی سەرۆک بەکر، کاتێ بەفڕۆکە لەگەشتێکی پۆڵانـد دەگـە ڕایەوە.

بۆ بەدبەختیی کەزار، فڕۆکەکە بۆ ماوەی چوار کاتژمێر دواکەوت. دەستەی بکوژەکان هەڵاتن. لەو باوەڕەدابوون دزەکراوەتە ناو پلانەکەیانەوە. بەدوو بەرپرسی پایەبەرزی رژێمەوە کە دەستبەسەرکرابوون لەزینـدان لای خـۆی. پاش هەڵوەشاندنەوەی پلانەکە، کەزار بەدوو بارمتەکـەوە بـەرەو سـنووری ئێران هەڵهات. سەدام سەرسام بوو بەهەڵسوکەوتی یـەکێـک لـەزۆر نزیکـە کانی، کەوتە راوەدوونانی، پێشی پێ گرت، بەرلەوەی لەسنوور دەرباز بێ.

ئەنجامی ensuing ئەو دادگاییکردنە، مەرگی بەسەر کەزاز و 8 کەس لەئەفسەرانی ئاسایشدا سەپاند. جگە لەئەفسەرانی سەربازیی. رۆژی دواتر. بەس بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کەدادپەروەریی ڕێگەی خۆی دەگرێ. 36 پیاوی تر دادگاییکران. 14 کەسیان لەئەنجامدا لەسێدارەدران. جارێکی تریش رژێم سەلماندییەوە کەتوانای زاڵبوونی resilience بە سەر تەنگانەدا هەیە. بەمشێوەیە هەرکەسێ بیەوێ دژایەتی رژێم بکات، باجێکی قورس دەدات.

## گیروگرفت لەباکوور

ئەو رژێمی بەعسەی کەسەدام بە لێبڕاویی وسەلیقە instinct ی خۆی بە ڕێوەی دەبرد. سەلماندی کەبەرگەی کوودەتا دەگرێ. بەڵام وەک دەردەکەوت توانای کۆتاییهێنانی بەکێشەی کورد نییە. وەک چۆن رژێمەکانی پێشووش نەیانتوانی. لە1974 دا ڕێککەوتننامەی مانیفێستۆی مارس{ بە یانی ئازار} بەخێرایی بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەچوو. بارزانیی پشتئەستوور بەکۆمەکی نێودەوڵەتیی. بەبێ دوودڵیی گێچەڵی بەبەعس دەکرد و رایگەیاند" ئەو ناوچانەی کەدەوڵەمەندن بەنەوت....ناوچەی خۆمانن. بەڵێ هی خۆمانن. بۆیە هەر هەنگاوێ بنێین بۆ هێنانەوەیان، هەنگاوێکی دەستدرێژکەرانە نییە."[81] لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ واشینگتۆنپۆستدا هاوینی 1973، بارزانیی بەئەنقەست دانی لەبەردەم ئەمێریکا رۆکردبوو. بەڵێنی دابوو" ئەگەر ئەمێریکا ئێمە بپارێزێ لەگەلەگورک......دەتوانین کۆنترۆڵی کێڵگە نەوتییەکان بکەین و بۆ کارپێکردنیشی بەکۆمپانیایەکی ئەمێریکیی بدەین. بێگومان. ناوەڕۆکی راگەیاندنەکانی بارزانیی، جێگەی نارەزایەتیی بەغداد بوو. شەڕێکی دوژمنکارانەی بەرفراوان بەڕێوەبوو. ئەمەش لە مارسی 1974 دا کلپەی سەند.

شەڕ لەگەڵ کوردەکاندا، خەریک بوو سەری بەعس بخوات و لەدەسەلات دە ری پەڕێنێ. کوردەکان لەلایەن هەریەکە لە ئەمێریکا، سوریا، ئیسرائیل و ئێرانەوە پشتیوانیی دەکران. لەکاتێکدا خاوەنی تۆپخانەی قورس و رۆکێتی دژەئاسمانیی بوون، گەریلا{ پێشمەرگە} شەڕکەرەکانی بارزانیی لە سوپای عێراقیش خاراوتر بوون. تێچوونی جەنگەکە( نزیکەی 4 بیلیۆن دۆلار)، ئابووریی عێراقی داغان کردبوو. لەکاتێکدا ژمارەی قوربانییەکان لە

ســـالانی 1974_1975 بــه 60000 گــهیشــت. دوای جــهنیــوهری 1975، ههلومهرجهکه تا دههات خراپتــر دهبــوو. ئیــران دوو یــهکــهی ســه ربازیی لهکوردستانی عیراقدا جیگیرکرد. بۆ یارمهتییدانی راستــهوخــۆ بــه کورده شۆرشگیرهکان. بۆ وهستانهوه لهههمبهر ههرهسی تهواو لهبواری سه ربازیی و ئابووررییدا، سهدام هیچ چارهیهکــی تــری نــهبــوو. جگــه لــهملکــه چکردن بۆ دهسهلاتی بههیزی ئیرانی دراوسیی.

لهمارسی 1975، سهدام و شای ئیران ریکهوتنامهی جهزائیریان مــۆرکرد. ریکهوتننامهکه دواتر لهجونی 1975دا یاساییکرا ، لهسهر سنووری نیــوده ولهتیی و پیوهندیی دراوسییانه ریککهوتن، ئهمهش بۆ سهدام ســاتکهلیکــی پر لهسهرشۆریی بوو. کیشهی دوورو دریژی ههریمایهتیی لهسهر کهنــداوی عهرهبیی، بهتهواویی لهقازانجی ئیران شکایهوه. لهسهر عیراقیش داواکــراو بوو، کهدهستبهرداری داواکردنی ههریمی عهرهبنشــینی خوزســتانی ئیرانــی بیت.[82]

جگهلهپابهندبوونی ئیران بهیارمهتیی برین لهکوردهکان، لهبهرامبهردا عیراق هیچی وای دهست نهکهوت. لهماوهی دوو رۆژدا لهواژۆکردنی پهیماننامهکــه وه، ههموو کۆمهکیکی نیودهولهتیی بۆ کوردهکان( لهئیران، ئیسرائیل و ئــه میریکاوه) برا. کوردهکان بیچاره مانهوه. لهماوهی دوو ههفتــهدا، شۆرشــی کورد ههرهسی هینا.

## مۆدیرنایزکردنی عیراق

لهکۆتایی 1975دا، رژیمی بهعس لهههموو بهرهکاندا جیگهوریگــهی خــۆی توندوتۆل کردبــووهوه، ببــوو بــهتــهمــهن دریژتــرین رژیمــی کۆمــاریی. لــه ناوخۆشدا، ههموو نهیارهکانی (هیزهچهکدارهکان، حشع و کوردهکان ). یان لهناوبردرابوون، یان بیلایهن کرابوون، یاخود کلک و گوی کرابــوون. روو بهدهرهوهش، سهرهرای ئهوهی ریککهوتن لهگهل ئیراندا، خۆبچووککردنهوه بوو، بهلام شهریکی گهورهی له عیراق لادا. بهروبوومی نــهوت پــارهیــهکــی زۆری پیکهوهنا، بۆیه سهرنجی سهدام بهرهو مۆدیرنایزکردنی عیراق چوو. سهرپهرشتییکردنی عیراق بهچــهمکیکــی گونجــاوی سۆشیالیســتییهوه[83] لــه ئایدۆلۆژیای بهعس، گۆرینی عیراق لــهولاتیکــی جیهــانی (ســی) وه بــهرهو ولاتیکی پیشکهوتوو، لهماوهی دهیهیهکدا، بهپشتبهستن بهدوو ئهگــهری ســه

رەکیی. یەکەم، پێویستی دەکرد، سامان بەشێوەیەکی هەرچی باشتر بە یەکسانیی دابەش بکرێ. بەواتایەکی تەسەلتر، رەوایی و خاوەن پایە لەناو خەڵکدا بۆ رژێمی بەعس بەند بوو بەگەیاندنی ژیانێکی باشتر بۆ عێراقییەکان لەچاو هەموو رژێمەکانی پێشووتردا. دووەم، رژێم پێویستی بەوە هەبوو، کەئابووریی عێراق هەمەجۆر بکات، بۆ دوورکەوتنەوە لەپشتبە ستنێکی لەرادەبەدەر لەسەر تاکە کالا( نەوت). بەپیشەسازییکردنی ئابووریی عێراق، کەمتر دەکەوتە ژێر کاریگەریی هەڵبەزودابەزی نرخی نە وتەوە، هەروەها پشتبەستنی عێراقی کەمتر دەکردەوە لەسەر هاوردەی وڵاتانی پێشکەوتوو، بۆ بەروبوومی پیشەسازیی.
بەدەر لەسروشتی سەرکوتکەریی ( یان" شەڕانگێزیی") رژێم، لەبوارەکانی تردا، لە بواری ئابووریی و کۆمەڵایەتییدا، دەستکەوتەکانی سەرنجڕاکێش بوون. بەرنامەی زۆر گەورە بۆ چێکردنی قوتابخانەو نەخۆشخانە دارێژرا. بەخۆڕایی دەستڕاگەیشتن بەباشترین جۆر لەچاودێریی تە ندروستیی و خوێندن، بوو بەمافێکی رەواو گشتیی، نەک مافێکی تایبەت وەک لەپێشدا هەبوو. بەرفراوانبوونی ئەم تۆرە کۆمەڵایەتییە، هاوشانی پرۆژەی بەرزخوازتر بوو لەرۆنانی ژێرخانی ئابوورییدا. هەوڵی گەیاندنی ئیلێکتریک{کارەبا} بەدەرو دەشت، ئەنجامەکەی 4000 گوند بۆ یەکەمین جار ئیلێکتریکیان بەخۆیانەوە بینی. بۆ ئەم مەبەستەش بۆ ئەوەی شتگەلێ بدرێ بەو خەڵکەی تازە ئیلێکتریکیان پێگەیشتووە، تەلەفیزیۆن و سە خچاڵی خۆڕایی بەسەر خەڵکدا دابەشکرا- لەشیعەوە- لەباشوورەوە دە ستی پێکرد، نەک بەڕێکەوت، بەڵکوو بەمەبەستەوە. بۆ سەدام، کڕینی جە ماوەری شیعە ستراتیژییەکی سێنترالّیی بوو.
هەروەها سەدام، دەستیکرد بەپلانێکی ئەفسانەیی، لەچەشنی پرۆژەکانی ستالین، بۆ پاقژکردنەوەی ئاوی دیجلەو فورات بۆ ئەوەی 3 میلیۆن هێکتار زەویی گونجاو بۆ کشتوکاڵ بخاتە گەڕەوە. مەبەستی پلانەکە" بووژانەوەی ناوچەیەکی تایبەت بەدانەوێڵەی جیهان" بوو. هەمەجۆرکردنی رێگەکانی هە ناردنی نەوت، گرنگییەکی تر بوو. سەدام سەرپەرشتیی چێکردنی سیستە می بۆرییە نەوتییە پێکەوەگرێدراوەکانی دەکرد، کەبتوانێ بەپێی پێویست لەهەر شوێنێکی عێراقەوە بێت لەسێ رێگەی جیاوازەوە( بەسرە، تورکیا و سوریا)، بۆ دەرەوە نەوت بنێرێت. بەروبوومی پیشەسازیی بەتەواویی لە

لایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدە برا. جەختی لەسەر فرەجۆریی دەکردەوە. بۆ ئەوەی چارەنووسی ئابووریی عێراق بەتەواویی نەبەستریتەوە بەبە رزونزمیی نرخی نەوتەوە. بۆ یەکەمین جار لەیەدەگی زۆری عێراق، کبریت و فۆسفات دەرهێنرا. هاوکاتیش پرۆژەیەکی گەورەی پیترۆکیمیایی لەبە سرە رۆنرا.

## لەدەسەڵاتی تاکحیزبییەوە بۆ دەسەڵاتی یەک کەسیی.

لەناوەڕاست تا کۆتایی حەفتاکان، حیزبی بەعس کە سەدام سەرەنێزەی بوو لەئەوپەڕیی بەهێزییدا بوو. رژێم توانستی خۆی تەواو کارا کردبوو بۆ رزگاربوون لەکۆمەڵی هەوڵی دووبارەی کوودەتا. شانازیی ئەمەش بۆ سەدام دەگەڕایەوە؛ رۆڵی سیاسیی هێزەچەکدارەکان وەک سەرچاوەیەکی سەرەکیی بارگرژیی لەپەشێویی سیاسیی عێراقدا بێبەزەییانەو کاریگەرانە کەمکرایەوە: کێشەی دووروودرێژی لەگەڵ ئێرانی دراوسێدا. لای کەم بە شێوەیەکی کاتیی، رێگەی لێگیرا کەگەشە بەرەو شتێکی سامناک نەکات. لە ئەنجامیشدا، ئەگەری تەوەرەیەکی ئێرانیی_کوردیی کە وڵات شەقوپەق بکات بەتاڵکرایەوە. هەرەوها کۆنترۆڵکردن و دەستڕاگەیشتنی دەوڵەت بە سەر بەشە سەرەکیی و گرنگەکانی ئابوورییدا. بەسەر یەدەکێکی زۆری زێڕی شلدا و تەخشانکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان. گرنگییەکی بێئە ندازەی هەبوو لەفەرمانڕەواییکردنی وڵاتدا. بۆیەکەمین جاریش لەمێژووی عێراقدا، رژێمێکی جێگیر پێڕۆی سیاسەتێکی ئاگایانەی لەدابەشکردنی ساماندا، لەبری کەڵەکەکردنی کرد. لەسەرێکەوە ئەم سیاسەتە بەشێوەیەکی دراماتیکیی جۆری ژیانی عێراقییە ئاساییەکانی گۆڕیی. لەسەرێکی تریشە وە گەشەیەکی خێرای دەزگای ئاسایشی دەوڵەت وایکرد چاودێرییەکی بە هێز بداتە دەست ئەوانەی کۆنترۆڵی دەوڵەتیان کردبوو. ئەمەش کاریگە ریی هەبوو لەسەر خەڵکەکەو وایلێکردن لەهەمیشە زیتر پشت بەدەسەڵاتی نێوەند ببەستن.

بەشێوەیەکی گشتیی لەزۆربەی بوارەکانی ژیاندا. کۆمەڵایەتیی، پەروەردە یی، ئابووریی، سیاسیی و سەربازیی- دەوڵەت کۆنترۆڵی پلەوپایەی پۆستە کانی کردبوو. بەرپرسانی دەوڵەت دەستنیشانیان دەکرد، کێ سزا بدرێ و کێ خەڵات بکرێ. خەڵکی عێراق لەبەردەم هەڵبژاردنێکی روونڈا بوون: دە

ستتێکەڵکردن لەگەڵ دەوڵـە ت و کـەڵکـوەرگـرتن لـەدەسـتبلاوییەکـەی largess. یان ئۆپۆزیسـیۆنبوون و رووبـەڕووبوونـەوە لـەگـەڵ ئاکامـە توندوتیژ و پڕ لەئازارەکانی. لـەکۆتـایی حـەفتاکانـدا، دەزگـای ئاسـاییش کۆنترۆڵی عێراقی کردبوو. حیزبی بەعس کۆنترۆڵی دەزگای ئاساییشی دە وڵەتی کردبوو سـەدامـیش کـۆنترۆڵی حیزبـی بـەعسـی کردبـوو. ئـەوەی مابووشەوە، دەبووایە ئەم هەرەمی دەسەڵاتە بەفەرمیی بناسێنێ. ئەمانـە لـە جولای 1979دا دەگوزەرا. کاتێک بەکری ناساغ و بەسـاڵاچوو راییکـرا. بەوەی دەستبەرداری دەسەڵات بۆ جێگـرە گەنجەکـەی خـۆی ببـێ. وتـارە تەلەفیزیۆنییەکەی وازهێنانی بەکر بەوردەکارییەوە دانرابوو تـا رێککـەوتی ساڵیادی شۆڕشی 17 ی جولای بکات.
لە وتارەکەیدا، بەکر روونیکردەوە کە نەخۆشییەکەی چیتر رێگەی پێنـادات کەبەرگەی پۆستەکەی بگرێ. ناچاری کرد کـە دامودەزگـای دەسـەڵاتداریی بـۆ "هـەڤاڵ سـەدام حوسـێن" و " تێکۆشـەری دڵسـۆز" و " سـەرکردەی لێوەشـاوە" ی شـۆڕش جـێ بهێڵـێ.[84] تێکۆشـەری دڵسـۆز و سـەرکردەی لێوەشـــاوە تـــەنها دووان لـــەو نازناوانـــە بـــوون لـــەکاتی وەرگرتنـــی پلەوپایەکەیـدا . سـەرەڕای ئـەوەی، بـوو بەسـەرۆک، سـەرۆک وەزیـران، سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان و سێکریتێری گشتیی سەرکردایەتی هەرێمیی حیزبی بـەعس و سـەرۆکی ئەنجوومـەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش RCC
سـەدام زۆر بەپەلـە کەوتـەخـۆ. بـۆ جێگیرکردنـی ئـەم پۆسـتە نوێیانـە. ئامانجەکانی ئەو، نەیارەکانی نێو بەعس بوون، یەکەمین کەس بەر لیسـتی لێدان کەوت، موحیی عەبدولحوسێن مەشهەدیی بوو. کـە ئـەو بۆچوونانـەی هەیبوو سەری بەخواردن دا. لـە کۆبوونـەوەی ئەنجوومـەنی سـەرکردایەتی شۆڕشدا بۆ دیارییکردنی جێگرەوەی بەکر، مەشهەدیی ئـەوەی ئاشـکراکرد هیچ دادوەرییەک لەوەدا نییە، بە دژایەتییکردنی لەپڕ خانەنشینبوونی بەکر. بۆیە داوای دەنگدانی کرد بۆ جێگرتنەوەکە. بەمشێوەیە مەشهەدیی پۆستی سـەرۆکایەتی RCC ی لێسـەنرایەوەو ئەشـکەنجە درا تـا ئەوکاتـەی دەبووایە دانی بەهەر شتێکدا بووایە بنایە.
لە 22ی جولای، سەدام داوای کۆبوونەوەیـەکی تایبـەتی کـرد، بـۆ ئـەوەی رێگە بە مەشهەدیی بـدرێ کـە وردەکـاریی ئـەو پلانـەی سووریا ئاشـکرا

بکـــــات، کـــــه بـــــۆ ژێرەوژوورکردنـی رژێـم دارێژرابـوو. سـەدام کۆبوونەوەکـەی بـۆ نـــەوەکانی داهـاتوو بــە ڤیـدیۆ گـرت. پـاش ددانپێداهێنانێکی ئامادەکراو لەلایەن مەشهەدییەوە. نـاوی پلانـدارێژەرەکان خوێنرایەوە. کاتێ ناوەکانیان بانگ دەکـرا، ئەندامـە بێچارەکـانی بـەعس لەلایەن پیاوەکانی ئاسایشەوە راپـێچ دەکـران- بەسـەریەکەوە 66 کـەس بـوون. دواتـر کۆبوونەوەکـە درێـژەی کێشـا. نوێنـەرەکانی مابوونـەوە پەیامەکەیان بەباشیی پێگەیشت.
لـەو 66 کەسـە، 22 کەسـیان، لەلایـەن دادگایـەکی سـەرپێیی و تایبـەتیی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشەوە سزای مـەرگیان بەسـەردا سـەپێنرا. دوو هەفتە دواتر بەرپرسانی حیزبیی جارێکی تر کۆبوونەوەیان کـرد بـۆ جێبەجێکردنی حوکمی دادپەروەریی بەکۆمـەڵ، بەسـەر تاوانبارانـدا. یـەک بەیەک سەرکردەکانی بەعس هەڵدەستان و گوللەیان دەنا بـە مێشـکی ئـەو 22 بەدبەختەوە. لەم " کۆبوونەوە پڕ شـکۆدارە عەشـیرەتییەدا". نزیکـەی سـەرجەم سـەرکردە حیزبییـەکانی کـە مابوونـەوە بەشـدارییان لـەم " گوللەبارانکردنە دیمۆکراسییەدا" کرد.[85]
ئـەم پاککردنەوەیـەی نێـو RCC هاوکـات بـوو لەگـەڵ پاککردنـەوەی هەمەلایەنـەی نێـو ریزەکـانی حیزبـی بـەعس بەمەبەسـتی لابردنـی هـەر ئۆپۆزیسیۆنبوونێکی چاوەڕوانکراو بـۆ سـەرکردایەتیی سـەدام حوسـێن. لەهەمان کاتیشدا دەزگایەکی تری ئاسایشی بۆ سەر دەزگاکانی تـر زێتـر کـرد کـە پاراسـتنی بـاری ئـارامیی وڵاتیـان لەئەسـتۆ بـوو. ئەمـەش بەدروستکردنی *ئەمنی خاس* ( هێزی پاراستنی تایبـەت). کـە بـە تـەواویی کاری، وەک دەزگایەکی تایبەتی ئاسایش بۆ سەدام دەکرد.
ساتەکانی سەرکەوتنی یەکجاریی سەدام، بەرزخوازیی ئەو کە سنووری بـۆ نەبوو. لە کوللەمەرگیی تکریتەوە هەڵیگرت بۆ ترۆپکی دەسەڵات لە عێراقدا. کورتخایەن بـوو. لـە مـاوەی سـاڵێکدا، عێـراق خـۆی خسـتە گۆڵمـەزێکی وێرانکەرەوە لـە گـەڵ دراوسـێی بـەهێزی رۆژهەڵاتیـدا کـە هەشـت سـاڵی خایاند. ئەمە جارێکی تر ئەوەی سەلماندەوە کە سەدام توانای ئەوەی هەیە دەرباز بێ تا سنوورێکی بێئەندازە.

## هەڕەشـــە لەلایـــەن ئێرانەوە

گەورەترین دوا شەڕی سـەدەی بیسـت و تەنانـەت لەمێژووشـدا. رژێمێکـی سـێکیولاری عـەرەبیی سـوننیی لـە بەرامبـەر رژێمێکـی فارسـیی، شـیعیی توندڕۆدا راگرت. شتێکی سـەیر نـەبوو شـەڕی نێوانیـان زۆر خوێنـاویی بوو. بەیەکدادانی سـەربازیی درێـژەی کێشـا، کـە هـیچ لایـەکیان بەرگـەی دۆڕانی شەڕەکەیان نەدەگرت. رەگوڕیشەی شەڕی عێـراق-ئێـران چەنـدین سەدە لە دوژمنایـەتی ئێسـنیکیی ( عـەرەب-فـارس) و تایـەفیی( شـیعیی-سـونیی) بـۆ دواوە دەگەڕێتـەوە. ئـەم هەلومەرجـە ژمارەیـەک کێشـەی هەرێمایـەتیی لەناوچەکـەدا دەگرتـەوە. گرنگترینیـان کێشـەی کەنـداوی عـەرەبیی بـوو. رێککەوتنامـەی جـەزائیر کـە لـەقازانجی ئێـران بـوو، لـە هەلومـەرجی باڵادەسـتیی ئێـران و بێـدەرەتانی عێراقـدا رەنگرێژکرابـوو. بـەڵام شۆڕشـی ئیسـلامیی لـە ئێـران و هاتنـەوەی ئایـەتوڵا خومـەینی لـە 1979 دا، دەستی بە پەلەپیتکەی کێشەکەدا نا.

ئێستا رژێمێکی سێکیولار، سۆشیالیست لە بەغداد، سوننە باڵادەستە تێیدا، بەرەنگاری رژێمێکی رادیکاڵی شیعە لە تـاران دەبێتـەوە، کـە بـەڵێنی داوە شۆڕش بنێرێتە دەرەوە بۆ تـەواوی رۆژهـەڵاتی نـاڤین. عێـراق لـەم هێڵـە گراوییەدا یەکـەم بـوو بەردەکـەوت. خومـەینی کـاتی زۆری بـەفیڕۆ نـەدا، بانگەوازی شیعەکانی عێراقی کرد، کە رژێمی چەپـەڵی بـەعس ژێـرەوژوور بکەن. کارە دوژمنکارییـەکانی هـەردوولا بـەخێرایی تەشـەنەی سـەندو لـە سنوورەکاندا بەیەکدادان روویداو تۆپخانەی هـەردوولا وەڵامـی یـەکتریان دەدایەوە. تۆپبارانی سەختی شارەکانی عێـراق لـە سـەرەتای سـێپتەمبەری 1980 دا، وای لەسەدام کرد، کشانەوەی یەکلایەنەی خۆی لـە رێککـەوتنی جەزائیر، لـە 17ی سـێپتەمبەردا رابگەیـەنێت. لەئەنجامیشـدا، ئێرانییـەکان لوولـەی تۆپـەکانیان کـردە ناوچـەکانی کەنـداو لەبـەری عێـراق، ناوچـە نیشتەجێکان و پرۆژە ئابوورییە گرنگەکانیان دەکوتا.

لە 22ی سـێپتەمبەردا عێـراق پـەلاماری ئێرانـی دا. پاڵنـەرەکانی شـەڕەکە روون نەبوون. یەکێ لەشارەزاکان بەمشێوەیە کورتی کردبـووەوە" ترسـی، ئۆپۆرتۆنیزم(هەلپەرستیی) و لەخۆباییبوونی لەپشتەوە بوو.، بڕیاری عێـراق بە پەنابردن بۆ شەڕ، تێکەڵەیەک بوو لە شەڕێکی بەرگرییانـە. ئاوێتەیـەک

له پێوانەی بەرگریکار و دەستدرێژییکار و ئالوودە بە تۆڵەئەستاندنەوە لە رەقیبێکی ناوچەکە بوو"[86]

بەبێ لەبەرچاوگرتنی پاڵنەرەکان، سەدام بەڕوونیی توانای ئێرانی لەبەرەنگاربوونەوەدا نەقەبڵاندبوو. سەدام پلانی چوونەناوەوەیەکی خێرای لەسنوورەوە دارشتبوو. گرتنێکی خێرای ناوچەیەک و لەنێویدا هەرێمی ئێسنیکی عەرەبیی خوزستان: ئەوسا یان دانیشتووانە عەرەبنشینەکەی خوزستان تێکەڵ بەبرایانی تری عەرەبیان دەبن و مەشخەڵی راپەرینێک دژی رژێمی تاران هەڵدەکەن. یان لە خراپترین دۆخدا. عێراق لە جێگەورێگەیەکی بەهێزدا دەبێت و لەوێشەوە لەپێناو ڤێرژنێکی تری رێککەوتنامەی 1975دا کە زۆرتر بە قازانجی بێت ئامادەی گفتوگۆ دەبێت. رێگە چارەی سێیەم نەبوو.

گومانی تێدا نەبوو. سەدام پێشبینیی ئەوەی نەدەکرد کە جەنگ لە چەند رۆژێ، یان چەند هەفتەیەک زێتر بخایەنێت. لەسەرەتاوە ئەم پێشبینییە جێگەی بڕوا بوو. کاتێ یەکە سەربازیی و زرێپۆشەکانی عێراق بەخێرایی پێشڕەوییان کردە ناو خاکی ئێرانەوە. لەسەرەتای ئۆکتۆبەردا. هێزەکانی عێراق شاری خورەمشەهریان گرت و ئابلۆقەی عەبادان، دووەم گەورە شاری ئێرانیان دا. لەم قۆناغەدا نەبوونی رێگە چارەی سێیەم گرفتی دروستکرد. لەجیاتی یەکگرتنیان لەگەڵ برا عەرەبەکانیان، عەرەبنشینەکانی ئێران لە پشت رژێمی ئێرانەوە وەستان و بەرگرییەکی سەرسەختانەیان دژی دەستدرێژیی عێراقییەکان کرد.

تەقەلاکانی عێراق بۆ کۆتاییهێنانێکی خێرا و چارەسەرێکی دیپلۆماسییانە لەلایەن خومەینییەوە رەتکرایەوە.[87] جگە لە تێداچوونی رژێمی سەدام کەمتر، تارانی قایل نەدەکرد. لەکاتێکدا هێزەکانی عێراق ناوچەگەلێکی زۆریان داگیرکردبوو. لەلایەن ئێرانییەکانەوە بە دیل دەگیران. بەبێ ئەوەی ئامانجێکی ستراتیژیی روونیان هەبێ. ئەنجامەکەش شکستێکی کاتیی بوو. بەڵام دواتر لە ناوەڕاستی1982 دا ئێرانییەکان دژە هێرشیان دەستپێکرد. خورەمشەهریان بە کۆمەڵە شەپۆلێکی سەربازیی گرتەوەو 15000 سەربازیی عێراقییان لە پرۆسێسەکەدا بەدیل گرت.

ئەمەش بووە سەرەتایەک بۆ چەندین خاڵی وەرگەڕان دەربارەی شەڕەکە. سەدام هێزەکانی خۆی لەناو خاکی ئێراندا کشاندەوەو کەوتە دۆخی

بەرگرییەوە لەسەر سنوور. لەجولای1982 دا، هێزەکانی ئێران هەلەکەیان قۆستەوەو پێشڕەوییان کرد و هێرشەکانیان پەرەپێداو و هاتنە ناو خاکی عێراقەوەو لەسەر بەسرە هەڕەشەیان دروستکرد. چەندین هەوڵی ئێرانییەکان لەساڵی 1983دا بۆ گرتنی بەسرە، بەچەکی کیمایی عێراقییەکان بەرپەرچ درایەوەو شەڕەکە جارێکی تر سستیی بەخۆیەوە بینییەوە. لەنێوان ساڵەکانی 1984-1986 دا، تەنها سەرکەوتنی زەمینیی لەلایەن ئێرانەوە کرابێ، گرتنی دوورگەکانی دەوڵەمەند بەنەوتی (مەجنون) لە باشووری زۆنگاوەکانی عێراق بوو. بەمشێوەیە، کێشەکە لەنێوانیاندا جەختی لەسەر لێدانی ژێرخانی ئابووریی دەکردەوە.

عێراق بە رۆکێتبارانیی ترێلە نەوتەکانی ئێران و بەندەرەکان هەڵساو ئێران بەهەمان شێوە وەڵامی دایەوە. مەزنترین پێشڕەویی هێزە ئێرانییەکان لە فێبریوەری 1986 دا بوو، کە ئەنجامەکەی گرتنی 310 میلی دووجا بوو لە دوورگەی فاو- ئەم سەرکەوتنە گەورەو ستراتیژییە بەسرەی خستە ژێر مەترسییەکی راستەوخۆوە. ئەمێریکا تا ئەم ساتەش، چەکوچۆڵی بەهەردوولا دەدا، لێرەوە بەئاشکرا لایەنگریی لە عێراق دەکرد، لەسەر داوای کوەیتییەکان، کەشتیی هێزە دەریاییەکانی ئەمێریکا چاودێریی تانکەرە نەوتەکانیان دەکرد لە ناوچەی کەنداودا، بۆ پاراستنیان لە هێرشی ئێرانییەکان.

لە ئۆکتۆبەری 1987 دا، هێزی دەریایی ئەمێریکا سێ بەلەمی دیدەوانیی ئێرانییان نغرۆکرد، لە وەڵام بەوەی گوایە ئێرانییەکان هێرشیان بۆ سەر هێلیکۆپتەرێکی ئەمێریکایی کردووە. لەم کاتەدا، لەسەروو 60 کەشتیی جەنگیی رۆژئاوایی (ئەمێریکایی، بریتانیی، فرانسیی)، لەناوچەکەدا لە ئامادەباشییدابوون بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئێراندا. رەوتی شەڕەکە جارێکی تر وەرچەرخا، عێراق هەلەکەی قۆستەوە، لە نیوەی یەکەمی ساڵی 1988دا، دەستیکرد بە هێرشی مووشەکیی زەمین بەزەمین بەبەردەوامیی بۆ سەر شارە سەرەکییەکانی ئێران، لە ئەپریلدا لەگەڵ کۆمەکێکی بەرچاوی هەواڵگریی ئەمێریکاییەکاندا، هێزەکانی عێراق دوورگەی فاویان گرتەوە و هەروەها لە مەیشدا دوورگەکانی مەجنونیان گرتەوە. بەهەڵداشاخان لەگەڵ هێزێکی زۆری هێزە بیانییەکان لە کەنداوداو هەڕەشەی راستەخۆ لەلایەن

دوژمنکاریی ئەمێریکاوەو بە سوپایەکی شەقوپەقکراوەوە. خومەینی ئەوەی خواردەوە کە بە" پەرداخێک ژار" ناسراو ئاگربەستی پەژراند.

## ئاکامەکانی شەڕەکە

بە دەربڕینگەلێکی ناوچەیی. شەڕی هەشت ساڵە. بەهەدەردانی ئەرکێکی زۆر بوو. لەوەش گرنگتر بەهەدەردانێکی تراژیدیی گیانی مرۆڤەکان بوو. بەس لەعێراق. ژمارەی کوژراوەکان نزیکەی 200.000 کوژراو و 500.000 بریندار بوو[88]. سیاسەتی سەدامی بەرنامەڕێژکراو" تفەنگ و کەرە". کە مەبەستی پارێزگارییکردنی عێراقییەکان بوو لە مالوێرانیی شەڕەکە. پێڕو دەکرا. هاوکات خەرجی سەربازییشی دەکێشا. ئەمەش وای لە عێراق کرد کە نزیکەی 100 بیلیۆن دۆلار قەرزبکا. کە نزیکەی 40 بیلیۆنی بۆ چەکوچۆلی سەربازیی بوو. سەرەڕای ئەمەش. شەڕەکە داهاتی تاکەکەسیی خەڵکی عێراق نیواو نیو کەمکردەوە. وێڕای داڕووخانی ژێرخانی ئابووریی عێراق. کە بە 200 بیلیۆن دۆرلار مەزەندە دەکرا[89] . عێراق لەشەڕەکە هاتە دەرەوە. بەبەهێزترین سوپای پڕچەکی ناوچەکەوە. سوپایەکی یەک ملیۆنیی. نزیکەی بەهەمان ژمارەش سوپای میلیی پاڵپشتیی دەکرد. خاوەنی 4500 تانک و 400 فڕۆکەی جەنگیی و پتر لە 3000 ماشێنی زرێپۆش بوو.[90] بەڵام دەستگرتن بەم سوپایەوە. حەوت لەسەر هەشتی هەموو دەرامەتی هەناردەی نەوتی عێراقی دەویست. ئەمەش قورساییەکی گەورە بوو بەسەر ئابووریی عێراقەوە کە پێشتر بەدەست قەرزەوە دەینالاند.

## میراتی دەسەلاتی بەعس 1968-1988

### بالادەستیی سوننە

لەکاتێکدا حیزبی بەعس لە ساڵی 1968 دا دەسەلاتی گرتە دەست. ریزەکانی خاڵیی بوو لە ئەندامی شیعەو کورد. لە ساڵی 1970 دا نوێنەرایەتیی شیعە لە پۆستە بالاکانی حیزبدا بۆ 14% کەمبووەوە.[91] بۆ حیزبێک کە پڕوپاگەندەی یەکسانیی نێوان عەرەبی سوننەو عەرەبی

شـــيعەی نەكـــرد لـــەناو نەتـــەوەی خـــاوەن ســـەروەری عەرەبـــدا. پەراوێزخستنی بەردەوامی زۆرینەی شیعە لەدەستڕاگەیشتن بـە دەسـەڵاتی سیاسیی كارێكی پڕ لەكێشە بوو. لەهەندێ رووەوە جێگەوڕێگەی سیاسـیی شیعە لە گوتاری 20 ساڵی دەسەڵاتی بەعسدا بەرەوپێشـەوە چـوو. بـەڵام لەهەندێ رووی ترەوە. لەسەردەمی بەعسـدا لـەچاو رژێمـەكانی پێشـووتردا دەسەڵاتی سیاسیی لە دەستی سوننەكاندا زۆرتر پاوانكرابوو.

لەســەرەتـای حەفتاكانـــدا. حیـزب سیاسـەتێكی داڕێـژراوی پێڕۆكـرد كـە كارگوزار بـوو. بـۆ تێكـەڵكردنی هـەرچی شـیعەی زیـاتر لـە هەرەمـەكانی دەسەڵاتدا. لەكاتێكدا نوێنەرایـەتی شـیعە لـە سـاڵی 1968ی ئەجوومـەنی سەركردایەتی شۆڕشدا. كە بڕیارە گرنگەكانی لە ناوستراكتۆری دەوڵەتـدا دەدا. سـفر بـوو. لەسـاڵی 1977 دا رێژەكـە گەیشـتە 28%. هـەروەها نوێنەرایەتی شیعە لە ناو بەرزترین سەركردایەتیی هـەرێمیی ئۆرگانـەكانی جێبەجێكردندا. گەیشە 26% لەهەمان ساڵدا. [92]

كاراكردنەوەی پارلەمان( ئەنجوومەنی نیشتمانیی) بە پێـی یاسـا لـە سـاڵی 1980دا. دەروازەیەكی تری كردەوە بۆ لابردنـی پەراوێزخسـتنی شـیعە. هەڵبژاردن بۆ دەستنیشـانكردنی 250 رێكخـراو بـە پێـی ناوچـەكان بـۆ گەرەنتییدان بەوەی كە شیعە و كـورد لـەو ناوچانـەدا هەڵـدەبژێردرێن كـە لەرووی ژمارەوە زۆرینـەن. بەمپێیـەش ئـەو نوێنەرانـەی هـەڵبژێردران لـە یەكەمین هەڵبژاردنی پارلەمانیی لە ساڵی 1958 ەوە. 43 لەسەدیان شـیعە بوون و 12 لەسەدیان كورد بوون.[93] بەگوێرەی پسپۆڕێك. ئەو سیاسـەتە چەواشانەیەی كە زیادكردنی نوێنەرایەتی سیاسیی شیعەی لەپشتەوە بـوو" بۆ ئەوە دانرابوو كە ئاماژە بدات بە گەنجـە شیعەكان. بـۆ ئـەوەی پـەتی خۆیان بە حیزب و سەركردەوە شـەتەك بـدەن و لـە ئـەنجامی دیفـاكتۆی بالادەســتیی عـــەرەبی ســـوننەدا بـــە شـــێوەیەكی ریاڵیســـتیی لـــەباری كۆمەڵایەتییەوە بەرەو پێشەوە دەچن".[94]

سەرەڕای هەندێ نوێنەرایەتیی لەپارلەماندا. كوردەكان بەشێوەیەكی گشتیی دووچاریی كەساسییەكی خراپتـر هـاتن لـە چـاو شـیعەكانەوە بـەدرێژایی ساڵەكانی 1968_1988. بۆ نموونە تەنها یەك كـورد بـۆ ئەنجوومـەنی ســەركردایەتی شـۆڕش دەرچـوو. لـە سـەركردایەتی هەرێمییشـدا هـیچ پشكێكیان بەرنەكەوت. ئەگەر عێراق لیبراڵ و دیمۆكراسیی بووایە. ژمارەی

هاوبەشـــی دەنگـــدەرانی شـــیعەو کـــورد لەپارلەمانـــدا. بەتـــەواویی کۆنترۆڵی دەدایە دەستیان بەسەر عـەرەبی سـوننەدا. بـەڵام هـەرگیز ئەمـە رووی نەدا. لەسەر کاغەز بەرەشکە دەسەڵات درابوو. لە پراکتیکدا هـەمووی دەگەڕایـــەوە لای ئەنجوومـــەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش. ئەنجوومـــەنیش دەستکردی حیزبی بەعس بوو. حیزبـی بەعسـیش نۆکـەری سـەدام بـوو. بەهـــەمان شـــێوەش کـــاتێ هەنـــدێ شـــیعە چوونـــە نـــاو ئەنجوومـــەنی ســـەرکردایەتی شۆڕشـــەوەو هەنـــدێکیان پۆســـتی وەزارەتیشـــیان وەرگـــرت. هـــەموو شـــوێنە گرنگـــەکانی دەســـەڵات لەدەســـت ســـوننەدا مانـــەوە. بـــەم پێودانگەش. وەزارەتی ناوخۆ و بـەرگریی. ئەفسـەرانی گـاردی کۆمـاریی. زۆرینـەی رەهـای ئەفسـەرانی سـوپا. زۆرینـەی دەزگاکـانی ئاسـاییش و ئەڵقەی راوێژکارە نزیکەکانی سەدام بەتەواویی لە دەستی سوننەدا لەماوەی دیارییکراودا مانەوە.

لەکاتێکدا سیستەمی سیاسـیی بەشـێوەیەکی گشـتیی زۆرتـر نوێنەرایـەتیی هەمەچەشـنەی دەکـرد. بـەڵام بڕیـاردانی سیاسـیی زۆر بـەوردیی جـەختی لێدەکرایەوە. ئاخافتن لەسەر باڵادەستیی عەرەبی سوننە زۆر وردیـی پێـوە نییـە. لەراسـتییدا دەسـەڵات لـە دەسـتی عەرەبـە سـوننەکانی تکریـت و دەوروبەریدا کۆکرابووەوە. [95] هەڵکشانی "مافیای تکریتیی" لە ناو حیزبی بـەعس و سـتراکتۆری سیاسـیی دەوڵەتـدا. لەسـەر بناغـەی "خـوێن لـە ئایدۆلۆژیی لە پێشترە" بـۆ بـەکر و سـەدامیش جێگـەی سـەرنج بـوو. لـە هەلومەرجی سیاسیی عێراقی پڕ لـە توندوتیژییـدا کـە پێشـبینیی نـەدەکرا. پێوەندییـــە عەشـــیرەتییەکان زامنـــی وەفـــاداریی زۆرتـــر بـــوون لـــەچاو ئایـــدۆلۆژیای هاوبەشـــدا. هەنـــدێجار ســـەرجەم ئەنـــدامانی ئەنجوومـــەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە تکریتییـەکان بـوون. تکریتییـەکان باڵادەسـتییان بەسـەر دەسـتەی ئەفسـەرانی سـوپا و گـاردی کۆمارییـەوە هـەبوو. جگـە لـەکۆنترۆڵکردنی دەزگاکـانی ئاسـاییش. یـەکێک لـەهاوکارانی سـەدام گوتبووی" هـیچ نهێنییـەک لـە بـەڕێوەبردنی عێراقـدا نییـە. چـۆن تکریـت بەڕێوە دەبەین. بەهەمان شێوەش عێراق بەڕێوە دەبەین". [96]

لەمـەش واوەتـر. پـاش 1975. سـەدام پشـتی بـە خزمایـەتیی بەسـت لـە دیارییکردنی ئەو ستافانەی شوێنە هەستیارەکانیان لە رژێمدا بەردەکـەوت. لە کۆتایی حەفتاکاندا بنەماڵەی سەدام حیزبـی بـەڕێوە دەبـردو لەوێشـەوە

دەوڵەتیان بەڕێوە دەبرد. کوڕی خاڵەکەی (ژنبرای) عەدنان خەیروڵا تولفاح، وەزیری بەرگریی بوو. بەرزانی زڕبرای دەزگای هەواڵگریی گشتیی ( موخابەرات). زڕبراکەی تریشی، وەتبان، پارێزگاری تکریت بوو. سەعدون شاکریش نووسینگەی ئاساییشی نیشتمانیی( کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو ڕێکخراوە ئەمنییەکانی تردا دەڕۆیشت) بەڕیوە دەبرد. هەروەک یەکێک لەچاودێرەکان دەڵێ" یەکێتییەک بوو لە نێوان بنەماڵەو حیزبدا. یەکەمیان دووەمی وەک ماشێنێک بەکار دەهێنا بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت"[97]

## حوکمکردنی عێراق

زۆرێک لەو گرفتانەی بەعس ڕووبەڕووی بووەوە- مەسەلەی یاخیبوونی کوردەکان لە باکوور، گرفت لەگەڵ ئێراندا لە ڕۆژهەڵاتەوە، جەماوەری داخ لەدڵی شیعە لە باشوور، ترادیسیۆنی کودەتای سەربازیی وەک میرات لە ڕژێمەکانی پێشووەوە بۆ بەعس مابوونەوە. لە هەلومەرجی شەپرێوی سیاسیی لە دەیەی یەکەمی کۆمارییدا لەعێراق، ئەوەی بەدەرخست کە دەرکەوتنی دیموکراسییەکی لیبراڵیی لە ئاستی سفردایە. مانەوەی ڕژێم لەپێش هەموو شتێکەوە بوو. ئەمەش دیسپلین و ڕێکخراوبوون و دڵڕەقیی دەویست؛ پلورالیزمی سیاسیی و ئازادیی سیڤیلیی واتایەکی ئەوتۆیان نەبوو. حیزبی بەعس بەرهەمی بارودۆخەکە بوو. لەماوەی بیست ساڵی دەسەڵاتدا، ڕژێم جێگیریی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی سەپاندبوو. لە کاتێکدا چینێکی پرۆفیشناڵی لە چینی ناوەڕاست و ڕۆشنبیران دروستکردبوو، کە زۆر پێیان وابوو زۆر گرنگن لە فەنکشنی دیمۆکراسییدا. هاوزەمان ڕژێم سەری نەیارانی پانکردەوەو بەمشێوەیەش دوا شوێنەواری پلورالیزمی لە عێراقدا سڕییەوە.

لە سەرەتاوە، هۆکارەکان بۆ مانەوەی ڕژێمی بەعس، بێلایەنکردنی دەزگا ڕکابەرەکان، سەرەکییترین کاریش، دوورخستنەوەی کودەتای سەربازیی بوو- ئەمەش "پاککردنەوە"ی بەپەلەی یەکەمی ئەو ئەفسەرە سەربازییانەی دەویست کە ڕژێمیان بەدەسەڵات گەیاند. بەڵام لەپشتی ئەمەشەوە، مانەوەی درژێخایەنی ڕژێم پێویستی بە دووبارە پێناسەکردنەوەیەکی ڕیشەییانەی سروشتی پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و سوپا بوو. لەکورتماوەدا

دەبووایە سوپا بهێنرێتەوە ژێر ڕکێفی باڵی سیڤیلی حیزبەوە. ئامانجیش لێرەدا چێکردنی " سوپایەکی ئایدۆلۆژیی ". کە دڵسۆزیی بێسنووری بۆ سەدام و حیزب بێت. نەک بۆ ئەفسەرەکانی. سەرکەوتن بە پلەی سەربازییدا. بەپێی تواناو چوستیی نەبوو بەڵکوو بە پێی ئەوەی چەندێک بۆ رژێم وەفادارن و بەتایبەتیش بۆ سەدام.
ئەم ئەرکە زۆر ئاسانکاریی تێدا دەکرا. چونکە تکریتییەکان بەهەمیشەیی لە سوپادا بوونیان هەبووە. سەدام ئەم هەنگاوەی بەولاترەوە برد. ئەوانەی پێوندیی خزمایەتیی هەبوو لەگەڵیدا. بەرزترین پلەی سوپای پێبەخشیتن. سەدام دەزگایەکی لە بەرپرسەکانی سوپا دروستکرد بۆ ئەوەی چاوو گوێی رژێم بن. بەمپێیەش ئەندامە دڵسۆزەکانی حیزب ریپۆرتی خۆیان راستەوخۆ بە سەرکردایەتی حیزب دەگەیاند. کە لەهەموو ئاستێکدا لەگەڵ سوپادا تێکهەڵکێش بوون. هەر زوو رێگە بە هێزە چەکدارەکان گیرا کە ئەندامەتیی هیچ حیزبێکی تر نەکەن جگە لەحیزبی بەعس.. ئەگەر بیکەن تاوانەو هەڵواسینی لەدوا دەبێت. سەرئەنجام بۆ ئەوەی سوپا بزانێ رەشمەی بەدەست "کێ" وەیە. پاکسازیی ناوبەناو دەکراو ئەو هەڕەشانەی لەرەگەوە هەڵدەتەکاند کە پلانیان لەژێر سەردابوو. دژ بە رژێم یان نەیارانی تایبەتی سەدام بوون. زۆر سەخت بوو کە بزانرێ ئەو پاکسازییانەی کە دەکران. هیچ بنەمایەکی راستییان تێدا هەبوو. یان چەندیان دروستکراو بوون .
زۆر لە چاودێرەکان. بەسادەیی پێیانوایە. سەدام ئەم پلانانەی لەمێشکی خۆیدا دروستدەکرد. بۆ مەبەستی سیاسیی رووت ( بۆ لابردنی دوژمن و رکابەرەکانی لە پاکسازیی داهاتوودا). یان دەرکەوتنی بەردەوامی ئەم پلانانە لەحەفتاکاندا لەئەنجامی نەخۆشیی و خۆبەزلزانینی سەدام حوسێنەوە سەرچاوەی دەگرت. لەلایەکی ترە. ئاسانە هەست بە خۆبەلزانیی بکەی. کاتێ ئەو هەموو خەڵکە بەشوێنتەوە بن بۆ راوکردنت.
وەک هێزێکی پاڵپشت بۆ سوپا. سەدام هێزێکی میلیشیایی نیمچە سەربازیی پێکەوە نا. بەناوی سوپای میللیی. بەڕاستییش کردی بە رێکخراوێکی جەماوەریی. لە ماوەی حەفتاکاندا. سوپای میللیی لە زۆریی و بۆرییەوە بوو بە هێزێکی شەڕکەری شەرعیی. ژێرخانی تایبەتیی خۆی هەبوو لە پرۆڤەو خۆبەخشییدا. لە دوو مانگ وانەدانی ئایدۆلۆژیانەدا بۆ

هـەموو کەسـێک، زامنـی دڵسۆزییان بۆ مەسەلەکە ( بۆ نموونە سـەدام) دەکـرا. لەسـەروبەندی 1980 دا ژمـارەی ئەندامـەکانی بـۆ 250000 بـەرزبووەوە. لـە کـاتی جـەنگی ئێـران-عێراقیشـدا. پـانوپۆڕ بـووەوەو ژمارەیان گەیشتە یەک میلیۆن.[98] بە دەربڕینێکی سەربازیی، سوپای میلیی وەک سوپای پێنەدەکرا. بەڵام بۆ مۆبەلایزکردن و ترساندنی خـەڵک، بـۆ کەمکردنەوەی کوودەتای سەربازیی، ئەم میلیشیایانە رۆڵێکـی گرنگیـان لـە رژێمی سەدامدا گێڕا.

سـەدامیش بـە تـەواویی لـە دەسـتکەوتەکانی بـوونی هێزێکـی پاراسـتن گەیشت، لە نێـوان هێـزە چەکـدارە نیزامییـەکان و رژێمـی دەسـەڵاتداردا. گاردی کۆمارییش کـە هێڵـی بـەرگریی کۆتـایی بـوو بـۆ رژێـم، پـانوپۆڕ بووەوە. باشترین پارەو چەکوچۆڵیان، کە رژێـم توانـای دەسـتەبەرکردنی هەبێ، وەردەگرت، بە ئەندامانی جێی بڕواش پڕدەکرانەوە- لەو سـوننانەی لە دەوروبەری تکریت بوون.

دامەزراندن و دەسـتپێوەگرتنێکی تونـد بەحیزبـەوە لەسـوپادا، یـەکێک لـە ئەرکە سەرەکییەکانی مانەوەی رژێم بوو. بـەڵام بەرچاوتـەنگیی بـەعس لـە مانەوەی رژێمیشی رەتدابوو. ئامانجی سەرەکیی، دارشتنەوەی سـەرلەبەری کۆمەڵگەی عێراقیی، لـە روانگـەی حیزبـەوە بـوو. ئەمـەش لادانێـک بـوو، لەبازنەی رژێمـەکانی پێشـوودا نـەبوو. لەسـەردەمی پادشـایەتیی و رژێمـە کۆمارییەکانی پێشووتردا، زۆرینەی رەهای جەماوەر، دەستیان بۆ نەبرابوو لەلایەن سیاسەتی نێوەندەوە. سیاسەت کـاری ئێلێـت بـوو، دانـەچۆڕابووە نـاو جـەماوەرەوە. ئـەم گۆڕانکارییـەی لەلایـەن بەعسـەوە، وایکـرد کـە ئایدۆلۆژی حیزب و ستراکتۆری رێکخراوەیی ببن بە ئامێری کاریگەر لـەم ئاڵوگۆڕانەدا[99].

دروشـمی سـەرەکیی بـەعس(رێنیسـانس) بریتیـی بـوو لـە " یـەکێتیی، سەربەستیی، سۆشیالیزم". ئاماژەیەکی دروست بوو بە ئایدۆلۆژیای بـەعس، ئەم ریزکردنی دروشمانە گرنگیـی رەنگدانـەوەی رێژەیـی ئـەو فەلسـەفەیە بوون. کە یەکێتیی عەرەب هەمیشە خاڵی سـەرەکیی بـووە. " سەربەسـتیی" واتای جیاوازی هەبوو، لەو تێگەیشتنە رۆژئاواییەی بۆ ئازادیی تاکەکـەس هـەبوو. لێـرەدا بـەکارهێنانی سەربەسـتیی مەبەسـت لێـی سەربەسـت لـە ئیمپریالیزم و رێگرییەکانی دروستبوونی تاک (وەک نەدانیی و هـەژاریی).

سەرچاوەی ئەم رێگریانەش لە ئیمپریالیزمی رۆژئاواییەوە بوو کە نۆرم و بەهای رۆژئاوایی بەسەر جیهانی عەرەبدا سەپاندبوو. لە ئۆخێکی وابەستیی و ملکەچییدا رایگرتبوون. مەوداکانی سۆشیالیزم لە بیری بەعسدا زۆر کەمتر بوو وەک ئەوەی لەرووی تیۆرییەوە گەشەی کردبوو. هەتا سالانی شەستەکان. ئەم تێرمە بەرزنەکرایەوە بەفەرمیی بۆ ئەو ئاستەی " یەکێتیی" و "سەربەستیی" تێدابووون. لە وەرگرتنی دەسەلاتیشدا لە عێراق و سوریا. ئامانجیان تەواو دەستبەسەرداگرتنی هۆکانی بەرهەمهێنان نەبوو.

لەم روانگەیەوە. سۆشیالیزمی بەعس. ڤێرژنێکی زۆر نەرمونیانتر بوو لە کۆمۆنیزم. لە راستییدا بەعس توانیی خۆی جیابکاتەوە لە دوژمنە بەهێزەکانی( لەهەموویان گرنگتر. حیزبی شیوعیی سوریا و حشع ) بەجەختکردنەوەیان لەسەر ناسیۆنالیزم.[100] ئەو ئابوورییەی دەولەت بەرێوەی دەبرد. هۆکارێک بوو بۆ بەرجەستەکردنەوەی مولکی نیشتمانیی هێزە بەرهەمێنەرەکان و کۆنترۆلکردنی هێزی ئابووریی لە پێناوی ئامانجی نیشتمانییدا. خالی لاوازو کوشندەی حیزبە شیوعییە عەرەبییەکان. پابەندبوونی کۆیلانەیان بە حیزبی دایکەوە لە یەکێتیی سۆڤێت بوو. ئەم حیزبانە نەیاندەتوانی هاوزەمان لایەنگریی لە مەسەلەی یەکێتیی عەرەب بکەن. لەکاتێکدا شوێن رێنماییەکانی مۆسکۆ دەکەوتن. بەعس بەسەر شیوعییەکاندا سەرکەوت. چونکە پەیامەکەی لەناو خەلکی زەحمەتکێشدا جێگەی خۆی کردەوەو هیچ جێدەستێکی بیانییشی پێوە نەبوو.

پێوەندیی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزمی عەرەبیی ئالۆز و تەمومژاوییە. ئەندازیاری دامەزرێنەری حیزب(میشێل عەفلەق). سەرەرای هەرشتێ. کریستیان بوو. " نەتەوەی عەرەب"یش لە رووی مێژووییەوە بوونی بۆ پێش دەرکەوتنی ئیسلام دەگەرێتەوە. هاوزەمانیش ئیسلام نوێنەرایەتیی تێکەلەیەک لە تاقیکردنەوەی مۆرالیی و گیانیی و فەلسەفیی نەتەوەی عەرەبی دەکرد. لە فۆرمۆلەی عەفلەقدا. " عەرەبیزم لاشەیەکە. گیانەکەی ئیسلامە".[101] بەلام عەفلەق دەستی بە ئیسلامەوە نەگرت وەک داوایەکی سەرەکیی بۆ"هاولاتیبوون" لە نەتەوەی عەرەبدا. لە پراکتیکدا. ئەمە واتای

ئەوەبوو. هەردوو حیزبی بەعس لە سوریاو عێراق. لە دەسەڵاتدا. سێکیولار بوون.
زۆرێک لەو سەرکەوتنانەی بەعسیزم لەوێوە سەرچاوەی دەگرت. کە لە زۆر ئاستدا جێگەی خەڵک قایلکردن بووە. فۆرمۆلەکانی عەفلەق لەچڕییەتیی و ئاڵۆزییدا. لە نووسینەکانی مارکس دەچوو. کە لەدەقەکانیدا بۆ ئیلیتی رۆشنبیران زۆر رۆدەچووە خوار. لەڕاستییدا. زۆربەی ئەندامانی حیزب. بەشێوەیەکی گشتیی لە خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆ پێکهاتبوون. لەهەمان کاتیشدا سانایییەکی مکۆم و باشی تێدابوو کە بەعسیزم بەشێنەیی بڕواتە خوارەوە بەزنجیرەی هزریی.
لایەن پۆزەتیڤەکانی. پەیامی لەدایکبوونەوەی عەرەب. نەتەوەی عەرەبی پێ بوو. بۆ گەڕانەوەی سەروەرییەکانی. لایەنی نەگەتیڤیش ئەوەبوو. بەعسیزم شیکردنەوەی دا بۆ شکستی عەرەب لە بەدەستنەهێنانی یەکێتیی پانعەرەبییدا؛ کە لایەنێکی ترە دەبێ لۆمە بکرێ. بەدڵنیاییەوە. ئامانجی سەرەکیی دوژمنایەتی رۆژئاوا بوو- بەتایبەتیی کۆلۆنیالیستەکان ( بریتانیا و فەڕانس) لەدوای ئەوانیشەوە ولاتە یەککگرتووەکان . لەم ئاقارەدا. بەعس جبەخانەیەکی دەوڵەمەندی لەدوژمنایەتییکردنی رۆژئاوا. لەبەردەستدابوو. کە ناسیۆنالیزمی عەرەبیی. بەدرێژایی چەندین دەیە. پێ پڕچەک دەکرد. یەکێک لە شیکەرەوەکان. سەرەکییترین بۆچوونی ناسیۆنالیزمی عەرەبیی بەمشێوەیە دەردەبڕێ :
لە رابردوویەکی نزیکدا. رۆژئاوا رێگەی لە عەرەب گرتووە بۆ گەیشتن بە چارەنووسی خۆیان(بۆ زۆر لە عەرەبە ناسیۆنالیستەکان هێشتا هەروایە). رۆژئاوا وەک ئەهریمەنێکی سێکیولار. هەر بە دوژمنێک پێناس ناکرێ. لەڕووی فاکتی مێژووییەوە کە جێ مەبەستی ناسیۆنالیزمی عەرەب بێ. بەڵکوو ئەم پێناسەیە بۆ جولانەوەی ناسیۆنالیستیی پێداوییستییەک بوو.[102]
عەرەبە ناسیۆنالیستەکان. پێیانوابوو. جیهانی عەرەب لەڕووی رۆشنبرییەوە لە رۆژئاوا پێشکەوتووترە. بەلام تەبایییەک لەنێوان راستییە تاڵەکانی دواکەوتوویی سیاسیی و ئابووریی و کەڵەگایی سەربازیی سەدەی بیستەمدا قۆچی قوربانیی scapegoat دەویست. ئیمپیریالیزمی رۆژئاوایی بە کاندیدێکی ناسراوەوە- وەک دەوڵەتی بێزراوی ئیسرائیل-

دەرکەوتبوو. " بۆ عـەرەب، ئیسرائیل نموونەیەک بوو بۆ هەموو رۆژئاوا، خەنجـەرێکی ژاراویـی بـوو لەسـەر گـۆی دڵـی نیشـتمانی عـەرەبیی."[103]
حیزبی بەعس سواری شەپۆلی ناسیۆنالیزمی میلیتـانتی عـەرەبیی بـوو کـە هەموو جیهانی عەرەبیی لە پەنجاکاندا گرتەوە: بەڵام هێزێکی ئـەوتۆی لـێ پەیدا نەبوو.
توانستی ئایـدۆلۆژیی بـەعس، بـەهۆی گرنگییـدان بـە لایـەنی ئـابووریی، جیاوازییـە تایـەفیی و ئێسـنیکییەکانی سـمیبوو. ئـەو فۆرمـە نـازدارەی سۆشیالیزمی دەوڵەتیی، ئامادەیی تێدابوو کە چارەسەری ئـەو نایەکسـانییە زۆرە لەبواری ئابووریدا بکات، کە بـە میـرات لـە رژێمـی پاشـایەتییەوە بـەجێمابوو. ئەمــەش دڵدانــەوەو دانرۆکردنــی بــۆ زۆرینــەی شـیعەی پـەراوێزخراو( زۆرترینیشـیان هـەژار) تێـدابوو. هاوکـات بـۆ جـەماوەری کوردیش لە باکووری عێراق شتی تێدابوو. هاوکات پـەیامی سـەرەکییترین رەقیبی بەعس واتـە حشـع ی کـاڵکردەوە. ئایـدۆلۆژیای بەعسـی عێراقیـی رەشمەی لە هێزی ناسـیۆنالیزمی عـەرەبیی (بەهـەردوو دیـودا بـە بـاش و بەخراپ ) بەستبوو. بەستبوویەوە بـە فـۆرمێکی نـوێ لـە ناسـیۆنالیزمی عێراقیی و گرنگییدان بە زۆرینەی بێبەشان، ئـەم فۆرمۆلەیـەش بـۆ ئەوسـا بەهێز بوو.
بەدڵنیاییەوە، هەرگیز حیزبی بەعسی عێراق، پشتی نەبەستووە بـەوەی کـە پەیامەکەی چەند جەماوەرییە، تا لەرێگەیەوە، بۆ پاڵپشتیی لە بـاڵای خـۆی، پاراسـتنی دەسـەڵاتەکەی مسـۆگەر بکـات. رێکخراوێکـی زۆر تونـد و سـەرکوتکەر بـوو، هاوکـات بـۆ سـەپاندنی ملکـەچیی بـۆ حیـزب دژی نـەیارەکانی، خـاووخلیچکیش نـەبوو. بـەدەر لەوانـەش، بانگەشـەی سەرکەوتنی حیزبی بەعس لـە ئـەنجامی توانسـتییەوە بـوو بـە گەیانـدنی زەبروزەنگ بەو عێراقیانەی پێ خوار دادەنـێن. ئەمـەش بـووە پـەیامێکی حیزبیی و لەناو خەڵکدا بە بەرزیی دەنگی دەدایەوە.
ئۆرگـەنایزکردنی حیزبـی بـەعس بـەوە ناسـرابوو، وەک خوێنـدکارێک دارێژرابوو کە لە یەکێتیی سۆڤییەت خوێنـدبێتی. لـە بنچینـەدا کۆپییـەکی تەواوی ستراکتۆری حیزبە کۆمۆنیستییەکان بوو، لە سەرتاسـەری جیهانـدا ( لەناویشیاندا حشع)- تۆرێکی نهێنیی ئاڵۆز، بەشـێوەیەکی هەرەمـەکیی و لەسەر پرینسیپی لێنینیستی" سـێنترالیزمی دیمـۆکراتیی" دارێژرابـوو.[104]

لەرووی تیۆرییەوە، حیزب لەناوخۆیدا دیمۆکراتیی بوو، کاتێ ریزەکانی خوارەوە ئەوانەی سەروو خۆیان هەڵدەبژارد، بەلام لە پراکتیکدا، ئەندامانی سەرکردایەتیی هەرێمیی لەلایەن سەدامەوە هەڵدەبژێردران و پێشکەشی کۆنگرە دەکران بۆ ئەوەی مۆری بکەن.
ستراکتۆری حیزب تا رادەیەکی بەرچاو تەومژاویی بوو لەناو دامەزراوە سیاسیی و دەوڵەتییەکاندا، دەسەلاتی گەورەی بڕیاردان لە دەستی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا بوو، کە حکومەت لەخوارییەوە بوو( بەسەرۆک وەزیران و کابینەکەشییەوە)، دوای 1980 ش، لەسەروو پارلەمانیشەوە بوو. لەڕاستییدا ئەم دوالیزمی ستراکتۆری سیاسییە، گرنگییەکی کەمی هەبوو، حەفتاکان تێدەپەڕیی و دامودەزگا سیاسییەکانی حیزب و دەوڵەت بەشێوەیەکی کاریگەر تێکەڵ دەبوون لەرووی بەناو ئەندامبوونییەوە. بەلام لە ناوەڕۆکدا، ستراکتۆری سیاسیی حیزب، دامودەزگا سیاسییەکانی دەوڵەتی هەڵلوشیی.
لە پراکتیکدا، ستراکتۆری بەعس بۆ دیکتاتۆریی گونجاو بوو. هاوکات نموونەیەکی ئایدیال بوو بۆ کۆنترۆڵکردنێکی سەرجەم کۆمەڵ. بەعس لەهەموو گوندێک، هەموو کارگەیەک، هەموو یەکەیەکی سەربازیی و هەموو قوتابخانەیەکدا بوونی هەبوو. ئەندامبوون لەحیزبدا بەشێوەیەکی هەرەمەکیی بوو، زۆر بەتوندیی کۆنترۆڵکرابوو. ئەگەر کەسێک بیویستایە، ببێت بە ئەندامێکی تەواو لە حیزبدا، پرۆسەیەکی وردی دەویست، کە ماوەی پێنج بۆ دەساڵ خزمەتی دەخایاند. بە هێواشیش بۆ پلەی بالاتری حیزبیی بەرز دەبووەوە. ئەم رێکخستنانە لە دوو سەرەوە جێگەی سەرنج بوون. ستراکتۆرێکی زۆر هاندەرو پێکهاتەیەکی باشی لە ئەندام دەخواست، بەبەردەوامیی دڵسۆزیی و گوێڕایەڵیی خۆی دووپاتبکاتەوە. ئەندامبوون هەمیشە چوارچێوەیەکی دیاریکراویی هەبوو، بەلام حیزب بۆی هەبوو کادری بەتوانا لەنێو لایەنگرەکانییدا، لەکاتی پێویستدا بەرزبکاتەوە. لەم پێودانگەوە، بەعس بزوتنەوەیەکی جەماوەریی، سیاسیی و رەسەن بوو. لە ساڵی 1988دا ئەندامانی تەواو دڵسۆزی بەعس 30000 کەس دەبوون ( نزیکەی 0.2 سەرجەم دانیشتووان)، بەلام حیزب بەشێوەیەکی گشتیی نزیکەی 1.5 ملیۆن لایەنگری لەهەموو ئاستەکاندا هەبوو. ئەمەش نزیکە 10% ی هەموو خەڵکی عێراقی

پێکدەهێنا. ئەمەش ئاماژە بەو ئاقارە دەکات. کە تەبعیسی Ba'athized لەماوەی بیست ساڵدا تێدا دەکرا.

تێگەیشتن لە پێداویستیی بڵاوکردنەوەی بەهاکانی بەعس لەناو هەرزەکاراندا. کۆنگرەی حیزبی راسپارد لە ساڵی 1974 دا بۆ رێکخستنی لاوانی عێراق بەمشێوەیە:

حیزب، خۆی هەوڵێکی زۆر و بەپەلە بدات بۆ یارمەتییدانی چالاکیی رێکخراوەکانی لاوان، دەبێت زۆرینەی لاوان لەخۆ بگرن. کوڕان و کچان. هاوکاریی ئەو چالاکییانە بکەن کە پانعەرەبیی و پرینسیپی سۆشیالیستیی دەچێنن لەنێویاندا. هانی تێڕوانین و فێرکردنیان بدرێ لەسەر ئەو رێگایانەی تا لە ستراکتۆری شۆڕشگێڕییدا. لە بەرگریی نیشتمانیی و ئەرکەکانی پانعەرەبییدا. بەتەواویی بەشداریی بکەن.[105]

بەمپێیە، منداڵان لەرێکخراوی پێشەنگاندا{ تەلائیع} ( لەتەمەنی 6 ساڵییەوە بۆ 10 ساڵیی). رێکخراوی پێشڕەوان( لەنێوان 10 – 15). رێکخراوی لاوان( لە 15 -20). رێکخدەخران. لە زمانی یەکێ لە چاودێرانەوە." ئەمانە رێکخراوگەلێکی ئاشکرا نین، بەڵکوو بەشداریی لەشۆڕش و حیزبدا دەکەن."[106]

بۆ چوونە ناو دڵ و دەروونی لاوانەوە. تا ئاستێکی باڵا. حیزب دەستیکرد بەدانانی پرۆگرامی خوێندن بەخۆڕایی و بەتۆبزیی بۆ لاوان و دەستکارییکردنی پرۆگرامەکانی خوێندن لە هەموو ئاستەکاندا بۆ جەختکردنەوە لە" خولیای سەرەکیی نەتەوەی عەرەبمان و ئامانجەکانی لە یەکێتیی و سەربەستیی و سۆشیالیزمدا."[107] هەروەها داوایەکی یاسایی هێنایە گۆڕێ، کە هەموو مامۆستاکان" لە چوارچێوەی پرینسیپەکانی" حیزبی بەعسدا بن. پێداگریی بەعس لەسەر بڵاوکردنەوەی بەهاکانی بەعس لە ناو خەڵکدا. دەرفەتی بۆ ئۆڵتێرنەتیڤێکی سیاسیی تر نەهێشتەوە. بانگەشەی پلورالیزمی سیاسیی لەرێگەی بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتووخوازەوە مکۆمکرایەوە( حشع و هەندێ گرووپی کوردیی لەخۆگرتبوو).

بەڵام کاتێ حشع بە ئاشکرا کەوتە رەخنەگرتن لە سیاسەتەکانی بەعس. مەرگی خۆی دەستنیشانکرد. لە 1978 بەدواوە. راوەدوونانی ئەندامانی حیزب بەسیستماتیکیی. بەگرتن و ئەشکەنجەدان و سێدارەدان

دەستپێکرد. لە 1979 تا سەرکردایەتی حشع، یان وڵاتیان بەجێهێشت ( بەتایبەت بەرەو سوریا)، یان رووبەڕووی چارەنووسی مەرگ دەبوونەوە. هەروەها هەندێ لە ئۆپۆزیسیۆنی سیاسیی لە لایەنە لیبراڵەکان( زۆرینەیان لە ئێنتەڵەجێنسیا و چینە پیشەگەرەکان) رووبەڕووی هەمان رەفتاربوونەوە، بەڵام هەرگیز ئەمانە لە رێکخراوێکی سیاسیی یەکدەستدا رێکنەخران. لەبری ئەوەی راستەوخۆ رووبەڕووی رژێم ببنەوە، زۆرینەی لیبراڵە بەرهەڵستکارەکان زۆر بەسادەیی، سەری خۆیان هەڵگرت و کۆچیان کرد. لەهەشتاکانەوە، بەعس بەئاسانیی مۆنۆپۆلی بیروباوەڕە سیاسییەکانی کردبوو.

لە کاتێکدا گومانی هیچ مەترسییەک نەدەکرا لە هەڵبژاردنی پارلەمانییەوە سەرچاوەبگرێ (کە لە 1980 و 1984 دا کران)، بۆ بەرهەمهێنانی ئۆپۆزیسیۆن لە دژی بەعس، هەر بۆ دڵنیاییش، هەموو کاندیدەکانی هەڵبژاردن لەسەرەتادا لەلایەن بەعسەوە دەبووایە بهاتنایەتە پەژراندن، بۆ تەتەڵەکردنی هەموو ئەو توخمانەی جێگەی باوەڕنەبوون. ئەم کردارانە لە کردەوەی رژێمەکانی پێشوو، جیاوازتر نەبوون. بەدرێژایی مێژووی عێراق، سەروگوێلاکی دیموکراسیی بەوردیی دارێژراوە. رێگەش بە ئۆپۆزیسیۆن دراوە تەنها تا ئەو ئاستەی کە هیچ مەترسییەکی بۆسەر ستراکتۆری دەسەڵاتی دامەزراو نەبووبێت. بەڵام ئەو دۆخەی بەعسی تێدابوو جیاواز بوو لە بەرچاوتەنگییەکانییدا. بۆ یەکەمجار لەمێژووی عێراقدا، هەوڵێکی زۆر درا، بۆ ئەوەی پەیامێکی سیاسیی بخرێتە ناو سەرتاپا دانیشتوانەوە. تەنها کات دەتوانێ سەرگوزەشتەی ئەوە بگێڕێتەوە، کە چەند لەڕووی سایکۆلۆژییەوە خەڵکی عێراق باجی ئەم دەستدرێژییانەی داوە، کە بۆ سەر دڵ و دەروونیان کراوە.

### بەکارهێنانی توندوتیژیی

بۆ شیکردنەوەی بەکارهێنانی توندوتیژیی وەک ئامێریکی سیاسیی لەسەردەمانێکدا بە لەسێدارەدان بەبەرچاوی خەڵکەوە و بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی لەکوردستاندا کۆتایی هات، رەنگە ئەو گرنگییەی نەبێ. حیزبی بەعس لەسەر دەستی سەدام، بە تێڕوانینێکی گشتیی واتای توندوتیژیی و تۆقاندنی دەگەیاند. بەڵام پێوەندیی دەسەڵاتی بەعس و

بەکارهێنانی توندوتیژیی زۆر لەوە ئاڵۆزتربوو، کە لەسەرەتاوە بەدەرکەوت. لە سەردەمی رژێمەکانی پێشووتردا - بەتایبەت قاسم- توندوتیژیی گشتیی بەربڵاوتربوو. جا ئەو کارە توندوتیژییانەی حشع لە موسڵ و کەرکوک پێی هەڵدەستا، یان ئەو بەیەکداهەڵشاخانە توندوتیژییانەی لە نێوان میلیشیا رکابەرەکاندا و لە شەقامەکانی بەغدادا هەبوو. هەموویان فۆرمێک لەتوندوتیژیی بوون و نیشانەی هەڵتەکاندنی سیستەمی گشتیی بوون.
ئەم توندوتیژییە ئانارشیستییانەیە بەشێوەیەکی بەربڵاو لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا کۆتایی پێهات. لە کاتێکدا حیزب چەپۆکی بەسەر کۆمەڵگەی عێراقییدا توندوتۆڵتر دەکردەوە. بەمشێوەیە سەقامگیریی بەسەر ئەو سیستەمە پڕ لەئاژاوەیەدا سەپاند. لەم پێوەندگەوە، حیزبی بەعس باڵی بەسەر کۆمەڵگەیەکی ئارامتردا گرت لە چاو ئەوانی پێشووتردا. بەدڵنیاییەوە ئەم ئارامییەش باجی خۆی هەبوو. بەکارهێنانی توندوتیژیی لەسەردەمی سەدامدا، زۆر رێکخراوترو سیستەماتیکتر بوو. توندوتیژیی بوو بە ئامێرێک بەدەستی دەوڵەتەوە بۆ کۆنترۆڵکردن. تا ئەوەی ببێ بە سیمبۆڵێک لەکاتێکدا دەوڵەت کۆنترۆڵ لەدەست بدات. بەلام زۆر گرنگە ئەمە لەبەرچاو بگیرێ. ئەوانەی بەر ئامانجی ئەم توندوتیژییەی دەوڵەت دەکەوتن، چ بەشێوەی زیندانیی، ئەشکەنجەدان یان مل بەپەتاکردن لە بەرهەڵستکارانی رژێم بوون- بەسروشتییش کوردەکان، هەندێ لەتوێژەکانی جڤاکی شیعە، ئەندامانی حشع، ئەفسەرانی سوپا و رکابەرانی سەدام، ئەوانەی لە هەرەمی حیزبی بەعسدا بوون.
پەیامەکە زۆر روون و ئاشکرا بوو، هەرکەسێ دژایەتی رژێم بکات، دەبێ مامەڵەیەکی زۆر دڵرەقانەی لەگەڵدا بکرێ. لەوانەیە جێگەی سەرسوڕمان نەبێ، زۆرینەی دانیشتوان دژایەتیینەکردنی رژێمیان هەڵبژارد، بۆیە بەر دڕندەیەتییەکەی نەکەوتن. ئەو بڵاوکراوانەی لەسەر عێراقی سەدام دەردەچوون، جەختیان لە درێژەی ئەو شێوازە دڕندانەیەی ئەشکەنجەدان دەکردەوە کە دەزگاکانی هەواڵگریی بەکاریان دەبرد، پێمان دەڵێن " کاتێ سەدام دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت.... وا دەقەبڵێنرا کە رژێم 107 جۆرە ئەشکەنجەی دژی نەیارەکانی تاقیکردبێتەوە."[108] کە ناشبێ ئەم خاڵە لەبیرمان بچێتەوە. بەکارهێنانی توندوتیژیی لە نێو رژێمەکانی رۆژهەلاتی

ناڤینــدا لــەو ســەردەمەدا هاوشێوە بوونــە.[109] ئــەوەی رژێمــی بەعســی جیادەکردەوە، ژمارەی تەکنیکەکانی ئەشکەنجەدان نــەبوو. بــەڵکوو رادەی ئەو سەرکوتە بوو کە دەزگاکانی دەوڵەت پێیگەیشتبوو. چاو و گوێی رژێم لەهەموو شوێنێ بوو. ئەمەش لەئەنجامی داچۆڕانێکی قــووڵی ســتراکتۆری حیزبەوە بۆ ناو کۆمەڵگە، بەدەستهات. هەروەها لەرێگەی تۆڕی ئاڵۆزەوە لە رێکخراوەکانی ئاسایش، کەدەسەڵاتێکی رەهایان هــەبوو. لــە هەشــتاکاندا لای کەم، پێنج ئۆرگانی ئاسایش لــە عێراقــدا هــەبوو. پتــر لــە 200000 کەس کاریان تێدا دەکرد.[110] هەر یەکە لەم ئۆرگانانەش تــۆڕێکی پــانوپۆڕ لە هەواڵگرەکانیان لەخۆگرتبوو بۆ چاودێری خەڵک( چاودێری یەکتریش).
کۆنترۆڵکردنی رژێم لەرێگەی توندوتیژیی بەردەوام و بــەربڵاوەوە نــەبوو. بەڵکوو لە رێگــەی هەڕەشــەی بــەردەوام و ســەرتاپا توندوتیژییــەوە بــوو. بەرەنگارییکردنــەوەی رژێــم مــەرگی بــەدواوە بــوو، هــەرچۆن بووایــە. دەدۆزرایــەوە و بەتونــدییش ســزای وەردەگــرت. لــەزمــانی یــەکێ لەشارەزایانەوە ئــەم سیســتەمە " زۆر ســەرکەوتووبوو لــە یــەکێ لــە هــەرە ئۆبجێکتیــڤ و ئامانجــە ســەرەکییەکانی: گەشــەپێدانی هەســتکردن بــە بێدەسەڵاتیی لەناو خەڵکدا بوو."[111]
لەوانەیە پیرۆزکردنی توندوتیژیی دژی گرووپی کەمە نەتەوەکان، زۆرتر لــە رۆتینــی بــەکارهێنانی ئەشــکەنجەدان، ســەختتر بــووبێ. کولتوورێــک کــە دەگەڕێتــەوە بــۆ کۆمەڵکوژییەکــەی ئاشــوورییەکان لــە 1933 و بەرنامــە شەڕانگێزییەکەی دژی جوولەکــەکانی بەغداد لەسالی 1941دا. هــەروەها لــەژێر دەســەڵاتی بەعســدا. جووەکــان ئامــانجی راســتوخۆبوون. گوللەبارانکردنی ئاشکرای 14 کەس بەتۆمەتی پلاندارشــتن لــە 1969 دا گرنــگ بــوو. چونکــە ترانداپــەتیی رژێمــی بەعســی دەرخســت. هــەروەها هەلومــەرجی تێگەیشــتنێکی قــووڵ و گشــتیی لەســەر عێــراق نیشــاندا کــە دەچووە ناو دەیەی شەشەمەوە. نە گوللەبارانکردنی بەکۆمــەڵ و نــە ئــەنتی زایــۆنیزمی چەپەڵانــە. لــەو ســەردەمەداو لــە رۆژهــەڵاتی ناڤینــدا کــارێکی نائاسایی نەبوو. بەڵام ئەوەی نائاسایی بوو ئەو کەفوکوڵەی شایلۆغان بوو کــە هاوشــانی کەشــێکی تۆقێنــەریش بــوو. کــار گەیشــتە ئــەوەی یــەکێک لــەچاودێران، وا باســی بکــات لــە " پۆرنــۆگرافی pornography ژێــر چاودێریی دەوڵەت"[112] واوەترە.

پشـــووی گشـــتیی بـــۆ دەربڕینـــی خۆشـــیی لەبـــەر هەڵواســـینەکان ڕاگەیەنـدرا. لـەنێوان 150000 بـۆ 500000 لـە هاوڵاتییـانی سـادەی عێراقیـی لـە گۆڕەپـانی ئـازادیی جـەمکران بـۆ بینینـی هەڵواسـینەکان و چێژوەرگرتن لە " ئەتمۆسفیری کەرنەڤاڵ"ەکە بەدەم خواردنـەوە لـەناو 14 لاشەکەدا هاتوچۆیان دەکرد. رادیۆی بەغداد هانی هاوڵاتییە عێراقییـەکانی دەدا، بۆ " هاتن و چێژوەرگرتن لـە ئاهەنگەکـە."[113] بەرپرسـانی حیزبیـی ئامادەبووانیان سەرگەرمکردبوو بە وتەی پڕلەکەفوکوڵ دەربـارەی وریـایی دژی زایۆنیستەکان، ئیمپریالیستەکان و هەر کەسێک کـە بیـەوێ مەترسـیی بۆسەر پیرۆزییەکانی شـۆڕش دروسـتبکات. وەزیـری ڕاگەیانـدن، سـەلاح عومەر ئەلعەلی بەجلێکی پۆشتەوە دەرکەوت:

ئەی گـەلی مـەزنی عێـراق! عێراقـی ئـەمڕۆ، لـە هـیچ خـائین و سـیخوڕ و تابوورێکی پێنجەم خۆشنابێ! تۆ ئەی ئیسرائیلی هەتیوچە foundling ، ئەی ئەمێریکاییە ئیمپیریالیستەکان و ئەی زایۆنیستەکان، گوێ رادێرن!.... هـەموو سـیخوڕەکانتان هەڵدەواسـین، ئەگـەر بەهـەزارانیش بـن.....ئـەی عێراقییە مەزنەکان! ئەمە هـەر بەرکوڵێکـە! گۆڕەپانـە مـەزن و نـەمرەکانی عێراق بەلاشەی خائینەکان و سیخوڕەکان لێوانلێو دەکەین. جاری چاوەڕێ بن![114]

چـــاوەڕوانیی زۆری نەکێشـــا. دیمـــەنی ئـــەو جـــەماوەرە بەرینـــە. بەیەکگەیشتنێکی نامۆ بوو لەنێوان بەعس و خەڵکدا. مەبەستیش لێی دانـی "ڕەوایی" بە ڕژێمی نوێ بوو.[115] لەبەرئەوەی بەعس بـەدوای شـەرعییەتدا وێڵ بوو، ئەمەیشی لەڕێگەی پیرۆزڕاگرتنـی گوللـەبارانکردنی بەکۆمەڵـەوە دەسـتبەر دەکـردو بەخـەڵکی گەیانـد سروشـتی دیکتـاتۆریی و بەشدارییکردنی سیاسیی لەعێراقی 1969 دا چۆنە.

بەدەر لە " دوژمنانی دەوڵەت". کوردەکان وەک هەمیشە بەرگـەی زۆرتـرین هێزی سەرکوتکەری دەوڵەتیان گرتووە. ڕژێمی بەعس بەتوندیی دەستی بە ترادیسیۆنێکی کۆنەوە گرتبوو: پێشنیازی ئاشتیی(بـۆی هـەبوو درۆزنانـە بـێ) بـۆ کوردەکـان کـرد (مانیڤێسـتۆی {بـەیانی} ئـازاری 1970). چارەسـەرێکی قۆنـاغ بـە قۆنـاغ بـۆ ڕێککەوتنامەکـە. لەکاتێکـدا کەسـیان نـەیانتوانی بـڕوا بـەوەی تریـان بکـەن (197401970)؛ لـە دواییشـدا کێشـەیەکی بـەرفراوان، کـە هێـرش دەکرایـە سـەر هێـزە کوردییـەکان

"پێشمەرگە" بەبێ پسانەوە. بەڵام هەرگیز بەتەواویی لەلایەن سوپای عێراقەوە ( 1975 ) لەناونەچوون. لەدوای 1975یشەوە توانستی رژێم بۆ کۆنترۆڵکردنی رووداوەکان لە باکووردا هەڵکشا. بەهۆی جیاوازییەکی گەورەی نێوان هەردوو زلحیزبی کوردستان- یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان( ینک PUK) و پارتیی دیموکراتی کوردستان( پدک)ەوە. لێرە بەدواوە، بەپشتبەستن بە پێوەندیی نێوان هەردوو باڵە کوردییەکە، رژێم زۆربەی کات دەیتوانی یەکێکیان لەدژی ئەویتریان بەکاربێنێ. وەک ئەو نموونەیەی لەساڵی 1983 دا روویدا. جیاوازییەکانی نێوان کوردەکان دەرفەتی بۆ بەغداد رەخساند. تا ئاگربەست لەگەڵ ینک دا بکات، لەهەمان کاتیشدا دەستدرێژیی بکاتە سەر ئەو دەڤەرەی بەدەست پدک ەوە بوو. لەنێوان 5000_8000 نێرینەی سەر بە پدک راپێچران و چارەنووسیشیان زۆر بەسانایی " بێسەروشوێن" کردن بوو. بە گوێرەی قسەکانی بەغداد بێت" سزای خۆیان وەرگرت و رەوانەی دۆزەخ کران."

بەڵام لەوەش ساردتر بەڕێوە بوو. لەساڵی 1987 دا بەرەو تەواوبوونی شەڕی ئێران-عێراق، ینک و پدک، جارێکی تر یەکدەست بوونەوە لە بەرەی کوردستانیی عێراقدا. چالاکانە کۆمەکی ئێرانییەکانیان بۆ کردنەوەی بەرەیەک لە باکوور دژی هێزە عێراقییەکان دەکرد. سەدام، عەلی حەسەن ئەلمەجیدی ئامۆزای راسپارد. تا " چاوی" لە کوردەکان بێت. بۆ ئەلمەجیدی پڕ لەکەفوکوڵ، ئەمە واتای" ناشتنیان بە بولدۆزەر." [116] بوو. بەشێوەیەکی وردتر، کەمپەینێکی بێ پسانەوە لە ئابلۆقەدان بوو. بەسەر هەموو ناوچە کوردنشینەکانەوە. لەساڵی 1987 ەوەو بە تایبەتیی لە فێبریوەری 1988 بەدواوە، کەمپەینی ئەنفالی ناوزراو( بەواتای دەستکەوتەکانی شەڕ). بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەخۆگرت و خاپوورکردنی 4000 گوندی کوردیی گرتەوەو راگواستنی نزیکەی50000 کەسیشی لێکەوتەوە. لەیەکێک لەهێرشەکانی بە گاز دەکرا( لەشارۆچکەی هەڵەبجە). لەسەروو 5000 کوردەوە ( ژنان و منداڵانیش)، لە هەلومەرجێکی ترسناکدا تێداچوون.

لە ساڵی 1925 ەوە، کاتێ پرۆتۆکۆڵی جینێڤ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەمەیدانی شەڕدا قەدەغە کرد. زۆر کۆمەڵە یاسای نێودەوڵەتیی

سەرپەرشتیی ئەو کۆبانــەی دەکرد کە بــە ســەردەمی شــەڕەوە بەســتراون. لەماوەی ساڵ و نیوێکدا، عێراق هەموو پەیمانەکانی ناو ئەو پەیماننامەیــەی ژێر پێ خست. لەکاتێکدا ئەو کردەوەیە زۆر کاریگەر و دڵڕەقانە بــوو. لــە زمانی مەسعود بارزانییەوە هاتووە" هەموو شتێ تەواو بوو. شۆڕش تەواو. ناتوانین بەدەستی بەتاڵ بەرەنگاری چەکی کیمیاویی ببینەوە."[117]
مامەڵەی سەدام لەگەڵ شیعەدا زۆرتر فرۆفێڵاویتر بوو. ئــەو توندوتیژییــەی بەرامبەریشــیان بــەکاردەهێنرا. زۆر هــەڵبژاردە بــوو. هــەروەک هەمیشــە وابووە. ئەوە سەلمێنرا کە چارەسەرکردنی جیاوازییە تائیفییەکان ( سونیی و شــیعیی ) ئاســانترە لــە جیاوازییــە ئێســنیکییەکان ( کــوردیی- عــەرەبیی) .[118] ئامــانجی ســەرەکیی هێــزە ســەرکوتکەرەکانی رژێــم، ســەرکردایەتیی ئــایینیی باشــوور بــوو. لــە نێــوان 1920 و1960 دا، سەرکردە دینییەکان لە دۆخێکی جێگیریــی سیاســییدا دەیناگوزەرانــد. بــە تــەواویی کشــانەوە لــە بەشــدارییکردنێکی چالاکــدا لــە دامودەزگاکــانی دەوڵەتدا. هەروەها تاڕادەیەکی بەرچاو، ئۆپۆزیسیۆنبوونی ئاشکرایان لــێ قەدەغەکرابوو. بــەڵام دەرکــەوتنی دەعــوە، رێکخراوێکــی فەندەمێنتالیســتی شــیعە/ گرووپێکــی تێرۆریســتی. ئامانجــەکانیان لــە رۆژهــەڵاتی ناڤینــدا برەوپێدانی شۆڕشی ئیسلامیی بوو.
ئەم دینەمیکە بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕدرا. بەسیاسییکردنی ئایین لــەژێر کاریگەریی کارێزمایی محەمەد باقر ئەلسەدردا، هەڕەشەیەکی سەرەکیی بوو بۆ رژێمی بەعســی ســێکیولاری سونیی. ســەرپانکردنەوەی ئەلــدەعوە لــە ساڵی 1974 ەوە بە لەسێدارەدانی چوار کــەس لــەو گرووپــە سیاســییە قەدەغــەکراوەی ئەوســا. بەهــەرحاڵ لــە ســاڵی 1977ەوە، یــەکێ لەپایــە فەندەمێنتاڵەکانی سیستەمی حیزبی بــەعس- زەقکردنــەوەو جیاکردنــەوەی ئایین لە سیاســەت بــوو. ســاڵی 1977 رووبەڕووبوونــەوەی تونــدوتیژی لێکەوتەوە، کاتێ رژێمــی دەســەڵاتدار ویســتی دەســەڵاتی خــۆی بســەپێنێ بەسەر دامەزراوە دینییەکاندا، بە رێگەگرتن لە مەراسیمی ئایینی ساڵانە لــە نێوان هەردوو شارە پیرۆزەکەدا، نەجەف و کەربەلا. لە تێکهەڵچوونەکانــدا، 60 گەشــتیار لەلایــەن پۆلیســەوە کــوژران، لەســەروو 2000 کەسیشــەوە گیــران. "دادگایــەکی تایبــەت" ی چێکــراو، بڕیــاری مــەرگی بەســەر 8 لــە

پیاوانی ئایینی شیعەدا و زیندانی هەتاهەتاییش بەسەر 15ی تردا سەپاند .
لەم نۆخە بارگرژە بەردەوامەدا. شۆڕشی ئیسلامیی لەئێران و دەرکەوتنی رژێمێکی فەندەمێنتالیستی سەرسەختی شیعە لە ژێر رابەرایەتیی ئایەتوڵا خومەینیدا. شتێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ دامرکاندنەوەی ئەم هەڵکفانە. خومەینی ژاری دەرشت لەدژی بەعسییە سێکیۆلارە قێزەونەکان. پارەشی هەڵرشت بۆ گرووپە چەکدارە ئیسلامییەکان. کە لەناو خاکی عێراقدا بوون- دیارترینیشیان *موجاهیدین*( جەنگاوەرە باوەڕ پیرۆزەکان ) بوو .
ئەلدەعوە بەهەرشێوەیەک بوو. بەرەنگاری نفوزی ئێرانییەکان بووەوە و تێکەڵی نفوزی بێگانە نەبوو. لەساڵی 1979 ەوە گرووپە ئیسلامییەکان. چالاکییەکانی خۆیان بردە ئاستێکی بالا. شەڕی گەریلایی بچووک بچووکیان دەکرد دژی سیمبۆڵەکانی رژێم- تەنها لە باشووردا نا. بەڵکوو لە گەڕەکە شیعییە هەژارنشینەکانی بەغدایشدا. خۆپیشاندەرەکان لە باشووردا. دروشمیان بۆ لایەنگریی لە خومەینیی دەگوتەوەو داوای دەرپەڕاندنی سەدامیان دەکرد.
سەدر فەتوای ( بڕیاری ئایینیی ) یەکی ناحەکیمانەی دەرکرد. دژی ئەندامانی حیزبی بەعس- وەک رووبەڕووبوونەوەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ رژێمدا. مەسەلەکان گەیشتە لووتکە. لە ئەپریلی 1980 دا. کاتێ هەندێ ئەندامی دەعوە بۆسەیان بۆ جێگری سەرۆک وەزیران تاریق عەزیز نایەوە. لەکاتی سەردانی بۆ زانکۆی موستەنسریە لە بەغداد. ئەو هەوڵی تێرۆرکردنە بە نارنجۆکی دەستیی. عەزیز بەسووکیی بریندار بوو. بەڵام ژمارەیەک خوێندکار بەرکەوتن. لەکاتی ناشتنیشیاندا. ئەلدەعوە دووبارەی پەلاماری دایەوە و هەندێ کەس پێکران.
سەدام ئاگری تێبەربوو. فەرمانی گەمارۆدانی میلیشیاکانی دەرکرد. سەدان گوللەبارانکران. هێزەکانی ئاسایش نێردران بۆ نەجەف بۆ دەستبەرداگرتنی سەدر و خوشکەکەی ( بنت ئەلهودا ) . هێنران بۆ بەغداد و لەسێدارەدران- سەدر پێدەچوو مێخیان لەسەری داکوتابێ. هەروەها لەسێدارەدانێکی بەربڵاو. نزیکەی 40000 شیعەی عێراقیی گومانلێکراویان (ئەوانەی هەر پێوەندییەکیان بە ئێرانەوە هەبووبێ) بە زەبری هێز دیپۆرتی ئێران کردەوە.

بەشێوەیەکی گشتیی، 20 ساڵی یەکەم لە دەسەڵاتی بەعس، لەسەر توندوتیژیی- بەشێوەیەکی بەربڵاو، وەک ئامێریک لە کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسییدا، بەهەڕەشە و چاوسووورکردنەوە راگیرا بوو. بەڵگە بۆ درانداییەتی رژێمی بەعس. لەژێر دەستی سەدامدا زۆر زۆرە. دوو لە ئەدگارەکانی دەسەڵاتی سەدام پێویستە جەختیان لێبکرێتەوە. یەکەم، رژێم بەدرێژایی تەمەنی، بۆ دەربازکردنی سەری، بەرەنگاری هەندێ هەڕەشەی راستەقینەو مەترسییدار بووەوە. هەندێ لەم هەڕەشانە لەئەنجامی هەڵسوکەوتی رژێمەوە بوو، بەڵام زۆربەیان لە ئەنجامی هەلومەرجی سیاسیی ناو عێراقەوە بوو. ئەم کۆمەڵە جۆراوجۆرە لە مەترسیی کە بۆیان هەبوو بتەقنەوە لەهەمبەر سەلامەتی سەری رژێمدا. جگە لە پیاوێک کە ئامادەبوو بۆ بەکارهێنانی هەرهۆکارێکی سەرپانکردنەوە لەکاتی پێویستدا، بوون بەهۆی خوێنڕژانێکی زۆر.

دووەم، سەدام سیاسییەکی زۆر لێزان بوو، زۆر بەباشی گرنگیی سزادان و خەڵاتکردنی دەزانی، پێشبینیشی هەبوو لەوەی کامیان لە کات و جێگەی خۆیدا بەکاربهێنێت. بەدڵنیاییەوە گۆپاڵێکی گەورەی بە لێوەشاوەییەوە بەکار دەهێنا. بەڵام ئەمە بەتەنها سەرسەلامەتیی و جەماوەرییبوونی ئەو لەناو خەڵکێکی زۆری عێراقدا شرۆڤە ناکات. تەنانەت ئەوەش شیی ناکاتەوە کە چۆن سەدام لەچاو هەر سەرکردەیەکی پێشووتری عێراقدا لەچێکردنی وێنەیەک لە ئایدێنتیتی لەنێوان دانیشتوانە عەرەبنشینەکەی عێراقدا کاراتر بوو. بەداخەوە، ئەوە ئایدێنتیتی عێراقیی بوو کە نەیتوانی درێژبێتەوەو کوردەکان لەخۆ بگرێ، لە ئەنجامی ئەوەشدا زۆریان چەشت.

## یەکێتیی نەتەوەیی

ئایدۆلۆژیی بەعس لە میلیتانتی پانعەرەبیزمەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر لەبناغەوە، بۆچوونێکی هەڵتەکیو و مەترسییدار بوو بۆ چێکردنی ئایدێنتیتی عێراقیی، پەیامی دیارییکراوی حیزب زۆر کەم بری کردە دەرەوەی چەقی قورسایی سوننەوە. گومڕاییەکی زۆری لەناو شیعەو بێباوەڕییەکی زۆریشی لەناوکوردەکاندا لێ کەوتەوە. لە دوو ساڵی یەکەمدا یان نزیک بەو ماوەیە لە دەسەڵاتی بەعس، هەوڵەکانی بۆ پانعەرەبیزم دەدرا، خەریک بوو سەری رژێم بخوات. بە تێچوونێکی ئابووریی زۆر،

حیزبی بەعس توانیی 25% ی سوپاکەی لە ئوردن، وەک هێزی یەدەکی پاراستن بهێڵێتەوە، ئامادەبن بۆ هەر دوژمنایەتییەک لە دژی ئیسرائیل دەست پێبکات. لە بەغدادەوە، دوور و بێوەی، رژێم بانگەوازی هەموو وڵاتە عەرەبییەکانی دەکرد بۆ رابوون دژی "قەوارەی زایۆنیی"چەپەڵ. جوێنبارانی هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکانی دەکرد. کە سەرکەوتنیان لەو دوژمنایەتییەدا بەدەست نەهێناوە. پێکەوەگونجانی ئایدۆلۆژیی لەحیزبدا بوونی نەبوو. لەکاتێکدا لایەنگرییان لە سەرەوژێرکردنی سەرکردە میسریی و سورییەکانیان دەکرد. لەبەر ئەوەی دڕێغییان لە مەسەلەی عەرەبیی کردووە. هەمان سەرکردەگەل و لەهەمان کاتیشدا داوای یەکێتییان لەو دوو دەوڵەتە دەکرد بۆ ئەوەی لەگەڵ عێراقدا یەکبگرن.

ئەگەر حیزب بەسەرسەختییەوە پابەندبووایە بە بیروباوەڕەکانییەوە، گومانی تێدا نەبوو کە تەمەنی کورت دەبوو. کێشەی نێوان" عێراق لەپێشدا" لەهەمبەر یەکێتیی عەرەبدا لە ناوەڕۆکدا کێشەیەک بوو لەسەر ئایدێنتیتی دەوڵەتی عێراق- تا ئێستاش ئەم مەسەلەیە دەمی کراوەتەوەو ئەگەری قڵیشاندنەوەیشی هەیە. لەسەردەستی یاریکەرێکی سەرەکیی وەک سەدام، ئەم کێشەیە بێبایەخکرا. لەڕاستییدا، سەدام بوو وەک یەکەمین کەس کە سەرکردایەتی بەعسی قایلکرد، کە رژێم روو بەرەو ناوخۆی عێراق و کێشە ناوخۆییەکان وەرگێڕێ، لە جیاتی ئەوەی ووزەی خۆی لە مەسەلەی پانعەرەبییدا خەرجبکات. لە سەروبەندی 1974 دا ڤێرژنێکی نوێ و باش لە پانعەرەبییزم پێکهات. ئەم تێڕوانینە دەستکاریکراوە، جەختی لە جیایی عێراق دەکردەوە لەناو سنووری جیهانی عەرەبی پانوپۆڕداو بۆ بەهێزکردنی ریزی ناوخۆش. کاتێکی زۆری دەویست. دواتر کە عێراق بەرجەستەبووەوە، دەبوو بەماڵێکی بەهێز بۆ یەکێتیی عەرەب. عێراقێکی بەهێز پێویست بوو بۆ چوارچێوەی یەکبوونی عەرەبیی لە پاشەڕۆژێکی( نادیاردا). ئەمە دووبارە فۆرمۆلەکردنێکی زیرەکانە بوو، کە رێگەی دەدا رژێم داکۆکیی لە مەسەلەی پانعەرەبیی بکات، لەهەمان کاتیشدا، چاو بخاتە سەر پێشهاتە ناوخۆییەکانی دەوڵەتی عێراق. هەروەها بۆ سەر شیعەکان و کوردەکانیش کەمتر هەڕەشەیەکی راستەوخۆ بوو.

ئەم دۆکترین تێپەڕاندنە. هاوشان بوو لەگەڵ پرۆژەی زۆرگەورەی پلاندانانی کۆمەڵایەتییدا. مەبەستی لای کەمی ئەوە بوو. کە لە بنەڕەتەوە ئایدێنتییەکی نیشتمانیی نوێ بۆ هەموو خەڵکی عێراق چێبکات. ئەگەر گەلی عێراق نەیتوانی یان نەیویست هەست بەو ئایدێنتییە بکات. ئەوە حیزبی بەعس ئەو هەستەی بۆیان دروست دەکرد. ئەمەش مێژووی هاوبەش و بەردەست ( لای کەم بەئەگەرەوە) ی دەویست بۆ هەموو چین و تویژە کۆمەڵایەتییەکانی عێراق. سەروەرییە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا( "خاکی نێوان دوو رووبار") زەمینەیەکی بەپیت بوون بۆ دروستکردنی "ئەفسانەی نیشتمانیی." مێژووی میزۆپۆتامیا- دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر- بۆ پێش ئیسلام و تەنانەت بۆ پێش عەرەبیش ( بۆیە بەهیچ گرووپێکی ئایینیی و ئێسنیکییەوە رەنگرێژ نەکراوە). تژیی بوو لە دەستکەوتی کۆمەڵایەتیی‌ئابووریی وسیاسیی و کولتووریی.[119] لای کەم شارستانییەتی رۆژئاوا قەرزاری میزۆپۆتامیایە. بەئەندازەی ئەوەی قەرزاری گریکە. ئەم ترادیسیۆنە پڕلەشانازییە بوو. بەعس ویستی بیپێچێتەوە.

ئەم شێوازە هەمەلایەنە بوو. لە حەفتاکاندا حکومەت پارەیەکی زۆری تەرخانکرد بۆ هەڵدانەوەی شاری بابلی کۆن. بۆ دروستکردنەوەی سەرلەنوێی، دووبارە ناویان لە شارەکان و هەرێمەکان نا- موسڵ بوو بەنەینەوا(شارێکی ئاشووریی کۆن). هەرێمی حیللە بە بابلیۆن{بابل} گۆڕدرا؛ پاڵەوانەکانی میزۆپۆتامیا لەسەر پارەو دراو. دەرکەوتن (حامورابی. بۆ نموونە. پێنج دیناری دەڕازاندەوە)؛ " حامورابی" و نەبوخوزنەسر" بوون بەیەکەکانی گاردی کۆماریی. تەنانەت جگەرەی عێراقییش کەوتە ناو جەرگەی ئەم باسەوە. کاتێ کە فیلتەری سۆمەرت دەکڕیی. لەسەر پاکەتەکە " دروستکردنی لە میزۆپۆتامیا" ی لێ نووسرابوو.[120] ئەم جەختکردنەوەیە لەسەر میزۆپۆتامیا. لەگەڵ کۆمەڵێ ئەستێرەی گەشی ئەو هەسارە{میزۆپۆتامیا} ناودارەدا. ئەگەرو دەرفەتێکی بێئەندازەی دا بەسەدام. بۆ گەشانەوەی ئەو کولتووری تاکپەرستییەی دوای ناوەڕاستی حەفتاکان. کە چەمکی سەرکردەی مەزنی لەخۆگرتبوو. بەتایبەتییش دوای 1979 بەخێرایی ئەو کولتوورە هەڵدەکشا. وێنەی گەورە گەورەی سەدام. بەجلی جۆراوجۆرەوە لە شارە گەورەکاندا

دەرنەکــــــەوت- چ وەک حــاموورابی( دانوەریـــی بـــۆ عێراقییـــەکان دەستەبەر بکـات) یـاخود وەک نەبوخوزنەسـر( جوولەکـەکان دەستبەسـەر بکاتەوە).
سەرباری ئەوانەش، بۆ رەنگوڕوودان بە چێکردنـی مێژوویـەکی هاوبـەش بۆ خەڵکی عێـراق، رژێـم بـۆ بەرجەسـتەکردنی ئایدێنتییـەکی کولتـووریی هاوچەرخ بۆ عێـراق، هـەوڵێکی زۆری دا. ئەمـەش پشـتی بـە کۆنسـێپتی" یەکێتیی لـە فرەییـدا." دەبەسـت و ئـەم گریمانـە پێشـکەوتووانەیە، دۆخـی تایبەتی عێراقی وەک نەتەوەیەک، بە وردیی کە لە جیاوازییە ئێسنیکیی و تائیفییەکانییـەوە هـەڵقوڵاوە، رەچـاو دەکـرد. جیاوازییـە کولتوورییـەکان دەبووایە بپارێزرێن و پێوەی هەڵپەرێتنایە. لـەبری ئـەوەی نکۆڵییـان لـێ بکرێ یان بەرکەنار بکرێن. ئەم جۆرە سیاسەتە، بەگوێرەی ئـەو شـوێنەی پێیگەیشت، سیاسەتێکی رۆشن بوو، وێڕای ئەوەی هیچ ئاماژەیـەک نـەبوو بۆ ئەوەی ئاهەنگگێڕان بەم جیاوازییانەوە، شۆڕدەبێتەوە بـۆ نـاو جیهـانی سیاسـیی و لەلایـەن حیزبـی بەعسـەوە بەپەرۆشـیی و شـێتگیرییەوە چاودێریی دەکرا. بیرۆکراسییەکی کولتووریی نوێ و بەرین چێکرا.
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی سینەماو شانۆ( سالی 1969) دامـەزرا، بـەرپرس بوو لە هەڵسوڕانی ئاهەنگی تایبەت بۆ فۆلکلۆری هەرێمـەکان، مۆزەخانـەی فۆلکلـۆریی لەسەرتاسـەری وڵاتـدا چێکـرا( بەتایبـەت ناوچـە کـوردیی و شـیعییەکان). سـەنتەری هونـەر و پیشەسـازیی دەسـتیی، راسـپێردرا بـە پاراستنی هونـەر و داهێنانـەکان لـە سـەرجەم ناوچـەکانی عێراقـدا، تیمـی جۆراوجـۆری هەڵپـەرکێی گـەلیی لەلایـەن رژێمـەوە کۆمـەک دەکـران، لەناویشیاندا تیمەکانی بەسرەو هەولێر( لەکوردستان). بۆ تـەیکردنی وڵات، شاری ناسریە لە باشووری شیعەنشین، بۆ فێستیڤاڵی شیعریی بۆ شـاعیرە میللییەکان لە ساڵی 1969 هەڵبژێردرا.
لەساڵی 1970 خانەی پۆشـاکی عێراقیـی بـەپێی یاسـا دامـەزرا، کۆمـەڵێ ئامانجی لەئەستۆ گرتبوو-" بۆ پاراسـتنی جلوبـەرگی کلاسـیکیی لەهـەموو بەشە جیاواز و کۆمیونیتییەکانی عێراقدا، بەمپێیەش تێکەڵەیـەکی ئاسـۆیی چێـدەکرێ، هاوکـات بـۆ پارێزگـارییکردنی پۆشـاکی عێراقیـی کـۆن و چاودێرییکردنیان و بەرزکردنەوەی شێوازی ستاندەردی پۆشاکی عێراقیی، بەکـەڵکوەرگرتن لـە دیزایینـی تـابلۆ عێراقییـە کۆنـەکان و بەمپێیـەش

پێوەندییـــەکی ئاســـۆیی لەگەڵ رابردووی عێراقی پێش ئیسلامدا گری دەدرێ."[121] ئەم تەقەلایانە هەر رووکەشیی نـەبوون. لەسـەردەمی شـەڕدا و لەساڵی 1982 دا رژێم بڕی 15 میلیۆن دۆلاری بۆ چێکردنـی بنکەیـەکی گەورە بۆ خانەی پۆشاکسازیی تەرخانکرد.
سـەدام، خـودی خـۆی وا دەردەکـەوت کـە هەسـتی بـە گرنگیـی سیاسـیی پرۆگرامـە نوێکـانی خوێنـدنی عێـراق کردبـێ. لـە کـاتێ ئامـاژەدان بـە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان- لەساڵێ 1975 دا وتی:
لەکاتێکـدا باسـی ئۆتۆنـۆمی دەکـەین، نـابێ ....سـتراکتۆری ئیـداریی ئۆتۆنۆمییەکە، بۆ دیواری چـین بگـۆڕین و عـەرەب و کوردەکـانی عێـراق لێک جودابکاتەوە. کاتێ فۆلکلۆری عێراق دەستنیشـان دەکـەین، پێویسـت ناکات قسە لەسەر فۆلکلۆری کوردیی یان عەرەبیی و دواتر تورکمـانیی بـە بنبڕیی بکەین. ... لەجیاتی ئەوانە بـا لـەچوارچێوەی فۆلکلـۆری عێراقییـدا لەقاڵبی بدەین........ لێمان گەڕێن با وشەگەلی عەرەب و کورد لابەرین بـە تێرمی خەڵکی عێراق جێیان بگرینەوە.[122]
لـە ڕێـڕەوی سـەرکردەیەکی حیزبـەوە کـە بـۆ پانعـەرەبیزم خـۆی تەرخانکردبوو، تێپەستینێکی زیادە بوو. نارێکیی گەورەی پێوە دیار بـوو، بەدڵنیاییەوە، ئەوە بوو کە کوردەکان حەزناکەن لـەناو "خـەڵکی عێـراق" دا جێکـەوتبن؛ لـەوەش زیـاتر، رژێمـەکانی بەغـداد، بەبـەردەوامیی هێڵێکیـان دانـابوو لـەنێوان لابردنـی"وشـەی کـورد و عـەرەب" لەلایـەک و لابردنـی کوردەکان بەزەبروزەنگ لە خودی عێراقدا.
جگەلەوانەش، بـەپێی سـتاندەردە مێژوویـیەکان بێـت، تەقـەلاکانی حیزبـی بەعس بۆ " یەکێتیی لەهەمەجۆرییدا" لە ڕێگەی هونەر و کولتـوورەوە نـابێ پشـت گـوێ بخـرێ. هـیچ رژێمێکـی پێشـووتر لـە عێراقـدا، شـتێکی لـەم چەشنەی دەرهەق بە یەکێتیی نیشتمانیی، بەم ئاستە پێشکەش نـەکردووەو پێوەی پابەنـد بـووبێ. بەهـەمان شـێوەش، ڕێگـەی تـری گرتەبـەر، ئەگـەر رووکەشانەش بووبێ- لەبواری خوێندن، مافی ژنان و بیمەی بێکارییدا.
سەدام خودی خۆی وا دەردەکەوت، کە بایەخێکی گرنـگ و راسـتەقینە بـە خوێندن دەدات. لەساڵی1977 دا کەمپـەینێکی سەرتاسـەریی نیشـتمانیی بۆ خوێنـدنی زۆرەملـێ، بەکارێکتەرگـەلێلی نوێخوازییـەوە بـۆ بنبڕکردنـی نەخوێنـدەواریی دەسـتپێکرد. سـوپایەکی 62000 ی لەمامۆسـتا و

بیرۆکـــــــرات بـــــــۆ جێبەجێکردنی ئـەم مەبەستە تـەرخانکرا. لـە ئەنجامدا، لە سـاڵی 1982 دا وا قـەبڵێنرا، کـە 2 میلیـۆن عێراقیـی فێـری خوێندنەوەو نووسـین بـوون.[123] ئـەم دەسـتکەوتە زۆر بـاڵکێش و مـەزن بـوو، لەلایـەن یونسـکۆوە UNESCO سـەدام بـە خـەڵاتی کرۆپێسـکا Kropeska رێـزی لێگیـرا بـۆ بەشـداریيکردنی لـە نەهێشـتنی نەخوێندەواریی، لەئاستی جیهانییدا. ئەوانەی کە نەیانتوانی نـاوی خۆیـان لەکەمپەیینەکەدا بنووسن، هەڕەشەی بەندکردنیان لێکـرا. تـەنها لـە عێراقـی سەدامدا، دەکرا نەخوێندەواریی بەتاوان بێتە ئەژماردن.

سەرەڕای بەرەوپێشـچوونێکی زۆر لـە بـواری خوێندنـدا، رۆڵـی ژنـان لـە کۆمەڵگەدا، ئـاڵوگۆڕێکی رادیکالانـەی بەخۆیـەوە بینـی. دیارترینیـان لـەم بوارەدا، زۆربوونی رێژەی ژنان بوو، ئەوانەی کە چوونـە بەرخوێنـدن. لـە ساڵی 1970 دا، تەنێ 34% ی ژنـان لـە بـواری پـەروەردەی خوێندنـدا بـوون؛ لـە سـاڵی 1980دا ئـەم رێژەیـە بـۆ 95% هەڵکشـا.[124] پـانوپۆڕبوونی کـەرتی گشـتیی دەرگـای تـری والاکـرد بـەڕووی ژنانـدا لەشوێنی کارکردندا، لە کۆتایی حەفتاکاندا، ژنان 46 لەسەدی مامۆستایان، نزیکەی 30 لەسەدی دۆکتەرەکان و نزیکەی 50 لەسـەدی دانسـازەکانیان پێک دەهێنا.[125] یاسای 1977 دەرگـای بـۆ ژنـان کـردەوە کـە خزمـەتی سەربازیی بکەن- دەستکەوتێک کە بەشێکی زۆر لە وڵاتانی رۆژئـاوا، لای کـەم دەیەیـەک دواتـر دەسـتیان پێیڕاگەیشـت. بەبـەراوردکردن بـە جێگەورێگەی ژنان لە تەواوی وڵاتانی عەرەبییدا لەو کاتـەدا( بەتایبـەتییش لە کوێت و عەرەبستانی سعودییە)، ژنانی عێراق لە دنیایەکی تردا دەژیان. لەسـەرێکی تـرەوە، گرنگـە ددان بـە دەسـتکەوتە پێشـکەوتووخوازەکانی رژێمی بەعسدا بنێن، لە ئاستێکی قـووڵتردا، گەمژەییـە ئەگـەر هەسـت بـە ئەجێنـدا سیاسـییەکانی نەکـەین، لـە مێـژووی کـورتی عێراقـدا، خوێنـدن{ پـەروەردە} بـۆ ئامـانجی سیاسـیی بـەکارهاتووە، لەسـەردەمی پادشـاییدا سیسـتەمی خوێنـدن، لەلایـەن میلیتانتـە پانعەرەبیسـتەکانەوە کۆنترۆڵ کرابـوو، بـۆ ئامـانجی گوتـارە سیاسـییەکانیان بـەکار دەهێنـرا. لەسەردەمی بەعسـدا، ئامانجـەکان زۆر بـەرزتر دەیڕوانـی، لـە رێـی تونـد کۆنترۆڵکردنی خوێندنەوەوە لەلایـەن دەوڵەتـەوە، بەسـەر پرۆگرامـەکان و پیشەی وانە وتنەوەدا، حیزب توانی راستەوخۆ بگاتە ماتریاڵی خاو، بیری

لاوان؛ ئەم بیرانە دەتوانرا بە شێوەی کۆمەڵ لەفۆرمێکی گونجاودا رێکبخرێن.
بەمپێیەش سەرتاپای کۆمەڵگەی عێراقیی لە دەوری بیروباوەڕە هاوبەشەکانی بەعسییەکان فۆرمەلە دەکرێ. بەهەمان شێوەش نەهێشتنی نەخوێندەواریی، جەختی لە زۆرینەی شیعە کردەوە( چونکە شیعەکان رێژەی نەخوێندەوارییان لەو کاتەدا زۆرتر بوو). رژێمی سوننیی توانی خۆی بخزێنێتە ناو هزری زۆرینەی چینەکانی خوارەوەی شیعە بۆ یەکەمین جار لەمێژووی عێراقدا. بەڵام ئەوە لە پرۆسەی فێرکردنی دۆکترین لەرێگەی خوێندنەوە بەولاوەتر بوو. پەروەردە بەکارهێنرا بۆ تێکشکاندنی ترادیسیۆنی وەفاو دڵسۆزیی. دواتر بە پێوەندیی نوێ جێگەیان بگیردرێتەوە. وەک لە تاکەوە بۆ رژێم. تەنانەت پێوەندییە فەندەمێنتالەکانی خێزانییش پیرۆز نەبوون. لە زاری سەدامەوە،
بۆ قەدەغەکردنی دایکان و باوکان، لە دەستبەسەرداگرتنی ویستی خێزان بە چەمکی کۆنەپەرستیی، پێویستە منداڵەکان باربهێنین بۆ دەرپەڕاندنی ئەم چەمکانە.... یەکێتیی خێزان نابێ لەسەر کۆنسێپتی دواکەوتوویی بنیات بنرێ، بەڵکوو لەسەر رێککەوتن و جەختکردنەوە لەسەر بەسێنترالکردنی ئەو بەهایانەی لە ترادیسیۆن و سیاسەتەکانی شۆڕشدا. لە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی نوێدا هەیە. هەرکاتێک گرفت کەوتە نێوان یەکێتیی خێزان و ئەم مۆرالانەوە....پێویستە بە قازانجی مۆراڵە نوێکان، بێتە چارەسەرکردن.[126]

بەمشێوەیە ئامانجی پەروەردە، نغرۆکردنی جەوانان لە وەفاداریی بۆ شۆڕش و حیزب لەجێگەی وەفاداریی بۆ یەکێتیی خێزان بوو. هەندێکی تر ئارگیومێنتی ئەوەیان دەکرد، گوایە ئازادیی ژنان لە کۆتوبەندە پاتریاکیی(باوکسالاری)ە خێزانییەکان، هەمان مەبەستی لەپشتەوە بوو- "ئەگەر وەفاداریی نوێ بۆ سەرکردە، حیزب و دەوڵەت، بڕیارە پێک بێت. ژنان دەبێ'ئازادبن' لە وەفاداریی کە لەرووی ترادیسیۆنەوە بە پیاوەکان و خزمە نێرینەکانیانەوە بەستراون."[127] جارێکی تر، تێکشکاندنی پێوەندییە ترادیسیۆنییەکان لە داواکارییە سەرەکییەکانی پێکهێنانی پێوەندیی دڵسۆزانەی نێوان ژنانی'ئازاد' و ئامانجەکانی شۆڕش بوو( هەروەک سەدام باسیکردبوو).

مـــەوبا ســـایکۆلۆژییەکانی هەوڵەکانی بەعس بۆ چێکرینی ئایدێنتییـەکی نیشتمانیی نوێ و یەکگرتوو بۆ دەوڵەتی عێراق. پرۆسەیەکی بەردەوامی لە تێکشکاندن و بروستکرینەوە لەخۆ گرتبوو. پێویست بـوو بانیشـتوان لـە هـەنگاوی یەکەمـدا بابەشـکرێن بـۆ یەکـەی بچـووک بچـووک. لەرێگـەی وێرانکردنـــی پێوەندییـــە ترادیســـیۆنییەکانەوە. بواتـــر بارشـــتنەوەیان لـــە قەوارەیەکی کۆلێکتیف و یەکگرتووبا کە مێژوویـەکی کـۆلێکتیڤی پیـرۆزی هەبێ و بە وەفاداریی بۆ حیزب و بەدڵنیاییشەوە بـۆ "سـەرکردەی مـەزن" پابەند بێت.
بەبەردەوامییش. لە ماوی 1968_1988 با. ئایدۆلۆژیای بەعس. جگە لـە سەدام. هیچ ناوەڕۆکێکی سەربەخۆی تێـدا نـەبوو. روانگـەی بەعسـییەکان هەر ئەوە بوو کەسەدام هەرچی بەدەمدا بهاتایە. لەژێر پەرچەمی چێکرینـی پێوەندیی وەفاداریی لـەنێوان گـەل و پرینسـیپی شۆڕشـگێڕانەی حیزبـدا. ســەدام زۆر کاریگەرانــە هــەوڵی دەدا. بــۆ بروســتکرینی جڤاکێــک کــە پێوەندیی سەرەکیی لەنێوان تاکەکانی ئەو جڤاکە و خودی خۆیـدا قـەتیس بێت. بەرەنجامی لۆژیکانەی ئەم پرۆسێسە. بەرزکرینەوەی سـەدام بـوو لـە شوێنێکەوە وەک سەرکردەیەکی سیاسیی بۆ سێمبۆڵی یـەکێتیی نەتـەوەیی کـەخۆی دەستنیشـانی کردبـوو. بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەم سـەرکەوتنەش. لەسەدام بەخوازرا کە هاوکات وەک هـەموو شـت دەرکـەوێ و بـۆ هـەموو کەسیش بێت.
هەنووکە وەک سەرکردەیەکی خێڵەکیی پیرۆز. لە جلوبـەرگێکی بەشـتەکیی رێکوپێکـدا. وەک نوێژکـەرێکی ئیسـلامیی لـە شـوێنە پیرۆزەکانـدا خواپەرستیی دەکـات. وەک جـەنگاوەرێک. شمشـێرەکەی لـە فارسـەکان. زایۆنییـەکان و ئیمپریـالیزم رەپکـربووە. هـەروەها وەک ئەکتـەرێکی سیاسـیی لێوەشـاوە. سـەدام سـەلماندی کـە ئـەزموونی بـەرزی خـۆی بـۆ پارێزگارییکربن لـەم رۆڵـە بگێـڕێ. لەکاتێکـدا ئـەم پیـاوە مەزنـە خـودی خۆی( یان یەکێک لەهاوشێوەکانی) ئامادەی ئاهەنگە تایبەتییەکان نەبووایە. وێنەی گەورە گەورە بە هەمەڕەنگیی لەشارەکانی عێراقدا ئەمسەرەوسەریان دەکـرد. هەمیشـە بـەبیر خـەڵکی عێـراق بەهێنرایـەوە. کـە وەفـاداریی و دڵسۆزیی سەرەکیی لەکوێدایە. یان لەکوێدا دەبێ بێ. عێراق بە شێوەیەکی بەرچاو خەریک بوو ببێ بەخاوەنی کولتووری تاکپەرستیی تەواو.

پاڵنەری سەرەکیی بۆ یەکبوونی سایکۆلۆژیی بە هاندانی ماددیی بەهێز دەکرا. وێرای هەڵاواردنێکی زۆر، زۆرایەتی شیعە لە دەسەڵاتی سیاسیی دوورخرابوونەوە، بەڵام لە میکانیزمی دامەزراندنێکی بەریندا رۆڵی هەبوو لەو ماوەیەی دەوڵەتدا. لەسەرەتای هەشتاکاندا، فەرمانبەرانی حکومەت بەژمارە لە ملیۆن و چارەکێکی تێپەڕاندبوو. ئەگەر ئەوانەی بژێوییان لەسەر ئەو فەرمانبەرانە بوو، ئەندامانی سوپای میلیی و هێزە چەکدارە جۆراوجۆرەکانیشیان بۆ زیاد بکەین، وا مەزەندە دەکرا، کە دەوڵەتی عێراق راستەوخۆ کۆنترۆڵی دەرامەتی ژیانی زۆرینەی خەڵک دەکات. بۆ یەکەمین جار لە مێژووی عێراقدا، رژێم ستراکتۆرێکی بەرینی دەوڵەتیی دانابوو، کە بەشی ئەوەی دەکرد کە زۆرینەی شیعەکانیش لەخۆ بگرێ. لەنێوان سالانی 1968_1988 دا، لایەنی ماددیی زۆرینەی شیعەکان باشیی بەخۆیەوە بینی. ئەمەش هەر مەسەلەی دابەشکردنی خۆرایی یەخچاڵ و تەلەفزیۆن نەبوو.
لەکۆتایی حەفتاکاندا، رێژەی ئەوانەی دەستیان بەخوێندن رادەگەیشت لەشیعەکان نزیک بەرێژەی سوننەکان بوو. لە ناوچەی شیعەنشینەکان و لە باشووردا بەتایبەتیی، ژمارەی ئەو نەخۆشخانانەی بۆ هەر تاکێک هەبوو زۆرتر بوو لەو نەخۆشخانانەی کە ناوچەی سوننەنشین، لە باکوور و ناوەڕاستدا هەیبوو.[128] بەڵام کوردەکان ئاستی گوزەرانیان لەخوارتربوو. سەرەڕای ئەوەش هێشتا پێشڤەچوونی بەخۆیەوە بینیبوو. لە 1978دا رێژەی منداڵانی کە دەچوون بۆ قوتابخانەی سەرەتایی لە ناوچە کوردییەکاندا یەکسان بوو بە ناوچەکانی تری عێراق، لەراستییدا رێژەی نەخۆشخانەکانی کە بەر هەر تاکێکی کورد دەکەوت، لە شیعەو سوننە زۆرتربوو. بەدڵنیاییەوە ئەو خۆشگوزەرانییەی لەجۆری ژیاندا هەبوو زۆر کەمتر بوو لە قەبارەی ئەو توندوتیژییەی دەرهەق بەکوردەکان لەو ماوەیەدا دەکرا. بەشێوەیەکی گشتیی، ماوەی 1968_1988 هەنگاوێکی سەخت بوو بۆ دواوە، دەرهەق بە ئاوێتەکردنی کوردەکان لەدەوڵەتی عێراقدا.
بۆ تێگەیشتن لە رژێمی بەعسی سەدام، دواتریش بۆ قەبلاندنی قەبارەی ئەو زیانە سایکۆلۆژیانەی بەر گەلی عێراق کەوتوونە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ پشت ئەو کلێشە سادانەی کە تەنێ جەخت لەبەکارهێنانی توندوتیژیی دەکەنەوە. لەکاتێکدا توندوتیژیی لەلایەن دەوڵەتەوە دژی نەیارانی رژێم،

بێ نووئلیی پیرۆز دەکرا. رژێـم هانـدان و هەڵرشـتنێکی زۆری پێشکەشـکرد بـۆ پێکـەوەکارکردن. هـەوڵێکی کـۆنکریتیی زۆر درا بـۆ چێکردنـی ئایدێنتییـەکی نـوێی نیشـتمانیی بـۆ عێـراق، ئایدێنتیتییـەکی گشتگیر، نەک دیارییکراو. گەشەکردنی دەوڵەتی عێراقی پێش یۆتۆپیای پانعەرەبیی و هەر بایەخێکی تر خستبوو.
پێوانەی سەرکەوتنی سەدام بۆ پێکهێنانی یەکێتییـەکی نیشـتمانیی لـە نـاو چـین و توێژەکـانی عێراقـدا، کـارێکی سـەخت بـوو. پێناچێـت زۆربـەی ئەوانـەی لـەدەرەوەی نێوەنـدی سـوننیین، دڵیـان بـە هـەوڵی نەخشە بۆداڕێژراو بۆ پێکهێنانی مێژوویەکی هاوبەشی میزۆپۆتامیـا ئـاوی خواردبێتـەوە. پـاش وتنـی ئەمـە، کـاتێ تاقیکردنـەوەی سـەخت لەشـەڕی عێراق-ئێراندا هاتە پێشەوە، پێکهاتەی عەرەبیی دەوڵەتی عێراق، بەبێ هیچ پێشبینییەک بۆ بەرگریی لەدژی ئێرانییە هێرشبەرەکان یـەکانگیر بـوون.
ئەمەش ئاماژە نییە بۆ وەفاداریی و دڵسۆزیی توێژێکی شـیعە بـۆ رژێمـی بەعس یان تەنانەت دەوڵەتی عێراقیش؛ بەڵام ئاماژەیە بۆ زۆرینـەی شـیعە عەرەبـەکانی عێـراق کـە پێوەندییـە ئێسنیکییەکانیان خسـتووەتە پـێش ئایدێنتیتییـە تائیفییەکانـەوە. بەپێچەوانەشـەوە، کوردەکـان نیشـانیاندا بەبەردەوامیی لەو ماوەیەدا، کە ئەیانـەوێ لەگـەڵ هەرلایەنێکـدا بـن، بـەبێ لەبەرچاوگرتنی نیشتمان و ئێسنیک بۆ ئەوەی خەباتەکەیان دژی دەوڵـەتی عێراق درێژە پێبدەن.

## بەرەنجام

سروشـتی بیسـت سـاڵی یەکـەمی دەسـەڵاتی حیزبـی بـەعس، ژمارەیـەک نیگەرانیی لەسەر پاشەڕۆژی عێراق دەورووژێنێ.
یەکەم، گرنگە جەخت لەسەر ئەو ئاستەی کە رژێمی بەعسـی تێـدا بەرهـەم هـات لـە ئـەنجامی دەوروبـەرە سیاسـییەکەیدا بکەینـەوە. حیـزب سەرکەوتووبوو لە توندوتۆڵکردنـەوەی چڕنـووکی دەسـەڵات و پاراسـتنی دەسەڵاتدا، لە سەردەمی ئانارشییەکی سیاسیی پڕ لەتوندوتیژییدا. لۆژیکی دەسەڵاتی بەعس لەسـەر مانـەوە رۆنرابـوو، لـە پرۆسـەی کۆتاییپێهێنانـی نـەیاران و ئۆپۆزیسـیۆندا، حیـزب فـۆرمێکی تونـدی لـە درندایـەتیی کۆمەڵگەیەکی سـەقامگیردا پێکهێنـا کـە پێچەوانـەی پەشـێویی رژێمـەکانی

پێشـــوو بـــوو. نیـــزام سەپاندن بەسەر عێراقدا دەکرا. بـەڵام بـە بێ قوربانیی نەبوو.
دووەم، زۆربـەی ئـەو شـێوازانەی بـۆ بـەڕێوەبردنی دەسـەڵات، سـەدام و ڕژێمەکەی بەکاریان دەهێنـا، دەسـتپێداهێنانی شـێوازی کـۆن بـوون نـەک شێوازی نوێ. هەروەک هەمیشەش عێراق وابووە. سوننە حوکمی کردووە، شیعەو کـوردیش بەردەسـت و ڕۆڵـی یارمەتییـدەریان هـەبووە. دووبـارە تونـدوتیژیی( هەڕەشـەکردن بـۆ بـەکارهێنانی تونـدوتیژیی) ئـەدگاری سـەرەکیی حـوکمی بـەعس بـووە. دابڕانێکـی گـەورەش نـەبووە لـە هەڵسوکەوتی ئەوانەی پێشـووتردا. بـەکارهێنانی میکـانیزمی خزمخزمێنـە لەحوکمکردنـــدا لـــەچاو ڕژێمـــەکانی پێشـــوودا زۆر بـــەربڵاوترو ڕەگ داکوتراوتر بوو . بەڵام ئەم تەکنیکە بەعس نەیهێنا بریتانییەکان هێنایان. بریتانییەکان زۆر پشتیان بەو تاکتیکانە بەستبوو" پەرتی بکـە و زاڵ ببـە" بۆ گۆڕینی عێراق بە کۆمەڵە خەڵکێکی بێفەڕ و بێکەڵک، هەر بەیەکدا بێن، ئەمەش وادەکات کە ئۆپۆزیسیۆنێکی یەکگرتوویان بۆ پێک نەیات. سـەدام هـــەمان گەمـــەی کـــرد- بەتایبـــەتیی لـــە کوردســـتانی عێراقـــدا- بـــەڵام بەسەرکەوتنێکی باشترەوە. سەبارەت بە دامـەزراوە سیاسـییەکان، حیزبـی بەعس لەسەر ئـەزموونی کەڵەکـەبووی ڕژێمـەکانی پێشـووتر پشـتی قـایم کردبـوو. ئەنجوومەنـەکانی سـەرکردایەتی شـۆڕش، دادگاکـانی شـۆڕش، گاردی کۆماریی، پارلەمانی "دیموکراسیی"، میلیشـیا نیمچـە سـەربازییەکان، تەنانـــەت کولتـــووری تاکپەرســـتیی، هـــەموویان لـــە ڕژێمـــەکانی پێشـــوودا پەیدابوون، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستیان پێوەگیراو لەگەڵ سـەردەمدا گونجێنران. لەم بوارەدا، یاساکان لەلایەن حیزبی بەعسەوە بـەرز ڕاگیـران لەبری ئەوەی کێشەیان لەسەر چێبکات.
سێیەم، تا ئاستێک کە ڕژێمی بەعس حوکمڕانی خۆی لە لاسـاییکردنەوەی ترادیسیۆندا دەبینییەوە، هەموو ئەنجامەکانی خراپ نەبوون، بەڕاشـکاویی جیاوازیی هەبوو لە ڕادەی توانستی ڕژێم بۆ چوونە خـوارەوە بـۆ دامێنـی کۆمەڵگە. ڕۆڵی گەورەو بەربڵاوی دەوڵەت لە ئابووریـیداو چـاودێریکردنی خزمەتگوزاریـیـە گشـتییەکان، وێـڕای سـتراکتۆری ڕێکخراوەیـی حیزبـی بەعس، ئاستێکی دا بەحیزب لەکۆنترۆڵکردنی ژیانی هاوڵاتیی ئاساییدا. تا هەنووکەش بە خەیاڵدا نایەت.

لەلایـــەنی پۆزەتیڤییـــەوە. ئاسـتی خوێنـدنێکی بـاش، کارگوزارییەکـەی، بانیشتوانێکی پێشکەوتووتر لەهەموو جیهانی عەرەبی لێکەوتـەوە. ئەمـەش شتێک نەبوو. رژێم تەنێ بەزەبروزەنگ بیکـات. بـۆی هـەبوو ئەمانـە بـۆ زۆرکەس جێگەی باوەڕ نەبێ( یان بـۆ تێگەیشـتن سـەخت بـوو). حیزبـی بـەعس و سـەدام بەتایبـەتیی زۆر خۆشـحاڵبوون بـە جـەماوەرییبوونی راسـتەقینەو بـەربلاوی خۆیـان لـەنێوان عێراقییـە سـادەکاندا لەزۆربـەی کاتەکاندا.[129] نەدەزانرا ئەمانە لە ئەنجامی ئاستی گوزەرانی باشـەوە بـوو. یان دەرەنجامی وەرگرتنی ئایدۆلۆژیا بەچرپی و پرپـی. یـان لـە ئـەنجامی زمان زبریی رژێم لە ئەنتی زایۆنیست و ئـەنتی ئیمپریالیسـت و ژاوەژاوی پانعەرەبییەوەیە بوو. بۆی هەیە لەئـەنجامی هـەموو ئـەو فاکتەرانـەوە بـێ؛ بەڵام فاکتێک هەبوو کە سەدام لەهەموو ئەوانی پێش خـۆی زۆرتـر نزیـک بـووەوە لـە دامەزرانـدنی دەسـەڵاتێکی سـەرکەوتوو لـە دەوڵـەتی عێراقـدا (بەدڵنیاییەوە کوردەکانی لێدەرکە).[130]

کاریگـەریی ئـەو باجـە سـایکۆلۆژییەی لەلایـەن خـەڵکی عێراقـەوە درا بەدرێژایی ئەو 20 ساڵە، بۆ چەندین ساڵی تر بەتـەواویی بەدەرناکـەوێ. حـوکمی تۆتالیتـاریی گەشـەیکرد بـۆ تاکپەرستییەکی بێوێنـە. پێوەندییـە کۆمەڵایەتییە کلاسیکییەکان بەشێوەیەکی پلانداڕێژراو تێکشـێکێندران. بـۆ ئـەوەی بـە پێوەنـدیی نێـوان تاکـەکان و سـەدام جێگـەیان بگیردرێتـەوە. ئەمەش پرۆگرامێکی گـەورەی مێشکشـۆرینەوەی ویسـت. چەنـدین سـاڵی دەوێ تا هەڵبتەکێنرێ.

لەدواییدا. ئەم بیست ساڵە تەواو بوو. کاریگـەریی هـەر ئەگـەرێکی لەگـەڵ خۆیـدا بـرد بـۆ ئاشـتبوونەوەیەکی دروسـت لـەنێوان کوردەکـان و عەرەبەکاندا. گرفتەکە هەر بـەرگریی کوردەکـان دژ بـە دەسـەڵاتی نێوەنـد نـەبوو- هـەرگیز شـتێکی نـوێش نـەبوو ڕاسـتییەکە ئـەوەبوو کاتێـک کوردەکـان لـەنێوان عەرەبـەکانی عێـراق و فارسـەکانی ئێرانـدا چانسـی هەڵبژاردنیان هەبێ. ئـەوەی دواییـان هەڵـدەبژارد. ئەمـەش درێغیـی بـوو. هەرگیز لەبیر نەدەچووەوە. لـە دیـدی کـوردەوە- هەسـتکردن بـە میراتـی شـالاوی درندانـەی ئـەنفال. لـەڕووی - سـایکۆلۆژیی و فیزیکییـەوە- تـا چەنـدین سـاڵی تـر درێـژەی دەبـێ. لەکاتێکـدا حـوکمی بـەعس لەهـەموو رژێمەکانی پێشووتری، کاری زۆرتر کرد بـۆ پێکەوەلکانـدنی پێکهاتـەکانی

دەوڵــەتی عێــراق بــۆ قەوارەیــەکی نیشــتمانیی یــەکگرتوو، بــەڵام پێکهاتەکانی کورد بە توندیی مامەڵــەی لەگەڵــداکراو جیاکرانــەوە. هــەموو پڕوپاگەندەی لەچەشنی یەکێتیی لە هەمەجۆرییدایە کۆتایی پێهات.

# بەندی چوار

## 2003-1988

## کاولکردنی عێراق

هەڵوێستی زۆر لەهێزە ڕۆژئاواییەکان لەئاست شەڕی ئێران- عێراق دا پڕ بەپێستی دەربڕینە نەمرەکانی هێنری کیسینجەر بوو کە گوتویەتی( بە داخەوە، ناکرێ هەردووکیان بدۆڕێنن)131، بەڵام لە ڕاستییدا، بە هەموو پێوانگە ماقوڵەکان، هەردوو لا دۆڕاندیان؛ ژمارەی قوربانییانی هەردوو وڵات بەسەدان هەزار بوو، زەرەرە ئابورییەکە لە ڕادەبەدەر بوو، هەردوولا شکستیان هێنا لەوەی ئامانجی ئەسڵی شە ڕەکەیان بپێکن و شە ڕەکە ش بەبنبەستی هەرێمیی کۆتایی پێهات. هەشت ساڵ شەڕو کوشتار لەواقیعدا، جگەلە مەینەتیی هیچیتری بۆ ئەم دوو نەیارەی کەنداو، بەرهەم نەهێنا. سروشتییە کە ئەمە رێگە ی لەسەدام نەگرت لەوەی شەڕەکە ناوبنێت' سەرکەوتنی مێژووی جیهانی عەرەبی بەسە ر" ئۆردوی فارسەکاندا". بەڵام هەر لەو کاتەوە کەعێراقییەکان ئاهەنگ و سەفا و خۆشییەکی هەشت ڕۆژەیان دەکرد لەسەر شەقامەکانی بەغدادا، کاری بنیاتنانی پەیکەرەکانی

سـەرکەوتنـە رووکەشییەکانی سەدام دەستی پێکرد. شتێکی ئاشکرا بوو کە شەڕەکە زەرەر و زیانێکی زۆری لە بونیـادی ئـابووریی و کۆمەڵایەتیی عێراق دابوو.132 عێراق کەچووبووە شەڕەوە یـەکێـک بـوو لەدەوڵەتـە هـەرە سـەقامگیر و مـۆدێرن و خۆشـگوزەرانەکانی رۆژهـەڵاتی ناڤین. بەرەبەرە تووشی داتەپینی ئابووریی دەبوو.
هەرچەندە ئەو کاتە دیار نەبوو. بەڵام ئەمە سە رەتای کۆتاییەکـەی سـەدام بوو. داگیرکردنەکەی کوەیت لەلایەن عێراقەوە لە 1990 دا وەڵامی سـەدام بوو بۆ ئەو قەیرانە ئابورییە سـەختەی کـە هەشـت سـاڵ شـەڕی دڕندانـە خولقاندبووی. پاشان. شکاندنێکی کاولکارانەی سە ربازیی لەلایـەن هێـزی هاوپەیمانانەوە لـە 1991 دا و هـەروەهـا زیـاتر لـە 12 سـاڵ لـەو سـزا ئابوریيە توندانەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان سەپاندبوونی. ئەمانە هەموو دەوڵەتی عێراقیان سـەرتاپـا وێرانکـرد. لـە ئـازاری 2003 دا. وەختێـک سـەدام جـارێکی دی بـەپێداگرییـەوە رووبـەرووی هێزێکـی بـاڵاتر (هاوپەیمانانی ویست-coalition of willing ) بـووەوە. هـەر ئەوکاتـە ئەو سەرۆکایەتی دەوڵەتێکی شکستخواردووی دەکرد. دەوڵەتێک کە چیدی دەستی بە پانتاییەکی فراوانی خودی هەرێمەکـەی خۆیـدا نـەدەگەیشـت و چیـدی نەیـدەتوانی تەنانـەت پێداویسـتییە هـەرە سـەرەتاییەکانی دانیشتوانەکەی خۆی دابین بکـات. لـەماوەی سـاڵانی 1988_2003 دا. سەدام( بەو هاوکارییەی کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی دەیکرد) توانی هەموو دەسـکەوتە سـەرکـەوتووەکانی 20 سـاڵی پێشـوو وێـران بکـات. لـەو پرۆسەیەشدا زیانێکی زۆری بـە یەکپارچـەیی کۆمەڵایـەتیی. ئـابووریی و سیاسیی عێراق گەیاند. کە میراتەکەی بـۆ دەیـان سـاڵی داهـاتوو هەسـتی پێدەکرێت.

## کێشە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکان

هەشت ساڵ شەڕ لەگەڵ ئێراندا بۆ عێراق بە گران کـەوتـەوە. لـە کاتێکـدا ئێران بەهەموو شێوەیەک خۆی پاراسـت لـە قـە رزکردنـی زۆر لـە دەرەوە ( رژێمی فاناتیکی ئیسلامیی ئێران پشتیوانی وەهای کەم بـوو کـە پـارەی پێببەخشن). عێراق قەرزێکی زۆری کرد لەپێناوی ئەوەدا کە خـۆی بگرێـت لەشەڕدا لەگەڵ دراوسێیەکی زۆر لەخـۆی گـەورەتر. قـەرزەکانی عێـراق لـە

ڕۆژئاواو ژاپۆن گەیشتنە 25 تا 35 بیلیۆن دۆلار؛ 10 بیلیۆن لە یەکێتی سۆڤێت؛ لە دەوڵەتانی کەنداویشەوە( بەزۆری عەرەبستانی سعودیيە و کوەیت) 50 تا 55 بیلیۆن دۆلار. بەوەوە کۆی گشتی قەرزە دەرەکیەکانی عێراق گەیشتە 100 بیلیۆن دۆلار. بە شێکی ئەو پارەیە بۆ ئەوە بەکارهات تا عێراقییەکان بپارێزێت لەکاریگەریی تەواوی شەڕ. سیاسەتێکی ئەنقەستی" تێرکردنی سکەکان" لەپێناوی سەقامگیرکردنی ناوخۆدا پێڕۆکرد.

بەڵام لەناوەڕاستیی هەشتاکاندا چیتر ئەم سیاسەتە نەدەتوانرا بەردەوامیی پێبدریت. هە روەها بەدرێژایی ماوەی شەڕ داهاتی تاک لە عێراقدا دابەزی بۆ نیوەی ئاستی ساڵی 1980. لەوە زیاتر چاککردنەوەی ژێرخانی عێراق مەزەندە دەکرا پێویستیی بە بەگەڕخستنی نزیکەی 200 بیلیۆن دۆلار هەبێ . ئەوەی مابووەوە لە پارە قەرزکراوەکە بۆ بنیاتنانی گەورەترین هێزی زەمینی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەکارهات. بەبێ شەڕێک کە سوپاکەی پێوە سەرقاڵ بێت، سەدام لەڕووی سەقامگیریی ناوخۆوە ڕووبەڕوی ئەگەری هەڕەشەیەکی جدیی بیووەوە . وەک چاودێرێک تێبینیی دەکرد" سەدام ملیۆنێک پیاوی سەربازیی هەبوو بەبێ ئەوەی کارێکیان هەبێ بیکەن....ئەو دەبووایە شتێک بدۆزێتەوە تا پێیەوە سەرقاڵیان بکات بەر لەوەی بیریان بەرەو کۆشکەکانی کۆماریی بڕوات، ئەوەی هەمیشە سوپاکان دەیکەن هەر کاتێک کاتیان لەبەردەستدا بێت."133

ئابووریی عێراق لەتوانایدا نەبوو کە سوپایەکی بەربڵاوی وا مەزن هەرس بکات، هەروەها لەهەمان کاتدا سەرچاوەیەکی تەواوی وەها لەبەردەستدا نەبوو کە سوپایەکی یەک ملیۆنی پێڕابگیرێت. هێشتا لەوەش مەترسییدارتر، ئەو بەرگرییە بەرچاوەی کە سوپا کردی لە خاکی عیراق لەماوەی ساڵانی کۆتایی شەڕدا جەماوەر و پایە ی عەسکەرتاریەتی گەلێک زیادکردبوو و دەستەیەکی لە پاڵەوانانی شەڕ ، لە نێو توێژی ئەفسەراندا دروستکردبوو. جارێکی تر سوپا وەک نەیاری ڕژێمی سەدام وەدەرکەوتنەوە. کاردانەوەکە ئاشکرابوو— هەوڵێکی کودەتا پووچەڵکرایەوە و پاشان یەک لەدوای یەک ئەفسەرە دیارەکانی سوپا لە پلەکانیان داماڵران. لەنێو قوربانییەکاندا کوڕە خاڵی سەدام خۆی( عەدنان

خەیروڵڵا) بوو. وەزیرێکی بەرگریی بەناوبانگ و لێهاتوو بوو. کۆپتەرەکەی لە هەلومەرجێکی" نالەباردا" لە مەی 1989 دا شکا. کلک و گوێکردنی سوپا یارمەتییدەر بوو بۆ دوورخستنەوەی هەڕەشەیەکی هەنووکەیی لە دژی رژێم. بەڵام کەمی پێکرا لە ئاست کێشە قووڵەکانی ئابووریی و سەربازە ماندووەکانی دوای شەڕ کەهیچ شتێکی بنیاتنەر لەئارادا نەبوو پێوەی خەریک بن.

باری نالەباری ئابوریی عیراق هەروەها هەڕەشەی لە یەکێک لە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی رژێمی سەدام دەکرد. هۆکاری بەردەوامیی رژێمی بەعس بۆ ماوەیەکی زۆر بەکارهێنانی لێزانانە ی " کوتەک و گێزەر" بوو— ئەوەی کە نارازیی بوو بە بێبەزەییانە سەرکوتکرا. بەڵام ئەوانەی کە لەسەر خەتی بەعس بوون چاوەڕوانیان دەکرد کە زۆر باش خەڵاتی ملکەچییەکەیان وەربگرن. تەخشانی بەخشیش – کە شتێکی بنەڕەتیی بوو بۆ کارکردنی سیستەمەکە بەئاسانیی_ سەرچاوەی ماڵیی زۆری دەویست. ئەمەش لەدوای شەڕ لەبەردەستدا نەبوو. لە 1990 دا داهاتەکانی نەوت تەنها 13 بیلیۆن دۆلار بوون-- ئەمەش شتێکی زۆر کەم بوو لەچاو قەرزە زۆرەکانی عێراق و تێچوونی چاوەڕوانکراوی بنیاتنانەوەی ژێرخانی عێراق. دەربازبوونی رژێمی بەعس و خودی سەدام پشتی بەستبوو بەگەیاندنی شێوازێکی پەرەسەندووی خۆشگوزەرانیی ماددیی بۆ دانیشتوانی عیراق. لە 1990 دا تورەکەکە بەتاڵ ببوو.

## کوەیت لە سێرەدا

پێوەندییەکانی نێوان کوەیت و عێراق لەدوای شەڕی ئێران- عێراقەوە زۆر بەخێرایی تێکچوو. کوەیت سوور بوو لەسەر ئەوەی عێراق دەبێ قەرزەکانی بداتەوە؛ عێراقیش گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی دوای ئەوەی " چەندین رووباری خوێنی ڕشتووە بۆ بەرگریی لە سەروەریی نیشتمانی عەرەبیی و کەرامەتی نیشتمانیی" دەبێ قەرزەکان ببەخشرێن[134] . هەوڵەکانی عێراق بۆ ڕازیکردنی ئەندامانی رێکخراوی وڵاتانی هەناردەی پێترۆلیۆم(OPEC) بۆ کەمکردنەوەی بەرهەمی نەوت بەمەبەستی بەرزکردنەوەی نرخی نەوت. لەلایەن کوەیتییەکانەوە پوچەڵکرایەوە.

کوەیتیەکان سووربوون لەسەر تێپەڕاندنی پشکی خۆیان لە OPEC. لەوەش خراپتر دەستیانکرد بەدەرهێنانی نەوت لە کێڵگەی نەوتی ( رومەیلە) کە یەدەگێکی نەوتی زۆر گەورەیەو دەکەوێتە هەردوو دیوی سنوورەکانی عێراق و کوەیتەوە.
لە 1990 دا نرخی نەوت دابەزی بۆ ژێر ئەو نرخەی کە ئۆپێک لەسەری رێککەوتبوو کە 18 دۆلار بوو بۆ بەرمیلێک؛ لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵدا نرخەکە دابەزی بوو بۆ 11 دۆلار بۆ بەرمیلێک. بۆ عێراق حیسابەکە ئاشکرا بوو ؛ دابەزینی هەر دۆلارێک لە نرخی نەوت واتە لەدەستدانی یەک بیلیۆن دۆلار لە داهاتی ساڵانە. وەزیری دەرەوەی عێراق ( تاریق عەزیز) هۆشداریی دایە کوەیتییەکان گوایە ئەوان لەسەر پەتێکی باریک یاریی دەکەن. ئاگاداریکردنەوە " هەوڵە ئەنقەستەکانی کوەیتییەکان بۆ دارمانی ئابووریی عێراق دوژمنکارییەکە لەرووی دەرئەنجامەکانییەوە کەمتر نییە لە دوژمنکارییەکی سەربازیی."[135] لە ناوەراستیی جولایدا سەتەلایتە ئەمێریکییەکان تێبینیی ئەوەیان دەکرد کە سوپای عێراقیی بەژمارەیەکی زۆر لەسەر سنوورەکانی کوەیت کۆدەبنەوە؛ بەڵام کاردانەوەی ئەمێریکا لاواز بوو.
لە 24 جولایدا Margaret Tutwiler. قسەکەری فەرمیی وەزارەتی دەرەوەی ئەمێریکا. رایگەیاند کە" ئێمە هیچ رێککەوتنێکمان نییە لەگەڵ کوەیتییەکان لە بواری بەرگرییدا و هیچ بەڵێنێکی بەرگرییکردنی تایبەتیی یان ئاساییشیی نییە لەگەڵیاندا"[136] هەر بەدوای ئەوەدا. باڵوێزی ئەمێریکا لە عیراق. (April Glaspie) بەشەخسیی بۆ سەدامی روونکردەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا " هیچ راوبۆچونێکی نییە لە کێشەکانی عەرەب لەناو خۆیاندا (عەرەب_ عەرەب). وەک ناکۆکیەکانتان لەسەر سنوورەکان لەگەڵ کوەیتدا" زنجیرەیەک راگەیاندن و دەربڕینی لەم جۆرە کە لە واشینگتۆنەوە دەردەچوون. ئەگەر وەک گڵۆپی سەوزیش نەبووبن تەواو ئاماژە بوون بۆ ئەوە کە ئەمێریکا نایەتە ناوەوە بۆ بەرگرییکردن لە کوەیت لە حاڵی هێرشی عێراقدا.[137] لە 31 جولایدا. نوێنەرانی عیراق و کوەیت لە جەددەی عەرەبستانی سعودییە بە یەکگەیشتن وەک دوا هەوڵ بۆ بەرگرتن لەشەڕ. کۆبونەوەکە بەشکست کۆتایی پێهات و شەڕ بوو بە شتێکی پێشبینییکراو.

## داگیرکرنی کوەیت

لە 2ی ئابی 1990 دا. سوپای عێراق سنوری بەزاند بۆ ناوەوەی کوەیت. دوای ئەوەی رووبەڕووبوونەوەیەکی جدیی زۆرکەمی هاتە پێش. لە کۆتایی ئەوڕۆژەدا کوەیتی گرت. کوەیت بەشێوازێکی بەرنامەرێژکراو لە هەر شتێکی بەنرخ دامالرا؛ پیاوانی کوەیتیی لەلایەن دەزگا ئەمنییە عێراقییەکانەوە کەوتنە بەر تێهەڵدان و ئەشکەنجەو ئیعدامکرن؛ دەستدرێژیی سێکسییش بۆ سەر ژنانی کوەیتیی شتێکی رۆتینیی بوو. ئەمێریکا سست بوو لە مەحکومکردنی داگیرکارییەکەی عێراق. لە راستییدا بۆی دەرکەوت کە چوارەم گەورەترین سوپا لە جیهاندا واخەریکە گەورەترین سەرچاوەی نەوتی جیهانیی مسۆگەر دەکات. لەترسی ئەوەی کە وڵاتەکەی رەنگە سەرەی هاتبێت بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی سە رنجی سوپای عێراقیی. شا فەهد شای عەرەبستانی سعودییە داوای هاوکاریی لە ئەمێریکا کرد. بۆ بەرگرییکردن لە وڵاتەکەی. سە رۆک جۆرج بوش زۆر خۆشحاڵ بوو کە خۆی ئەرکبار بکات. 40.000 سە ربازی ئەمێریکیی رەوانە کرد بۆ پاسەوانییکردنی سنوورەکانی سعودییە. سەدام بەڕەسمیی گێرانەوەی کوەیت و راگەیاندنی وەکو " نۆزدەهەمین پارێزگای عێراقی" وەڵام دایەوە . تا ناوەڕاستی مانگی ئاب تەوەرەکانی شەڕ کێشران.
لەرووی دیپلۆماسییەوە ئەمێریکا هەردوو ' گێزەر و کوتەک' ی بەکارهێنا بۆ مسۆگەرکردنی دەرچوونی بڕیاری ژمارە 678 ی ئەنجومەنی ئاسایشی مانگی نۆڤەمبەری 1990. کەڕیگای دا بە دەوڵەتانی ئەندام بۆ بەکارهێنانی هەموو" هۆکارە پێویستەکان" بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت مەگەر عێراق پێش 15 ی جەنێوەری 1991 بکشێتەوە. بۆ بەگەڕخستنی مەرجەکانی 678ی UNSCR. ئەمێریکا هێزێکی 600.000 ی لە هاوپەیمانان کۆکردەوە. کە لە نێویاندا سەربازی چەندین وڵاتی عەرەبیی تێدابوون. لەرووی ژمارەوە ئەم هێزە کەمتر بوو لە سوپای عێراقی بەڵام تا رادەیەکی زۆر باڵاتر بوو لە رووی تەکنەلۆژیی و مەشقکردن و ئامێرەوە. ئینکاریی سەدام لە ملدان لە ئاست ئەو هەموو توانا سەربازییەی نەیارەکانیدا. لەلایەن هەندێکەوە بەوە لێکدرایەوە کە بەڵگەی ئامادەباشیی بۆ چوونە ناو قوماری بێئامانەوە پێیە؛ بەڵام واقیعییانەتر بڵێین سەدام

خـــــۆی خزانـــــــدبووه سوچێکەوه. له ناوخۆدا. کشـانەوه، ئەگـەرێک نەبوو. ئەگەر ملیشی دابا بۆ وادەی کشانەوەکه مانای ئـه وه بـوو سـەدام تاڕادەیەک هەیبەتی دەشکا له عێراقدا کـه تـەنانـەت دەربـازبوونی خـودی رژێمەکەشی مسۆگەر نەبـوو. وەک یـەکێـک لـه نوسـەرەکـان گوتویـەتـی" کشانەوه لەو قۆناغەدا و لەژێر ئەو مەرجانەدا که هاوپەیمانان دایانڕشتبوو یەکسان بوو به خۆکوشتنی رژێمی عێراق"[138]

## ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیابان

دوو رۆژ لەدوای بەسەرچـوونی دوا وادەی 15 ی جـەنیوەری، هێـزەکـانی هاوپەیمانان ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیابانیان دەستپێکرد. یەکەم قۆناغی هەڵمەتەکه شـەش رۆژ بۆمبـارانکردنی خـەسـت بـوو، زۆربـەی ژێرخـانی سەربازیی(و سیڤیلیی) عێراقی هەڵوەشاندەوه. بـەمـه زۆربـەی دەسـکەوتـه گەورەکانی رژێمی بەعسی له ناوەڕاستیی حەفتاکانەوه لەنـاوبرد. چڕتـرین بۆمبـارانکردن بـوو تـا ئـەوکاتـه بینرابێـت" بەغـداد و 3.5 ملیـۆن دانیشتوانەکەی گەڕاندەوه بۆ جیهانی سێیەم"[139] لەسەروبەنـدی هـەڵمـەتـه ئاسمانییەکەدا. لەراستییدا داگیرکردنـی زەمینـی هاوپـەیمانـان شکسـتێکی تابڵیی شەرمەزارانه بوو. شەڕ له کەمتر له 48 کاژێردا دا کۆتـایی هـاتبوو و بۆ جارێکی تر کوەیت " ئازاد" بوو. له 28 ی شوباتدا سـەرۆک بـوش ئاگربەستی راگەیاند، ئەمەش زیاتر بۆ راگرتنـی کوشـتوبڕی بـەردەوامـی سەربازه عێراقییه بێدیفاعەکان له پاشەکشێکردنیاندا بوو.
زۆر بەئاشکرایی، گەردەلوولی بیابان شکستێکی جەرگبڕ بـوو بـۆ عێـراق؛ کـەمتـر لـه دوو مانـگ هێـزەکـانی هاوپـەیمانـان ژێرخـانی عێراقیـان تەفروتوناکرد و گەورەترین لەشکری زەمینی ناوچەکەیان ریسـوا کـرد— ئەمەش له بەرامبەر کەمترین زەرەردا له رووی قوربانییانی هاوپەیمانانەوه. سەرۆکی دەزگای هەواڵگری سەدام جەنەڕاڵ وەفیق سامەڕایی، که دیـاربوو گومانی نەبـوو لـه دەرەنجامـەکـانی شـەڕەکـه گوتبـووی" پێموایـه ئـەمـه گەورەترین نسکۆیه له مێژوودا"[140] له روویەکـی دیکـەوه ئـەم دەرەنجامـه لەلایەن سەدامەوه زۆر خراپ نەبوو. بەهەرحاڵ ئەو دەربازی ببوو. لەوەش زیاتر زۆربەی ئەو سەربازانەی که لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوه لەنێوبران، سەربازی بەزۆرگیراوی کـورد و شـیعه بـوون کـه خـراپ راهێنرابـوون و

باش پرچەک نەکرابوون . ئەوانەش کە بەر شالآوەکانی هاوپەیمانان نەکەوتن بەکۆمەڵ خۆیان بەدەستەوەدا. یەکە دەستبژێرکراوەکانی سەدام خۆی( واتە گاردی کۆماریی) بە سەلامەتی لە شەڕەکەدا دەرچوون— هەروەک دوایی دەرکەوت ئەمەش حیساباتێکی هەڵەو ستراتیژیی گەورە بوو لەلایەن هاوپەیمانانەوە. هەتا ئێستاش هەرکاتێک رووبەڕووی هەڕەشەیەکی جیددی بوویێتەوە بۆ سەر رژێمەکەی-- وەکو راپەرینە هاوکاتەکانی کورد لە باکوور و شیعە لە باشوور ئەوە گاردی کۆماریی بووە کە زامنی دەربازبوونی رژێمەکەی بووە.

## عێراق لە راپەڕیندا

لە 15ی شوباتدا، 13 رۆژ بەر لە راگەیاندنی ئاگر بەست، سەرۆک بوش لە یەک رۆژدا دووجار وتاری دا. لە هە ردووکیاندا داوای کرد" لە سوپای عێراق تا بڕیاری خۆیان بدەن و زۆر بۆ سەدام حوسێنی دیکتاتۆر بێنن لە دەسە لات دابەزێت". ئەم بانگەوازانە مەبەست لێیان هاندان بوو بۆ کوودەتایەکی سەربازیی. دەستەواژەی "خەڵکی عێراق" وەک بیرۆکەیەکی درەنگوەخت زیادکرا. بەڵام لە نێو عێراقدا بە شێوازێکی تر لێکدرایەوە.[141] بۆ ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی بەزۆرگیراوی{ رەشبگیر} عێراقیی( بە زۆریی شیعە)" کە وەکو جرج ڕاونران" لە کوەیتەوە و زۆر لەو خیانەتکردنەی سەدام تووڕە بوون، قسەکانی سەرۆک بوش وا تێگەیشتبوون کە ئاماژەبن بۆ ئەوەی راپەرینێکی جەماوەریی، چالاکانە لەلایەن سوپای ئەمێریکاوە پشتیوانی لێدەکرێت.[142] کاتێ سەربازە پەشۆکاو و تێکشکاوەکانی عێراق لە کوەیتەوە رژانە ناو شار و شارۆچکەکانی باشووری عێراق، دیتیان هەموویان رقێکی هاوبەشیان هەیە لە رژێمەکە.

راپەرینی باشوور تەقییەوە لە شارە سونییەکانی ( ئەبو خەسیب و زوبێر)، 50 میل لە باشووری بەسراوە، بەڵام هەرزوو وەکو ئاگری نێو کا بڵاوبووەوە بەرەو شارە شیعە سەرەکییەکانی بەسرە و نەجەف و کەربەلا. ئەمە راپەرینێکی بەرنامەرێژکراو نەبوو بەڵکو زیاتر زنجیرەیەک هەڵچوونی هاوکات و توندوتیژ بوون ( کۆمەڵێک هەڵچوونی پڕ توندوتیژیی). ئامانجی ئە و رقهەڵڕشتنە بریتیی بوو لە سیمبۆل و

کەسایەتییەکانی رژێمی بەعس. بەرپرسە بەعسییەکان لە لایەن دەستە دەستەی خەڵکی ڕاپەڕیو دەگیران و پاشان بەبەرچاوی خەڵکەوە بە شێوازی زۆر درندانە لە لایەن ئاپۆرەی خەڵکەوە دەکوژران. سیمبۆڵەکانی رژێم یان تالان دەکران یاخود خاپوور دەکران ئەمەش دوایی بە خێرایی بوو بەوێرانکاریی و کوشتن لەشێوەی تۆڵەسەندنەوە و تەفروتوناکردن و پاشاگەردانیی. وەک یەکێک لە بەشداربوان لە نەجەف دەیگێڕێتەوە" لەسەرەتاوە ئێمە کەمێک شێت بووین..... ئێمە پێمان وابوو تەنانەت ترافیک لایتەکانیش نوێنەرایەتیی رژێم دەکە ن، بۆیە ئەوانیشمان تێکشکاند" [143] دەسکەوتی سەرەکیی راپەڕین بریتی بوو لە خێراکردن لە تێکچووونی یاساو نیزام لە باشووردا. لێرەوە دروستکردنی بۆشاییەکی دەسەڵاتی خەتەرناک، بەڵام خاڵیی بوو لە سەرکردایەتییکردن و ئاڕاستەکردنێکی رێک و یەککگرتوو. روون نەبوو کێ ئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوە.

راپەڕینەکەی باکوور باشتر رێکخرابوو. یەککگرتوو لە ژێر ئاڵای بەرەی کوردستانیی عێراق دا(IKF). دوو پارتە کوردە سەرەکییەکە-- یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان(PUK) و پارتیی دیموکراتی کوردستان(KDP) جۆرێک لە هەماهەنگییان بەراپەڕین دابوو. تا 19 ی ئازار کوردستانی باشوور لە دەستی کوردەکاندا بوو. لەم حاڵەتەدا کە 16 پارێزگا لە کۆی 18 لە راپەڕیندا بوون، رژێمی سەدام لە کێشەیەکی گەورەدا بوو. هاتنە ناوەوەیەکی ئەمێریکا لەکاتی خۆیدا ڕەنگە لە شێوەی هاوکاریی ئاسمانییدا بۆ شۆڕشگێڕەکان-بەدڵنیاییەوە کۆتایی سەدامی دیاریدەکرد. بەڵام ئاشکرابوو کە رژێم گۆڕین بەدوای سەرهەڵدانێکی سەرتاسەرییدا، هەرگیز ئەوە نەبوو کە لە بیری ئەمێریکادا بوو. ئەمێریکا حەزی لە مۆدێلی ترادیسیۆنی عێراق بوو بۆ گۆڕینی رژێم—کوودەتایەکی سەربازی کە پێکهاتەی رژێمەکە وەک خۆی دەهێڵێتەوە. بەڵام سەدام بگۆڕێت بە دیکتاتۆرێکی دەستەمۆتر. هەروەک پاشاگەردانییە خێراکەی باشوور بە ئاشکرا پیشانیدا، بەدیلی شێوازی سەدام بۆ یاساو نیزام— بێ یاسایی و بێ پەیرەوی بوو. بەڵام ترسی ڕاستەقینەی ئەمێریکا ئەوەبوو کە گرووپە ئیسلامییە توندڕۆ شیعەکان ئەو بۆشاییە پڕ دەکەنەوە. لێرەوە سەرتاپا مۆژنەکانی راپەڕین دەگۆڕن.

دوای دڵنیـــا بـــوون، ئـەنجومـەنـی بـاڵای شۆڕشـی ئیسلامیی لـە عێراق، کە لەلایەن ئێرانەوە پشتیوانی دەکرێت،[144] پشتبەستوو بـە هێـزە سەربازییەکانی خۆی( فەیلەقی بەدر). هـەڵـەکـەی قۆستـەوە، بـە دەرکردنـی فەرمانی ئەوەی کە " هەموو هێـزە عێراقییـەکـان دەبـێ خۆیـان تـەسلیمی ئەنجومەنی بـاڵای شۆڕشـی ئیسلامیی بکـەن و گوێڕایـەڵـی ئـەوان بـن" هەروەها" جگە لە فیکری ڕاستـەقینـەی ئیسلامیی نـابێ هـیچ شـتێکی تـر بڵاوبکرێتە وە"[145] هەوڵەکـانی ئـەنجومـەنـی ئیسـلامیی بـۆ جڵـەوکردنـی ئاڕاسـتەی ڕاپـەڕین پێشـهاتێکی مـەترسییدار بـوو. نـەک هـەر ئـەوەی هـەڕەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە بـارەکـە بارگـاوی بکـات بـەتاموبۆیـەکـی توندڕۆیانەی شیعەگەرایی کە ببێتە هەڕەشەیەکی جدیی بۆ سە ر کەمینەی سوننە؛ بەڵکوو نفوزی ئێرانیشی زیادکرد بەسەر باری ناڵەباری ئەو کاتەدا لە عێراق. دەستێوەردانی ئەنجومەنی باڵا بێگومان یەکلاکەرەوە بوو. بـەڵام بـە گشـتیی لەبـەر ئـەوەی شکسـتی بـە ڕاپەڕینەکـە هێنـا. ئەگـەری ڕژێـم گۆڕینێک کەسەر بکێشێت بۆ جێگرتنەوەی سەدام بە دەسە ڵاتێکی ئـاییـنی شـیعیی لـە ژێـر هێجـەمۆنی ئێرانییـدا لەلایـەن زۆر لـە یاخیبووەکانـەوە خـوازراو نـەبوو. بـە هـیچ شـێوەیەکیش لـە لایـە ن ئـەمێریکاوە مایـەی پەژراندن نەبوو. تێوەگلانی ئەنجوومەنی باڵا هێـزەکـانی دژ بـە سـەدامـی پارچە پارچەکرد زەمانەتی ئەوەشـیدا کـە ئـەمێریکا خـۆی دوور بگرێـت بەوەی کە پشتیوانی لە ڕاپەڕینی باشوور ناکات.

دوای ئەوەی ڕووبەڕووی ڕاپەڕینەکانی باکوور و باشوور بووەوە، حیزبـی بەعس و هەرێمی ناوەڕاستیی عێراق( ناوچەرگەی سوننەکان) لێکدانـەبـڕا. بەڵکوو ئەو هەڕەشانە پشتیوانیان بۆ ڕژێم توندترکردەوە لە نێو کەمینەی سوننەدا. ڕژێم زۆر بێهێز کرابوو لەلایـەن هێـزی هاوپـەیمانانـەوە، بـەڵام هێشتا بەهێزتر و یە ککگرتووتر مابووەوە لە نەیارەکانی. هەر گومانێک کە هەبوو دەربارەی نیازی ئەو هێزە ئەمێریکییانەی کە بەشێک لە باشووریان داگیرکردبوو ڕەویەوە دوای ئەوەی کە چاودێرکردنی چەند پێوەندییەکـی تەلەفۆنی ئاشکرای کرد کە ئەمێریکا هـەنـدێک داخـوازی یـاخیبووەکـانی باشووری بۆ هاوکاریکردنیان ڕەتکردووەتـەوە. وەڵامـی ئـەمێریکا دیـارە ئاوا بووە" ئێمە پشتیوانیتان ناکەین لەبـەر ئـەوەی ئێـوە شـیعەن و ئێـوە دەستان لە گە ڵ ئێراندا تێکەڵکردووە"[146] دوای ئەوەی ئاوا دڵنیا کرایەوە،

سـەدام ئامۆزاکـەی و زاواکەی، حوسێن کامیل( کە تازە بە وەزیـری بەرگریی دەستنیشان کرابوو) و چەند یەکـەکـی گـاردی کۆمـاریی بـەرە و باشوور بەرێکرد بۆ لەناوبردنی یاخیبوونەکە. یـەک لـە دوای یـەک شـارە گەورەکانی باشوور، بەسرە، کەربەلا و نەجەف کەوتنە ژێـر دەسـتی هێـزە دڵسۆزەکانی رژێم. تا نـاوەراسـتی مـانگی ئـازار سـەدام دەسـتی بـەسـەر باشووردا گرتەوە.

کوردەکان سەرەیان هاتبوو لە لیستەکـەدا. هێـزەکـانی رژێـم، پڕچـەک بـە هـەلیکۆپتـەری جـەنگیـی، بـە بێمانـایی وەک بـەشـێک لـە رێککـەوتنـی تەسـلیمبوون لـەگـەڵ هاوپـەیمانـان رێگـەی پێـدرابوو بـۆ بـەکارهێنانیان، هێزەکانی رژێم، جارێکیتر بە گاردی کۆماریی پێشکەوتـوو . چوونـە نـاو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی کوردە راپەڕیوەکانـەوە. تـا نـاوەراسـتی ئـازار راپەڕیوە کوردەکان لە شارە گەورەکان وەدەرنرابـوون بـەرەو شـاخەکـانی سەرسنووری تورکیا و ئێـران. ئـەو توندوتیژییـەی کـەبـەبێ جیـاوازیی پەیرەو کرابوو لەبەرامبەر پێشمەرگەی کوردو خەڵکی مەدەنیی وەک یـەک، کۆچێکی بەکۆمەڵی {کۆڕەو} گەورەی بەرپاکرد، کارەساتێکی مرۆیی مەزنی خولقاند. تا کۆتایی ئەپریل، نزیکەی یەک میلیۆن کورد یان سـەرمـابردوو بیوون یان خەریک بوو لە برسا دەمردن لەسەر سنووری تورکیا. لەوەڵامی ئەوەدا نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارێکی دەرکرد، داوای کرد کە داپڵۆسینی هاوڵاتیانی عێراقیی رابگرێت و رێگە لە فرۆکە عێراقییەکان بگیرێت کە لـە بـاکووری هێلـی 36 دا جموجـۆڵ نەکـەن. ژمـارەیـەک" پـەناگـەی ئـارام" دروستکران بۆ پاراستنی هاوڵاتییانی پەرتەوازەبووی کـورد، بـەڵام ئـەمـە تەنها رێژەیەکی بچووکی کوردسـتانی عێراقـی گرتـەوە، و هـیچ لـە شـارە گەورەکانی هەرێمەکەی نەگرتـەوە. راپـەرینـی کـوردان کۆتـایی پێهـات و سەرکردایەتی بەرەی کوردستانیی رێگەی چارەیەکی بەدەسـتەوە نـەمـابوو ئەوە نەبێت کەجێگەی خۆی بکاتـەوە لـەگـەڵ رژێمـدا بـۆ بـەرگـرتن لـەو کارەساتە مرۆییەی کە لە شاخەکانی زاگرۆسدا بەرێوەبوو.

جەنگی دووەمی کەنداو و ئاسەوارە خێراکانی لەهەمان کاتدا خاڵە بەهێز و لاوازەکانی رژێمەکەی سەدامی دەرخست. کە ڕووبـەڕووی هێزێکـی تـەواو پڕچەککراو، تەواو راهێنراو لەرووی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووەوە بـووەوە، هێزە عێراقییەکان، بە خێراییـەکـی مـەترسیدار لێکهـەڵوەشـان. دیـاربوو،

ئـــــــۆرنووی چـــــــوارەم گەورەتـرین سـوپای جیهـان هـیچ مـەیلێکـی نەبوو لەپێناوی بەرگرییکردن لە رژێمی سەدام شەڕ بکات و سـەربازەکانی بەکوشت بدات . بەڵام ئەو هێزە بەزەبرەی کە لەبەردەستی رژێمدا بوو-بە تایبەتی گاردی کۆماریی و هێزە ئەمنییـە جیاجیاکـان بێـڕادە لـە نێوخـۆدا بەهێزتر بوون لە هەر شتێک کە هێزە بـەرهـەڵستکارەکـان بتـوانن کـۆی بکەنەوە. لە کۆتاییدا. راپەڕین لە باکوور و باشووردا زۆر بـەئاسـانیی لـە ماوەی هەفتەیەکدا تێک شکێنرا.

## ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا

پاکێجی سەرەکیی سزاکانی نەتەوە یەککگرتووەکان( SCR 661 ). کە لـە ئـابی 1991 دا دەرچـوو. بـەسـەر دەوڵـەتـانی ئـەنـدامی نـەتـەوە یەککگرتووەکانیدا سەپاندبوو کە رێگە لە مامەڵەی ئابووریی بگرن لـەگـەڵ عێراقدا. بەکردەوە ئەمە مانای وابوو کە قەدەغەیەکی تـەواو بخرێتـە سـەر هەموو هاوردە و نێردەیەکی عێراقیی. بڕیاری (UNSCR 687)--- کـە بە" دایکی هەموو بڕیارەکان" ناسراوە بەهۆی درێژبوونەوەکەی— رێگـەی بەعێراق دا بوو کـە خـواردن و ئـەو کـەرەسـانە هـاوردە بکـات کـە" بـۆ پێویستییەکانی خەڵکی مەدەنیی بنەڕەتیین": عێراقی بە بـەرپـرس دانـا لـە هەموو ئەو زەرەرانەی کە لە کوەیت کەوتن: هەروەها داوای لە عێراق کـرد. بەبێمەرج. قبوڵی بکات کە هەموو بەشەکانی پرۆگرامـی چـەکـە کیمیـایی و بایۆلۆژییەکانی و هەروەها موشەکە بالیستیکییەکانی کە لە 150 کیلۆمەتـر زیاتر بڕدەکەن."لە ژێر چاودێریی نێودەوڵەتییدا لەناویان ببات. لایان ببات. یـان لـەکاریـان بخـات" بڕیـاری 678 کۆمیتـەیـەکـی تایبـەتیـی UN ی دروسـتکرد بـە نـاوی(UNSCOM) بـۆ چـاودێرییکردن و لـەنێوبردنی چەکەکان و هەروەها دەسەڵاتی لەنێـوبردنی بـەرنامـەی چـەکـی ئـەتـۆمیی عێراقی دا بە ئاژانسی وزەی ئەتۆمیی نێودەوڵە تیی(IAEA ).

هەڵگرتنی سزا ئابوورییەکانی دژ بە عێراق بەسترایەوە بە مەرجی ئەوەی کە راپۆرتەکانی UNSCOM و IAEA نیشانی بدەن کە ئەرکـەکانیـان بە سەرکەوتوویی جێبەجێکراوە. لـە سـەرەتـادا. هـەوڵـەکـانی UN بـەدوو کێشەی سەرەکیی پەکخران. یەکـەم. بڕیارگـەلێکی زۆر. عێراقیـان لـە رووی مادییـەوە کـردە بـەرپـرس بـۆ دابینکردنـی دارایـی بـۆ کـارەکـانی

UNSCOM و IAEA و له هەمانكاتدا خەرجی ئاوەدانكردنەوەی كوەیت. ئەم پارە دابینكردنە تەنها دەكرا لە رێگەی نێردەی نەوتی عێراقەوە بێت، كە ئەمیش هاوكارییەكی جیدیی عێراقی دەویست. بەڕای سەدام، خاڵەكانی بڕیاری 678 ڕەنگدانەوەی بەزاندنێكی زەقی سەروەریی عێراق بوون. لەوەش مەترسییدارتر بەڵگەیەكی زەقی بێهێزیی رژێم بوون لە دوای جەنگی كەنداوەوە. لە بنەڕەتدا. عێراق لە سەری فەرزكرابوو كە باجی ڕیسوابوونی نیشتمانیی بدات.

دووەم، بڕیاری 678 سەودایەكی تێدابوو، كە تێیدا هاوكارییكردنی عێراق لەكاتی لەنێوبردنی چەكە كۆكوژەكانیدا بە لابردنی سزاكانی سەری خەلات دەكرا. لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەرەتای ئەپریلی 1991 دا سەرۆك بۆش ئاشكرایكرد ئامانج لە سزاكانی UN (لە روانگەی ئەمێریكاوە) چەكداماڵین نەبوو بەڵكوو گۆڕینی رژێم بوو. لە كۆنگرەیەكی ڕۆژنامەوانییدا لە 16 ی ئەپریل، بوش بەكردەوە بڕیاری 678 ی دووبارە داڕشتەوە، كاتێك رایگەیاند " ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر سزا ئابوورییەكان هەتا سەدام حوسێن لەوێ بێت"[147] كەمێك دوای ئەوە سەرۆك بوش فەرمانی بە CIA كرد هەڵمەتی شاراوە دەستپێبكەن بۆ "خولقاندنی هەلومەرجێك بۆ لابردنی سەدام لە دەسەلات".

ئەم سیاسەتە نوێیە لە 7ی مەیدا لە لایەن جێگری راوێژكاری ئاسایشی نەتەوەیی رۆبێرت گەیتز(Robert Gates) بەرجەستە كرا، كە تەئكیدی كردەوە" هەموو سزایەكی گونجاو بەردەوام دەبێت هەتا ( سەدام) دەڕوات... هەر سووككردنێكی سزاكان تەنها وەختێك قسەی لێدەكرێت كە حكومەتێكی نوێ بێتە كایەوە"[148] پەیامی ئەمێریكا بۆ سەدام روون بوو. هیچ شتێكی لە هاوكاریكردنیدا بۆ لە نێوبردنی توانای چەكە كوژەكان. دەست ناكەوێت . لە ژێر ئەم بارودۆخەدا. جێگەی سەرسوڕمان نییە كە هەوڵەكانی UNSCOM بۆ جێبەجێكردنی بڕیارەكە وردە وردە سەریكێشا بۆ گەمەیەكی مشك و پشیلەی درێژخایەن و گرانبەها كە بۆ ماوەی یەك دەیە كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی سەرقاڵكرد.

## گەمەكە دەستپێدەكات

" یاساکانی" گەمەکە هەر زوو دامەزرێنران. پشکنەرەکانی UNSCOM و IAEA لە حوزەیرانی 1991 دا گەیشتنە عێراق. تا ناوەراستیی حوزەیران ئەوان بەڵگەیان دۆزیبووەوە لەسەر بەرنامەی چڕوپڕ و تا ڕادەیەک ئاڵۆزی چەکی ئەتۆمیی عێراق: لە هەمان مانگدا سەدام ئەنجومەنێکی نهێنیی و پلە بەرزی لە ڕاوێژکارە نزیکەکانی ڕاسپارد بۆ شاردنەوەی چەند بەشێکی بەرنامەی چەکە کۆکوژەکانی. پلانەکە یەکێک بوو لە ددانپێداهێنانە ستراتیژییەکان تێکەڵکراو بەفێڵێکی ورد. عێراق بەتەواویی هاوکاریی دەکرد لە هەندێک بواردا( پرۆگرامی ئەتۆمیی. هەندێک پرۆگرامی کیمیایی) هاوزەمان بە شێوازێکی سیستەماتیزەکراو ئەو بەڵگانەی دەشاردەوە کە پەیوەست بوون بە پرۆگرامەکانی گازی دەمار و چەکە بایۆلۆژییەکانەوە. لە هەمانکاتدا پلانەکان بۆ لەنێوبردنی ڕژێمی سەدام خەریک دەبوو دەکەوتنە کار. لە حوزەیرانی 1992 دا یەکەم کۆبوونەوەی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق لە ڤییەننای نەمسا لە ژێر سەرکردایەتی بزنسمانی ئاوارە ئەحمەد چەلەبییدا بەسترا.

کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی(INC ) وەک ڕێکخراوەیەکی خڕکەرەوە سەیر دەکرا. کە (لای کەم بە ڕووکەشیی) گروپە عێراقییە بێئومێدەکان لە ژێر یەک چەتردا یەکدەخات. چەلەبیی بە پاڵپشتی دارایی CIA هەموو ئەمانەی لەگەڵ یەکتری کۆکردەوە: هەردوو حیزبە کوردییە سەرەکییەکە( یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و پارتیی دیموکراتی کوردستان). پاشماوەکانی حیزبی شیوعیی عێراقیی و. چەند گرووپێکی بەئاشکرا ئیسلامیی( لە نێویاندا ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراقدا). و دەستەیەک لەو عێراقییە ئاوارانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر دژایەتی دەسەلاتی سەدامیان دەکرد. گرووپێکی تر هاتبووە پاڵ INC کە ئەویش(INA ) ویفاقی نیشتمانی عێراقی بوو— کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێک کۆنە ئەفسەری ناڕازیی و کۆنە بەعسیی. بە پێچەوانەی INC وە. کە هەوڵی دەدا پێکهاتە جیاوازە زۆرەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە. ویفاقی نیشتمانیی. هەرچەندە لە لایەن سێکولیارێکی شیعەوە سەرکردایەتی دەکرا( دکتۆر ئەیاد عەلاویی). بەلام هێشتاش ڕێکخراوەیەکی زۆرینە سوننە بوو. کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقیی و

ویفـــاقی نیشـــتمانیی دوو ڕێگە چارەی تەواو جیاوازیـان دەخسـتە ڕوو بۆ گۆڕینی ڕژێم لە عێراقدا.
جگە لە تێکەڵاویان لەگـەڵ دوو حیزبـە کوردیـە سـەرەکییـەکـە، کـۆنگرەی عێراقیی پێوەندیی کەم بوو لەگەڵ خەڵـک لـەئاسـتی بـەرز و لـە نـاوخۆی عێراقدا؛ چەلەبیی خۆی کە لە 1958 وە عێراقی بـەجێهێشـتبوو کـەسێکی تەواو نەناسراو بوو. پلانەکە یان ئەوەبوو کە خاکی کوردان بەکاربێنن بۆ دەستپێکردنی ڕاپەڕینێکی سەراسەریی دژ بە ڕژێم. ئامـانجی سـەرەکییـان جێگرتنەوەی سەدام بوو بە دەسەڵاتێکی نوێنەرایەتی دیموکراتیی. ویفـاقی نیشتمانیی دەیتوانی پێوەندیی لە باڵاترین ئاستی ڕژێمی سەدامـدا پـەیـدا بکات( لە نێویاندا لە ناو گاردی کۆماریی و دەزگا ئەمنییـەکـانی دەوڵـەت). یـاخود پلانـەکـەیـان ئـەوە بـوو کـە ئـەو پێوەندییانـە بـەکـاربێنن بـۆ پـەیـڕەوکردنـی ڕێگـە چـارەی" گوللـەی زێـڕین"-- کوودەتایـەکـی بـێ خوێنڕشتن کە ڕژێمێکی سوننیی سالار بگۆڕێت بە یەکێکـی دیکـە. بۆیـە هەر لە بەراییەوە کۆنگرەی عێراقیی و ویفاقی نیشـتمانیی دوو ئـەجێنـدای جیاوازیان پەیـڕەو دەکـرد و پێوەندییـەکانیشـیان بـۆ ڕاکێشـانی دارایـی CIA. ڕکابەری پێوە بوو تا ئەوەی هاوکارییکردن بێت لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش. CIA خۆیشی لە نێوخۆیدا بەشبەش ببوو لە سەر لایەنە باشەکانی هەریەک لەو دوو ڕێگە چارەیە. هەرچەندە بەگشتیی لەگەڵ ڕێگەچارەکەی ویفاقی نیشتمانییدا بوو، چونکـە سـاناتر بـوو و ئـەگـەری سەرکەوتنیشی زۆرتر بوو.[149] لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەو سەرەوە دیـار بـوو کە ئۆپۆزیسیۆنی تاراوگە هەموو شتێکە تەنها تەبا و یەکگرتوو نییە.

## عێراقییەکان باجەکە دەدەن

لە نێوان سالانی 1991 و 1996 دا. عێراق کەوتە ژێر باری یەکێـک لـە بەرفراوانترین ڕژێمی سزاکان کە تـا ئەوکاتـە کۆمـەڵگـەی نێـودەوڵـەتیـی سەپاندبێتی بەسەر وڵاتێکدا. ڕەتکردنەوەکەی بەرایی سەدام بۆ پەژراندنی ڕێککەوتنی ( نەوت لە بەرامبەر خۆراک) ی UN دا ( کە ڕێگەی بە عێراق دەدا هەر شەش مانگ جارێک بایی 1.6 بیلیۆن دۆلار نەوت بەڕێبکات بۆ کڕینی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی خەڵکی سیڤیل) مانـای ئـەوە بـوو کـە، جگە لەو ئالۆویرانەی لە ڕێگەی بەقاچاغ دەرکردنی ڕێژەی کەمکەمی نەوت

بۆ ئەوییو سنوورەکانی وڵاتە دراوسێکانی ئەردەن و تورکیا. عێراق هیچ سەرچاوەیەکی داهاتی پشتپێبەستراوی نەبوو بۆ دابینکردنی هاوردەی خواردن و پێویستی دەرمانیی کە پێویست بوو بۆ پارێزگارییکردن لە دانیشتوانەکەی، نەخوازەڵا ئاوەدانکردنەوەی ژێرخانی لێکهەڵوەشاوی. لە نێو ئەو ئامانجە سەربازییانەی کە سەرنجی جبەخانەی هاوپەیمانانی ڕاکێشابوو لە کاتی شەڕدا وێستگەکانی کارەبا. بەشەکانی ئاوەڕۆ و پرۆژەکانی پاککردنەوەی ئاوبوون، ئەمانە بەبێ هێنانی کەرەسە لە دەرەوە نەدەتوانرا چاکبکرێنەوە. بەڵام لە دواییدا. مەترسی ڕاستەقینە لە سەر خەڵکی هەمیشە پڕمەینەتی عێراق، برسییەتیی نەبوو( سیستەمێکی یەکسان و ڕێکوپێکی دابەشکردنی خواردەمەنیی پەیڕەو دەکرا کە وایکرد حکومەت بتوانێت زیاتر لە 50% ی پێویستییەکانی ڕۆژانەی تاکەکان دابین بکات، بەڵکوو مەترسی سەرەکیی وەک مەرحەمەتێکی تێکەڵەی سەدام، بریتیی بوو لە بەدخۆراکیی و پەتا و دارمانی سیستەمی چاودێریی تەندروستیی. ئەو دارووخانە قووڵەی ئاستی ژیانی خەڵکی سادەی عێراقی بۆ ئاستی سەب سەحارای ئەفریقا برد . لە لایەکەوە ئەو خەڵکەی کە سەرقاڵ بوو بە کاری خۆ ژیاندن و گوزەران، زەحمەت بوو هەڕەشەیەکی جەماوەریی بۆ سەر رژێم دروست بکات .

هیچ نەبێت، داهێنانی سیستەمی دابەشکردنی خۆراک کۆنترۆڵی رژێمی بەسەر خەڵکەکەیەوە نەک کەم بەڵکوو زیاتر کرد. هاوڵاتییە" باشەکان" بە بایەعی زیاتر خەڵات دەکران و ئەوانەش کەکێشەیان نایەوە بۆی هەبوو بەیەکجاریی خۆراکیان لێببڕدرێت. لەوەش زیاتر. نەهامەتییەکانی ئەو عێراقییانەی کە قوربانیی یەکەم بوون_زۆر لە منداڵ و بە ساڵداچووەکان— کەرەسەیەکی پڕوپاگەندەی بەنرخی دایە سەدام لە شەڕە قسەیدا لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا. وێنەی تەلەفزیۆنی ئەو ساوا عێراقییە سیسەڵانەی کە لەناو عێراق و جیهانی عەرەبییدا بڵاودەبوونەوە کاتێک لە نەخۆشخانە وێرانەکانی عێراقدا کەمترین چارەسەرییان پێدەگەیشت، بوو بەهۆی خولقاندنی تورەیی و ڕق دژ بە ئەمێریکا و بەریتانیا(کە لەهەموان زیاتر توندتر بوون لە بانگەشە بۆ مانەوەی سزاکانی سەر عێراق).

بەڵام کاریگەریـی سزاکان ئەگەری مەترسیی بۆ سەر سەدامیش خولقاند. لـە کاتێکـدا لـە 60% ی عێراقییـەکـان پشـتیان بـە مووچـەی حکومـەت دەبەست، سەدام پێویستی بـە ڕێگـەیـەک هـەبـوو کـە پـارەی دەزگاکـانی دەوڵەت دابین بکات. کە نەیدەتوانی( یان نەیدەویست) لە سەرچـاوەکـانی نەوتەوە داهات پەیـدا بکـات، ڕژێـم پـەنـای بـرد بـۆ کردنـەوەی دەزگـای چـاپکردن و دەسـتیکرد بـە دینـار ڕاکێشـان. هـەڵاوسـانێکی حـەتمـی گەورە_نرخەکان لە شەش مانگی یەکەمی شەڕدا بـۆ نزیکـەی لـە 600% بەرز بوونەوە – هەرزوو دیناری کرد بە شتێکی بێنرخ و خەڵکی هـەرچـی زیــاتر ڕوویکــردە ئــاڵوگۆڕکردن بــۆ دابینکردنــی پێویســتییەکانیان. مووچەکانی حکومەت نەیانتوانی  شانبەشانی ڕێژەی هەڵاوسان بڕۆن، بەو هۆیەوە، داهاتی ڕاستەقینەی فەرمانبەرانی حکومەت بۆ لە 90% دابەزی لە ماوەی ساڵی یەکەمی سزاکاندا. لە سـاڵی 1993 دا، نرخـی ڕاستەقینـەی مووچەکـانی حکومـەت دابـەزی بـۆ 5 دۆلار مـانگی . ڕژێمـی سـەدام کـە زۆربەی شەرعییەتی خۆی لـەوەوە وەرگرتبـوو کـە توانیبـووی بژێویـەکـی هەرچی باشتر بۆ خەڵکی سادەی عێراقی دابین بکات، ئێستا سەرۆکایەتـی بەسەر کارەساتێکی ئابوورییەوە دەکرد. یەکێـک لـەکۆڵـەکـە گرنگـەکـانی سەدام  خەریک بوو دەڕوخا.

لەهەمووشت مەترسییدارتر بۆ سەر سەقامگیری ڕژێـم ئاشـکرابوونی ئـەو ڕاستییە بوو لە چەند بەشێکی عێراقدا کە هەتا سەدام لە دەسـەڵاتـدا بێـت وەزعەکە لەوە باشتر نابێـت. ئـەو سـەرۆک خێڵـە سـوننییانەی کـە پێشـتر دڵسۆزی سەدام بوون و گەلێک کـەڵکیـان لـە پشـتیوانییەکانی وەرگرتبـوو ئێستا لە ئاغاکەی خۆیان هەلگەڕانەوە .بۆ نموونە لـە سـاڵی 1993دا دوو ئەفسەری سەربازی لە خێڵی جبوور، کە لە دەوروبـەری موسـڵدا جێگیـرن، گیران و لەناوبران، بەتاوانی پلاندانان بۆ کوودەتایەکی سـەربـازیی. هـەر نائارامییەک لە ناوچەرگەی سوننە دڵسۆزەکاندا وەک ڕومـادیی و سـامەڕا هەبووایە، دەبوو بە هێز سەرکوت بکرێت. ئەوانە ئەو ناوچانـە بـوون کـە بەحەماسەتەوە دڵسۆزی سەدام مابوونەوە، تەنانـەت لـە ڕۆژە تاریکـەکـانی 1991یشدا. دیـار بـوو ئـەوانـیش گـەیشـتبووە سـەر لوتیـان. زەمینـەی پشتیوانیی لە ڕژێم زۆر بەرتەسک دەبووەوە. وەڵامی سەدام ئـەوەبـوو کـە

زیاتر پشتی بە کەسە نزیکەکانی خۆی و خێزانە گەورەکەی دەبەست—بەڵام تەنانەت لێرەشدا وردەوردە کەلێن دەردەکەوت.

## ڕکابەریی خێزانیی

بۆ پڕکردنەوەی پێگە هەستیارەکانی ڕژێمەکەی، سەدام زیاتر پشتی بە کەسە نزیکەکانی خێزانەکەی خۆی دەبە ست— هەردوو کوڕەکەی عودەی و قوسەی— و دوو باڵ لە خێزانە گەورەکەی( بنەماڵەی بێجات لە خێڵی ئال بوناسر)، بنەماڵەکانی المجید و ابراهیم. لە نێو بنەماڵەی (ئەلمجید) دا کە پۆستی سەرەکیی لە ڕژێمدا پێبڕابوو، بەناو بە " چەکوچی کوردان" و ئەندازیاری هەڵمەتی ئەنفال، عەلی حەسەن المجید("عەلی کیمیایی")، و حوسێن کامل و سەدام کامیل بوون کە ئەو دووانەی دوایی بەدوای یەکدا کچەکانی سەدام ڕەغدە و ڕەنایان خواستبوو. ئەلمجیدەکان " جێبەجێکەرەکانی" بنەماڵە بوون—ئەوانەی کە سەدام هەرکاتێک پێویستی بە بەکارهێنانی درندایەتییەکی زۆر دەبوو پەنای بۆ دەبردن. لە 1988 دا عەلی حەسەن مەجید لە ریزی پێشەوەی قەتڵوعامکردنی کوردەکاندا بوو؛ لە 1991 دا بەرپرسیارییەکە تەسلیم بە حوسێن کامیل کرابوو، کە یارمەتی تێکشکاندنی ڕاپەڕینی باشووری دا بەو درندایەتییەی کە سیمای ئەو خێزانە بوو. لە بەشی ئیبراهیمی بنەماڵەدا، هەرسێ زڕبراکەی سەدام، بارزان و وەتبان و سەبعاویی لە قۆناغی جیاجیادا پۆستی بەرچاویان لە دەزگاکانی ئەمن و هەواڵگرییدا وەرگرتبوو. پێکەوە لەگەڵ عودەی و قوسەی ئەمانە کۆڵەکەی ڕژێمی سەدام بوون.

بەڵام ئەمە خێزانێکی بەختیار نەبوو. دوژمنایەتی لە نیوان ئەو دوو بنەماڵەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ 1983، وەختێک سەدام بنەماڵەی ئەلمەجیدی لەجیاتی بنەماڵەی ئیبراهیم بۆ هاوسەری ژیانی کچەکانی هەڵبژارد، ئەم پێوەندییە تا نەوەدەکانیش باش نەبوو. ئەوەی کە بە ڕووکار بە دەستەیەکی دەسەلاتداری پێکەوە گرێدراوی تەبا خۆی دەنواند لەراستییدا مۆڵگەیەکی بۆگەنی ڕکابەری خێزانی بوو. ڕادەی جیاوازیی لەنێو بنەماڵەی دەسەلاتداردا لە ئابی 1995 دا زۆر بە ڕوونی دەرکەوت کاتێک کاروانێک لە مارسیدسی ڕەش کە حوسێن کامیل و برا بچوکەکەی سە دام کامیل و ژنەکانیان( کچەکانی سەدام) و چەندین ئەندامی تری بنەماڵەی

ئەلمەجید ئاودیوی سنوور بوون بۆ ناو ئەردەن. [150]حوسێن کامیل یەکێک لە سەرە گرنگەکانی مەکینەی حوکمکردنی سەدام. هەڵگەڕابووەوە. [151] لەگەڵ خۆیدا. زانیاریی گرنگی برد کە پەیوەستبوون بە بەرنامەی ئالۆزی عێراق بۆ شاردنەوەی چەکە کۆکوژەکان لە پشکنەرەکانی UNSCOM .

چوار ڕۆژ دوای گەیشتنی بە عەمان. کامیل لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییدا دەرکەوت و ئاشکرای کرد مەبەستی ئەو لەوە زیاترە کە تەنها ژیانێکی تازە بێت لە ئەردەندا. ئەو رایگەیاند" ئێمە کار لە سەر ئەوە دەکەین کە رژێم بڕوخێنین". کامیل داوای لە جەوهەری دارودەستە داپلۆسێنەرەکەی سەدام —دەزگای ئەمن و گاردی کۆماریی و گاردی تایبەتی کۆماریی— کرد کە ڕاپەڕن و رژێم بڕوخێنن. ئەمە بانگەوازێک بوو سەیر نییە کە کەس گوێی لێنەگرت.[152] لە کۆتاییدا هەڵگەڕانەوەکەی کامیل بۆ بزواندنی گۆڕینی رژێم وەک نەبوویێت وابوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرای کرد کە درزێکی ڕوخێنەر لەناوجەرگەی رژێمدا پەیدا بیوو. لەم ڕووەوە. ئەم هەڵگەڕانەوەیە بۆی هەبوو گەورەترین کوتەکی جەرگبڕ بێ کە سەدام لەوکاتەوە ببووە سەرۆک توشی هاتبوو. بوونی کامیل لە عەمان هەروا ڕێگەی دا بوو بە سەرۆکی UNSCOM ڕۆلف ئیکۆس( Rolf Ekeولاتە یەککگرتووەکان ) سوود لە عەقڵی ئەو پیاوە وەربگرێت کە سەرپەرشتی شاردنەوەی پرۆگرامی چەکە کۆکوژەکانی عێراقی کردبوو لەوکاتەوە کە دەستکرابوو بە پشکنینیان. لە چاوپێکەوتنەکاندا کامیل ڕوونی کردەوە کە چۆن پرۆگرامی شاردنەوەکە سەرکەوتوو بووە لە چاوبەستەکردنی UNSCOM بۆ ماوەی چوار ساڵ. هەروەها ووردەکاریەکانی پرۆگرامە چڕەکانی چەکی بایۆلۆژیی و گازی VX ی ئەعسابی عێراقیی ئاشکرا کرد.

لە وێ لە بەغداد. رژێم شێوازی خۆی گۆڕی بۆ کەمکردنەوەی زیانەکان. بە شێوەیەک کە باوەڕ ناکرێت ئیدعای ئەوەی کرد کە حوسێن کامیل تەنها خۆی بەرپرسیار بووە لە شاردنەوەی بەڵگەکانی پرۆگرامی چەکە کۆکوژەکانی عێراق. ئەمەشی بەبێ ئاگاداری رژێم کردووە. هەروا سەدام چەند هەنگاوێکی نا بۆ توندکردنی دەسەڵاتی بەسەر رژێمەکەیدا. حوسێن کامیل لە هەموو پێگەیەکی ڕەسمی داماڵرا و لە حیزبی بەعسیش وەدەرنرا.

سـه‌دام عـــوده‌ی به‌لێهاتوویه‌کی سیاسیی هه‌ڵسه‌نگاند و کـوڕه بچوکه‌که‌یشـی هـه‌ڵبـژارد بـۆ پڕکردنـه‌وه‌ی ئـه‌و بۆشـاییانه‌ی کـه کـامیلی هه‌ڵگـه‌ڕاوه بـه‌جێیهێشـتبوون. لێـره‌وه یـه‌کێـک لـه بـه‌ره‌نجامـه‌کـانی ئـه‌و هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌یه ئه‌وه‌بـوو کـه سـه‌دام بازنـه‌ی ده‌سـه‌ڵاتـی لـه ده‌وری خـۆی بچوکبکاته‌وه. چیـدی بنـه‌ماڵـه‌ی پـانوپۆڕ ناکرێـت بـڕوای پێبکرێـت. بـۆ ئه‌مه‌ش ته‌نها که‌سه نزیکه‌کانی خودی خێزانه‌کـه‌ی خـۆی هێشـته‌وه وه‌کـو سه‌رچاوه‌ی دڵسۆزیی. سه‌ره‌ڕای ئه‌و لێکترازانه خه‌ته‌رناکه‌ی که که‌وتبـووه نێـو جـه‌رگـه‌ی بازنـه‌ی سـه‌دامـه‌وه، دوو هـه‌وڵـی ڕوخانـدنی ڕژێـم کـه هه‌ردووکیان له هه‌نده‌رانه‌وه به فیتـی CIA ڕێکخرابـوون لـه نـاوه‌ڕاسـتی نه‌وه‌ده‌کاندا شکستیان هێنا. ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌بوو له ڕووی توانای بۆ کۆنترۆڵکردنی وه‌زعی ناو عێـراق سـه‌دام هێشـتا هێزێـک بـوو ده‌بووایـه حیسابی بۆ بکرێت.

## هه‌ره‌سی کۆنگره‌ی نیشتمانیی عێراقیی INC

یه‌که‌م هه‌وڵ له‌و دوو هه‌وڵه‌ی کـه CIA ی پشـتیوانی ده‌کـرد بـۆ گـۆڕینی ڕژێم له عێراقدا بۆ هه‌موو ئه‌وانه‌ی که پێوه‌ندییان پێوه‌ی هه‌بوو( جگـه لـه سه‌دام) به کاره‌سات کۆتایی پێهات. ئـه‌و پلانـه‌ی کـه لـه‌لایـه‌ن چـه‌لـه‌بیـی سـه‌رکـرده‌ی کـۆنگره‌ی عێراقییـه‌وه داڕێژرابـوو. چـه‌نـدین سـاڵ بـوو به‌ڕێوه‌بوو. له ساڵی 1994 یشدا شێوه‌ی بـه‌رجـه‌سـته‌ی خـۆی وه‌رگـرت دوای ئه‌وه ی CIA چالاکوانه‌کانی به کۆمه‌ڵ به‌ره‌و شاری سـلێمانیی ژێـر ده‌ستی کورده‌کان گواسته‌وه. که شارێکی بچووکه لـه دووری 15 مایـل لـه باکووری پایته‌ختی کورده‌کان—هه‌ولێر. پلانه‌که هه‌ڵمه‌تێکـی تێـدا بـوو لـه دژی پێگه عێراقییه‌کان له باکووردا. به پێشڕه‌وی هه‌ردوو حیزبـه کوردییـه سه‌ره‌کیه‌که (KDP و PUK). به‌نیازی بزواندنی هه‌ڵمه‌تێکی سه‌ربازیی و ڕاپه‌ڕینێکی جه‌ماوه‌ریی له دژی ڕژێم. له به‌ راییه‌وه پلانه‌کـه کێشـه‌و گرفـت ده‌ستی له بینی نابوو. له ساڵی 1994 ه وه KDP و PUK ده‌ستیان لـه قوڕگی یه‌کتریدا بوو( سه‌یری به‌شی حه‌وتـه‌م بکـه). لـه‌کاتیـکـدا کـه CIA وێـران ببـوو بـه‌جیاوازییـه‌کـانی نـاوخۆی لـه سـه‌ر ئـه‌وه‌ی ئایـا پلانـه دڵگه‌رمانه‌که‌ی کـۆنگره‌ی عێراقـی یـان ڕێگـه چـاره‌ی گوللـه‌ی زێـڕین کـه له‌لایه‌ن ویفاقی نیشتمانیه‌وه پێشکه‌شکرابوو به‌هه‌ندوه‌رگرن.

نوێنـــــەری CIA بـــــۆ کوردستان( کە تەنها بـەنـاوی بـۆب" Bob "
ناسرابوو) چەلەبی دڵنیا کردەوە کە ئەمێریکا تـەنهـا وەختێـک یارمـەتـی
سەربازیی دابین دەکات کە هێرشەکە بەڕێوە بێت. ئەمەش بەڵێنێک بوو کە
مەسعود بارزانی( کوڕی مەلا مستەفای کـۆچکردوو) بـەزەحمـەت متمانـەی
پێدەکرد( هەروەک واش دەرچوو). کاتێک ڕۆژی جێبەجێکردنـی پلانـەکـە
نزیکـدەبـووەوە( سـەرەتـای ئـازاری 1995)، ویفـاقی نیشـتمانی CIA
دڵنیـاکرەوە کـە هـەر هێرشـێک بـۆ سـەر سـوپای عێراقـی ڕووبـەڕووی
هێرشێکی بە رامبەری جەرگبڕ دەبێتـەوە، کـە ئـەمـەش دوایـی بـەڵێنێکـی
سەربازیی جدیی دەخوازێت لەلایـەن ئـەمێریکاوە. کـە کۆشـکی سـپی بـە
وردەکاریەکانی ئەو هێرشە چاوەڕوانکراوەی زانی، راوێژکاری ئاسایشـی
نەتەوەیی ئەمێریکی تۆنی لەیک(Tony Lake ) بەزوویی پەیـامێکی بـۆ
سەرکردەی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقیی نارد، کـە تیایـدا هـاتبوو" وڵاتـە
یەککگرتووەکان نە لەڕوی سەربازیی و نە لە هیچ ڕوویەکـەوە پشـتیوانی لـە
هێرشێکیَ وەها ناکات"[153] لە سەعاتی یازدەهـەمـدا ئـەمێریکا پشـتیوانیە
ئاشکراکەی خۆی بۆ پلانەکەی چەلەبی کشاندەوە.
لەگەڵ کشانەوەی ئەمێریکا، بارزانی لە پـارتی KDP ڕەتیکـردەوە کـە لـە
سەرەڕۆییەکەوە بگلێت کە کەمترین چانسی سەرکەوتنی هەبوو، کـە ڕەنگـە
ببێتـە هـۆی جموجـۆڵی گـاردی کۆمـاری بـۆ داگیرکردنـی ناوچـەی ژێـر
دەسەڵاتی پارتی دیموکرات. بۆیە، کاتێک کە 1000 چەکداری کۆنگرە ی
نیشتمانی و هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لـە 5 ی
ئازاری 1995 دا هێرشیان کردە سەر سوپای عێراقیی بـەبـیَ پشـتیوانی
KDP و ئەمێریکا بوو. وەک چاوەڕوان دەکرا هێرشەکە گاڵتەجاڕیی بـوو
و دوای ئەوەی کە شارەکانی کەرکوک و موسـڵ ڕانـەپـەڕیـن و سـوپاکەی
سەدام یاخی نەبوو، سەرتاپای هەلمەتەکە کەمتر لە دوو هـەفتـەدا شکشـتی
خوارد.

## هەرەسی ویفاقی نیشتمانیی

کوودەتاکەی ساڵی 1996 ی ویفاقی نیشتمانیی لە هەوڵـەکـەی کـۆنگرەی
نیشتمانی باشتر ڕێکخرابوو بەڵام دەرەنجـامی هـەردووکیـان وەکـو یـەک
کارەساتبار بوو. بە پێچەوانەی کۆنگرەی نیشتمانیی، ویفـاقی نیشـتمانیی

پێوەنـدی نایـابی هـەبـوو لەنـاو رژێمـەکـەی سـەدامـدا کـە گـەیشـتبووە ناوجەرگەی بازنەی دەسەڵاتەوە. بەگوێرەی ناسنامەی ئەوانەی کە لـە دوای شکستی کوودەتاکە دەستگیرکرابوون. لەنێـو ئـەو پێوەندییانـەدا پلـەداری بەرزی گـاردی کۆمـاریی و موخابـەرات و ئاسایشـی تایبـەتیی( دەزگـای ئاسایشی تایبـەتیی سـەدام) و دەزگـای گشـتیی ئاسایشـیان تێـدا بـوو. کوودەتاکە کە لە عەممانی پایتەختی ئەردەنەوە هەڵدەسـوڕا، بـە پشـتیوانی CIA. ئەو پلانی کوودەتایـەی ویفـاقی نیشـتمانیی بـۆ سـێیە م هـەفتـە ی جـونی 1996 داڕێژرابـوو. بـۆ بەدبـەختیی بەشـداربووان، پیـاوەکـانی هەواڵگریی سەدام شەش مانگ بەر لە وادەی خۆی پێیان زانیبوو. لەجیاتی ئەوەی لە ڕێگادا بیوەستێنن پیاوەکان، چاوەڕێیان کـرد تـا پلانـەکـە هاتـە پێگەیشتن. ڕۆژێک بەر لە وادەی کوودەتاکـە دەسـتگیرکردنەکـان دەسـتی پێکرد و بەگشتیی زیاد لە 100 ئەفسەر لە بەشە جیا جیاکانی دەزگاکـانی سەربازیی و ئاسایش پەلبەستکران و لەسێدارە دران.

## سەدام سەودایەک دەکات

ڕووداوەکـانی نـاوەراسـتی نـەوەدەکـان ئـەو راسـتییەیـان دەرخسـت کـە رژێمەکەی سەدام تا چەند لەئاست هەڕەشە ناوخۆییەکانـدا خـۆگرە. بـەڵام لەهەمان کاتدا دەریانخست کە تا چەنـد دڵسـۆزیی و پشـتیوانیی گرووپـە ترادیسیۆنەکان چیدی ناکرێت پشتیان پـێ ببەسـترێ. لـەلایـەکـەوە رژێـم خۆی بـەتۆکمـەیـی گـرت لەئاسـت دوو هـەوڵـی گـۆڕینی رژێـم کـە CIA سازیکردبوون، هەروەها لە بەرامبەر هـەڵگـەڕانـەوەکـەی حوسـێن کامیلـدا؛ لەلایەکی ترەوە هەڵگەڕانەوەکە دەریخسـت کـە چیـدی پێوەنـدیی خـوێنیی ناکرێـت وەکـو زامنکـەری دڵسـۆزیی حیسـابی بۆبکرێـت. کوودەتاکـەی ویفاقی نیشتمانییش ئاشکرایکرد کە تا کوێ پێگەی سەرەکیی پشـتیوانیی رژێـم لـەکـەمبوونـەوەدا بـوو لـەدوای راپەڕینـەکـانی 1991 وە. هـەمـوو بەشدارانی پلانەکە لە پیاوە دڵگەرمەکانی خێڵە دڵسۆزەکـانی ناوجـەرگـەی ناوچە سوننەنشینەکان و ئەوانەبوون کە زۆربەیان پۆستی بەرزیان هەبوو لە دەزگا هەستیارەکانی رژێمدا. رژێمی سەدام توانی دەربازی ببێت چونکە ڕێکخراوتر و یەکگرتووتر بوو لەهەر شتێک کە هێـزەکـانی هاوپـەیمانـان توانیان کۆیبکەنەوە. بەڵام لەڕاستییدا. شێوازی کلاسیکیی سە دام" کوتـەک

و گێـزەر" بـۆ حـوکمکردن خــە ریــک بــوو لــە کــەلێنــەکانییــەوە لێکهەڵدەوەشایەوە.

هێشتا دەکرا کوتەکەکە بە هەندێک هێزەوە بەکاربهێنرێـت. بـەڵام بـەهـۆی ئەوەی کە چیدی داهاتێکی بەردەوام لە سەرچاوە نەوتییەکانەوە نەدەڕژایـە ناو خەزێنەی دەوڵەتەوە. سەدام هۆکارێکی دارایی لەبەردەستدا نـەبـوو کـە پێگەیەکی پشتیوانیی بەرفراوان ڕابگرێت. سـەدام کـە ئـەمـەی دەزانــی لـە ساڵی 1996 دا بۆ دواجار ڕێکەوتنی( نە وت لـە بـەرامبـەر خـۆراک) ی UN قبووڵکرد. ڕێککەوتنەکە بەشێک بوو لە بڕیـاری UNSCR 986. کە ڕێگەی بە عێراقدا تا هەر شەش مانگ جارێـک بـایی 2 بیلیـۆن دۆلار نـەوت بنێرێتــە دەرەوە( ئــەمــە دوایــی زیـادکرا بـۆ 5.2 بیلیـۆن دۆلار) بەکارهێنانی داهاتی ئەمەش بۆ کڕینی پێویستییە بنەڕەتیی و سـیڤیلییەکان بـوو. لـە سـەدا چەنـد بەشـێکی داهاتــەکـە وەلادەنـرا بـۆ خـەرجکردنــی خەرجییەکانی ئاوەدانکردنەوەی کوەیت و هەروەها بۆ ڕاگرتنــی بـاکووری کوردیی( نزیکەی لـە سـەدا 13). لیسـتێک لـەو هاوردانـەی کـە ڕێگـەیـان پێدرابوو دەبووایە بە توندی لەلایەن ئەنجومەنــی ئاساییشــەوە کـۆنترۆڵ بکرێت.

ئامانجی UN ئەوە بوو کە لەو مەینەتییە سەختانەی کە کەوتبوونـە سـەر خەڵکی عێراق لە 1991 ە وە کەمبکاتەوە. لەهەمانکاتــدا ڕێگـە بگرێـت لـە ڕژێم کە هەناردنی نەوت بەکاربێنێت بۆ کڕینی کەل و پەلی سەربازیی یان کەرەسەی پەیوەست بە چەکی کۆمەڵکوژ. ئەمێریکا و بەریتانیا بـەکـردەوە پێگەی خۆیان وەک دوو دەولەتی خاوەن ڤیتۆ لە ئەنجوومەنی ئاساییشـدا بەکارهێنا بۆ بەرگرتن لە هاوردەکردنی هەر کەرەسـەیـەکـی ناسـراو بـە " بەکارهێنانی دوو سەرە " ( ئە و کەرەسـانەی کـە بـۆ هـەردوو مـەبـەسـتی سەربازیی و مەدەنیی بەکاردێن) بۆ ناو عێـراق. ئـەمـە وایـدەگـەیانـد کـە هێنانی زۆر کەلوپەلی ڕۆژانە وەک کلۆر. تەنانەت بۆ گاڵتەجاڕیی قـەڵـەمـی داریش قەدەغەکرا. [154] لەمە زیاتر. زۆر لەو کەرەسانەی کە پێویست بـوون بـۆ بنیاتنانــەوەی ژێرخـانی داڕمـاوی عێـراق کـەوتنـە ژێـر ناونیشـانـی" بەکارهێنانی دوو سەرە" وە. لێرەوە. لەکاتێکدا پرۆگرامی نـەوت بـەرامبـەر خۆراک لە کێشەی خۆراک-دابینکردنــی کـەمکـردەوە. هیچـی نـەکـرد بـۆ چارەسەرکردنی کێشەی ژێرخانی داتەپیوی عێراق.

قبوڵکردنی پرۆگرامەکە لە سەدامی دەخواست هەموو ئەو قسەو باسانە وەلابنێت کە باس لە سەروەریی عێراق دەکەن. بەڵام لەڕووی دووربینیەوە یارمەتی سەدامی دا بۆ دەستگرتن بە دەسەڵاتەکەیەوە. بەر لە 1996، رژێم سالانە لای کەم یەک بیلیۆن دۆلاری خەرجدەکرد بۆ هێشتنەوەی عەمبارە حکومییەکانی خواردن. لێرە بەدواوە ئەم پارەیە دەگوازرایەوە بۆ بوارێکی تر ئەویش بەهێزکردنی تۆڕەکانی کۆنترۆڵکردنی رژێم بوو. پڕچەککردن و دارشتنەوەی چەند یەکەیەکی سەربازی هەڵبژاردە و دابینکردنی پارە بۆ بەقاچاغ هێنانی چەک و تەکنۆلۆژیای چەکسازیی. هەروەها پرۆگرامەکە کەلێنی کردەوە بۆ بوارێکی بێئەژماری گەندەڵیی، رەسمیی و نارەسمیی. کە رێگە خۆشکەر بوو بۆ دەرکەوتنی چینێکی نوێ لە ' سۆپەر دەوڵەمندەکان' " بازرگانەکان" ئەوانەی کە کاری تایبەتیان دابینکردنی کەرەسەی قەدەغەکراو بوو بەگوێرەی پرۆگرامی نەوت لە بەرامبەر خۆراکدا. تا کۆتایی 1990 ەکان بازاڕی رەش، بە کەمێک جیاوازیەوە بزاوترین کەرتی ئابووریی عێراق بوو. دەتتوانی هەموو شتێک لەسەر شەقامەکانی بەغدادا بکرێت بە نرخێکی دیاریکراو. سزاکانی UN بەبێ مەبەست کۆمەڵگەیەکی دوو فاقەیان خولقاند لە عێراقدا-- چینێکی تا بڵێی دەوڵەمەند کە یان دەستی لەگەڵ رژێم تێکەڵ بوو یان رژێم چاوپۆشی لێدەکرد. 99 لە سەدی دانیشتوانی عێراقیش بەمەمرەو مەژیی دریژەیان بەژیان دە دا لە هەلومەرجێکی پەرپوت و نالەباردا. ئەوەی جێگەی سەرنج بوو نەبوونی هەرشتێک بوو کە ئاماژە بکات بۆ چینی ناوەڕاست. میراتێکی گرنگی رژێمی سزاکانی UN. رێک لە ناوبردنی ئەو چینە بوو کە دەکرا کۆڵەکەی سەرەکی پێکبێنێت بۆ داهاتوویەکی سیاسی میانرە و دیموکراسیی بۆ عێراق.

## UNSCOM لە هەمبەر سەدامدا: گەمەی کۆتایی

پەژراندنی بڕیاری UNSCR 986 لەلایەن سەدامەوە هیچی نەکرد بۆ گۆڕینی بناغەی دینامیکیەتی پشکنینەکانی UNSCOM. هەڵوێستی ئیدارەکەی کلینتۆن لەئاست پێوەندیی سزاکان و گۆڕینی رژێم جیاوازیی نەبوو لەگەڵ ئەوەی ئیدارەکەی پێشوو(بوش). مادلین ئۆلبرایت وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەمێریکا لەوتارێکدا لە زانکۆی

جۆرجتـاون(Georgetown ) لـه ئـازاری 1997 دا رەفزی کرد کە هـیچ پێوەندییـەک هـەبێت لـە نێوان لابردنـی سـزاکانی سـەر عێـراق و پابـەنـدبوونی عێـراق بـە بەبەڵێنـەکـانی چەکداماڵینییەوە. رژێم گـۆڕین بـوو بـە یاسـای زاڵ لـە دوای دەرچـوونی (یاسای ئازادکردنی عێراق) لەلایەن ئەنجومـەنـی پیرانـی ئـەمێریکـاوە لـە مانگی دەی 1998 دا. یاساکە ڕیگەی بەسەرفکردنـی 100 میلیـۆن دۆلار دا بۆ پشتیوانییکردنی گرووپەکـانی ئۆپۆزسـیۆن لـەگـەڵ ئاشـکراکردنی نیازی لەناوبردنی رژێمی سەدامدا. دوای ئەوەی هیچ پاڵنـەرێکـی بـاش لـە ئـارادا نـەبـوو بـۆ هاوکـارییکردن لـەگـەڵ پشـکنەرەکـانی UNSCOM هەروەها دوای ئەوەی کە گەیشتە ئەو قەناعەتەی( بە بەڵگەی تەواوەوە) کە پشکنینەکـان پـەردەیـەک بـوون بـۆ پلانـە هـەواڵگرییـەکانی ئـەمێریکاو بەریتانیا و ئیسرائیلیش هەوڵی بۆ داڕشتنی پلانێک بۆ لەناوبردنی سـەدام حوسێن دەدا. هەڵوێستی عێراق لەئاسـت پشـکنینە بـەردەوامـەکـان چـووە ئاستی کرژییەوە.

گەمەی کۆتایی نیشانەکـانی دەرکـەوت. بـەڵای دوایـی ئـەوکاتـە هـات کـە ڕیچارد بەتلەر(Richard Butler ) ی ئوسترالیی ( جێگرەوەکەی Rolf Ekeu) ڕەتیکـردەوە کـە ئیسـپاتی بکـات کـە عێـراق هـەمـوو چـەکـە قەدەغەکانی خۆی لە ناوبردووە. لە وەڵامی ئەوەدا عێـراق ڕەتیکـردەوە کـە چیـدی هاوکـاری UNSCOM بکـات. لـە کۆتاییـدا پشـکنەرەکـانی UNSCOM لە عێراق کشانەوەو( هەرگیز نەگەڕانەوە). و لەنـاوەراسـتیی مانگی کـانوونی یـەکـەمـی 1998 دا هێـزەکـانی ئـەمێریکا و بـەریتانیـا هەڵمەتی ڕێوی بیابان(Operation Desert Fox) یان دەسـتپێکرد-- هەڵمەتێکی لاوازی بۆردومانکردنی 70 سـەعاتـە کـە شـتێکی بـەرچـاوی بەدەست نەهێنا.

هەڵمەتی ڕێوی بیابان یەکێک بوو لە نیشانەکانی کۆشکی سپی کـە هـیچ بیرۆکەیەکی پێنەمابوو لە مامەڵە کـردن لـەگـەڵ عێراقـدا. حـەوت سـاڵ لـە توندترین سزا لە مێژووی جیهاندا دانیشتوانی مەدەنیی عێراقیی شـەپرێـو کردبوو( بەبێ ئەوەی کـە زەرەیـەک کاریکردبێتـە سـەر خۆشـگوزەرانیـی ماددیی رژێمی دەسەڵاتدار). چینی ناوەڕاستی عێراقیی سڕییەوە، ژێرخانی مەدەنیی عێراقیی لەبارێکی داڕماوی هەمیشەییدا هێشتەوە، هێشـتا کـەمـی

کــــرد بـــۆ لاوازکردنــــــی دەستڕاگەیشتنی توندی سەدام بەدەسەڵاتــەوە. تاکۆتــایی ئیــدارەی دووەمــی کلینتــۆن، ئــەنجومــەنــی ئاسایشــی نــەتــەوە یەکگرتووەکان لەپشێویدابوو. ئەوکاتە ئەندامــە هــەمیشــەییــەکــان( چـین و ڕوسـیا و فــەڕەنســا) بــەجــدیی لــە دژی بــەردەوامیــی سـزاکان بــوون و ئەمێریکاو بەریتانیــاش ســەرســەختانــە دەیانویسـت بیانهێڵنــەوە. خـودی ڕژێمی سزاکانیش بەخێرایی لە هەڵوەشانەوەدا بوون. چونکە ژمارەیــەکـی زۆر لە وڵاتەکان( لە نێویاندا فڕەنسا و ڕوسیا) بڕیاریاندا کــە خاڵــەکــانی پشتگوێ بخەن و بەئاشکرایی مامەڵە لەگەڵ عێراقدا بکەن.
لــەوەش زیــاتر، کاریگــەری سـزاکان بــەســەر خــەڵکـی ئاســایی عێراقــەوە کـــارەســـاتێکی بـــەردەوام بـــوو بـــۆ ئـــەمێریکا لـــە بـــواری پێوەندیـــە گشتیەکاندا(public relations). بەتایبەتی جەختکردنــەوەکــەی مــادلین ئۆڵبرایت لەسەر ئەوەی کــە مردنــی 500.000 منــداڵی عێراقــی" نرخێـک بوو شایەنی بەخشین بوو" بۆ بەربەستکردنی ســەدام. ئەمــەش خزمــەتــی نەکرد بە ناوبانگی ئەمێریکا لە جیهانی عەرەبیدا. تــەنانــەت ئوسـامە بـن لادن —کە بەدڵنیاییەوە دۆستێکی گەورە ی ڕژێمە عــەلمانییــەکــەی بەغــداد نەبوو—" گەمارۆکەی ئەمێریکای بۆ سەر خەڵکی عێراق وەکو یەکێـک لـە سێ هۆیەکەی ڕاگەیانــدنی جیهــاد لــە دژی ئــەمێریکا لــەســاڵی 1998 دا باسکرد. ئەوەی کە کلینتــۆن لــە مــانگی کــانوونی دووەمــی 2001 دا بـۆ ئیدارەی داهاتووی بوش بەجێیهێشت. سیاســەتێکـی ڕوون نــەبــوو لــەمــەڕ عێراق. بەڵکو کۆمەڵێک ناکۆکیی ناقۆڵا و شکست بوون کە بۆ ماوەیــەکـی درێژخایەن باریان هەڵناگیرێت.[155]

## هەڵمەت بەرەو شەڕ

ئەو کاتەی کە ئیدارە تازە هەڵبژێردراوەکەی بوشی (کوڕ) دەست بەکاربوو لە جەنیوەری2001 دا. وەزعی عێراق لەسەر شاشەی ڕاداری سیاسی وون بیــوو. ســەرۆکــی تـــازە لـــەســـەر بنـــەمـــای سیاســـەتێکـــی دەرەکیـــی" توندڕۆminimalist" هەڵبژێردرابوو. کە دەیخواست ئەمێریکا بەکردەوە لــە هــەر بــەڵێنێــک ئــازاد بکــات لــەودیــو ســنوورەکــانی خۆیــەوە و بەگاڵتەجاڕییەوە سەرکۆنــەی سیاســەتــی " نەتــەوە- بنیاتنــان"(-nation building) ی کلینتــۆنی دەکــرد (لــەو شــوێنە دوورە دەســتانەی کــە

ناوەکانیشیان نایەتە سەر زاران). لەویو پەردەکانەوە. کۆمەڵێکی بچووک لەوانەی کە پێیان دەگوترێت( پارێزگارە تازەکان— Neoconservatives). لەوانەی کە زۆربەیان لە ئیدارەی بوشی باوکدا کاریان کردبوو بیرۆکەی جیاوازیان لە کەڵەدا بوو لەمەڕ ڕۆڵی گونجاوی هێزی سەربازی ئەمێریکا لە جیهاندا. نیۆکۆنسێرڤەتیڤەکان کە بەتەواویی ئیدارەکەدا بڵاوبیبونەوە بەڵام زیاتر لە وەزارەتی بەرگریدا چڕببوونەوە پتر لەگەڵ شێوازێکی دەستپێشخەرییانە(pro-active) ( وەک کردەوەی سەربازیی) دا بوون بۆ کێشەی دەوڵەتە سەرکێشەکان(rouge states) ی وەک عێراق و کۆریای باکوور. ئەو بیرۆکانە هەتا 11ی ئەیلولی 2001 هەواداریکی زۆریان هەبوو لەنێو چەندین (think than) ی ڕاستڕەودا لە واشینگتۆن دی سی. بەڵام شکستیان هێنابوو لەوەی کاریگەری بخەنە سەر پیادەکردنی سیاسەتی دەرەکی ئەمێریکاوە.
ڕوداوەکانی 11ی سێپتەمبەر لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا ئەمەیان گۆڕیی. لەماوەی ڕۆژێکدا. وەزیری بەرگری دۆناڵد ڕامسفێڵد فشاری دەخستە سەر سەرۆک بۆ ئەوەی لێدانی عێراق بکاتە بەشێک لە زنجیرەی تۆڵەکان دژی ئەو لایەنانەی کە بەرپرسیارن.[156] بەڕێنمایی (کۆڵن پاوڵ) ی وەزیری دەرەوە. بوش بڕیاریدا کە یەکسەر ڕوو بکاتە ئەفگانستان پێشئەوەی دوایی ڕوو بەرەو عێراق وەرگێڕێت. ئەوەی کە لەمەڕ عێراق لەسەری ناکۆک بوون مەسەلەی کات بوو نەک مەسەلەی لێدانەکە خۆی. ساڵ و نیوێکی خایاند هەتا سیاسەتی ئیدارەکەی بۆش لەسەر عێراق هاتە بەر— بەڵام بڕیاری لێدانی عێراق زۆر لەپێش 20 ی ئازاری 2003 وە کە یەکەم بۆمب فرێدرایە خوارەوە. درابوو. تەنها سێ هەفتە لە دوای کەوتنە خوارەوەی یەکەم بۆمب. ڕژێمی سەدام و ( سەدام خۆیشی) بەهەوادا چوون و سیاسەتە کۆنەکەی ئەمێریکا( ڕژێم گۆڕین) لە عێراقدا ئەو سیاسەتەی کە دەگەڕێتەوە بۆ 1991 بۆ دواجار جێبەجێکرا.

## میراتەکانی حوکمی سەدام، 1988-2003

### باڵادەستیی سوننە

ڕاپەڕینەکانی 1991 بەتایبەتی لەباشووردا— هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیان خستە سەر باڵادەستی سوننە لە ناوەڕاستدا. ئاماژەیەکی ئاشکراشیان دەدا بە بەرتەسکبوونەوەی بنکەی پشتیوانیی لە رژێم. بەڵام یاخیبوونی باشوور سوننەکانی ناوەراستی لە پشت رژێمەوە کۆکردەوە. لەدوای هەموو حیسابێک، دەزگا سوننی سالارەکانی سەرکوتکرن(گاردی کۆماریی بەشێوەیەکی سەرەکیی). دوای ئەوەی ڕووبەرووی لەدەستدانی هێز و ئیمتیازاتەکانیان بوونەوە دوودڵییان نەکرد بۆ لەناوبردنی برا شیعەکانیان بە ئەوپەڕی دڕندەییەوە. مەسەلەکە جیاوازیی تایەفی نەبوو— هەرچەندە سەدام هیچ هەلێکی نەفەوتاند بۆ ناشیرینکردنی ڕاپەڕینەکە بە ناولێنانی بە توندڕەویی شیعەی ڕادیکاڵیی—بەڵکوو مەسەلە دەسەڵاتی سیاسیی بوو. هەر ڕاپەڕینێکی گشتیی باشووری زۆرینەی شیعە هەڕەشە بوو بۆ سەر ئەو دابەشکردنەی دەسەڵات کە لە ئارادا بوو. لە 1991 یشدا، مەڵبەندی سوننەنشین مسۆگەریی سەدامی پێباشتر بوو لە نامسۆگەریی شۆڕشێکی شیعەسالاری لەخوارەوەڕا. ڕاپەڕنی باشوور هەروا ئەوەشی ئاشکراکرد کە دانیشتوانی شیعە زۆر دوورن لەوەی کە قەوارەیەکی تەباو هەماهەنگ بن.

ئەوە نەبوونی سەرکردایەتی و ئاڕاستەیەکی هاوبەش بوو کە ڕاپەڕینەکەی تووشی شکست کرد. هەوڵەکانی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی بۆ بارگاویکردنی ڕاپەڕینەکە بەهەستی ئایینیی ڕادیکاڵانە بەگشتیی لەلایەن خەڵکی ڕاپەڕیوەوە ڕەتکرایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گومانی تێدانییە کە سەدام سودی لە وانەکانی 1991 وەرنەگرتووە. ڕێکخراوی حیزبی بەعس لە باشووردا کە بەپلەی یەکەم ستافەکانی شیعە بوون، هەرزوو پەرش و بڵاو بوو. بەرپرسەکانی حیزبی بەعس یان بەبەرچاوی خەڵکەوە کوژران، یان هەڵگەڕانەوە و چوونە پاڵ یاخیبووەکانەوە. بەپێڕەوکردن لە تاکتیکە ئیمپریالیستییەکانی بەریتانیای 70 ساڵ پێشتر، سەدام داوای پاڵپشتیی لە سەرۆک خێلە شیعەکانی باشوور کرد(ئەوانەی کە هەندێکیان شانبەشانی رژێم لە دژی یاخیبووەکان جەنگابوون) هەولێشیدا کە لە شەرعیەتی حیزبە ئیسلامییە شیعەکان کەمبکاتەوە بەڕاکێشانی ئەو

سـەرکـردە ئایینییـە عێراقییانەی کە بە ڕەگەز عێراقین. بۆ نمونـە، ئایەتوڵڵا عبدالقاسم الخوئی—بەرزترین دەسەڵاتـی ئـایینی لـە نـەجـەف_ رابیکرا بۆ ئەوەی بەئاشکرا سەرزەنشتی راپەرینەکە بکات.[157]
چەند ئیمتیازاتێکی بچووکی تریش درا بە زۆرینەی شیعە. بۆ یـەکـەمجار لەماوەی 22 ساڵی دەسەڵاتی بەعسدا، سەدام سەرۆک وەزیرانێکی شـیعەی دانا، سەعدون حەمادیی، بەڵام بێگومـان دەسـەڵاتـی ڕاسـتەقینـە هـەروەک هەمیشە لەدەستی سەدام خۆی و دەستەبژێری تکریتیی سوننەدا مایەوە.
دۆخەکە تارادەیەک لە باکوردا جیاواز بوو. سەدام کە دەیزانی هەڕەشـەی هەرەبەرچاو لە باشووردا ماوەتەوە و ئەگەری پێوەنـدیی باشـووریش بـە دانیشتوانە زۆرەکەی شیعەی بەغداوە هەر هەیە، نەیدەتـوانی بـەتـەواوی باکووری کوردیی پڕ سەرباز بکات. لـەراسـتییدا هـەردوولا بێهێـز بـوون، سەدام لە دوای نسکۆکەی کەنداو هیچ چارەیەکی تری نەبوو، ئەوە نـەبێـت کە سوپاکەی بەسەریـەکـەوە کۆبکاتـەوە. حیزبـە کوردییـەکـانیش هێشـتا لەدوای کارەساتی ئەنفال نەهاتبوونەوە سەرخۆیان( کە هـەر سێ سـاڵێک پێشتر کۆتایی پێهـاتبوو). خـەڵکـی کوردسـتانی عێـراقیش تاسـابوون بـە کۆڕەوەکەیانەوە بەرە و چیاکان. سەدام نەیدەتوانی کوردستان بگرێتـەوە، نە کوردەکانیش دەیانتوانی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بن بـۆ سـەر رژێـم. لەژێر پارێزگاریی ناوچەی دژە فڕینی باکوور و بەسەرچاوەیەکـی داهـاتی مسۆگەرەوە لە UN، چیـدی کـوردەکـان بـەشـدار نـەبـوون لـە دەوڵـەتـی عێراقییدا. کە کوردستان بەکـردەوە لـە هاوکێشـەی سیاسـیدا لابـرا. هـیچ ئەگەرێک نەما بۆ ئەوەی کوردەکان هیچ جۆرێک لە نوێنەرایەتـی سیاسـیی لەدەزگاکانی حکومەتی ناوەندییدا بەدەست بێنن.
لەکاتێکدا هەندێک دەسەڵات درا بە سەرۆک خێڵـەکـانی باشـوور، رژێـمـی عێراق لەماوەی 1990 ەکاندا بەدڵسۆزییەوە پـەیـڕەوی کـرد لـە نـەریتـی شکۆداری سوننەسالاریی. کە باشووری شیعە بەگشتیی لەژێـر کۆنترۆڵـدا بـوو لـەمـاوەی 1990 ەکـانـدا، بـاکووری کـوردییش لـەودیـو کـۆنترۆڵی حکومەتدا بوو. پرسیاری سەرەکیی ئەوەبوو ئایا رژێم دەتوانێت مەڵبەنـدی سـوننە لـەژێـر دەسـتی خۆیـدا بهێڵێتـەوە. هـەوڵـی کوودەتاکـەی ویفـاقی نیشتمانی لە 1996 دا، هەرچەندە لەرووی جێبەجێکردنەوە سـەرکـەوتـوو نەبوو، دەریخست کە چیدیکە بنکەی پشتیوانی سـەدام لـەنێـو خێڵـەکـانی

بــــاکووری ڕۆژئـــــاوای عێراقـــدا بێچـــەنـــدوچوون دڵســـۆز نـــین. لەکۆتاییدا، هەڕەشـەی سـەرەکیـی بـۆ سـەر دەربـازبوونی ڕژێمـە سوننی سالارییەکەی سەدام لەماوەی ساڵانی 1990 دا نە لـە شیعەکـان و نـە لـە کوردەکانەوە بوو بەڵکوو لە دۆستە سوننییەکانەوە بوو.

## بەڕێوەبردنی عێراق

بۆ یەکەم جار لە ناوەڕاستی حەفتاکانــەوە، سـەدام پێویسـت بـوو ڕژێمـەکـەی بەیەکەوە ڕابگرێت بەبێ کـەڵـک وەرگـرتن لـەسـەرچـاوە نـەوتییـەکـان یـان شەڕێکی دەرەکی گەورە تا سوپاکەی کۆبکاتەوە. لـەدوای کۆتاییهاتنی شـەڕی ئێـران عێـراق سـەدام بـۆ پـازدە سـاڵی دیکـە دەربـازی بـوو. سـەرەڕای ڕاپەڕینـەکـان و هـەوڵـەکـانی کوودەتـاو یاخیبوونـەکـان لـەبـەرامبـەر ڕژێمـی دڕندانەی سزا ئابوورییەکاندا. لەکۆتاییدا پێویسـتی بـە توانـای سـەربازیی بەهێزترین هێزی شەڕکـەری مێـژوو(ئـەمێریکا) هـەبـوو تـا دەسـەڵات لـەژێـر چنگیدا دەربهێنرێت. کۆتاییـەکـەی سـەدام لـەنـاوخۆوە نـەهـات. بـەڵکـوو لـە دەرەوەڕا بـەسـەریـدا سـەپێنـرا. 1988 خـاڵێکی وەرچـەرخـانی گرنگـی دەرخست لە سروشتی ڕژێمەکـەی سـەدامـدا. لـە سـاڵانی پێشـوودا، مانـەوەی ڕژێـم مـەرجێکـی پێویسـت بـوو بـۆ گـەیشـتن بـە ئامـانجی بـاڵاتر، وەکـو گەشەپێدان و مـۆدێرنێزەکردنـی دەوڵـەتـی عێراقـی؛ لـە دوای (1988) ە وە، مانەوەی ڕژێم بۆخۆی بوو بە ئامانجێـک—کـە دەبووایـە کـاری بـۆ بکرێـت بێ گوێدانە ئەو زیانەی کە بـەر پێکهاتـەی کۆمـەڵایـەتیـی و سیاسـیی عێـراق دەکەوێت، یـان ئـەو باجـە سـایکۆلۆژیی و فیزیکییـەی کـە خـەڵکـی ئاسـایی عێراق دەبووایە بیدەن.
بـۆ دەربـاز بـوون لەکۆسـتەکـانی نـەوەدەکـان و پاشـتر، سـەدام چـەنـدین ستراتیژیی حوکمکردنی جیاوازیی بـەکارهێنـا— هـەنـدێکیان لـە هـەنـدیکی تریان کەمتر سـەرکـەوتووبـوون. لـەوانـەی کـە کـەمتـر سـەرکـەوتـوو بـوون بـازیکردنی کورتخایـەنـی سـەدام بـوو لـەگـەڵ بـەلیبراڵیکردنـی سیاسـیی و پێداگرتنی بەردەوامی لەسـەر بـەکارهێنـانی کـارتی ئیسلامیی. "تاقیکردنـەوە دیموکراتییەکەی" سەدام کورتخایەن بوو بەقەد ئـەوەی کـە جێگـەی قـەناعـەت پێکردن نەبوو. تاقیکردنـەوەکـە بنـەمـای نـامۆی وەکـو ئـازادیی قسـەکـردن، ڕیفۆرمی دەستووریی و پلوراليزمی سیاسیی تێدا بوو. ڕۆژنامـە عێراقییـەکـان

دەبووایـــە لاپـــەڕەیـــەک تەرخان بکەن بۆ نامەی سکاڵای خوێنەران کـە لەسەرەوە وتەیەکی سەدام بوو کە هانی خەڵکـی دەدا بـۆ" ئـەوەی حـەزدەکـەن بینووسن بەبێ ترس"[158] لە مـانگی ئـەپریلـی 1989 دا چـاوێری دەرەکیـی بانگێشتکران بۆ ئەوەی گەواهیی هـەڵبژاردنـەکـانی ئـەنجومـەنـی نیشـتمانیی عێراقیـی بـن. لـەو پرۆسـەیـەدا کـە لـە ئـەنجامیـدا حیزبـی بـەعـس چـەنـد کورسییەکی لەدەستدا لە پەرلەمان. ئەمەش ڕەنگە لەبـەر ئـەوەی کـە چـەنـدین بـەرپرسـی بـالادەسـتی حیزبـی بـەعـس هـەڵگـەڕانـەوە لـەکـاتی دەنگدانـدا، تاقیکردنەوە دیموکراتییەکە لەناکاو لە دوای هە ڵبژاردنەکانەوە لەباربرا.
بەڵێنەکانی سەدام بۆ ئیسلام، کە هەر هێنـدەی بـەڵێنـەکـانی بـۆ دیموکراسیی جێگەی بڕوا بوون. لە کۆتـایی هـەشـتاکانەوە دەستیان پێکردبـوو. بـەڵام لـە نەوەدەکاندا گەلێک زیـاتر خـۆدەرخـەرتـر بـوون. بـۆ نموونـە لـە 1990 دا وشــەکـانی" اللـە اکبـر"(خـوا گـەورە ترینـە)—جـاڕی ترادیسـیۆنی بـانگی ئیسـلامیی— بـەڕەسـمیی لکێنـران بـە ئـالای عێراقـەوە. سـەدام ژمـارەیـەک ناونیشانی نوێی شەرافەتمەندانەی بەخۆی بەخشیی، لە نێویانـدا" بـەنـدەی خوا"" پێشەوای هەموو موسوڵمان". لە ئۆکتۆبەری 1990 یشـدا بـەویقـارەوە بە خەڵکی عێراقی ڕاگەیاند کـە ئـیدی پێغـەمبـەر موحـەممـەد دێتـە خـەونـی ئامۆژگاری دەکات سەبارەت بە ستراتیژی سەربـازیی( وێـدەچـێ خەونـەکانی باش نەبووبن). چەندین سزای ئیسلامی بە مەرسوومی گشتیی خرانـە نێـو یاسای سزاکانەوە، وەکو بڕینـی دەسـتی ڕاسـتی دز و سـەربڕینـی خـاوەنـی سۆزانییخانەکان. فرۆشتنی ئەلکهوول لە شاری مەزارە شـیعییەکـانی نـەجـەف و کەربەلا—دواتر قەدەغەکردنەکـە درێژکرایـەوە بـۆ چێشـتخانەکـانی خـودی پایتە خت.
شیکردنەوەیەکی ماقووڵ بۆ ئەو هەوڵە ئاگایانە کـە مـەبـەسـت لێیـان ڕەونـەق بەخشین بوو بە ئایـدێنتیتیی ئیسـلامییانەی ڕژێـم، ئـەوە هـەوڵێـک بـوو بـۆ کەڵکوەرگرتن لەو هـەسـتە ئایینییـە هـەڵکشـاوەی نێـو خـەڵکـی ئاسـایی کـە لەماوەی سالانی نەوەدەکاندا سەریهەڵدا. لـەدوای دوو دەیـەو نیـو لـە حـوکمی حیزبـی بـەعـس کـە تیایـدا نزیکـەی هـەمـوو بونیـادە کۆمـەلایـەتییـە ترادیسیۆنەکان ( لەنێویاندا خێزان) بەشێوەیەکی سیستەماتیکیی بە مێشـک داشۆرین یان زۆر لێکردن لێکهەڵوەشێنرابوون، خەڵکی عێراق هـەرچـی زیـاتر لەئایینـدا بۆ دڵنەوایی دەگـەڕان.[159] وەکـی دی زەحمـەتـە کـە لـەو عـەقڵیـەتـە

بگەین کە لەپشت بڕیاری سەدامەوە بوو لە ساڵی 1994 دا بۆ ڕاگەیاندنی پلانی دروستکردنی گەورەترین مزگەوت لە جیهاندا (لەکاتێکدا کە عێراق هیچ سەرچاوەیەکی دیاریکراوی داهاتی نەبوو، مەینەتییەکانی خەڵکی ئاسایی عێراقیش گەیشتبووە لووتکە). " مزگەوتی گەورەی سەدام" دەریاچەیەکی دەستکردی تێدا دروست دەکرا بەقەبارەی 70 گۆڕەپانی تۆپی پێ لەسەر شێوەی نەخشەی جیهانی عەرەبیی، لەناویدا دەریاچەی تێدا دەبوو لەسەر شێوەی خەتی پەنجەگەورەی سەدام خۆی. منارەی مزگەوتەکە دەبووایە گەورەترین و درێژترین بووایە لە جیهانی ئیسلامییدا بۆ ئەوەی سەدام لەهەر کەسێکی تر لەسەر ڕووی زەوی لەخوا نزیکتر بێت.
وەکو موسوڵمانێکی لەخواترس، سەدام هەمیشە ئەگەری ئەوەی هەبووە کە دەلاڵێکی خراپ بێت، لەبەر ئایدۆلۆژیا عەلمانییە ئاشکراکەی حیزبی بەعس، بەلام لەڕاستییدا، بنەما سەرەکییەکانی حیزب دەمێک بوو لەوەدا نەمابوون کە هیچ کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبێت بەسەر سیاسەتەکانی ڕژێمی سەدامەوە. بۆ نموونە، زەحمەت بوو کە باوەڕی بنچینەیی حیزب بە یەکێتی عەرەب لەگەڵ ئەو واقیعەدا بگونجێنرێت کە عێراق ئەو کاتە نزیک بەتەواویی گۆشەگیر ببوو لەهەموو جیهانی عەرەبیی. چەندین وڵاتی عەرەبیی لە 1991 دا بەکردەوە چەکیان لەدژی عێراق هەڵگرت( لە وەلامی داگیرکردنی وڵاتێکی تری عەرەبیی برا).. ئەوانەش کە ئەوەیان نەکرد وەکو ئەردەن، لەکۆتاییدا لە 1996 دا پشتیان لە سەدام کرد.
بەهەمان شێوە، ڕەهەندە " سۆشیالیست" یەکەی ئایدۆلۆژیای بەعس لەگەڵ ئەو بارە سەختەی واقیعی ژیانی ئابووریی نەوەدەکانی عێراقدا نەدەهاتەوە. ئەوەی کە لەماوەی دوو دەیەدا لە عێراقدا سەریهەڵدا ئابوورییەکی دوو لایەنە بوو.[160] ئابووریی تایبەت، کە لەلایەن دەستەیەکی بچووک لە پیاوانی ڕژێم و نەوەیەکی تازە دەرکەوتوو لە" سوودمەندەکان" پێکهاتبوو کە کاریان دابینکردنی کالای قەدەغەکراو بوو بۆ بازاڕەکانی عێراق. لە جگەرەی بیانیی هەرزانەوە بیگرە تا سیستەمی چاودێریی مووشەک، ئەو قازانجە کە دەست دەکەوت قازانجێکی زەبەلاح بوو. ئابووریی گشتیی، کە نێوەندی ئەو هێزی کارە بوو کە تەواو هەژار کرابوو بەسترابووەوە بە موچەیەکی زۆر کەمی حکومەت و بۆ مانەوەی خۆی پشتی دەبەست بە بەشە خۆراکی حکومیی. لە ساڵی 2003 دا دانەپی. هەموو

دەسکەوتە " کۆمەڵایەتیی"ە گەورەکان—سیستەمێکی بەرفراوان و بە خۆڕایی خوێندن، سیستەمی چاودێریی تەندروستیی کە دەکرا لەرووی چۆنیەتییەوە بەوەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا بەراوردی بکەی، ئابوورییەکی دەوڵەتیی، بەتوێژێک کارمەندی دەوڵەتیی بەڕیوە دەبرا موچەی باش دەدران بەگشتیی، ڕاستگۆ و بەزۆریی لێهاتوو بوون—لە کۆتایی ئەو ماوەیە دا( 2003 بەسەرەوە) دارمێنرا بوو.

بێبایەخبوونی هەرچی زیاتری ئایدۆلۆژیای بەعسیی لەگەڵ کەمبوونەوەی گرنگیی حیزبەکە وەکو دەزگایەک، هاوشان بوو . لەکاتێکدا حیزب بەردەوام بوو لە دابینکردنی بونیادێکی دەستووریی بۆ دەوڵەتی عێراق و هۆکاری گونجاو بۆ بەخشینەوەی خەڵات و سزادان، لە نەوەدەکاندا چیدی ڕژێم پشتی نەدەبەست بە بونیادی حیزب بۆ ڕاگرتنی دەسەڵات. لەرووی سیاسیەوە بەعس مەبەستی خۆی بەجێهێنابوو سەدامیش هەرچی زیاتر بونیادەکانی"خۆی" دەخستنە کار وەکو دەزگای سەربازیی جیا جیا.

سوپا بەردەوام هۆکارێک بوو جێگەی خەملێخواردن بێ. بە درێژایی نەوەدەکان، سەدام بەوریایی مایەوە لەبەرامبەر ئەو ورە بەردانەی کە کەوتبووە ناو کۆی هێزە سەربازییەکانەوە لەدوای دەرکردنە خەجاڵەتبارانەکەی لە کوەیت. تەواو لەوەش بەئاگا بوو کە دەشێ سوپا لە دژیدا بەکاربهێنرێت بە ناوی نیشتمانپەروەریی عێراقییەوە. بێشک، گەرەترین ئومێدی واشینگتۆن کەوتبووە سەر گاردی کۆماریی بۆ سازدانی کوودەتایەک.[161] گاردی تایبەتیی کۆماریی، دەگوتریت لەبەرایی ساڵی 1992 دا دامەزرێنراوە کە ئەرکی پاراستنی سەرۆک و بەرپەرچدانەوەی توند و یەکلاکەرەوە بوو لەئاست هەر هەوڵێکی کوودەتای ناوخۆیی. ئەرکی ئەمەیان تاڕادەیەک جیاواز بوو لە سوپای ئاسایی یان گاردی کۆماریی. تاکە ئامانجی 30,000 گاردی تایبەتیی کۆماریی بەهێز پارێزگارییکردن بوو لە سەدام و پلەدارە باڵاکانی ڕژێم. هاوشان لەگەڵ دەزگای ئاسایشی تایبەتیی گاردی تایبەتیی کۆماریی لە خێڵی سەدام خۆی (ئال بوناسر) و خێڵە سوننیە دڵسۆزەکانی ناوچەی تکریتەوە وەردەگیران.

بەزۆریی، ئەوانەی وەردەگیران ئەو گەنجانە بوون خوێندەوارییەکی کەمیان هەبوو لە ژیانیکی نەدارییەوە دەریان دەهێنان و بە تێر و پڕیی لەلایەن ڕژێمەوە بەخێودەکران. پێکەوە بە بەخێوکردن و مێشک داشۆرینێکی

چـــــــرەوە هێزێکیـــــــان دروستکرد کە سەرسەختانە بـۆ سـەدام دلسـۆز بوو . دەزگای ئاسایشی تایبەتیی و یـەکـەی پارێزگارییکردنی سـەرۆکایەتـی لـەلایـەن کـەسـە نزیکـەکـانی خانـەوادەی سـەدام و ئـەنـدامانی خێڵـی ئـال بوناسرەوە سەرپەرشتی دەکـران. ئـەو گرووپانـە کـەسـی زۆر خوێنـدەوار و هەڵسوراویان تێدا بـوو کـە مانـەوەی خـودی خۆیـان بـە خۆشـگوزەرانیـی سەدام بەسترابووەوە.[162] پێشک دروستکردنی هێزی وەکو گـاردی تایبـەتیـی لە ناوخۆدا رژێمیان بەهێزکرد، بەڵام خودی ئەو هۆیەی کـە سـەدام پێویسـتیی بە دروستکردنی هێزی وەها هەبوو بەڵگەی لاوازی بوون.

لەبنەڕەتەوە گاردی کۆماریی وەکو بەربەست کـاری کـردووە لـەنێـوان سـوپای گشتیی و رژێمدا، بەمەبەستی بەرگرتن لە هـەر کوودەتایـەکـی سـەربـازیی— ئێستا سەدام پێویستی بەهێزێکی دیکە هەبوو تا لە هێزی بـەربـەسـتی خـۆی بپارێزێـت. بـە لـەبـەرچـاوگرتنی بـەڵگـەی هـەوڵـی کوودەتاکـەی 1996 ی ویفاقی نیشـتمانی( کـە تیایـدا پلانگێـڕە سـەرەکییـەکـان ئـەفسـەری گـاردی نیشتمانیی بوون)، بڕوای سەدام بەوەی کە چیدی ناکرێـت متمانـە بـە گـاردی کۆماریی بکرێت لەجێگەی خۆیدا بوو—ئەوە تاکە هێزی سەربـازیی بـوو کـە لەتوانایدا هەبوو رژێمەکەی بشێوێنێت. لەبەر ئـەمـە گـاردی کۆمـاریی ڕێگـەی لێگیرا بچێتە ناو پایتەختەوە.

لـەگـەڵ ئـەوەشـدا بـۆ کـەمکردنـەوەی هـەڕەشـەی گـاردی کۆمـاریی، سـەدام بەکردەوە تاکە هێزی بەتوانای خۆی لەکارخست لـەکاتێکـدا کـە ڕووبـەڕووی هەڕەشەیەکی دەرەکی بووەوە. لەکاتی شـەڕی 2003 دا، سـتراتیژی لـۆژیکیی لەڕووی ڕەهەندی سەربازیی ڕووتەوە ئـەوە بـوو کـە یـەکـە سـەربازییـەکـانی گـاردی کۆمـاریی لـە ناوچـەرگـەی بەغـدادوە بکێشـرێنەوە، پـردەکـانی سـەر ڕووباری دیجلەیان بەدوادا بتەقێنرێتەوە. وەکو دەرکـەوت، سـەدام یـەکـەکانی گـاردی کۆمـاریی لـەدەرەوەی پایتـەخـت بـەجێهێشـت لـەبـەردەم ڕەحمـەتـی بۆمبـارانی هـەوایـی بێئامـانی هاوپـەیمانانـدا. یـان لـەم حاڵـەدا سیسـتەمی سەرکردایەتیی و کۆنترۆڵی عێراق بە تەواویی لەبەریەک هەڵوەشا، یـان ئـەمـە بڕیارێکی ئاگایانەی سەدام خـۆی بـوو، لـەترسـی ئـەوەی کـە ڕەنگـە گـاردی کۆماریی هاتنە نـاوەوەی خـۆی بـۆ بەغـداد وەکـو هـەلێـک بـەکاربێنێـت بـۆ ڕوخاندنی رژێم.

دووباره بنیاتنانەوەی سوپا بۆ هێزێک کە بەرگری لە رژێم بکات لەبەرامبەر هەڕەشەی ناوخۆیی تەنها ئاشکراترین و بەرچاوترین هەوڵەکانی سەدام بوو بۆ خڕکردنەوەی دەسەلات لە ساڵە سەختەکانی ناوەراستی نەوەدەکاندا. ستراتیژییەتی مانەوەی سەدام تەنها بەسادەیی لەسەر بەرگریی دواسات لە رژێم دانەمەزرا بوو. ئەوەندەی کە جێگەی گرنگی سەدام بوو، گاردی تایبەتیی کۆماریی(گ.ت.ک) و دەزگای ئاسایشی تایبەتیی(د.ئ.ت) بەکردەوە بەر لە وادەی روداوەکان دەستوەشێن بوون. کە بگەیشتبایە ئەو حالەتەی کە پێویستی بە شارەزایی پاراستنی ئەوان هەبێت لەرووی فیزیکیەوە، ئەوە دوا رۆژەکانی نزیک ببوونەوە.

سەدام دەبوایە ئاسایشی شەخسیی خۆی تێکەڵ بە ئاسایشی عێراق بکات، بۆ ئەمەش پێویستیی بەوە هەبوو کە ملکەچیی خێڵەکان بۆخۆی مسۆگەر بکات. بەر لە زاڵبوونی حیزبی بەعس، عەشیرەتەکانی عێراق هەر ئەو کاتە لە پرۆسەی ئاوابووندا بوون لەرووی رێکخستنی سیاسی و نفوزیانەوە.[163] سالانێک لە چاکسازیی کشتوکاڵیی و جەختکردنەوە لەسەر حکومەتێکی پێشکەوتوو و سێنترالیزەکراو بناغەی ئابووریی و رۆڵی سیاسیی عەشیرەتەکانی لەنێو برد. فیدراسیۆنە عەشیرەتییە بەهێزەکانی وەکو مونتفق لە باشوور لە پرۆسەی لێکهەڵوەشانەوە دابوون و زۆرێک لەو فەنکشنە کۆمەلایەتییانەی کە پێشتر لەبەردەستی عەشیرەتەکاندا بوون لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومییەوە دەستیان بەسەردا گیرا.[164]

لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەک چۆن حیزبی بەعس لە کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقییەوە فێربوون چۆن کۆنترۆڵی شەقامەکان بکەن ئاواش وانەی باشیان لە دەسەلاتی خێلەکییەوە وەرگرت. یەکەم، هەوڵێک درا بۆ بنیاتنانی جۆرێک لە عەشیرەتگەریی نیشتمانیی کە سەدام خۆی لە سەنتەرەکەیدا بێت، پێدەچێ ئەمە کەمتر کارا بوو بێت. لەم پرۆسەیەدا "عەشیرەت"ە کەی سەدام خۆی دەبووە هاوشێوەی دەزگاکانی حکومەت، سیمایەکی خێڵەکیشی دا بە شەرعییەتی سەدام، کە پەنای بۆ عەشیرەتە هاوپشتەکانی تر برد چونکە وەکو ئەمری واقیع ددانی دەنا بە بونیادی دەسەلاتی خودی عەشیرەتەکاندا. ئەم ستراتیژییەتە لەگەڵ پێکهێنانی بالاترین رێکخراوە ئاسایشییەکانی وەکو(د.ئ.ت)و(گ.ت.ک) دەشێ بڵێین گەیشت بە لوتکەی خۆی. دووەم بەعس سیاسەتێکی سەربازیی خێلەکیی پیادەکرد، کەتیایدا سەدام

کێشەی خێڵەکیی نێوخۆی بەتایبەتی لە نێو کوردەکان بەکارهێنا بۆ بەهێزکردنی رژێمەکەی.
لەرووی لۆکاڵیەوە، عەشیرەتی بارزانیی کە سەرکردایەتیی نیوەی بزوتنەوەی کوردی دەکرد بەهێز بوو بەڵام باڵادەستی ئەم عەشیرەتە رق و کینەی لەلای عەشیرەتە کوردییەکانی تر پەیداکرد کە تەنانەت ئامادەبوون پشتیوانی لە سەدام بکەن لەبەرامبەر بەخشیشێکدا. بەدرێژایی ساڵانی 1970 کان عەشیرەتەکانی زێباریی، هەرکیی، سورچیی، برادۆستیی و دۆسکیی وەکو چەکداری ئامادەباش دامەزرێنران و هەتا 2003 ش وەکو بەشێک لە فەوجەکانی بەرگریی نیشتمانیی سەدام مانەوە، دوای ئەوە زێبارییەکان هەڵگەڕانەوە بۆلای بارزانیی. ئەو عەشیرەتانەی کە لەلایەن سەدامەوە بەخێو دەکران بێڕادە دەوڵەمەندبوون، ئاغای عەشیرەتەکانیش دەیانتوانی سەخاوەتمەندانە چاویان لە پیاوەکانی بەردەستی خۆیان بێت. ئەم عەشیرەتانە بەرژەوەندپەرستییەکی رووتیان دەکرد؛ بە چوونە پاڵ رژێمی سەدام، سەرۆک عەشیرەتێک دەیتوانی خۆشگوزەرانی خەڵکی خۆی مسۆگەر بکات؛ بەڵام بە چوونە پاڵ" کوردستان" داهاتوویان گەلێک نامسۆگەر بوو.[165]
گرنگترین لایەنی رەوتی "عەشیرەتگەریی نوێ"(neo-tribalist) ی سەدام بۆ بەڕێوەبردن، ڕاکێشانی سەرۆک عەشیرەتەکانی باشوور بوو. کە حیزبی بەعس رووبەرووی راپەڕین بووەوە لە 1991 دا، بە ئاسانیی و بە زراوبردوویی تە سلیم بوو. چیدی نەدەکرا بۆ دەستڕاگەیشتن بە باشوور پشت بە پۆلیس ببەسترێت. دەستە خێڵەکییەکانی باشوور هەرگیز نەچوونە پاڵ قەوارە ئایینیە شیعیەکان( چونکە پیاوانی عەشیرەت بەگشتی مەیلیان نییە بۆ مەسەلە ئایینییەکان)، هەمیشە دوژمنایەتی ئەوەشیان دەکرد کە پێی دەڵێن جیاوازی سوننیی-شیعیی. کەواتە، دەکرێ دڵسۆزییەکەیان بکڕدرێت—تەنانەت لەلایەن رژێمێکەوە کە سوننە تکریتییەکان تێیدا زاڵن. لەدوای راپەڕینی(1991) ەوە، سەدام سیاسەتێکی زیرەکانەی پەیرەو کرد. ئەویش گواستنەوەی دەسەڵات بوو لە مەرکەزەوە بۆ هەندێک عەشیرەتی هەڵبژێردراو.
بەپێچەوانەی " سەدام وەکو موسوڵمانێکی لە خواترس"، " سەدام وەکو سەرۆک خێڵ" رۆڵێک بوو کە بەشێوەیەکی سروشتیی پەیدا بوو.

هـەرچۆنێـک بێـت، سـەدام خۆی بۆ چەندین ساڵ عێراقـی وەکـو خێڵێکـی مەزن بەڕێوە برد. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ڕەوتە ئاماژەی لادانێکی بـەرچـاو بـوو لە فەلسەفەی بەعس، کە وەکو نەریتێکی خۆی خێلەکان و بەهاکـان و بونیـادی سەرکردایەتیی خێڵەکیی وەک سەرچـاوەی " دواکـەوتـوویی" و بـەربـەستێک لەبەردەم بە مۆدێرنکردنی عێراق کە دەبووایە لاببرێـت، وێنـە دەکـرد. ئێسـتا، سەدام خۆی عەشیرەتگەریی زیندوو دەکردەوە. نـەک وەکـو هێزێکـی سیاسـی بەڵکوو هەروەها وەکو سیستەمێک لە بەهاکان. نـەریتـی خێڵـەکیـی هاوشـانی عـەرەبچێتـی، کولتـوورو مێـژووی میزۆپۆتامیـا خرایـە نێـو" ئـەفسـانەی عێراقیی"ەوە.

لەمەوە، لە ساڵی 1992 دا سەدام عەبای تراديسیۆنی بەدەویەکانی لـەبـەرکـرد و میوانداریی سەرۆک عەشیرەتەکـانی باشـووری کـرد بـۆ بەغـداد. یـەک لـە دوای یـەک سـەرۆک خێڵـەکـان سـوێندی وەفادارییـان خـوارد بـۆ" شـێخی شێخان"(سەدام). لەبەرامبەر ئەوەدا، عەشیرەتە بەهێـزەکـان، ڕێزێکـی تـازەیـان لێگیرا لەلان رژێمـەوە، لـە میـدیاکانی عێراقـدا وەکـو ڕەمـزی بـەهـا عێراقییـە ڕەسەنـەکـان هـەڵـدەنرانـەوە، سـەرپشـک کرابـوون کـە وەک پیـاوی سـەدام هەلسوکەوت بکەن لەو کارانەدا کە پێوەندیی بە یاسـاو ڕێسا لۆکاڵییـەکانـەوە هەیە. عەشیرەتەکان تەنانەت ڕێگەیان پێدرا کە میلیشـیای چـەکـداری خۆیـان هەبێت کە لەلایەن رژێمـەوە بـە چـەکـی سـووک و لـە هـەنـدێک حاڵـەتیشـدا بەهاوەن و ئار پی جیش پڕچەک دەکران. بـەرەنجامـە چـاوەڕوانـکـراوەکـانی ئـەم سیاسـەتـە لـە سـاڵی 2003 دا ئاشـکرا بـوون کاتێـک کـە هێـزەکـانی هاوپـەیمانـان بـەرە و باشـوور دەکشـان. ئـەوانـەی کـە لـەلایـەن میـدیاکانی ڕۆژئاواوە بەو" مەدەنییانە" ناودەبران کە بەرگرییەکـی سـەختیـان دەکـرد، بـە هەموو ئەگەرێک، ئەندامی میلیشیای عەشیرەتـەکـان بـوون نـەک هێـزەکـانی سوپا کە خۆیان گۆڕیبێت.

بە لەبەرچاوگرتنی کەمیی ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستی رژێمـدا بـوون بـۆ کۆنترۆڵکردنی باشوور، دابەشکردنی دەسەڵات بە سەر عەشـیرەتـەکانـدا بـەم شێوەیە هەنگـاوێکی زەروور بـوو بـەڵام مەترسـیدار و سـەرکێشیش بـوو. خواستی سروشتیی سەدام هەمیشە ئەوە بووە کە دەسەڵات چڕبکاتـەوە نـەک بڵاوی بکاتەوە. ئێستا هەر ئەو خۆی بە ئاگاییەوە هێزی چەکـداری تایبـەتیـی لە باشووردا دروست دەکرد بۆ ئەوەی ئەو ئەرکـە بـەجێبگـەیـەنـن کـە چیـدی

رژێمەکەی نەیدەتوانی بە باشیی بەجێیان بگەیەنێ. ئەمە ددانپێنانێکی ئاشکرای بێهێزیی رژێم بوو. لەوەش زیاتر، ئەوکاتە رێگەیان پێدرا بوو کە فەنکشنی قەزائییش بنوێنن. لەو ناوچانەدا کە لەژێر دەستی عەشیرەتەکاندا بوو، نەریتی خێڵەکیی دادوەریی زاڵ بوو؛ لەهەموو شوێنەکانی دیکە عەدالەت بەگوێرەی یاسای گشتی دەوڵەت بەجێدەگەیەنرا. ئابوورییەیە دوو فلیقانەییەکەی عێراق ئێستا بە سیستەمی قەزائیی دوو فلیقانەیی تەواو کرا. وەختێک ناکۆکی دەکەوتە نێوان ئەم دووانە، بەزۆری دادگای خێڵەکیی زاڵ دەبوو.

قێزەونترین نموونەی زاڵبوونی یاسای خێڵەکیی لە مەسەلەی چارەنووسی حوسێن کامیلی هەڵگەراوەدا خۆی نواند(لە پێشەوە باسمان کرد). دوای ئەوەی داوای پەنابەریی سیاسیی کرد لە ئەردەن و بانگەشەی کوودەتایەکی سەربازی کرد لە دژی سەدام، گرنگترین نهێنییەکانی پرۆگرامی شاردنەوەی چەکە کۆمەڵکوژیەکانی عێراقیشی ئاشکرا کرد، حوسێن کامیل پیشانیدا کە تا ئەوپەڕی رادە لە هەر سەلیقەیەکی سیاسیی داماڵراوە بەوەی کە رازی بوو بگەڕێتەوە بۆ عێراق. هەر کە گەیشتنە سەر سنوور هەردووک براکە(حوسێن و سەدام کامیل) لە ژنەکانیان(کچەکانی سەدام) جیاکرانەوە و بەزۆر کاغەزی جیابوونەوەیان پێ واژۆکردن. رۆژی دواتر، کەسە نێرەکانی بنەماڵەکە کە برابوونە کۆشکێکی بەغداوە، بە دەستەیەک لە 40 چەکداری گە نج گەمارۆ دران، هەر هەموویان لەماوەی 13 سەعات شەڕی خەستدا کوژران، ئەمە قەسابخانەیەکی ئاهەنگئامێزی "شەرەف" بوو. بکوژەکان هەموویان ئەندامانی (خامس)ی حوسێن کامیل بوون— یەکەیەکی خزمایەتی پێنج-نەوەیی، کە گشت ئەندامە نێرەکان دەبووایە تۆڵەی شکاندنی شەرەفەکەیان بکەنەوە.

لە ئەنجامی ئەوەدا، بنەماڵەی کامیل لەلایەن کەسوکاری خۆیانەوە لەنێوبران. ئاشکرایە کە کوشتن بۆ تۆڵە، بەزاندنی سیستەمی یاسایی رژێم بوو، بەڵام لە جیاتی داوای سزادانی بکوژەکان، سەدام شەرعییەتی بەکوشتنەکاندا وەکو بەشێک لە پرۆسەی" پاککردنەوە". هاوشێوەی لێکردنەوەی" پەنجەیەکی نەخۆش" لە"دەستی" خێڵ.[166] دوو لەو بکوژانەی کە لە کاتی هێرشەکەدا کوژران دوایی پرسەی پاڵەوانانیان بۆ دانرا کە ئەندامە باڵاکانی رژێم ئامادەی بوون. وادیار بوو، بەها خێڵەکییەکانی دادوەریی یاسای وڵاتیان

تێپـــــەڕانـــــدبوو. [167] پشتبەستنی سەدام بە بونیادی خێڵەکیی بۆ حوکمکردن گەڕانەوە بوو بۆ پراکتیکی پێشوو. سەدام وادیار بوو لە نەوەدەکاندا لە ئەزموونی بەریتانییەکانەوە فێر ببوو. هەروەک دەسەڵاتدارە کۆلۆنیالییە پێشووەکانی عێراق زیرەکانە گومانیان کردبوو، حوکمکردنی دانیشتوانی بەش بەشی عێراق لەڕێگەی ئەو بونیادە کۆمەڵایەتییانەی کە لە ئارادان. هەرچەندە بێ باج نابێ بەڵام بێزرادە ئاسانترە لە سەپاندنی رژێمێکی یەکگرتوو بۆ حوکمکردن.

## بەکارهێنانی توندوتیژیی

هە رچەند سەدام گەلێک بێهێزکرابوو بە کاریگەرییە کەڵەکەبووەکانی شەڕی ئێران-عێراق و شەڕی کەنداو. هێشتا کەسێک یان گرووپێکی ئازا( یان گەمژەی) دەویست کە لە ساڵی 1991 دا لە دژی بووەستێتەوە. هەرچەندە بەتەواوی لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانان شکستی پێهێنرابوو. هێشتا سەدام دەسەڵاتێکی سەربازیی ملکەچی بەگوێرەی پێویست و توانایەکی وەهای مابوو کە ئەوپەڕی زۆرداریی بخاتە گەڕ، کە لە وەزعێکی تژیی بەکەرتوپەرتبوونی سیاسیی و کۆمەڵایەتییدا دەگوزەرا. ئەو هێشتا باڵادەستیی تەواوی هەبوو لە ناوەندەوە. بەکارهێنانی توندوتیژیی بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینی باشوور لەئاستێکی گەلێک نامرۆڤانەدا بوو. کاروانی ئەو پەنابەرانەی کە کەربەلا و نەجەفیان بەجێدەهێشت بە نەوت(کیرۆسین) خنکێنران کە بە کۆپتەر دەیانرشت و پاشان بە گوللەی گڕدار ئاگریان تێبەردرا.

بەسرە زیاتر لە هەزار کوشتاری دا دوای ئەوەی کە گاردی کۆماریی. دووەم گەورەترین شاری عێراقی گرتەوە. زیاتر لە هەزار لە شوێنکەوتوانی ئایەتوڵا ئەلخوئیی بە ئاسانیی بێسەروشوێن بوون. دەتوانی هەر ژمارەیەکیش بلێیت بۆ ئەو قوربانییانەی کە عەلی حەسەن ئەلمەجید(عەلی کیمیایی) خستنیەوە. دوای ئەوەی کە مۆدیلەکەی خۆی لە عەدالەت لە باشووردا بەجێگەیاند. [168] جێگەی خۆیەتی سەرنجی ئەوەش بدەین کە "ئینتیفازە" بۆ خۆیشی لێوان لێو بوو لە ئەوپەڕی توندوتیژیی و دڕندایەتیی. ئەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ بەرپرسە بەعسییە بێبەختەکاندا{ بێبەخت لەوەی کە فریای ڕاکردن نەکەوتن وەرگێڕ} کرا

کتومت لە ترسناکییدا هەمان ئەوەبوو کە رژێم کردی بە یاخیبووەکان. بەگشتیی، یاخیبووەکان سەدان کەسیان" ئەشکەنجەدا و سەر و ئەندامی لەشیان بڕی". هەروەک هەمیشە وابووە بە درێژایی مێژووی عێراق، هەر راپەڕینێک لە وەلامی توندوتیژیی و درندایەتی رژێمێکی مەرکەزییدا بۆ خۆی پڕ بووە لە ئەوپەڕی توندوتیژیی و درندایەتیی.
هاوشان لەگەڵ کۆنترۆڵکردنی هەر ئەگەرێکی یاخیبوونی شیعە و هەر گرووپێکی تری نەیار، رژێم دەبووایە بەرەنگاری بەرەنجامەکانی هەلومەرجی نالەباری ئابووریی و کۆمەلایەتییش ببێتەوە. لەکاتێکدا لە ناوەراستی سالانی 1990 دا سزاکان کاریگەریی گەورەیان دەکردە سەر ژیانی رۆژانەی خەڵکی ئاسایی عێراق، هاوشانی ئەمانە، تاوانی مەدەنیی و گەندەڵیی و بێسەروبەرەیی زیادیکرد. بەلای رژێمەوە، ئەم بەرزبوونەوەیە لە رەفتاری بێیاسایی و بێسەروبەریی جەماوەر هەرەشەیەک بوو بۆ سەر ئارامیی ولاتەکە. وەلام بەمانە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو.
رژێم کۆمەڵێک میتۆدی سزادانی ترسناکی بەرهەمهێنا بۆ بچووکترین تاوانی لادان. بۆ دزینی ئەو کەلوپەلانەی کە نرخەکەیان لە 15 دۆلار زیاتر بوو، تاوانباری بێبەخت بۆی هەبوو لە سزای ئەوەدا دەستی راستی ببڕدرێت. بۆ جیاکردنەوەی خراپەکاریی ترسناک، لەو پاڵەوانە بەدبەختانەی شەڕ کە ئەندامێکیان لە شەڕی بەرگریی لە عێراقدا لەدەستدا بوو، تاوانبارەکان بە پیتێکی (X) ی گە ورە تە وێڵیان مۆردەکرا. ئەگەر کەسێکی تۆمەتبار کە پێشتریش ئەندامێکی بڕابوو دووبارە لە سەر دزی بگیرابایەتەوە، ئە ندامێکی تریان دەبڕی. سزای مردن بەئۆتۆماتیکیی دەخرایە سەر ئەو تاوانبارانەی کە ئەندامی سوپا یان فەرمانبەری حکومەت بوون— ئەمانەش پێکهاتەیەکی گەلێک زۆری دانیشتوان بوون.[169]
تۆقاندنی هەرەمەکیی خەڵکی عێراق بەدرێژایی سالانی 1990 پەیرەو دەکرا. فیداییەکانی سەدام، کە لە ناوەراستی سالانی 1990 دا پێکهێنران و، لەلایەن عودەی سەدامەوە سەرپەرشتی دەکران— وەک خوێنرێژەکانی رژێم ناویان زرابوو. بێگومان ئامانجی سەرەکیی فیداییەکان"کۆنترۆڵکردن" ی دانیشتوانی عێراق بوو، ئەمەش ئەرکێک بوو کە زیاتر بە کاری توندوتیژیی و هەرەمەکیی بەجێدەگەیەنرا. لەوانە کوشتنی دەستبەجێ، لەبەرامبەر ئەوانەی کە رژێم بەتێکدەر دەیناساندن.

وەکو بەشێک لە هەوڵی سەدام بۆ وێنەکردنی خۆی وەک موسوڵمانێکی لەخواترس. ئەرکی فیدایییەکان ئەوە بوو کە چارەی لەشفرۆشەکان بکەن. لە ئۆکتۆبەری2000 دا فیدایییەکان بەشێوازی بێوێنەی خۆیان، دەیان ژنیان گرت بەتۆمەتی لەشفرۆشیی و لە شوێنە گشتییەکان بەبێ دادگاییکردن سەریانبڕین. ئەو پیاوانەش کە دەستیان لەگەڵیاندا هەبوو بە هەمان شێوە سەربڕدران.
بە پێچەوانەی ئەو توندوتیژییەی کە لەلایەن بەعسەوە پەیڕەوکرابوو لەچەند دەیەی پێشوودا، توندوتیژیی ساڵانی 1990 هەڕەمەکییانەتر بوو، کەمتر کۆنترۆڵکرابوو، ئاشکراتریش بوو. لە ساڵانی پێشووتردا، بە دڕندایەتییەکی ماقوڵتر بەرپەرچی شکاندنی" ڕێساکان" دەدرایەوە—بەڵام ڕێساکان خۆیان تەواو ئاشکراو دیاریکراو بوون. ڕەخنە لە سەرۆک مەگرە و ململانێ لەگەڵ ڕژێم مەکە. بەڵام لە ساڵانی 1990 دا، ڕژێم ڕۆژانە ڕیساکانی دەگۆڕی. دژایەتییکردنی ڕژێم هێشتا گەورەترین تاوان بوو. بەڵام ئێستا هەموو جۆرەکانی"تاوان" لەدژی بەها ئیسلامییەکان( یان وورتر، مۆدیلەکەی سەدام لە بەها ئیسلامییەکان) مەزن بوون. داپڵۆسینی خەڵکی بەدبەختی عێراق گەیشتە لوتکە، وەختێک دەستەدەستە لە فیدایییەکان بەسەر شەقامەکانیاندا دەدا و سزای خێراو، زیاتر دڕندانەیان جێبەجێدەکرد لەبەرامبە ر بچوکترین یاسا شکاندندا کە زۆر جار شتی وەها هەر لە ئارادا نەبوو. ئەم گەڕانەوەیە بۆ جۆرێک لە توندوتیژیی بۆ ئەوە داڕێژرابوو خەڵکی بتۆقێنێت، نەک ئەوەی هەڕەشە بکات، نیشانەی سیستەمێکی سیاسیی تەواو ناتەندروست بوو.

## یەکێتیی نیشتمانیی

لە 1991 دا، دەوڵەتی عێراق بەکردەوە دابەش بیوو بۆ دەوڵەتێکی عەرەبیی بە "قەوارە" یەکی کوردییەوە وەک پاشکۆ. دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردیی لە رووی سیاسیی و ئابوورییەوە جیابوو، لە ژێر بونیادی حکومیی و قەزائیی خۆیدا هەڵدەسورا. بە ڕێوشوێنێکی پارلەمانیی و هێزێکی سەربازیی سەربەخۆ لە بەغداد. ئەم لەتبوونە لەپێکهاتەی ئیداری دەوڵەتی عێراقییدا ویدەچێت دیارترین رووداو بێت لە مێژووی نوێی ئەو وڵاتەدا. کوردەکان ئێستا بۆ یەکەمجار بەراستیی هەلی ئەوەیان لەبەردەستدا بوو کە هەرێمەکەی

خۆیـان بـەڕێـوە ببـەن. لـە ڕاستییدا، حیزبە کوردییەکان ئـەرکێکی تـابڵێی گەورەیان پێسپێردرا بوو. لـەگـەڵ ئـەوەشـدا، دە سـاڵی ناهـاتوو بـۆ دواجـار بەڵگەی ئەوەبوون کە کوردەکان توانیان قەوارەیەکـی ئۆتۆنـۆمیی دامـەزرێـنن، ئەڵبەتە بە کارێکتەری حۆلحولیی کوردانە.

کە باکووری کوردیی بـەکـردەوە لـەوێـیو چنگـی زۆردارانـەی ڕژێمـەوە بـوو، چیدی سەدام دەسەڵاتی نەبوو بەسەر برێکی بەرفراوانـی خـاکی عێراقـدا. بـە درێژایـی مێـژووی کـورتی عێـراق، دەسـەڵاتـدارە یـەک لـە دوای یـەکـەکـان هەوڵیانداوە کە قەوارەیـەکـی یـەکگرتـوو لـە کۆمـەڵێـک پارچـە ئایـدێنتیتیی ململانێکـەر(زۆرتـر دژ بـەیـەک) دروسـتبکەن. هیچیـان نـەیـانتوانیوە کـە بـە سەرکەوتـوویی پێکهاتـەیـەک بـەرهـەم بێـنن کـە بتوانێـت دەوڵـەتـی عێـراق بگۆڕێت بەرەو شتێکی زیاتر لە کۆی پارچە و ناوچـە جیاجیاکـانی. لـە دوای 1991 ەوە، دەوڵەتی عێراق— لەبەر کۆمەڵێک مەبـەسـتی پراکتیکـی—لـەوە دەرچوو کە تەنانـەت کـەمتـرین ڕۆڵـێ لـە ئاسـتی ناوچـەیـی بچـووکراوەی وەهاشدا هەبێت.

سەبارەت بـە بـەشـی زۆرینـەی عـەرەبیـی دەوڵـەتـەکـە، مـاوەی دوای 1988 وێنەیەکی تێکەڵ بوو لەرووی یەکێتیی نیشـتمانییەوە. بێشـک هـەنـدێک هێـز یارمەتی پەرەپێدانی یەکێتییان دا، کەچیی هێزەکانی تر(بەهێزترەکـان) لـەگـەڵ پارچەپارچەکردنـی پـتـری کۆمـەڵگـای عێراقییـدا بـوون. ئـەو یـەکێتیـەی کـە عەرەبە عێراقیەکان لەشەڕی یەکەمی کەنداودا پیشـانیانـدا، کـە تیایـدا شـیعە و سوننە شانبەشانی یەکتری لە سەنگـەرەکانـدا لـەدژی ئـۆردووی ئێرانییـەکـان جەنگابوون، بەڕوونی ئاماژەبوو بۆ شـتێـک، ئـەمـە چ وەفاداریـەکـی هاوبـەش بوو بۆ ڕژێم(ئەمەیان ئەگـەرێکـی زۆر بـێ هێـزە)، هـەسـتێکی ناسیۆنالیسـتی عێراقیی بوو، یان تەعبیرێک بوو بۆ هاوبەشی ئێسـنیکیی عـەرەب. زەحمـەتـە بەدڵنیاییەوە هیچ لەمانە بڵێین. سروشـتی ئـەم هێـزی یـەکگرتنـە هـەرشـتێـک بووبێ، بێشک لەرزۆک بوو. ڕاپەڕینەکەی باشـوور هـەرسـێ سـاڵیک لـەدوای ئەم دەرخستنەی یەکێتی عەرەب ڕویدا ڕاچڵەکانـدنێکی تونـدبوو. لێکدانـەوەی ڕاپەڕیـن بـە ڕووداوێـک کـە بـەهـۆی ڕقـی تائیفیـەوە(شـیعە دژ بـە سـوننە) سەریهەڵدابێت ئەمە خۆی خوێندنەوەیەکی ساویلکانەی دیاردەیەکی ئاڵۆزە.

ئەمە قۆناغی بەرایی شەڕێکی ئاینی لەعێراقدا نەبوو. لـەگـەڵ ئـەوەشـدا، هـەر ئەو ڕاسـتییەی کـە زۆربـەی زۆری بـەشـداربوانی ڕاپەڕینـەکـە شـیعە بـوون،

لــەكاتێكــدا ئــەو هێــزە ســەركوتكــەرانــەی كــە كۆكرابوونــەوە بــۆ دامركاندنەوەی بەشێكی ئێجگار زۆریـان سوننە بـوون، راسـتییەكـی گرنـگ ئاشــكرا دەكــات ســەبـارەت بــە جیـاوازی تـائیفیی لــە عێراقــدا. كێشــە جەوهەرییەكان مێژوویی و سیاسیین نەك مەزهەبی. عێراق هـەمیشـە لـەلایـەن سوننەوە حوكمی كراوە و شیعەش هەمیشە حوكمی بەسـەردا كـراوە. لـەكـاتی شەڕدا، هەمیشە رژێمە سوننیەكان بڕیارە سەرەكییـەكانیـان داوە، لـەمـەیدانی شەڕدا هەمیشە ئەفسەرێكی سـوننی سـەرپـەرشـتی سـەربـازەكـانی كـردووە، هەمیشەش شیعەكـان( یـان كـوردەكـان) بوونـەتـە قـۆچی قوربـانیی. شـەڕی كوەیتیش زۆر لەم نموونە مێژووییە بنەڕەتیە لاینەدا. لێرەوە، لێكدانـەوەیـەكـی ماقوڵی راپەڕین ئەوەیە كە بەڵگەی تەقینەوەی ئـەو دوژمنایـەتییـە بـوو نـەك تەنها رووی لە رژێمە سوننییەكەی دەسەڵاتـداری ئـەو كاتـە بـوو(هـەرچـەنـدە ئاشكرایە دوژمانیەتی لەبەرامبەر سەدامـدا گـەلێـك زۆر بـوو) بـەڵكـوو رووی لـەو هـەرەمـە تـرادیسـیۆنەی دەسـەڵات بـوو كـە لـەسـەرەتـای دروسـتكردنی دەوڵەتی عێراقیدا لەئارادا بوو.

سەرەرای بەڵگەی ئەوەی راپەڕین كە یەكێتیی عەرەبیی هێنـدە بـەهێـز نـەبـوو وەك ئەوەی لەدوای" سەركەوتن" ە كـەی عێراقـەوە لـەدژی ئێـران دیـار بـوو، چەند فاكتەرێك رۆڵیان هەبوو لـە عێراقـدا لـە سـاڵانی 1990دا یارمـەتـی قایمكردنی عێراقیان دەدا بە رووی دوژمنكارییدا. ئەوەی كە زۆر لـەبـەرچـاوە، رژێمی سزاكان نەهامەتییـەكـی هاوبـەشـی تووشـی هـەمـوو خـەڵكـی عێـراق كردبوو، ئەمەش یارمەتی سەدامی دا تا جڵەو و ئاراسـتەی رقـی خـەڵكیـی لـە رژێمەكەی خۆی دوور بخاتـەوە. بـەبـێ حیسـابكردن بـۆ ئـەوەی كـە دەبـێ سەركۆنەی كێ بكرێت لەبەرامبەر مەینەتییەكانی خـەڵكـی عێراقـدا ڕاگەیانـدنی دەوڵەتیی جڵەوكراو لـە عێراقـدا هـەرگیز كەمتەرخـەمی نـەدەكرد لـە فێڵـەكانی گەمەی دیپلۆماسییدا. پروپاگەندەی رۆژانە كوتانەوەی ئـەمێریكا و بـەریتانیـا بوو( ئەو دووانـەی كـە هـەردووكیـان سـوور بـوون لـەسـەر درێـژەپێـدانی لابردنی سزاكان) پەخش دەكرا بۆ ماڵە عێراقیـەكـان، لـەلای زۆر كـەس هـیچ گومانێكیان نە هێشتبوو كە كـێ بـەرپرسـیارە لـە " گـەمـارۆی" سـەر عێـراق. سزاكان ئەگـەر هیچیـان نـەكردبێـت یارمـەتـی مانـەوەی سـەدامیـان دا نـەك بەپێچەوانـەوە، كـە رێگریـی بـۆ مانـەوەی بكـەن.... سـەدام هـەر ئـەمسـەرو ئـەوسـەری بــوو لــە یــاری مشــك و پشـیلەدا لــەگــەڵ پشـكنەرەكـانی

UNSCOM. وەک لەسەرەوە سەرنجمان دا سەدام هیچی دەستنەدەکەوت لە هاوکارییکردنی پشکنەرەکان. بەلاّم زۆری دەست دەکەوت لە گێچەڵ نانەوەدا. بەدرێژایی ساڵانی 1990 بەتایبەتی لە 1998 دا سەدام چەندین قەیرانی بەدوای یەکدا داهێنا کە وایلێکرد وەکو بەرگریکەرێکی ئازا لە سەروەریی و شەرەفی عێراق دەربکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە سەدام سیایسیەکی تەرەکراو بوو لەنێو سەرکردەی دەوڵەتە عەرەبییەکانی ناوچەکە، بەلاّم گۆڕا بۆ پاڵەوانێکی تائیفی لەنێو خەڵکی ڕەشۆکی عەرەبدا. ئەم ستراتیژیە بێسەرئێشەیە." لەدەوری ئالاّدا کۆبینەوە"تەنها دەشێ ئەوەی پێبکرابایە کە گوربدات بەمانەوەی رژێم لەوەختێکدا کە شتێکی وەها بەقیمەت لەئارادا نەبوو تا عێراقییەکان دڵی پێخۆشبکەن.

لەودیو ڕووکاری ئەم" یەکێتییە لە مەینەتیی" ە دا. ئەو رەوتەی کە لەو ماوەیەدا زاڵ بوو لە رووی یەکێتیی نیشتمانییەوە بەشی هەرە زۆری نەگەتیڤ بوو. سوپای عێراقیی، کە بۆ ماوەیەکی زۆر بوو مایەی شانازیی عێراق بوو هەروەها یەکێک بوو لەو دەزگا کەمانەی کە پێکهاتە جیاجیاکانی عێراقی لە تاکە قەوارەیەکدا کۆکربووەوە(هەڵبەتە قەوارەیەکی سوننی سالاریی)، وەکو هێزێکی بڕوا پێکراو لەماوەی ساڵانی 1990 دا نزیکەی بەتەواوی لێکهەڵوەشێنرا. ئەو سەرچاوانەی کەلە بەردەستی رژێمدا بوون نزیکەی تەنهاو تەنها خرانە خزمەت دەزگا" بژاردە" کانی ئەوکاتە، وەکو گاردی کۆماریی، یان بۆ ئەو هێزانەی کە تازە دروستکرابوون، وەکو(گ.ک.ت) ئەو هێزەی کە پتر بژاردە بوو. لەرووی راهێنان و ئامێر و کەرەسەوە، سوپا بوو بەسێبەری پێشووتری خۆی . ئەمە سیاسەتێکی ئەنقەست بوو لەلایەن سەدامەوە. سوپا رۆڵێکی نایابی لە دژی ئێران گێرا ، لێرەوە ئەمەش هەڕەشەیەک بوو بۆ سەر رژێمەکەی.

کاریگەری ئەم سیاسەتە لەسەر خۆراگرتنی سوپا لەشەڕی 2003 دا ئەو کاتە زۆر ئاشکرا بوو، وەختێک سەربازە نیمچە برسییەکانی عێراق کە تەنها کۆنە تفەنگ و تانکی سۆڤیتی پەنجاکانیان پێبوو و لوتیان چەقی بە"دیواری پۆلاّیینی" ئەمێریکییەکاندا. لەساڵی 1991 دا، شەڕی سوپای عێراق لەدژی هێزەکانی هاوپەیمانان بوو بەمەشقێکی "ماقووڵی" ی خۆبەدەستەوەدان: ئەگەر لەرووی کەمی لاشەی مردووەکانی ساڵی( 2003)ە

وه سەیری بکەین، شەڕی دووەمی ئەمێریکا بوو بەمەشقێکی لەشەڕ هەڵاتن. گومانی تێدانییە، دەشێ سوپا ڕێک بخرێتەوە، بەڵام کاتێکی زۆری دەوێت تا هەیبەتەکەی خۆی دەگێڕێتەوە لەدوای ئەم دوو ڕیسواییەوە. ڕەمزەکانی تری یەکێتیی نیشتمانییش هەروەها گورزی جەرگبڕیان بەرکەوت لەدوای ساڵی (1988)ە وە. لەبنەڕەتەوە دەوڵەت—وەکو دابینکەری خزمەتگوزاریی گشتیی نەوەکو ئامێرێک بۆ داپڵۆسین—لەماوەی ساڵانی 1990 دا دارما. سیستەمەکانی فێرکردن و تەندروستیی کە وەختێک مایەی شانازیی بوون بەهۆی سزاکانەوە لەپەلوپۆ کەوتن. ئەمانە لە ساڵەکانی پێشوودا سەرچاوەی شانازیی نیشتمانیی بوون و یارمەتیی پێکەوە گرێدانی دانیشتوانەکەیان دابوو لەڕێی کۆشش و ئەزموونە هاوبەشەکانیانەوە. دەوڵەت ئیتر وەکو خاوەنکار و بەخشندەی سەرەکیی عێراق کەوتە سستیی. لەکاتێکدا بیرۆکراتەکانی پێشووی عێراق، دکتۆرەکان و دانسازەکان و مامۆستاکان ژیانێکی خۆشگوزەرانی چینی ناوەڕاست دەژیان، لە کۆتایی ساڵانی 1990 دا، ئەوانەی کە لە وڵات هەڵنەهاتبوون کەوتبوونە چنگەکرێی ژیان لەسەر مووچەیەکی مانگانەی کەمتر لە 5 دۆلار. خولقاندنی چینێکی ناوەراستی زیندوو و گەشەسەندوو یەکێک بوو لە دەسکەوتە سەرنجڕاکێشەکانی حیزبی بەعس—هەروەها باشترین ئومێدی عێراق بوو بۆ تێپەڕاندنی دابەشبوونە تائیفی و ئێسنیکییەکانی. لەکۆتایی ئەو ماوەیەدا، چینێک نەما بوو بەناوی چینی ناوەڕاستەوە. لەجیاتی ئەوە، عێراق دابەش ببوو بەسەر دوو چیندا: چینی زۆر پارەدار و چینی زۆر هەژار. هەروەک بەرپرسێکی عێراقی لە ساڵی 1999 دا بۆی دەرکەوتبوو" دوو دەیە لە بێبەشکردن و پشتگوێخستن لەلایەن جیهانەوە پێکهاتەی کۆمەلایەتی تێکداوە. ئێستا هەرکەس بیر لەخۆی دەکاتەوە."[170] لەکاتێکدا سەدام پێشتر بەئاگاییەوە هەولی" پەرشکردنەوە" ی دانیشتوانی عێراقی دابوو وەک یەکەمین قۆناغی پێویست بۆ دروستکردنی سیستەمێکی کۆمەلایەتیی نوێ وپێشکەوتوو، ئێستا" پەرشکردنەوە"(atomization)ی خەڵکیی وەک ستراتیژیەتی مانەوە پەیڕەودەکرا.

دانیشتوانێکی پەرتکراو بۆ ڕژێم ئاسانتر کۆنترۆڵ دەکرا. ئەمە بەئاشکرا لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ساڵانی 1995 و ئۆکتۆبەری 2002 دا دیار بوو. ئەنجامەکە لەهەردوو حاڵەتەکەدا جێگەی شک نەبوو-- 99

لەسەدی خەڵکی دەنگیان بۆ بەردەوامبوونی سەدام وەک سەرۆک دا. ئەمە لەحاڵێکدا کە نزیکەی هەموو خەڵکی بەشداری هەڵبژاردنەکانی کردبوو. بەڵام لەکاتێکدا زۆربەی میدیای ڕۆژئاوا سەرنجیان خستبووە سەر سروشتی گاڵتەجاڕییانەی ئەم ئەزموونەی دیموکراسییەتی جەماوەریی(popular democracy)، مەسەلە ئەسڵیەکەیان پشتگوێ خستبوو کە—هێشتا ڕژێم( تەنانەت لە کۆتایی 2002 شدا) دەیتوانی سەرتاپای دانیشتوان کۆبکاتەوە بۆ کردنی هەرشتێک (هەرچەندە گاڵتەجاڕییش بێت).

ئەو لەسەدا 99.96 دەنگە " بەڵێ" یەی کە لە 2002 دا بەدەستهات ڕەنگە ئاماژەیەکی جێگەی بڕوا نەبووبێت بۆ پێگەی جەماوەریی سەدام، بەڵام بە دڵنیاییەوە بەڵگەی ئەوە بوو تاچەندە چەپۆکی سەدام بەسەر سەری خەڵکی عێراقەوە بەهێز بوو. خەڵکی عێراق لەناو " ڕەبانێکی ئۆتۆماتیکی" دا بوون—هەرکە ڕژێم فەرمانی دا، ئەوان بەبێ پرسیارکردن جێبەجێیان دەکرد، نەک لەبەر خۆشەویستی یان ڕێز، بەڵکوو لەبەر ئەوەی دەیان ساڵ دەسەلاتی بەعس هەر جۆرە توانستێکی بیرکردنەوە و کارکردنی سەربەخۆی لێسەندبوونەوە.[171] لێکدانەوەیەکی تر لەجیاتی ئەم لێکدانەوەیە—کە سەدام هێشتا جەماوەرێکی بەرفراوانی هەبوو تەنانەت لە کۆتایی 2002 شدا دوای ئەوەش کە وڵاتەکەی بەم دەردە بردبوو—ئەمەش ڕەنگە بەهەمان شێوە بێزارکەر بێت. بنیاتنانەوەی ژێرخانی عێراق چەندین ساڵی دەوێت هەتا دێتەدی، بەڵام بنیتنانەوەی سایکۆلۆژیای کۆمەڵگەیەکی زامدارکراو زۆر لەوە زیاتر دەخوازێت.

بنیاتنانەوەی سیاسیی عێراقیش هەروەها لەوە زیاتر زەحمەت دەبێت، وەکو بەرەنجامێکی دوایین دەیە یان زیاتری حوکمی سەدام. ڕەوتی زاڵ لە عێراقدا بەش بەشبوونی سیاسی بوو تا یەکێتیی سیاسیی. سەدام بەدانی دەسەلات بەسەرۆک خێڵەکان چەندین تۆڕی دروستکرد لە" قەڵەمڕەویی" بچووک بچووک، کە دەسەلاتی سەرۆک خێڵەکان لەوێدا بەهیچ شێوەیەک مایەی لێپرسینەوە نەبوو لەلایەن دەسەلاتی مەرکەزیەوە. حوکمکردن لەڕێی بونیادی خێڵەکییەوە پەرەیدا بە سەقامگیریی ڕژێمەکەی سەدام لەڕۆژە سەختەکاندا و سەدام تەنانەت پڕوپاگەندەی ئەوەشی دەکرد( بەهەندێک

شـــەرعیـــەتپێدانـــەوە) کـــە عەشیرەتەکان سەرچاوەی یـەکێتـی تـائیفیین لـە عێراقدا نەک دابەشبوونی تائیفیی.
چەندین عەشیرەت جیاوازیی تائیفییان تێپەراند بوو، بـۆ نموونـە، خێڵـەکـەی سەدام خـۆی(ئـال بوناسـر) لقێکـی سـوننیی هـەبـوو کـە مـەلبـەندەکـەی لـە دەوروبەری تکریت بوو، لقێکی بچوکتری شیعەی هەبـوو لـەنزیـک نـەجـەف. لەگەڵ ئەوەشدا، سیاسەتی "عەشیـرەتگـەرییـە نـوێ"یـەکـەی سـەدام چـەنـدین دەروازەی نوێی کردەوە بۆ پەرتپەرتبوون. پێدانی چەکـی سـووک و تـۆپ بـە خێڵەکـان چـەنـدین کێشـەی عـەشیـرەتیـی گـۆڕی بـۆ ڕووبـەڕووبوونـەوەی چەکداریی گەورە. لە یەکێک لەو ناکۆکیانەدا کـە چـەنـدین عـەشیـرەت تیایـدا بەشدار بوون لە دەوروبەری ناوچەی کوت، تیایدا هاوەن بەکارهـات کـە بـووە هـۆی کـوژرانی 266 کـەس و بریـنـدار بـوونی 422 کـەس. هـەروەک ڕۆژنامەی زمانحاڵی ڕژێم گووتی" ئەو عـەشیـرەتانـە چـەکیـان پێـدرابوو کـە شەڕی وڵاتە یەکگرتووەکان بکەن...... نەک شەڕی نێو خۆیان" [172]
لابردنی ڕژێمی سـەدام بۆشـاییەکـی بـەرچاوی لـە دەسـەڵات بـەدوای خۆیـدا هێنا. تەنها عەشیرەتەکان وەکو تاکە بونیادی کۆمەڵایەتیی تـەبـا ماونـەتـەوە، لێرەوە، بێشک ڕۆڵی سەرەکیی دەبینن وەکو خودان هێـز لـە ناوچـەکانیانـدا، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کـە زۆر لـە خێڵـەکـان هێـزی میلیشـیای چـەکـداری تایبەتیی خۆیان ( زۆر باش پڕچەککراو) هەیە، ئەگـەری کێشـمەکـێش لـەنێـو خێڵەکان لەسەر دەسەڵات گەلێک زۆرە. بە نەبـوونی دەسـەڵاتێکـی مـەرکـەزی بەهێز کە هەمـوان بـەیـەکـەوە کۆبکاتـەوە، بونیـادە خێڵـەکییـەکـان ئیمکـانی ئەوەیان نییە کە بناغەیەکی بڕواپێکـراو دابـین بکـەن بـۆ گـەشـەسـەنـدنێکی سـەقامگیریی سیاسـیی لـە عێراقـدا، ئـەگـەری ئـەوەش زۆر دوورە خێڵـەکـان بەخواستی خۆیان لیبڕال دیموکراسیی و دەسەڵاتی یاسا قبووڵ بکەن.
ساڵانی 1990، شانبەشانی هەستانەوەی بـەختـی عـەشیـرەتـەکـان، شـاهێدی سەرهەڵدانەوەیەکی بەرچاوی سـۆزی ئـایینی بـوون لـە نێـو شـیعەکانـدا، کـە پاڵنەری سەرەکیی کەسایەتی کارێزمـایی ئایـەتوڵا محـەمـەد سـادق ئـەلسـەدر بوو. وەکو هەڵبژێردراوێکـی  ووریـای ئـەزمایشـکراو لـەلایـەن ڕژێمـەوە، بـۆ ئەوەی جێگـەی ئایـەتوڵا ئـەلخوئی نـەجـەف بگرێتـەوە، سـەدر واچـاوەڕوان دەکرا کە بەرە و ڕژێم دایبشکێنیت، کـەچـی ئـەو هـەر لـەسـەرەتـاوە هێڵێکـی سەربەخۆی گرتـەبـەر. وتـار و وەعـزەکـانی کـە هـەزاران نوێژکـەر ئامـادەی

دەبوون. هەرچی زیاتر ڕەخنەبوون لە ڕژێم لەماوەی ساڵانی 1990 دا، لەوەش گرنگتر، سەدر سەرکەووتوانە چەندین تۆڕی لەشووێنکەوتوانی شیعە پێکهێنابوو کە گرووپە شیعییە جیاجاکانی لەژێر پەرچەمی خۆیدا کۆکردبووە. بەئاشکرا، سەدر خەریک بوو ببێ بە هەڕەشەیەک بۆ سەر ڕژێم، دوایی باجەکەی بەژیانی خۆیدا و لە 1999 دا( لەگەڵ هەردوو کوڕەکانیدا) کوژران........... کەمترین گومان لەوەدا نییە کە ئەم کوشتنە بەفیتی ڕژێم بوو: بەدڵنیاییەوە خەڵکێکی زۆری شیعە لەو باوەڕەدابوون بەوشێوەیە بووبێت، ژمارەیەکی زۆریش خۆپیشاندان لەچەندین شاری عێراقییدا لەدژی ڕژێم بەرپابوون.
سەدام ئامرازەکانی داپڵۆسینی خۆی کۆکردەوە و فیداییەکان و ئەمنی تایبەت و. گاردی کۆماریی بەرێکرد بۆ هێورکردنەوەی وەزعەکە. شاری ناسرییە، لەژێر فەرمانی عەلی کیمیاییدا خرایە ژێر گەمارۆی سەربازیی، پاشان بەبێ جیاوازیی بەتۆپی قورس تۆپبارانکرا. ئەوەی کە لەهەمووی ناڕەحەت تربوو بۆ سەدام ناڕەزایی توندی توێژە شیعییەکانی بەغداد بوو. ئەو ڕۆژەی کە کوژرانی سەدر ڕاگەیەنرا، خۆپیشاندانی دژ بە ڕژێم سەری هەڵدا، ئەویش بەتوندیی لەلایەن فیداییەکانەوە سەرکوتکرا. بەهەمووی، 25 خۆپیشاندەر کوژران و 50 ی تریش بریندار بوون. هەوڵەکانی سەدام بۆ جڵەوکردنی شەپۆلی زیندووبوونەوەی ئایینی شیعە بە بەکارهێنانی ئیسلام وەکو هێزێک بۆ هێشتنەوەی ڕژێمەکەی بۆ دواجار شکستی هێنا.
سەدر، سەرکەوتوبوو لە بنیاتنانی بناغەیەکی بەهێز کە لێیەوە ڕەخنە لە ڕژێم بگیرێت، لێرەوە، ئایینی وەکو هێزێکی سیاسیی خستبووەوە کار. هەر سەرکردەیەکی ئایینیی ئەگەر بتوانێ پەیڕەوی لەڕەوتی سەدر بکات و جڵەوی ئەو هێزە ئایینیە بکات کە لە نەوەدەکاندا پەخش ببووەوە، ڕۆڵێکی سەرەکیی دەبینێت لە داهاتووی سیاسیی عێراقدا. ژمارەکان تەنها خۆیان باس لە چەندایەتییەکان دەکەن. لە 1999 دا، زیاتر لە 2 ملیۆن حەجکەری شیعە سەفەریانکرد بۆ کەربەلا بۆ یادکردنەوەی شەهادەتی حوسێن: لە 2001 دا ئەم ژمارەیە زیادی کرد بۆ 2.4 ملیۆن(نزیکەی لە سەدا 20 ی تەواوی دانیشتوانی شیعە مەزهەبی عێراق).[173] سەدام و بەعس زۆربەی 30 ساڵی دەسەڵاتیان سەرفکرد لە بەکارهێنانی هەر هۆکارێکی پێویست—چ زۆر لێکردن بێت، ڕاکێشان، یان بەخشیش—بۆبەرگرتن لە سەرهەڵدانی

ئیســـلامی شـــیعە وەکـــو هێزێکی سیاسیی بەهەیبەت. بـەڵام لـەو کاتـەدا کە ڕژێمەکەی ڕووخا لە ساڵی 2003 دا، ئەمـە ڕێـک ئـەو ئـەگـەرە بـوو کـە بۆخۆی خوڵقاندی.

## بەرەنجام

ماوەی 1988-2003 کۆتایی سەردەمی سەدامـی بـەخۆیـەوە بینـی. لـە مەی 2003 دا، سەدام چیدی سەرۆکی عێراق نەبـوو. وڵاتـەکـەش ڕێگـای درێژ و پڕ مـەترسـیی خـۆی دەسـتپێکرد بـەرە و بوژانـەوەی سیاسـیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی. بەبێ گەڕانەوە بـۆ 35 سـاڵ حـوکمی بـەعس، کەس ناتوانێت لەمەزنی ئەو ئەرکە بگات کە کەوتۆتە پێش ئـەوانـەی کـە دەخوازن عێراق ئاوەدان بکەنــەوە. ئـەم مـاوەیـە کۆمـەڵگـەیـەکـی تـابلێی پەشۆکاو بەشبەشبووی بەدوای خۆیدا بەجێهێشت—نەک باشترین ژینگەی یارمەتیدەر کە هیچ جۆرە بونیادێکی دیموکراتیی خۆڕاگری تێدا پـەیـڕەو بکرێت. لەوەش زیاتر، ئەم ماوەیە کەلێنـەکـانی نێـو کۆمـەڵگـەی عێراقیـی گەورەتر کرد بە قووڵکردنەوەی جیاوازیە ئێسنیکییەکانی کورد-عـەرەب و بە بەهێزکردنی باڵادەستی سوننە لە سەنتەردا. سەرهـەڵدانـەوەی گرووپـی زیاتر—وەکو عەشیرەتەکان و پێشەوا ئاینیەکان لە باشووردا—ئەمانـەش وا دەردەکەوێت کە لەداهاتووی عێراقدا کاریگەر دەبن. میراتی سەدام ئەوە بووە کەکۆمـەڵگـەیـەک بـەجێبێڵێـت پراوپـڕ لـە بـۆمبی چێنـراو بـۆ هـەر ڕێکخراوێک کە هەوڵی ئەوەبدات دەوڵـەتێکـی عێراقـی خـۆڕاگر و تـەبـا بنیات بنێت کە لەڕێی کۆمەڵێک دەزگای دیموکراتییەوە حوکم بکرێت.

لە هەمووی گرنگتر، پێدەچێت ئەوەبێت کـە ئـەم سـەردەمـە دەسـتپێکردنی دابەشکردنی عێراقی بەخۆیـەوە دیت، دامـەزرانـدن و بـەدەزگـاییکردنی دەوڵەتێکی کوردیی. لەهەموو شتێکدا تەنها بەناو نـەبێت. دەریخسـت کـە عێراقییەکان نامۆنین بە چەمکی دیموکراسیی. بەڵام ستراکتۆری دەوڵـەتـی عێراقیی، بەو شێوەی ئێستای ( ئەگەر بەملێی قسـە بکـەیـن)، یارمـەتیـدەر نییە بۆ پەرە پێدانی دیموکراسیی. ئەو ڕاستییەی کە کوردستانی عێراق لـە ( 1991 ) ەوە سەربەخۆیـە و بـە جیـا لـە بەغـداد کـار دەکـات، چـەنـد کێشەیەکی بونیادیی دروسـتکردووە کـە وای کـردووە زەحمـەت بێـت بـۆ کوردستان بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی بەر لە ساڵی 1991. ئێسـتا زمـانـی زاڵ

کوردییه—منداڵانی کورد بەبێ ئەوەی پێویست بکات عەرەبیی فێربن پەروەردەکراون. ئێستا سیستەمی پەروەردە بە کوردیی بە زانکۆ "نیشتمانییەکان" پڕچەککراون کە لە هەموو شارە سەرەکییەکاندا هەن. ئیدارەی کوردییش هێزی سەربازیی خۆی دامەزراندووە. تەنانەت ئەگەر کوردستان" بدرێتەوە بە بەغداد". زۆر ڕێی تێدەچێت کە دژایەتی کوردان لەبەرامبەر بەغداد زیاتر دەبێت لەوەی کە تائێستا بینراوە تەنانەت زیاتر لە کاتی توندترین شۆڕشی کوردا لە ساڵانی 1960 دا. کوردەکان تامی ئازادییان کردووە دەشیانەوێت پارێزگاریی لێبکەن.
لەگەڵ ئەوەشدا، هاوتای ئەم بێهێزبوونە لە یەکڕیزیی خاکی عێراقدا، لەبەرامبەریدا بەهێزبوونی گرووپە سوننیە سەرەکییەکانە. چەند عەشیرەتێک جگە لە عەشیرەتەکانی ناوچە ی تکریت ئێستا بەهێزن و لەلایەن سەدامەوە بەهێزکراون. لەوەش زیاتر، ئەو عەشیرەتانەش کە لەلایەن سەدامەوە نابووتکرابوون بەدڵنیایەوە لەدوای ئەوەی کە ئەو نەما دەردەکەونەوە و هەوڵ دەدەن کە پێگەی خۆیان بستێننەوە. عێراق بەبێ سەدام، کۆمەڵگەیەک دەبێ لەگەڵ خۆیدا لەشەڕدایە. بەتایبەت دوای ئەوەی کە کۆت و پێوەند و تۆقاندنی سەدام لەناودا نەما و هەرکەسە و پەلاماری غەنیمەکانی دەوڵەتی عێراقیی دەدات. سەدام بەرهەمی دەوڵەتی عێراق بوو. بەڵام دەوڵەتی عێراقیش بەشێوەیەکی ڕیشەیی بەو هەمو هێزەوە گۆڕا کە لە کەسایەتی ئەودا بوو. میراتی زیندووی ئەو بۆ ئەمێریکاو بەریتانیا ڕەنگە ئەوە بێت، کە دەوڵەتێک بەدوای خۆیدا بەجێبهێڵێت لە 2003 دا بە نەبوونی خۆی ڕەنگە حوکمکردنی ئەستەم بێت .

# بەندی پێنج

# شیعەکان

١

## پێشەکیی

چەسپاندنی دیمۆکراسییەکی ڕاستەقینە لەعێراقدا سەرئەنجامەکەی دەوڵەتێک دەبێت کە شیعە تیایدا زاڵ دەبێ. لەڕووی ژمارەوە شیعەکان نزیکەی 14 ملیۆن کەس دەبن، زۆرینە (لەسەدا 60) ی دانیشتوانی عێراق( بەکوردەکانیشەوە). ئەمە بەدڵنیاییەوە وامانلێدەکات بەوشێوەیە بۆی بچین کە دانیشتوانی شیعە وەکو قەوارەیەکی دەنگدانی تەبا هەڵسوکەوت دەکەن لەهەر هەڵبژاردنێکی دیمۆکراسییدا. بەڵام لەڕووی مێژووییەوە شیعەکان بەدەگمەن قەوارەیەکی تەبابوون، ئەمەش یارمەتیی رژێمە سوننییە یەک لەدوای یەکەکانی بەغدای داوە تا ( بەشێوازی جیا جیا) جیاوازییە سروشتییەکانی نێو جڤاکی شیعە بقۆزنەوە بۆ بەرگرتن لەدەرکەوتنی ئۆپۆزیسیۆنێکی شیعەی یەککگرتوو، لێرەوە بتوانن بالادەستیی تەواوی خۆیان بەسەر دەسەلاتدا بپارێزن.

هەر لەکۆنەوە شیعەکان بەتەواوی بێبەشکراون لەنێو ئۆفیسەکانی بڕیاردانی دەوڵەتی عێراقدا. لەوەش زیاتر ئەوان بەشێوەیەکی سیستەماتیزەکراو بوونەتە ئامانج و ڕووبەڕووی هێزی داپڵۆسێنەرانەی حکومەتی ناوەندیی بوونەتەوە.. لەوانە لەناوبردنی بەکۆمەڵ و ئیعدامی دەستبەجێ و وێرانکردنی ناوچەی بەرفراوانی هۆرەکانی باشوری عێراق. سەدام سیاسەتێکی بێئامانی چەوساندنەوەی پەیرەو دەکرد لە داپڵۆسینی شیعە عەرەبەکاندا بەدرێژایی ماوەی دەسەلاتی و بەتایبەتیی لە 1988 بەدواوە، پاڵنەری ئەم سیاسەتە ترس بوو لەئەگەری دەسەلاتی جەماوەری شیعە مەزهەب و پشتئەستوور بوو بەنیگەرانیی عەرەبستانی سعودییە و دەوڵەتانی تری کەنداو سەبارەت بە ئەگەری بلاوبوونەوەی نفوزی سیاسیی ئێران لەڕێگای برا شیعە عەرەبەکانیانەوە.

سیاسەتی پاراستنی دەسەڵاتی حکومەتی کەمینەی سوننە و دوورخستنەوەی شیعە لە گەیشتن بەدەسەڵات سیاسەتێکی زاڵ بووە لەمێژووی کورتی عێراق و هەر ئەمەش سیمایەکی دووبارەبووەوەی مێژووی عەرەبیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. بۆ ئەوەی لەوە بگەین کە بۆچیی شیعە گرووپێکی سیاسیی پەراوێزکراوە لەناوچەی عەرەبیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەروەها لەعێراقدا. بۆ ئەمە پێویستە بەقوڵایی بە مێژووی ئیسلامدا بچینەوە تا دەگاتە سەر ساتە بەراییەکانی سەرهەڵدانی ئەو ئایینە. هەرچەندە، کاریگەرییە مێژووییەکان و میراتی کۆنی جیاکردنەوەی شیعەگەرایی لەگەڵ کاروباری دەوڵەتدا. تا ئێستاش کاریگەرییان هەیە بەسەر سایکۆلۆژیای سیاسیی دیندارە شیعەکانەوە، مۆدێرنەش جارێکی تر تێڕوانینی سیاسیی گەلێک کەسی گۆڕیوە. زاڵبوونی گەلێک لەمەڵبەندە شارنشینە شیعییەکان لەعێراقدا و ئەو پشتیوانییەی ئێران دەیدات بەڕێکخراوە شیعییەکان و بەتایبەتییش، ئەو دڕندایەتییانەی ڕژێمی سەدام کردی لەبەرامبەر خەڵکی باشووردا. تا ئەو ڕادەیە شیعەکانی تێکەڵ بەسیاسەت کردووە کە ڕەنگە ئەستەم بێت لەعێراقی دوای سەدامدا پشتگوێ بخرێن.

ئەوەی زیاتر مەسەلەی پێگەی شیعەی لەعێراقدا ئاڵۆز کردووە ئەو ڕاستییەیە کەشیعەکان خۆیان بەناسیۆنالیستی عێراقیی دادەنێن. لەکاتێکدا، چەند ئاراستەیەکی جیاجیای هێزە سیاسییەکانی شیعە، حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراقیان کردۆتە ئامانج، زۆرینەی شیعە بەگشتیی هیچ هەستی بەتاوانباریی نەکردووە لەسەر پەژراندن و پشتیوانییکردنی ڕەوایی دەوڵەتی عێراقیی. بەدڵنیاییەوە، ئەوە کێشەی نوێنەرایەتییکردنە لەدەوڵەتی عێراقدا وای لە مەسەلەی شیعە کردووە تا جیاواز بێت و چارەسەرکردنیشی ئەگەرێکی زۆر پڕ چەرمەسەریی بێت بە بەراورد لەگەڵ مەسەلەی کوردەکاندا. کوردەکان تا دوا رادە هەوڵی ئۆتۆنۆمیی و کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکەی خۆیان دەدەن و کەمتر لەخەمی مەسەلەی نەتەوەی عێراقدان. شیعەکان بەپێچەوانەوە، ناسیۆنالیستی عێراقیین.

بۆ نموونە خێڵە شیعەکان زۆر بەچڕیی بەشداربوون لە شۆڕشی 1920 دا لەدژی بەریتانییەکان و زۆربەشیان پشتیوانیی دەوڵەتی عێراقیان کرد لەدژی ئێران لەشەڕی ئێران-عێراقدا لە ساڵانی 1980-1988 دا . ئەو

نموونەیـــــەی دوایــــــی، لەکاتێکدایــە، بـواری سیاسـیی شـیعەگەرایی لەئەوپەڕی برەودا بوو لـەدوای کاریگـەری شۆڕشـی ئیسـلامیی لـەئێرانی دراوسێدا. بەزۆری وەک بەڵگـەی تێکـەڵاوبونێکی سـەرکەوتووانەی شیعە باسدەکرێت لەنێو دەوڵەتی عێراقییدا. هەروەها وەکـو بەڵگەیـەکی ئاشـکرا باسـدەکرێت بـۆ پووچەڵکردنـەوەی ئـەو بۆچوونـەی پێیوایـە جیـاوازیی گشتیی هەیە لە نێو شیعە و سوننەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا، لای کەم لەدوو بواری گرنگـەوە، ئـەم جیـاوازیی تائیفییـە شتێکی واقیعییە. یەکەم، لەئاستی سیاسییدا." حیکایەتی" دەوڵەتی عێراقیـی هەر لەبـەرایی دروسـتبوونی خـودی دەوڵـەتی عێراقـەوە لەلایـەن کەمینـەی سـوننییەوە داڕێــژراوە. زنجیرەیـەک لەحکومــەتی یـەک لـەدوای یـەکی پانعەرەبیی و بە زۆریـی سێکیولار و، سـوننی سـالار. هەمیشـە لەهـەوڵی ئەوەدا بوون ئایدێنتیتیی عێراق لەدەوری چەنـد بیرۆکەیەکـدا داڕێـژن کـە زۆر بەکـەمیی جێگـەی بایـەخی زۆرینـەی شـیعە بـوون( بـۆ نموونــە، پانعــەرەبیزمێکـــی ناحـــەز virulent و ســـیکیۆلارێکی ڕووپامـــایی avowed).

بەپێچەوانــەی دابەشـبوونی ئێسـنیکی کـوردیی/عــەرەبیی، دابەشـبوونی سوننیی/شـیعیی لەسـەر شـەرعییەتی بنـەڕەتیی عێـراق وەکـو قەوارەیـەکی هــەرێمیی(territorial entity) دانامــەزرێ، بــەڵکوو پەیوەســتە بــە ( ئایدێنتیتی) دەوڵەتەکە خـۆی، بەتایبـەتیی، ڕۆڵـی سیاسـیی گونجـاو بـۆ پێشەوا ئایینییەکان، تا کـوێ عێـراق وەکـو دەوڵـەتێکی ئیسـلامیی حـوکم بکرێت، ئەمانە ئەو مەسەلانەن کە بێشک لەسەر ئاستی جیـاوازی تـائیفیی کێشە دروست دەکەن. دووەم، کە گرنگترە لەوەی پێشوو، ئەو شیعانەی کـە سیاسییانە بیردەکەنەوە پێیانوایە کێشەی بنەڕەتیی کە ڕووبەڕووی عێراق دەبێتەوە مەسەلەی نوێنەرایەتی ناتەواوی شیعەکانە لە سیسـتەمی سیاسـیی عێراقدا.[174] ئەوانەی کە گرنگیی جیاوازیی تائیفیی بەکـەم دەگـرن دەبـێ ئــەوەش بپــەژرێنن، لەکاتێکــدا کۆمەڵگــەی شــیعیی بەشـێکی دانــەبڕاوە لەبونیادی دەوڵەتی عێراقییدا، شیعەکان هــەرگیز نەبوونەتــە بەشـێکی تــەبا لەنێو ڕیزی بڕیـار بەدەسـتی حکومـەتی عێراقییـدا.[175] پێـدەچێ تەنانــەت لەکێشەی کوردیش زیاتر، کێشەی نوێنەرایەتی شیعە بـۆ چەنـدین سـاڵ و مانگی تر ببێتە مایەی گرنگیپێدان.

## شیعەکان کێن؟

بەپێچەوانەی ناونیشانی وەکو" کورد" یان" عەرەب" کە ئاماژەن بۆ ئایدێنتیتییەکی ئێسنیکیی/کولتوریی تایبەت. شیعەگەرایی. شیعە پۆلێنکردنێکی (classification) سۆسیۆلۆژیی سیاسیی. یان کولتووریی نییە.[176] ئەو چەمکانە ئاماژەن بۆ چەند بیروباوەڕێکی ئیسلامیی تایبەت کە لەبیروباوەڕەکانیتر جیا دەکرێنەوە. لەنێویاندا لە هی سوننیەکان. بەلەبەرچاوگرتنی ئەمە" شیعەکانی خۆرهەلاتی ناوەراست" هەرهێندەی " پرۆتستانتەکانی ئەمێریکای باکوور" قەوارەیەکی چوونیەکن. کە ئەمەش بەزەحمەت گشتاندنێکی ماقوڵ پێکدێنێت.

شیعەگەرایی و شیعەکان، زیاتر لەهەر شتێک دەبەسترێنەوە بە کۆماری ئێران. بەتایبەتیی لەلایەن میدیای خۆرئاواوە. وێنەی ئەو ئایەتوڵلایانەی کە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکا بە" شەیتانی گەورە" ناو دەبەن. دیمەنی هەڵبژێردراوی ئەو شیعانەی لەخۆیان دەدەن و شین و شەپۆڕ دەکەن لەکاتی یادە ئایینییەکانیاندا. هەروەها بەستنەوەی ئێران لەلایەن ئەمێریکاوە بەدەستتێکەڵاوکرنن لەگەڵ ڕێکخراوە تیرۆریستییەکاندا. هەموو ئەمانە وێنەی شیعەی لەلای خەڵکی خۆراوایی ناشیرین کردووە. لەوەش زیاتر. بەزۆریی وا مەزەندە دەکرێت کە شیعەکان ئێرانیین. کەچیی لەڕاستییدا زۆرێک لە شیعەکان عەرەبن و دڵسۆزی وڵاتە عەرەبییەکانی خۆیانن تا ئێران.

لەگەڵ ئەوەشدا. ورووژاندنی مەسەلەی نوێنەرایەتی سیاسیی عەرەبیی شیعە لە جیهانی سوننەسالاریی عەرەبییدا. ورووژاندنی مەسەلەیەکە کە زۆربەی هەرەزۆری حکومەتەکان پێیان باشترە پشتگوێی بخەن.[177] سروشتی پەیوەندیی سوننیی/شیعیی لەدەوڵەتانی عەرەبیی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا مێژووەکەی کۆنە بەئەندازەی مێژووی ئیسلام خۆی. پەیوەستە بە ململانێیەکی چارنەکراو کە بووەتە واقیعێکی بەدەزگاییکراو( institutionalised) لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. کۆمەڵێک ڕووداو بەر لە هەزار ساڵ. کەبوونە هۆی زاڵبوونی سوننە بەسەر شیعەدا. ئەو سەروەرییە سیاسییەی چەسپاند بۆ سوننەکان لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا کە ئەمڕۆ لەبەرچاوە.

هــــەر هـــــەولێک بـــــۆ چارەســــەرکردنی دەرکەوتــــە سیاســـییەکانی ناوچەکە لەئێستادا. بێگومان لەئەنجامدا هەرەشە دروست دەکـات بـۆ سـەر ئەم بارودۆخە چەسپاوەی ئێستا و بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو نەخشـەی سیاسیی خۆرهەلاتی ناوەڕاست دەگۆڕێت.[178] لەعێراقی دوای سەدامدا. کـە شیعەکان ئێستا بازووە سیاسییە تازە پە یدابووەکانیان دەردەخەن. هەست بەترسی رژێمە سوننە سالارەکانی کەنداو بەتایبەتیی دەکەن. ئەگەر عێـراق ببێتــە دەولـــەتێکی شیعەســـالار. بـــەرگرتن لەکاریگـــەریی یەکســـەرەی ئـــەم ڕووداوە بەســـەر خۆرهـــەلاتی ناوەراســـتەوە کـــارێکی زەحمـــەت دەبێـــت. لەبەرئەوە. زۆر گرنگە باســی ئەوەبکــەین چــۆن ســوننە تــوانی ئــەم پێگــە زاڵەی خۆی بەدەست بێنێت بەسەر شـیعەدا—ئەمـەش بـە بـەدواداچوونی سەرەتاکانی ئەو بەشبەشبوونە دەبێ.

## بناغەکانی دابەشبوونی سوننە/ شیعە

هەر لەدوای دامەزراندنی ئیسلام لەلایـەن پێغەمبـەر محەمـەدەوە لەسـەرەتای سەدەی حەوتەم؛ ئایینەکە توشی دابەشبوونێکی گەورە بوو لەسەر مەسەلەی جێگرتنەوەی پێشەوایەتی بەسـەر کۆمـەڵی موسـوڵمانانـدا. لـەدوای کـۆچی دوایی پێغەمبەر محەمەد لە ساڵی 632 ی زایینیدا. لەسەر مەسەلەی چۆنێتی دیاریکردنی کەسی جێگـرەوەی، جیـاوازی سیاسـیی دەرکـەوت. کۆمـەڵێک لەگەڵ ئەوەدابوو کە خەلیفەیەک لەنێو سەرکردە بەرچاوەکان هەڵبژێردرێت. کۆمەڵی دووەم لەگەڵ دانانی ڕاسەوخۆی زاواکـەی پێغەمبـەر. عـەلی کـوڕی ئەبوتاڵیب دا بوون وەکو خەلیفە. لەمەوە. شوێنکەوتوانی عەلی بە " شیعەی عەلی"(پشتیوانانی عەلی) ناسران، کە دواتر کورتکرایەوە بۆ "شیعە".[179] ئــەوان پێیــانوابوو عــەلی پەیوەنــدیی نزیکتــری هــەبوو لــەڕێی خــوێن و ژنخوازییەوە لەگەڵ پێغەمبەردا. دوایـی قەناعـەتیان وابـوو کـە تـەنها ئـەو کەسانەی لەخزمە نزیکـەکان و نـەوەی محەمـەدن( ئـەهلی بـەیت. "خـەڵکی

ماڵەکـــە") تـــەنها ئـــەوان بەراستی بۆیان هەیـە ببن بەخەلیفە. هـەوڵی عەلی بـۆ پێشـەوایەتییکردنی موسـوڵمانان چەنـدین جـار ڕێگـری لێکـرا. تەنانەت هـەزار سـاڵ بـەر لـە ئێسـتاش. وا دەردەکـەوت ئـەو مەسـەلانەی پەیوەستن بەجێگرتنەوەی سەرکردە سیاسییەکان لەو ناوچەیەدا کـە دوایـی بوو بە عێراق. هـەر ئـەو کاتـە لێوانلێـو بـوون لـە کێبڕکێـی خوێنـاویی و بێئامان. یەکەم خەلیفە ئەبووبەکر بوو دوای ئەو عومەر و دواتر عوسـمان. لەکۆتاییدا عەلی پۆستەکەی لە ساڵی 656 ی زایینیدا مسۆگەر کـرد بـەڵام دوای پێنج ساڵ کوژرا. پاشان خەلافەت تەسلیم بە موعاویەی کوڕی ئـەبوو سوفیان کرا. ئەو کەسـایەتییەی کـە شـیعەکان قینیـان لێیـدەبووەوە لەسـەر دژایەتییکردنی لەپێشینەی بۆ پێغەمبەر محەمەد . شـیعەکان لـەجیاتی ئـەوە ئومێدی سیاسییان خستە سەر کوڕەکـانی عـەلی و فاتیمـە(کچـی محەمـەد). حەسەن و حوسێن. حەسـەن کـە لەلایـەن شـیعەوە وەکـو" ئیمـامی دووەم" ڕێزی لێدەگیرێت.[180] لەلایەن موعاویەوە بەزۆر خانەنشین کرا. لە مەدینەدا. بەر لەوەی بەفێڵی خودی خەلیفە ژەهر خواردوو بکرێت.
لـە 680 دا موعاویـە مـرد. بـەڵام لەلایـەن کـوڕە ملهـوڕ و بەدکارەکەیـەوە جێگەی گیرایەوە. لە کاتێکدا کە ماڵبـاتی موعاویـە لـە قۆنـاغێکی بێهێزیـدا بوو. شیعەکانی کوفە ئەمەیان بەهەل زانی بۆ گەڕاندنەوەی ئەهلولبـەیت بـۆ پێگـەی سـەرکردایەتیی و پـەیامێکیان نـارد بـۆ حوسـێن کـە لـە مەککـە دادەنیشت. تاوەکو سەرکردایەتی شۆڕشێکی شیعە بکات و داوای خەلافەت بکاتەوە بـۆ شـیعە. حوسـێن هـەرگیز نەگەیشـتە کوفـە. بـەڵکوو خـۆی و دەستەیەکی بچووک لە شوێنکەوتووەکانی لەلایەن هێزەکـانی یەزیـدەوە لـە کەربەلای عێراقی ئێستادا ڕێگـەیان لێگیـرا. حوسـێن کـوژرا و لایـەنگرە دیلکراوەکانی بەرەو کورسی دەسەڵاتی یەزید بـەڕێخران بـۆ دیمەشـق و لەوێ دەستبەسەر کران.[181]
لێرە بـەدواوە شـیعەکان بـە بـەردەوامیی بوونـە ژێردەسـتە لـە کاروبـاری دەوڵـەتی ناوچەکـەدا. سـوننەکانیش هەمیشـە سەردەسـتەبوون لەحکومەتـە یەک لە دوای یەکەکاندا لە دیمەشق و پاشان لە بەغداد. بـەڵام بزوتنـەوەی شیعەکان بـە شکسـتەکەی شـەڕی کەربـەلا بنبـڕ نـەکرا. لـەجیاتی ئـەوە. هەستکردن بە ناعەدالەتیی و ڕق و کینە لەبەرامبەر خەلیفە سوننەکاندا هـەر لەزیاد بووندا بوو. بە مردنی حوسێن لە کەربـەلادا. عێـراق ئـەو قۆناغـەی

دەستپێکرد کە تیایدا بوو بە مەڵبەندی لەدایکبوونی شیعەگەرایی.[182] هاوشان لەگەڵ ئەمانەدا ئەو قەناعەتەی کە خەلیفە سوننییەکان گەندەڵ و بەدکاربوون. زۆربەی موسوڵمانانی باشووری عێراق ڕوویانکردە شیعەگەرایی، بەتایبەت لەسەدەکانی 18 و 19 دا. ئارامگای عەلی و حوسێن و 4 لە 12 ئیمامەکە لەشارە پیرۆزەکانی عێرقدان—نەجەف( کە عەلی تێدا نێژراوە)، کەربەلا(کە ئارامگەی حوسێنە)، کازمیە( لە نزیک بەغدا)، و سامەڕا. ئەمانە هەموو عێراقیان کردووەتە چەقی قورسایییەکی حاشاهەڵنەگر لەجیهانی شیعەدا.

چیرۆکی شەڕی کەربەلا و سەربڕینی حوسێن بوو بە خاڵی کۆبوونەوەی شیعەکان، دوای حوسێنیش کوڕەکانی و ئەندامە بەدوایەکدا هاتووەکانی ماڵباتەکەی جێگەیان گرتەوە. زنجیرەی ئیمامەکان بەگوێرەی مەزهەبی" دوازدەیی" شیعەگەرایی، لە دوازدە ئیمام پێکدێت هەر لەدوای مردنی پێغەمبەرەوە. شیعەکان باوەڕیان وایە کە" ئیمامی دوازدەهەم" ( محەمەدی مەهدی)، لە ساڵی 874 دا لەلایەن خواوە بەرزکراوەتەوە و شاردراوەتەوە تاوەکو ڕێگە لەکوشتنی بگرێت. پیاوە ئایینییەکانی مەزهەبی دوازدەیی لەو باوەڕەدان ئەو ئیمامە هێشتا زیندووە و لەداهاتووشدا وەکو " مەهدی"— ئەو کەسەی کە خوا ڕێنوێنیی دەکات—دەگەڕێتەوە و حوکمی کۆتایی دەدات.[183] لەمەوە، دەسەڵاتی کۆتایی بەلای شیعەکانەوە لەدەستی ئیمامی ونبوودا دەمێنێتەوە.

لەو کاتەدا کە ئیمام بەشێوەیەکی کاتیی ونە، پێشەوایەتییکردنی کۆمەڵی شیعە لەئەستۆی" زاناکان" یان" مەلاکان" دا بوو. هەر زانایەک" عالمێک" کە زاناکان بە کەسێکی تەواو تێگەیشتوو و فێربووی دە زانن، ناونیشانی" موجتەهید" هەڵدەگرێت، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە توانای" ئیجتیهادی" هەیە، توانستی بەکارهێنانی یاسا ئیسلامییەکانی بۆ مەسەلەی جیا جیا هەیە. ئەو پێگەیەی کە دەسەڵاتی ئایینی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسییدا بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەستەمە دەستەبەر بکرێت، بۆیە باوەڕدارە شیعەکان شوێنی موجتەهیدە بالاکان دەکەون وەکو کەسانی سەرچاوەی شوێنکەوتن، یان" مرجع التقلید"{ لەدەقە ئینگلیزییەکەدا بەمشێوەیە نووسراوە} بالاترین مەرجەعی شیعە لە عێراقی

ئێســــــــــــــــــتادا. ئایەتوڵڵا( ئەبولقاسم خوئیی)ە. بەدوای ئـەودا. ئایەتوڵڵا( سەید عەلی سیستانی) دێت لە نەجەف.[184]
لەڕووی سیاسییەوە ئـەم شـوێنکەوتنەی کەسـایەتییە باڵاکـان زۆر گرنگـە. چونکە کەسی شیعە ئازادن لەوەی شوێن فەرمایشتەکانی هـەر مەرجـەعێک بکەون. بەبێ گوێدانە شوێنی جیۆگرافیی. کاریگـەریی ئـەوە لەوەدایـە کـە کۆمەڵگەیـەکی جـوڵاو و چـالاک دەخولقێنێـت. کـە چەنـدین جەمســەری دەسەڵاتی ڕۆحیی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا. لەڕووی سیاسییەوە ئەمـە بووەتـە هـۆی پەیـدابوونی بونیـادێکی پارچەپارچـە و لێکـدابڕاو. کـە لەخزمـەتی پێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسیی شیعەدا نییە. ئەم ڕووە فـرە جەمسـەرییەی شیعە رووکارێکی سەرەکیی کۆمەڵگاکەیانە.
لەمـــەوە. دوورخســـتنەوە لـــە دەســـەڵات و نفـــوز لـــەدەزگای ئیـــداریی دنیاییدا( وەکو حکومەت). رووکارێکی بەرچاوی مێژووی شیعەیە. تەنانـەت لـەوەش زیـاتر بووەتـە نیشـانەی سـەرەکیی ناسـینەوەی شـیعە خـۆی. شـیعەگەرایی گەشـەی سـەندووە بـەنێو توێژێـک لـە خـەڵکی چەوسـاوەو بێبەشدا. کـە لەسـەر مـۆدێلی دوورخسـتنەوەی حوسـێن و باڵادەسـتبوونی سوننە دامەزراوە. لێرەوە. ناکۆکییەک هەیە لەنێوان سیۆلۆجی{ لاهـوتیی-خواناسیی} ناسیاسیی(apolitical theologyl) شیعە و هەڵپەی شیعەی بـە سیاسـییکراو بـۆ بەدەسـتهێنانی دەسـەڵات لـەو ولاتانـەدا کـە تیایـدا نیشتەجێن. لەوانەش عێراق. ئەو شـیعانەی کـە ئامـانجی سیاسـییان هەیـە دەخـوازن جڵـەوی حکومـەت بگرنـە دەسـت. بـەڵام ئایینەکـەیان لەسـەر پەراوێزخسـتنی پێشـوویان لـە حکومـەت و هـەوادارییان بـۆ ئیمامـە نەیارەکانی هەزار ساڵ پێشوویان دامەزراوە.
چارەسەرەکەی ئایەتوڵڵا ئێرانییەکان. بە پێشڕەوایەتی ئایەتوڵڵا خومەینی بـۆ کێشـەی مسـۆگەرکردنی شـەرعییەتی سیاسـیی بـۆ پێشـەوا ئایینیـە شیعەکان. ئەوەبوو زاناکان بکرێن بـە وەکیـل بـۆ گرتنـە ئەسـتۆی ئەرکـە ئایینیـەکانی ئیمـامی بـزر و ئامادەنـەبوو. ئەمـەش بۆخـۆی مانـای سـەرکردایەتییکردنی ژیـانی سیاسـیی کۆمەلایـەتی(socio-political) دەوڵەت بوو.[185] بەپێچەوانـەوە لـە عێراقـدا. ئایـدێنتیتیی سیاسـیی شـیعە نـەیتوانیوە ئـەم کێشـە ناوەکییـە چارەسـەر بکـات و شـیزۆفرینیاییانە schizophrenic دەردەکەوێت. بە جۆرێک کە هێزەکانی مۆدێرنە هـانی

زۆرینەی شیعە دەدەن تا شوێنی دەسەڵاتی لاچووی حکومەتیی بگرنەوە. کەچیی دەزگا کۆنە ئایینییەکان دوودڵن لەوەی کە ڕۆڵی سیاسیی ئاشکرا بگێڕن. کەسایەتییەکی گەلێک ئامادە و خودان توانستی فیکریی دەوێت تا بێت و ئەم دینامیکە بەرووکار دژبەیەکانە کۆبکاتەوە لە سایکۆلۆژیای شیعەی عێراقیدا.

ئەگەر شیعەکانی عێراق بە جیا دابنێین لەوانەی ئێران ئەوە ژمارەیەکی بەرچاون لەنێو خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا. ژمارەی دانیشتوانی شیعەی عێراق زیاترە لەکۆی ژمارەی دانیشتوانی رەچەڵەکی ولاتانی( ئەنجوومەنی هاوکاریی کەنداو—GCC). دووەمین گرووپی شیعە لەگەورەییدا لە لوبنانە، بەڵام ژمارەی ئەوان تەنها دەیەکی ژمارەی شیعەی عێراق دەبێت.[186] بۆیە، شیعەی عێراق گرووپێکی سیاسیی گرنگن لە خۆرهەڵاتی ناوەراستدا. کەچیی ئایدێنتیتییان لەهەر گرووپێکی تری ناوچەکە زیاتر تووشی بەدحاڵیبوون هاتووە( هەندێکجار بەئەنقەست) هەروەها خواستەکانیان بەکەم گیراوە. لێرەوە، جێگەی خۆیەتی کە وێنەیەکی نزیککراوەی شیعەی عێراق بکێشین لەڕووی ئایدێنتیتیی گشتیی و تێروانینی سیاسییانەوە.

## گەشەسەندنی شیعەگەرایی سیاسیی لە عێراقدا

شیکردنەوە و هەلسەنگاندنی گەشەسەندن و مێژوو و دینامیکیەتی پێگەی شیعەی عێراق لەدەولەتێکی سوننەسالاریدا کارێکی ئالۆزە. ڕێکخستنی سیاسیی شیعە تایبەتمەندییەکی ناجێگیری هەیە. کە ڕەنگدانەوەی سروشتی فرە جەمسەرییە لەدەسەڵاتی ئایینیی شیعەدا. لەکاتێکدا کوردەکان لەدەوری بیرۆکەی ناسیۆنالیزمی کوردییدا یەکگرتوو بوون( تەنانەت لەو کاتانەشدا کە لە ململانێدا بوون). ئامانجێکی کۆکەرەوەی وەها نەبووە تا وەکو نێوەندێک کار بکات بۆ یەکخستنی شیعەکان لەڕووی سیاسییەوە. لەدواییدا ئەوانیش عەرەبن و کێشەیەکی وەهایان نییە تایبەت بە شەرعییەتی دەوڵەتی عێراقیی. زیاد لەوەش، دامەزراوەی ئایینی شیعە ڕقی لە تێکەڵاوبوون بە بواری سیاسیی و سێکیولارییە. لەمەوە بنکەی سەرەکیی ئایدێنتیتیی مەزهەبیی جیا دەکاتەوە

لە سەرکردایەتی چالاکیی سیاسیی میلیتانتیی کە بەناوی شیعەوە ئەنجام دەدرێت.
بە درێژایی مێژوو، رژێمە سوننییەکان بالادەستی سیاسیی خۆیان بەوە راگرتووە کە شیعە بە لاوازیی و پارچەپارچەیی بهێڵنەوە. چەندین تەکنیکی جیاجیا خراوەتە کار—راکێشان و خەلاتکردن و سزادان—بۆ بەرگرتن لەدەرکەوتنی هێزێکی ئۆپۆزیسیۆنی شیعەی تەباو یەکگرتوو کە بتوانێت ململانێی بالادەستیی سوننە بکات. کلیلی ئەم ستراتیژییە، بەرگرتن بووە لە بەسیاسییکردنی دامەزراوەی ئایینیی شیعەی عێراقیی (حەوزە)، و بەمەش بەردەوامیی بدەن بە گۆشەگیرکردنی سیاسیی ئەو دامەزراوەیە لە جەماوەری شیعە. ترسی رژێمە سوننییە یەک لەدوای یەکەکان و بەتایبەتیی رژێمی سەدام، نە خودی حەوزەو نە جەماوەری شیعە بووە، بەڵکوو ترس بووە لە ئەگەری ئەوەی کە هەردووکیان پێکەوە بزوتنەوەیەکی سیاسیی جەماوەریی دەستپێبکەن لەدژی بەغداد.
لەکاتێکدا نە حەوزە و نەجەماوەری شیعە هەڕەشە نین بۆ بالادەستیی سوننە هەتا بەشبەش بن. بەلام مەسەلەکە شتێکی تر دەبێت کاتێک کەسایەتییەک یان رێکخراوێک ئەو کەلێنە پڕ دەکاتەوە و سەرکەوتوو دەبێت لە بەسیاسییکردنی حەوزە و بەرۆحانییکردنی جەماوەر. دیارترینی ئەو کەسایەتیانە محەمەد باقر سەدر بوو(1935-1980). ئەو مەرجەعە ئیلهامبەخشەی کە بەکۆکردنەوەی ئایین و سیاسەت لەرێگەی حیزبی دەعوەی ئیسلامییەوە. خەریک بوو بەرەنگارییەکی جدیی دروست دەکرد لەبەرامبەر رژێمی بەعسی دەسەلاتداردا.[187] هەروەک چۆن ئەوانەی کە سیاسەتی کوردیی شیدەکەنەوە پێویستە لە هەلسەنگاندنی مەلا موستەفای بارزانیی و پارتیی دیموکراتی کوردستانەوە دەستپێبکەن. بۆ تێگەیشتنیش لە دینامیکیەتی شیعەگەرایی هاوچەرخ لەعێراقدا زەروورە شوێنپێی گەشەسەندنی کۆنترین حیزبی شیعی —حیزبی دەعوە-- و سەرەکییترین داڕێژەری ئایدۆلۆژیای ئەو حیزبە—ئایەتوللا محەمەد باقر سەدر هەلبگرین.[188]

## دامەزرانـــدنی حیزبـــی دەعوەی ئیسلامیی

دەتـــوانین ســـەرەتاکانی ســـەرهەڵدانی شـیعەگەرایی سیاســیی چەکـداریی بگێڕینەوە بۆ ئەو نائارامییـەی کـە لـەدوای رووخـانی پاشـایەتی لەسـاڵی 1958 دا بـاڵی بەسـەر عێراقـدا کێشـا.[189] یەکـەم و ڕەنگـە گرنگتـرین بزوتنەوەی سیاسیی شیعیی حیزبـی دەعـوە بـوو. کـە لـەکۆتایی سـاڵانی 1950 دا لـە نەجـەف دامـەزرا. یەکـەم سـەرکردەی کۆمـاری عێـراق— عەبدولکەریم قاسم-- لەرادەبەدەر پشتی بەست بەهێزی ڕێکخستنی حیزبی شیوعیی عیراقیی بۆ لەناوبردنی نەیارەکانی و بۆ دزەکردنە ناو دامـەزراوە ئاینییـەکانی شـارەکانی نەجـەف و کەربـەلا. دامـەزراوەی ئـایینی شـیعە بەسەرکردایەتی ئایەتوڵڵای عوزمـا موحسین ئەلحـەکیم کـە رووبـەڕووی سەرهەڵدانی چەند هێزێکـی سیاسـیی" خوانـەناس" بـووەوە. کەوتـەخۆ و پشـتیوانیی لـە دامەزرانـدنی قەوارەیـەکی شـیعیی کـردەوە کـە بتوانێـت بەرەنگاری ئەم شالاوە سێکیولارییە ببێتەوە بۆ سەر خەڵکی شیعە.

ئەو ڕێکخراوەی کـە دواتـر نیگەرانـە سیاسییەکانی دامـەزراوەی ئـایینی دەگوازێت بۆ کرداری سیاسیی لـەنێو جـەماوەری شـیعەدا، حیزبـی دەعـوە دەبێت.[190] بۆچوونەکان لەنێو حەوزەی شیعەدا دابەشبوون لـەنێوان ئـەو کۆنەخوازانەی کە دەیانویست جیاوازییەکی ڕوون ڕابگرن لەنێوان هەردوو بواری سیاسیی و ئاینیدا، هەروەها ئەو هەڵسوڕاوانەی کـە دەیانخواسـت هاوسەنگی هێز لەناو دەوڵەتی سوننەسالاری عێراقدا دووبارە دابڕێژنـەوە. دەستەی دوایی بانگەشەی دەکرد بۆ بەشداریی سیاسیی شیعە و کۆمەڵـەی زانایانیان- لە نەجەف دامەزراند بۆ ئەوەی وەکو رووکارێـک کـار بکـەن لـــەنێوان دامـــەزراوەی ئـــایینی شـــیعە و گرووپـــە سوســـیۆئابوورییە (socioeconomic) جیاوازەکانـدا.[191] هێـزی حـەوزەی شـیعە و ئـەو کاریگەرییـەی کـە دەکـرا هـەیبێت بەسـەر سیاسـەتی نیشـتیمانییەوە زۆر بەڕوونی دەرکەوت لەدوای ئەوەی ئایەتوڵڵا موحسین ئەلحـەکیم فەتوایـەکی دەرکردو قەدەغەی کرد موسوڵمانان بچنـە ریزەکـانی حیزبـی شـیوعییەوە. ئەمەش بۆخۆی قاسمی ناچار کرد واز لە هاوپەیمانێتییەکەی بهێنێت لەگـەڵ شیوعییەکاندا.

هێشتا پێویستیی بەئاراستەی دنیایی زیاتر دەکـرد لەدامـەزراوەی ئـایینی شـیعە بـۆ دەستنیشـانکردنی ڕێگـەچارەی سیاسـیی و ئـابووریی بـۆ

کێشـــەکانی کۆمەڵگـــە. محەمەد باقر سەدر کەسایەتییەکی گرنگ بـوو بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. لەو ماوەیەدا سەدر مەلایەکی گەنج بوو کە لەگـــەڵ کۆمەڵـــەی زانایانـــدا کـــاری دەکـــرد وەک سەرنووســـەری بڵاوکراوەکانیـان. ئـەو بەرپرسـیار بـوو لـە دەستنیشـانکردنی زۆر لـە لایەنەکانی پێکهاتەکانی حکومەتێکی ئیسلامیی. کارەکانی لە بڵاوکردنەوەی کتێبی فەلسەفەتونا ( فەلسەفەی ئێمە) دا لە سـاڵی 1959 دا بـە دواییهات. کە تیایدا ڕەخنەی لـە کۆمـۆنیزم دەگـرت. لەدوای ئـەم نوسـینە لـە سـاڵی 1961 کتێبی ئیقتیسادونا( ئابووریی ئێمە) هـات. کـە تیایـدا تیۆرییـەکی لەمـەڕ ئـابووریی ئیسـلامیی پێشکەشـکرد و هێرشـیکردە سـەر هـەردوو تیۆرییە ئابوورییەکانی کۆمۆنیزم و سەرمایەداریی. کتێبەکان زۆر بەباشـی پێشوازیان لێکرا لەلایەن جەماوەری شیعەوەو سەرکەوتوو بوون لە هەرچی زیاتر دارمانی ورەی شیوعییەکاندا.[192]

یەکەم کوودەتای بەعسییەکان لە 1963 دا. بەدواییدا حکومەتەکانی عارف هـاتن لـەنێوان سـالانی 1964 و 1968 دا. لـەو ماوەیـەدا شـیعەگەرایی سیاسیی دەسکەوتەکانی خۆی چەسپاند و بواری بۆ دەعوە رەخسـاند کـە پەرە بستێنێت.[193] رژێمی تازە خۆی بە قـەرزاری کارەکـانی دامـەزراوەی شیعە دەزانی لە ناوزڕانـدن و بێهێزکردنی پێگەی حیزبی شـیوعی عێراقیـی و لەمەوەش بێهێزکردنی هەرچی زیاتری پێگـەی قاسـم. بێشـک، حـەوزەی شیعە پێدەچوو هێنـدەی بەعسـییەکان دڵگـەرم بێـت بـۆ لـەناوبردنی هـەر شیوعییەکی گومانلێکراو لەدوای کوودەتاکـەی 1963. بـەڵام نیشـانەکانی ململانێ ئاشکرابوون. کـە دەعـوە ڕێـژەی ئەنـدامێتیی و نفوزی سیاسـیی زیادکرد لە نێـو جـەماوەری شـیعەدا. سـەنتەر و کتێبخانـەی ئـایینی نـوێ دامەزران لە سەرتاسەری عێراقدا. بوو بە هەڕەشەیەکیش بۆ رژێمی بەعسی سۆشیالیست و پانعەرەبییست و سێکیولارییست کـە لـە سـاڵی 1968 دا دەسەلاتی زەوتکردبوو.

## بەرەو داپلۆسین

حکومەتی تازە کە سەدام حوسێن تیایدا جێگری سـەرۆک بـوو، هـەرزوو گلایە ناو کێشمەکێشێکی زۆر سەختەوە لەگەڵ ئێراندا. ئەمەش بـەرەنجامی خەتەرناکی هـەبوو بـۆ شـیعەکانی عێـراق.[194] ئـەو کاتـەی کـە ئایـەتوڵڵا

ئەلحەکیم ڕازی نەبوو بە مەحکوومکردنی شای ئێران دوای ئەوەی سەرۆکی عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر داوای لێکرد. لەو کاتەوە چارەنووسی شیعەکان دیاریکرا. ڕژێم کە تووشی ببوو بە تووشی دامەزراوەیەکی ئایینیی ئامانجدار. جەماوەریی و لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە نەیاری ڕەوتی سۆشیالیستیی و سێکیولاریی بەعس. نەخشەی کێشا بۆ لەنێوبردنی سیستەماتیکیانەی هێزە سیاسییەکانی شیعە و بەتایبەتیی نفوزی حەوزە. قوتابخانە ئایینییەکان و حوجرەکان داخران و بڵاوکراوەکانیان لە بازاڕ هەڵگیرانەوە. کوڕەکەی ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم گیراو ئەشکەنجە درا. کەسایەتییە شیعە ناودارەکان لەلایەن ڕژێمەوە لەنێوبران. خوێندنەوەی قورئان لەسەر تەلەفزیۆن ڕاگیرا و فێرکردنی ئیسلامیی لەپەیڕەوی قوتابخانەکاندا لابرا.[195]

هەتا ئەم کاتە حیزبی دەعوە و سەدر لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە جیانەکرابوونەوە و حیسابێکی تایبەتییان بۆ نەکرابوو. ڕژێم لەجیاتی ئەوە قورسایی هەوڵەکانی خستبووە سەر حەوزەی نەجەف و ئەو بێگانانەی ( بەزۆریی ئێرانییەکان) کە گومان هەبوو لە دڵسۆزییان بۆ بەغداد. ئەمە پاشان گۆڕا. ئەویش دوابەدوای مردنی ئاسایی ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم لە جونی 1970 دا و جێگرتنەوەی بە ئایەتوڵڵا ئەبو ئەلقاسم ئەلخوئیی. ئایەتوڵڵای تازە لەم پێگە باڵایەیدا. بڕیاریدا کە ئەو ڕێگەیە هەڵبژێرێت کە حەوزە پێی باشە. لێرەوە خۆی بەدوورگرت لە کێشمەکێشی سیاسیی. سەرکردایەتییکردنی هێزە سیاسییەکانی شیعەگەرایی لە عێراقدا بۆ سەدر بەجێهێڵرا. لەدوای ئەوەی کە پێگەی جێنشینی ئەلخوئیی پڕکردەوە و خۆیشی بوو بە ئایەتوڵڵا ئەلسەدر. بۆ ئەوەی ببێ بەسەرکردەی ئەو هێزانەی شیعەگەرایی سیاسیی لە عێراقدا.[196]

سەدر سەیریکرد سوود لە سۆزی سیاسیی میانەڕەوانەی شیعە وەردەگرێت. ئایەتوڵڵا خومەینی. کە ئەو کاتە ئاوارە بوو لە نەجەف دوای ئەوەی لەلایەن شاوە لە ساڵی 1964 لە ئێران دەرکرا بوو (یەکەمجار بۆ تورکیا و دوایی لە ساڵی 1965 ڕۆیشت بۆ عێراق). لە لوتکەی شیعەگەرایی سیاسییدا بوو. بانگەوازی مەزهەبیی دەکرد. لەو سەرەوە ئایەتوڵڵا ئەلخوئیی هەوڵی دەدا کە سۆزی شیعە هەرچی زیاتر ڕابکێشێت بەرە و ئاراستەی ئایینیی تا سێکیۆلاریزم. سەدر لە ناوەڕاستدا بوو.

وەکوو عەرەبێکیش بوو بە جەمسەری شیعەی عێراقیی. لەگەڵ زیادبوونی ناو و ناتۆرەی حیزبی دەعوە، لە ئان و ساتی ئەوەدا بوو کە رژێمی بەعس دەست بداتە داپلۆسینی.
لە ساڵی 1972 بەسەرەوە، ئەوانەی کە گومانی ئەندامێتی حیزبیان لێدەکرا (دەعوە) زیندانی دەکران و ئەشکەنجە دەدران و هەندێکیشیان لە سێدارە دەدران. ئێرانییەکان رۆژانە دەردەکران و رێگەیان پێنەدەدرا کە سەردانی نەجەف و کەربەلا بکەن. بەمەش دامەزراوەی ئایینی شیعەی عێراقیی لە داهاتێکی دارایی زۆر پێویست بێبەش دەکرا. رژێمی بەعس هاوشانی ئەم رێوشوێنە داپلۆسێنەرانە، سیستەمێکی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی(social welfare) چڕوپڕی داهێنا. بیمەی تەندروستیی هاتە ئاراوە و کارەباش بۆ گوندە دوورە دەستەکان دابینکرا.[197]
شیعەکانی عێراق بەشێوەیەکی کاریگەر پارچەپارچە و بێهێزکران لەلایەن حکومەتێکی کارامە لە هونەری سوودوەرگرتن لە لاوازیی نەیارەکانی لەپێناو بەهێزکردنی پێگەی خۆیدا.
ئەو کردارەی کە پێودانگەکانی ژێردەستەکردنی شیعەی لە دەوڵەتی عێراقی بەعسیدا دارشت لە سەرەتای ساڵی 1977 دا دەستپێکرد. رژێم ئاهەنگە ئایینییە ساڵانەکانی یادکردنەوەی شەهیدکردنی حوسێنی قەدەغە کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، زیاد لە 30.000 شیعە بە ئاڵا و دروشمی دژە-بەعسەوە لەنێوان نەجەف و کەربەلادا کۆبوونەوە بۆ بەجێگەیاندنی حەج. ئەمەش هەستی سیاسیی دژ بە بەعسی دەرخست. رژێم دوای ئەوەی توشی یاخیبوونێکی لەم چەشنە بوو، هێزی سەربازیی لە دژی حاجییەکان بڵاوکردەوە. ئەو پشێویەی دوایی لە کەربەلا کەوتەوە و لەسێدارەدانی دوابەدوای خۆپیشاندەرە دیارەکان دوو براوتی خولقاند-- کە هەردووکیان کاریگەریی گەورەیان بەسەر شیعەدا هەبوو. یەکەم، خۆپیشاندانەکە و ئەوەی کە بە "راپەڕینی سەفەر" ناسراوە. هەردووکیان لەرێگەی کارامەیی رێکخراوەیی مەلاکانی نەجەفەوە پلانیان بۆ دانرابوو. کەڵکیان لێوەرگیرا بوو.
ئایەتوڵڵا سەدر و دەعوە لەپێشەوەی ئەو کەس و گرووپانە بوون کە رژێمی بەعس گومانی دەکرد بزوێنەرە سەرەکییەکانی شیعەگەرایی سیاسیی بن. لە 1977 بەدواوە، سەدر و دەعوە بوون بە ئامانجی

سەرەکیی رژێمی بەعس. دووەم، هەڵسوکەوتی توندی رژێم کەلێنی خستە نێو خودی سەرکردایەتی بەعسەوە، سەدام دوورخستنەوەی ئەوانەی مسۆگەرکرد لە بەرپرسیارێتی کە بە میانەڕەو ناودەبران. ئەمەش رێگەی خۆشکرد بۆ پەرەسەندنی سیاسەتی داهاتووی بەعس لە بەرامبەر شیعەدا بە شێوازێکی زۆر داپڵۆسێنەرانەتر. بەعسیزم وەک ئایدۆلۆژیای زاڵی عێراق خرایە پێش، دەزگا شیعییەکان بە چڕیی کران بە ئامانج لەلایەن رژێمەوە.

سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامیی عێراق لە نێویاندا سەدر. لەدوای ئەوەی رووبەڕووی زیاد بوونی توندوتیژیی دەوڵەت بووەوە و ورەی بەرز بوو بە سەرکەوتنی شۆڕشەکەی ئایەتوڵڵا خومەینی لە ئێراندا لە ساڵی 1979. بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژانەیان هەڵبژارد لەگەڵ رژێمدا. بەکردنی ئەمە ئایەتوڵڵا سەدر چارەنووسی خۆی دیاریکرد. سەدر لە حوزەیرانی( 1979 )ە وە تا ئازاری 1980 زیندانیکرا. لەو ماوەیەدا سەدری زیندانیکراو هانی شوێنکەوتووەکانی دەدا لە دژی رژێمی بەعس بووەستنەوە. کێشەکە پتر ئاڵۆز بوو بە سیاسەتی بەردەوامی داپڵۆسین و کوشتوبڕی رژێم، تا ناوەڕاستی 1979 -- 3000 کەس گیرا. بە بەرچاوی جەللادەکانیەوە. سەدر بەردەوام بوو لە کارکردن لەدژی حکومەتی سەدام و لە رێگەی کاسێتی تۆمارکراوەوە بانگەوازی کرد بۆ هەموو عێراقییەکان. بە شیعە و سوننە و کورد و تورکمانەوە. تا یەکبگرن و دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەرێگەی خەباتی چەکدارییەوە دامەزرێنن.

لەو پەیامەیدا کە پاشان بە" دوا پەیامی" سەدر ناسرا. جەختکردنەوەی لەسەر توندوتیژیی و یەکگرتنی موسوڵمانان ئاشکرایە. کە دەڵێ :" پێویستە سەنگەری شەڕ بگرن، من ئەم بوونەم لە پێناوی شیعە و سوننە وەک یەک تەرخانکرد. لەوەدا کە بەرگرییم لەو پەیامە کرد کە یەکیخستوون و ئەو باوەڕەش کە هەردووکیانی لە لاشەیەکدا ئاوێزان کردووە."[198] گرووپە چەکدارە ئیسلامییەکان، لەوانە دەعوە، رووبەڕووی ئاپۆڕای ئەو خۆبەخشانە بووەوە کە ئامادەبوون گیانی خۆیان بەخت بکەن لەجیاتی ئەوەی لەژێر زەبری رژێمی بەعسدا بمێننەوە. رێکخراوەکانی تریش لەوانە-- *جونلئیمام*—( سە ربازانی ئیمام) و—

*مونەزەمــــەی عەمـــــەلی ئیسلامیی*—(ڕێکخراوی کاری ئیسلامیی) بۆ خەباتی چەکداریی سەریان هەڵدا.[199]
ڕێکخراوی عەمەل هەوڵێک بوو بۆ جەختکردنەوە لەسەر چالاکی سیاسیی لە ئاستی جەماوەرییدا. گرنگە ئەوە بزانین عەمەل، کە لەلایەن ئایەتوڵڵا محەمەد تەقی ئەلمودەریسییەوە سەرکردایەتیی دەکرا. ڕێکخراوێکی کەربەلاییە، کە جەخت دەکاتەوە لەسەر جەمسەرە جیۆگرافییە جیاواز و پارچەپارچەکانی شیعەگەرایی لەعێراقدا. لەهەمانکاتدا. مەڵبەندی دەعوە، نەجەف بوو. ئەم دەستە پاچەییە لەپەرەپێدانی هاوسۆزیی سیاسیی لەنێو سەرکردایەتی سیاسییدا. ڕێگەی گرت لە گەشەسەندنی بزووتنەوەی سیاسیی شیعەی عێراق.[200] فراوانبوونی گرووپە چەکدارە ئیسلامییەکان، پشتئەستوور بە کۆماری ئیسلامیی ئێران، هاوشان بوو لەگەڵ کرداری ئازایانە و توندوتیژانە دژ بە ڕژێمی سەدام. لەناوەڕاستی 1979 دا( موجاهیدەکان) لەناوەڕاستی خودی بە غدادا هێرشیان دەبرد. سەدام خۆی لە مانگی ئۆگۆستی ئەو ساڵەدا بوو بە ئامانج. دامەزراوەی ئایینیی کە لەلایەن( کۆمەڵەی زانایانی ئایینیی) لە نەجەف سەرکردایەتیی دەکرا. پشتیوانیی خۆی پیشاندا بۆ خەباتی چەکداریی، لە ئۆکتۆبەردا فەتوایەکی دەرکرد هانی شەڕیدا لەدژی بەعس. لەکۆتایی 1979 دا. حیزبی دەعوە لیوای چەکداریی خۆی دامەزراند کە ناوی( هێزی شەهید سەدر) بوو.
زیادبوونی خەباتی چەکداریی ئیسلامیی، دڕندەیی زیاتری سەدامی بەدواوە بوو. لە ئازاری 1980 دا 96 ئەندامی دەعوە لە سێدارەدران و ئەندامبوون لەو حیزبەدا کرا بە تاوانی گەورە. لە ئەپریلدا. زیاتر لە 30.000 شیعە بۆ ئێران دەرکران و لە 8 ی ئەپریلدا. ئایەتوڵڵا سەدرو خوشکەکەی( بنت ئەلهودا) لە سێدارەدران. مردنی سەدر کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو بەسەر بزووتنەوەی ئیسلامییدا لە عێراق. بزووتنەوەکە لەدوای ئەوەی سەرکردە ڕوحییەکەیان لەدەستداو. پردی نێوان شۆڕشگێڕەکان و دامەزراوەی ئایینی ڕووخا و لەیەکهەڵوەشا. ڕژێم بەردەوام بوو لەسەر داپڵۆسین و دەرکردنی شیعەکان بۆ ئێران، لە سێپتەمبەری 1980 شدا عێراق پەلاماری ئێرانی داو شەڕێکی خوێناوی 8 ساڵە دەستی پێکرد، کە تیایدا سەدام هەڕەشە شیعەی لەسەر هەموو خۆرهەلاتی ناوەڕست نابوود کرد. شیعەی سیاسیی دوای ئەوەی

رووبەڕووی ئەم ڕووداوانــە بووەوە بەدوای یەکێک لە دوو ڕێگاکە کـەوت. دوای ئەوەی زۆریان دەرکرابوون و سەرکردایەتییەکەیان پشتی بـە ئێـران دەبەست. ژمارەیەکی زۆر بەرە و ئێران ڕۆیشـتن تـا لـەوێ یەکبگرنـەوە و لەسەر خەباتی دژ بە رژێم بەردەوام بن.[201] لەگەڵ ئەوەشدا، بڕیاریاندا لـە عێراقدا بمێننەوە. چاوەڕێی هەلێکیان دەکرد تـا بـەرەنگاریی دژ بـە رژێـم سەرهەلبداتەوە. ئەم جیاوازییە ئەمڕۆش دیارە. ئەوانـەی کـە ڕۆیشـتن بـۆ ئێران، لەڕوی سیاسییەوە پێگەیشتن بەلاَم لـە جـەماوەری شـیعە دابـڕان و نامۆبوون، بە زۆریی لەلایەن برا عێراقییەکانیانەوە وا دەبینرێن کـە وەکـو داردەستی حکومەتی ئێران هەڵدەسوڕێن.

## دامەزرانــدنی ئەنجوومــەنی بــالاَی شۆڕشــی ئیســلامیی لــە عێراق، (المجلس الاعلى للثورة الإسلامية في العراق)[1]

ئەنجوومـەنی بـالاَ لـە 17ی نۆڤەمبـەری 1982 دا دامـەزرا. لەبنەڕەتـەوە دروستکراوی ئێران بوو هـەرواش دەمێنێتـەوە. لـە عێراقیشـدا وا سـەیری دەکرێت. ئەم ڕێکخراوە وەکو بەرەنجامی هەوڵەکانی ئێران بۆ یەکخستنی بزووتنەوە ئیسلامیە عێراقییە پەرتەوازەکان دەرکەوت.[202] ئەنجوومەنی بالاَ پاشـماوەکانی دەعـوە و ئـەو مونەزەماتانـە لـەخۆ دەگرێـت کـە لـە عێـراق هەلاَتبوون، لەگەڵ چەنـد بێلایـەنێکی دیـار و ناسـراودا. لەگـەڵ ئەوەشـدا، پەیوەندیی سەرکردایەتی ئەنجوومـەن بەسـەرکردایەتی ئایـەتوڵڵا محەمـەد باقر ئەلحەکیم و قەوارە و پێکهاتەکانی تر کەوتە ئاڵۆزییەوە چونکە دەعوە حەزی بە دەستێوەردانی ئێران نەبوو لە کاروبارەکانیـدا. لەمـەوە، گرووپـە پێکهێنەرەکانی سەربەخۆیی خۆیـان پاراسـت و خۆیـان دەسـتیان بەسـەر سەرچاوەی دارایی و پیاوەکانی خۆیاندا ڕادەگەیشت.

---

[1]- لە مەی 2007 دا ناوەکەی گۆڕا بۆ ئەنجومەنی بالاَی ئیسلامیی لە عێراق(المجلس الأعلى الإسلامي في العراق). وەرگێر.

هـــەروەها دەشـــیانتوانی هـــەرکاتێک بیانـــەوێت لەئەنجوومەنەکـــە بکشێنەوە. سەرکردەی ئەنجوومەنی باڵا، ئایەتوڵڵا محەمـەد بـاقر حـەکیم بـوو تـا کوشـتنی لـە مـانگی ئۆگۆسـتی 2004 دا. دوای خـۆی بـرا بچوکەکـەی، ئایـەتوڵڵا عەبدولعـەزیز ئەلحـەکیم جێگـەی گرتـەوە. لەگـەڵ ئەوەشدا. هێشتا سەرکردایەتی ئەنجوومـەن پتـر پشـت بـەو کەسـایەتییانە دەبەستێت کە پەروەردەی دەستی محەمـەد بـاقر سـەدر بـوون لـە سـاڵانی پەنجاکانی سـەدەی رابـردوودا. گـەورەترین هۆکـار لەپشـت دامەزرانـدنی ئەنجوومـەنی بـاڵاوە شـەڕی ئێـران-عێـراق بـوو. مەبەسـت ئـەوە بـوو هـەروەختێک ئێـران ناوچـەکانی باشـوور بگرێـت بەتایبـەتیی بەسـرە، سەرکردایەتی ئەنجوومەنی باڵا بتوانێت حکومەتێکی کاتیی پێکبهێنێت.[203]
تا ئەو کاتە هات، ئەنجوومەن سەرگەرمی ڕێکخستنی ئۆپۆزسـیۆن بـوو لـە دژی رژێمی بەعس . سەدام بەزەبروزەنگێکی بێوێنەوە وەڵامی دایـەوە. لـە ئایاری 1983 دا 90 کەس لە ئەندامانی بنەماڵەی حەکیم دەسـتگیرکران، شەش ئەندامی دیاریان بەبەرچاوی کەس و کاریانـەوە کـوژران. ئەوانـەی مانەوە لەدواییدا تەنها پێنجیان ئازاد کران.[204]
لەگـەڵ ئەوەشـدا. بەرەنگاربوونـەوەی ئیسـلامیی هـەر بـەردەوام بـوو. ئەنجوومەنی باڵا وەکـو چـەترێک دەیتـوانی بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە پشـیتوانیی ژمارەیـەکی بـەرفراوانی گرووپـە ئیسـلامییەکانی عێراقیـی لـە پشـتە و هـەروەها دەشـتوانێ بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە یەکخـەری ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامیی عێراقی فرە ڕەنگـە. لەگـەڵ ئەوەشـدا. ئەنجوومـەن خۆیشی وەکو حیزبێکـی سـەربەخۆ ڕەفتـاری دەکـرد. هـەروەها هـەروەک چۆن دوایی لەنەوەدەکاندا کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقیـی( ING) گەشـەی سـەند، ئەنجوومـەنیش لەیەککاتـدا چـەترێکی کۆکـەرەوە و قەوارەیـەکی یەکگرتووش بوو. ئەنجوومەن تا 1983 هێزی سەربازی خۆی دامەزراند، کە لە ئەوپەڕی باکووری کوردستانی عێراقدا لـە حـاجی ئۆمـەران لـەژێر سایەی سوپای ئێراندا. جێگیر ببوو. هێزەکە کە ناوی فەیلەقی بـەدر بـوو، ئەگـەر مەترسیشـی بـۆ سـەر حکومـەتی عێـراق نـەبووبێت گێچـەڵی بـۆ دروستدەکرد.
لەگـەڵ ئەوەشـدا. ئـەو ڕاسـتییە هـەر وەک خـۆی مایـەوە، "حیزبەکـە" ئەنجوومەنی باڵا. نـەک چەترەکـە {بەرەکـە} لـەژێر کـۆنترۆڵی حکومـەتی

ئێرانییدا بوو. فەیلەقی بەدر لەلایەن سوپای پاسدارانەوە سەرپەرشتی دەکرا. فەرمانەکانی حەکیم دوای ئەوەی بەچەندین فلتەری ئێرانیی دیاریکراودا ڕەتدەبوون ئینجا فەیلەقی بەدر وەریدەگرتن. بێشک، لە نەوەدەکاندا و لەدوای سەرهەڵدانەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی حەکیم تەنانەت نەیدەتوانی سەردانی فەیلەقی بەدری"خۆی"شی بکات بەر لەوەی پێشتر مۆڵەتی تاران وەربگرێت.[205] لێرەوە، ئەنجوومەن ئایدێنتیتییەکی سێ-لایەنەی وەرگرت. بەر لە هەر شتێک چەترێک بوو. لەبەر ئەوە، تەنها هێندە بەهێز بوو کە قەوارە پێکهێنەرەکانی دەیانخواست ببێت. دووەم، قەوارەیەکی سەربازیی بوو، لە شێوەی فەیلەقی بەدردا. لەکۆتاییدا، ئەنجوومەنی باڵا ئامێری سیاسیی بوو بۆ خواستەکانی بازنەی نزیکی ئایەتوڵڵا حەکیم.

سەرەڕای ئەوەش کە ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامیی لەدژی سەدام لە دوای لەسێدارەدانی ئایەتوڵڵا سەدر زۆر لێکهەڵوەشا بوو، بەڵام ئەو نائارامییەی کە بەهۆی شەڕی ئێران-عێراقەوە خولقابوو، ڕێگەی خۆشکرد بۆ بەردەوامیی بەرەنگاریی سەربازیی دژ بە ڕژێمی بەعس. شانەکانی دەعوە بەردەوام بوون لەسەر هێرشەکانیان لە دژی ڕژێم و سەدام خۆی لە ئەپریلی 1987 دا بوو بە ئامانج. گەڕەکی شیعەنشینی ئەلسەورە لە بەغداد لە هێزە حکومییەکان حەرامکرابوو، چونکە لەو شوێنەدا، کە بوو بەمەڵبەندی دەعوە چالاکییە نهێنییەکانیان گەلێک کاریگەر بوون. فەیلەقی بەدری ئەنجوومەنی باڵا گەشەی سەند و لە 1988 جارێکی تر لەچەند بەشێکدا ڕێکخرابووەوە: پیادە، تۆپخانە، تانک و پارتیزانیی.[206] لەبەرامبەر توندبوونی بەرەنگاریی ئیسلامییدا هێشتا ڕژێم بەردەوام بوو لە داپڵۆسینی دڕندایەتیی خۆی، سەرچاوە عێراقییەکان وا پیشانیدەدەن کە لە نێوان 5000 تا 10.000 ئیسلامیی تا ناوەڕاستی هەشتاکان کوژران.[207]

## ڕاپەڕینی 1991ی باشوور

ئۆپۆزسیۆنی شیعە لە دژی سەدام وەکو هی کوردەکان لەگەڵ داگیرکردنی ناوادەی کوەیت لە 1990 دا بوژایەوە. هەرچەندە، بزووتنەوەی شیعە بێهێزکرابوو . پردی نێوان حەوزە( کە هێشتا لە نەجەف و کەربەلادا بوو بە پێشەوایەتی ئایەتوڵڵا ئەلخوئی) و جڤاک بەر لەسێدارەدانی ئایەتوڵڵا سەدر شکا. بەبێ کەسایەتییەکی کاریزمایی کە بتوانێت ئامادەیی شۆڕشگێرانەی جەماوەری شیعە بقۆزێتەوە و جڵەوی بکات لەگەڵ ڕاکێشانی حەوزە بەرە و بواری سیاسیی. بۆ سەدام تاڕادەیەک ئاسان بوو کە بزووتنەوەی ئیسلامی شیعە لە عێراقدا کۆنترۆڵ بکات.

ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییەی کە لە ساڵی 1991 دا لە باشوور بەرپا بوو لە دژی سەدام، ڕووداوێکی خۆکرد بوو بەبێ هاندانی حیزبە سیاسییەکان. بەپێچەوانەی ڕاپەڕینەکەی دوایی کوردان، پارتە ئیسلامییە سەرەکییەکان نەیانتوانی تێکەڵ بەو یاخیبوونە ببن کە سەریهەڵدا. لەکۆتاییدا یاخیبووە شیعەکان کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی دەزگا شیعیيە کۆنەکانی دامەزراوەی ئاینییەوە. کە لە ئایەتوڵڵای عوزما ئەلخوئیدا خۆی دەنواند. کۆمەڵگەی مەدەنیی پارچەپارچە بووی شیعە بۆ هەمووان ئاشکرا بوو لەگەڵ شکستهێنانی ڕاپەڕینەکەدا. ئەو بەسیاسییکردنە زۆرەی حیزبە چەکدارە شیعەکان کە بەرەنجامی شەڕی ئێران-عێراق بوو بۆچوونێکی هەڵەی لەلا دروستکردبوون لەسەر بەهێزی بانگەشەی شۆڕشگێرانەی خۆیان. ڕێکخراوەکانی وەکو ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق و( تاڕادەیەکی کەمتر دەعوە). لەبەرچاوی زۆربەی عێراقییەکان بە دەستتێکەڵکردن لەگەڵ ئێراندا ناشیرین ببوون.

لەدوای هەشت ساڵی درێژ و دڕندانەی شەڕ کە تیایدا زۆربەی زۆری عەرەبە عێراقییەکان بەبێ گوێدانە ئایدێنتیتیی تائیفی پێکەوە بەرەنگاری هێرشی ئێرانی بوونەوە. حەماسەتێکی کەم لەنێو خەڵکی سادەی شیعە هەبوو بۆ ڕاپەڕینێک لەدژی ڕژێمی سەدام کە ئێران سەرپەرشتیی بکات. گرووپە سیاسییە شیعەکانی نەیاری سەدام هەڵەیەکی کوێرانەیان کردبوو بە هاوکارییکردنی تاران. بەڵام چارەیەکی تریان نەبوو—لەمەوە شەرعییەتی خۆیان لە ناوخۆدا لەدەستدابوو. ئەمە بەتایبەتیی ئەو حاڵەتە بوو کە ئەنجوومەنی باڵا و ئایەتوڵڵا محەمەد باقر حەکیمی دەگرتەوە کە

وتارەکانی دژ بە رژێم لە تارانەوە لەکاتی شەڕی ئێران-عیراقدا هیچی نەکرد جگە لە بەهێزکردنی چەپۆکی سەدام بەسەر کۆمەڵگای شیعەوە. بەچواندنی ئەنجوومەنی باڵا وەکو بووکە شوشەی دەستی ئێران. بانگەشەی سەدام لەسەر کۆنترین خووی مرۆڤایەتی دامەزرا بوو—حەزی پاراستنی خاک و ناوچە. بانگەوازەکەی پشتی دەبەست بە پەیامێکی سادە بەڵام بەهێز: پێویستە سنوورەکانی عێراق لەدژی دوژمنکاری ئێرانی بێگانە بپارێزرێن.

لەم سەرووبەندەدا، شیعەگەرایی ڕادیکاڵ دەکرا وەک تابووری پێنجەمی خائین و خەتەرناک وێنە بکرێت—کە هەڕەشە لە ئاسایشی خاکی عێراقی دایک دەکات. سەدام عەرەبەکانی عێراقی وەها وێنە دەکرد کە بەرگریی لە جیهانی عەرە بیی دەکەن لە دژی ئۆردووی ئێرانییەکان و باسی پاڵەوانەکانی ڕابردووی دەکرد، وەکو نەبوخوزنەسر کە فەلەستینی داگیرکرد و سەلاحەددینی ئەییوبی کە شەڕی خاچپەرستەکانی کرد.[208]

هەوڵەکانی ئەنجوومەنی باڵا بۆ سەرکردایەتییکردنی ڕاپەڕینی باشوور ڕاستەوخۆ لەخزمەتی رژێمدا بوو، وای لە سەدام کرد ڕاپەڕینەکە وەها وێنا بکات کە هەڕەشەیەکە بە فیتی ئێران لەدژی یەکپارچەیی خاکی دەوڵەتێکی عەرەبیی. ئەمە یارمەتیی ئەوەی دا کە مەڵبەندی سوننەنشین لە دەوری رژێم خۆی تۆکمە بکات و هێز و وزەی لە ڕاپەڕینەکە بڕی، لەمەش زۆر گرنگتر، بەفیعلیی زەمانەتی ئەوەی کرد کە ئەمێریکا نەیاتە هانای یاخیبووەکانەوە. ڕاپەڕینەکە بەزوویی بە ئەوپەڕی دڕندەیی سەرکوتکرا. ڕەنگە هەرگیز ژمارەی تەواوی ئەو شیعانەی کە کوژران نەزانرێت، بەڵام بەگوێرەی سەرهەڵدانەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکان لەدوای شەڕی 2003 ژمارەکە دەبێ لە دەیان هە زاردا بێت.

لە لوتکەی ڕاپەڕینەکانی 1991 دا، رژێم تەنها کۆنترۆڵی 3 پارێزگای دەکرد لەکۆی 18 پارێزگا. رژێمی سەدام ئەو کاتە لە هەرکاتێک نزیکتر بوو بۆ لەناوچوون، سەدامیش وانەکانی ئەوکاتەی لەبیر نەچوون. ڕێکخراوی حیزبی بەعس لە باشووردا زۆر بەخێرایی لێکهەڵوەشا. لێرەوە، بۆ دەستبەسەر ڕاگەیشتنی باشوور، سەدام مۆدێلی سیاسەتی بەریتانیی پەیڕەو کرد بە ڕاکێشان و بەهێزکردنی خێڵەکان. هاوکاتی ئەمە، سەدام

دەستیکرد بە لەناوبردنی ئەو چەکدارە شیعانەی کە مابوونەوە و لەدەرەوەی هۆڕەکانی باشووردا جموجۆڵیان دەکرد.

## لەناوبردنی عەرەبی هۆڕەکان

زۆنگاوەکانی باشوور سەروەختێک ڕووبەرێکیان دادەپۆشی کە نزیکەی 20.000 کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبوو لەدەوروبەری بەیەکگەیشتنی هەردوو ڕووباری دیجلە و فوڕات لە باشووری عێراقدا.[209] زۆنگاوەکان (مەعدانەکان) ی لەخۆ دەگرت. کە ژمارەیان بەسەدان هەزار دەبوو بۆچوونی شیعییان هەبوو. زۆنگاوەکان هەروەها دەوڵەمەندترین یەدەگی نەوتی وڵاتیان داپۆشیبوو لە کێڵگەکانی مەجنوون و قورنەی خۆرئاوادا کە بە بەڵگەوە بە هەردووکیان 40 تا 50 بیلیۆن بەرمیل نەوتیان تێدایە.[210] شێوەژیانی عادەتی مەعدانییە ڕەسەنەکان پەیوەست بوو بە هەلومەرجی شوێنی ژیانیانەوە. چەند پیشەیەکیان هەبوو لەنێویاندا. ماسیگریی. کشتوکاڵیی بەشی گوزەرانی خۆیان. قامیش کۆکردنەوە و چەند پیشەسازییەکی هاوتای ئەمانە.

ژمارەی زۆنگاوەکان لە هەشتاکاندا بۆ خۆی لە کەمبوونەوەدا بوو بەهۆی ڕاکێشانی ژینگەی شارنشینییەوە کە توێژی گەنج و خوێندەواری کۆمەڵگەی هان دەدا بۆ کۆچکردن. هەرچەندە. ناوچەکە هەر لەزووەوە لە سەرەتای ساڵانی 1950 وە ببوو بە ئامانجی گەشەپێدان لەلایەن حکومەتەوە لەڕێگەی" پرۆژەی ڕووباری سێیەم" ە وە کە مەبەست لێی ووشککردنی زۆنگاوەکان و بەکارهێنانی خاکەکە بوو بۆ کشتوکاڵ. پرۆژەکە بەهۆی شەڕی ئێران-عێراقەوە لە ساڵی 1980 دا ڕاگیرا. هەرچەندە. کاتێک هێزەکانی ئێران دەستیان گرت بەسەر دوورگەکانی مەجنووندا. سەدام فەرمانیدا بە دەستپێکردنەوەی وشککردنەوەی زۆنگاوەکان و دواتر هێرشی سەخت لەدژی ئێرانییەکان کە تیایدا چەکی کیمیایی بەکارهێنرا. کە لەکۆتاییدا لە ساڵی 1988 دا مەجنوونیان گرتەوە.

گرتنەوەی ناوچەکە و کۆتاییهاتنی شەڕ لەگەڵ ئێراندا. نەبوو بەمایەی گەڕانەوەی ئاشتیی و ئارامیی بۆ زۆنگاوەکان. لەجیاتی ئەوە. حکومەتی عێراقیی زۆنگاوەکانی وەک مەڵبەندی کاری تێکدەرانە ناساندبوو کە

بووەتە پەناگەی فەیلەقی بەدری ئەنجوومەنی بالا و میلیشیاکانی دەعوە. لەپاڵ ڕێگەدان بە هاتنەناوەوەی ئێرانییەکان بەناو ئەو سنوورانەی زۆنگاوەکاندا لە هۆڕەکانی حوێزەدا کە پاسەوانیکردنی زەحمەتە. سەدام هەروەک چۆن بەری بەو هەڕەشەیەی ئێرانییەکان گرت کە لە هەڵەبجەوە دەهات و دەرسێکی دایە کوردەکان کە بۆ چەندین نەوە لە ڕووی فیزیکیی و سایکۆلۆژیەوە شوێنی بمێنێت. ئاوهاش دواتر هەمان تاکتیکی بۆ باشوور بەکارهێنا.

لە دوای شکستی ڕاپەڕینەکەی باشوور. هێزەکانی سەدام گەڕانەوە بۆ زۆنگاوە وێرانەکان. مەعدانییە ڕەسەنەکان بەتاوانی دەستێکەڵکردن، باجی تاکتیکە پێشووەکانی داگیرکردنە سەربازییەکەیان دا. بەدوای ئەوەشدا سەرتاپای ژینگە زۆنگاوییەکەیان وشککرا. [211] هەموو چەکێک بەکار هات بۆ کۆنترۆڵکردنی زۆنگاوەکان. تۆپبارانکردن و هێرشی ئاسمانیی و ناپاڵم و تەقە لێکردن بەمەبەستی کوشتن ئەمانە هەموو کوشتاری کوردەکانی وەبیر دەهێنایەوە لەهەڵمەتی ئەنفالەکاندا. هەروەها بەهەمان حەماسەت و زەبری سادییانەوە ئەنجام دەدران. بە هەزاران لە مەعدانییەکان ڕایانکرد بۆ ئێران. لەوانەی مانەوە گەلێکیان لەنێوبران یان بێسەروشوێن کران. هاشوهووشی ستراتیژیی ئابووریی چاککردنی زۆنگاوەکان بۆ پەرەپێدانی کشتوکاڵ بەدرۆ دەرچوو. ناوچە وشککراوەکان کەمترین بەڵگەی سەرکەوتوویی زەوی چاککردن بوون. ڕاپۆرتی تایبەتیی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بەتوندی ئاماژەی بەوەدا کە ئەمە" بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری کاولکردنێکی بەرفراوان و مەینەتی مرۆییە"[212]

## بوژانەوەی ئایدێنتیتیی هاوبەشی شیعە

مەسەلەی شیعەکانی عێراق لە ماوەی سالآنی 1990 دا نەدەهاتە بەر سکرین و ڕاباری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە. جار بەجار نیگەرانیی پیشاندەدرا لەسەر چارەنووسی عەرەبی هۆڕەکان. بەڵام ئەمە زیاتر جەختی دەکردەوە لەسەر لایەنی ژینگەیی مەسەلەکە تا تراژیدیایەکی گەورەی مرۆیی کە لە ئارادا بوو. ئەم لاموبالاتییە بە مەسەلەکە، بەڵگە بوو بۆ توانای سەدام لە کۆکردنەوەی دەسەڵاتەکەی لەدوای ڕاپەڕینەکان و یان

شکستپێهێنانی نەیارەکانی یان ڕاکێشانیان بۆ لای خۆی. ئەو ڕاکێشانە مەرج نەبوو بەزەبری هێز بێت. سەدام باری لاری خۆی بەلێزانیی و کارامەیی ڕاستکردەوەو توانی کە گلەیی ئابوورییە داتەپیوەکەی عێراق و هەژاریی باشوور بخاتە ئەستۆی ئەمێریکا و هاوپەیمانەکانی.

چیدی شەڕە بەیناو بەینەکانی سەدام خەتابار نەبوون لە بێبەشکردنی خەڵکی عێراق. لەجیاتی ئەوە، ئەوە سزاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و سیاسەتەکانی ئەمێریکا بوون کە بەرپرسیار بوون لە نەهامەتییەکانی خەڵکی عێراق و مەینەتییەکانی. لەهەمان کاتدا، حکومەت دەستیکرد بە لەنێوبردنی ئەو دەزگا مەدەنییانەی کە لە هەڵمەتەکانی پێشوودا دەرباز ببوون. لەنێویاندا ئەو ڕێکخراو و لایەنانەی پەیوەندییان نەبوو بە دامەزراوەی ئایینیەوە، کە بۆی هەبوو بەکار بهێنرێن بۆ پەرەپێدانی ئایدێنتیتییەکی شیعەی دوژمنکارانەتر لەنێو جەماوەردا. سیاسەتەکە بەدژی خۆی کەوتەوە، چونکە پیاوە ئاینییە دیارەکان لەجێگەی خۆیانەوە تۆڕی پشتیوانیی دینیی و دەزگا خێرخوازییەکانی خۆیان بەرفراوانکرد.[213]

پەرەسەندنی جەماوەری وابەستەیی ئایینی و بەهێزبوونی ئایدێنتیتیی دەستەجەمعیی لەم ماوەیەدا زۆر بەرچاو بوو. تەنانەت لە لایەن ڕژێمیشەوە هاندەدرا. سەدام وەک شیعەکانی وڵات خۆی دەنواند. سەردانی مەزاری شیعەکانی دەکرد. ڕەچەڵەکی خێزانیی خۆشی دەستکاریی کرد تا کەسایەتییە مێژووییەکانی شیعەش بگرێتەوە تادەگاتە خودی ئیمام حوسێن. مەسەلەکە ڕوون بوو ــ سەدام یاری بەکارتی شیعە دەکرد و هەوڵی دەدا کە ئەو چانسە زۆرەی لەوەدا هەیە لەخزمەتی خۆیدا بەکاری بێنێت.

هێزە ئەمنییەکان بەشاراوەیی( هەندێک جاریش هێندە شاراوە نا) بەردەوام بوون لە کردنە ئامانجی گرووپە سیاسییەکان. لەژێر ئەم داپڵۆسینەشدا، دەعوە ناچارکرا کە ژێربەژێر کار بکات. بەڵام حەوزە وادیار بوو قەناعەتی هەبوو بە بەردەوامییدان و پەیڕەوکردنی باوەڕی بە جیاکردنەوەی نێوان ئایین و سیاسەت.[214] هەرچەندە ئەم جۆرە تاکتیکانە بۆ ماوەیەکی کورتخایەن سەرکەوتوو بوون، بەڵام سەدام هێشتا

زۆر باش دەیزانی کە هەر هاوپە یمانێتیەکی نێوان حەوزە و جەماوەر لەدواییدا دەبێت بە کارەسات بۆ رژێمەکەی، هەروەها هێشتا تەواو هەستیار بوو لەبەرامبەر هەر کەسایەتییەکی ئایینیدا کە بتوانێت سیاسەت و ئایین بە یەکبگەیەنێت.

ئەم هەستیارییەی زۆر ئاشکرا بوو لە ساڵی 1999 دا. پیاوی ئایینیی سەرەکیی شیعە لەکۆتایی ساڵانی 1990 دا ئایەتوڵڵا محەمەد سادق ئەلسەدر بوو. کە ئەندامێکی تری خانەوادەی سەدر و ئامۆزای محەمەد باقر سەدر بوو. ئایەتوڵڵا سادق سەدر مەلایەک بوو لەلایەن حکومەتەوە دەستنیشان کرابوو. لەسەرەتادا وادەردەکەوت کە بە ئارەزووی رژێم هەڵبسورێت. کەچیی، لەگەڵ پەرەسەندنی جەماوەری شیعەگەرایی، سادق سەدر چووە ئەو پێگە مەترسییدارەی کە حەوزە و جەماوەر بەیەکبگەیەنێت و دەستیکرد بە قسەکردن لەدژی حیزبی بەعس.[215] بۆ یەکەمجار لە ساڵی 1980 وە شیعەکان سەرکردەیەکیان هەبوو کە جەماوەرێکی هەبوو دوای دەکەوتن و توانای ئەوەی هەبوو کە سیاسەت بخاتە حەوزەوە و ئایین بخاتە ناو جەماوەرەوە. سەدام کە هەستی بە هەڕەشەکە کرد بەتوندیی بەرپەرچی دایەوە؛ ئایەتوڵڵا سادق سەدر لەگەڵ هەردوو کوڕە گەورەکەی لە ساڵی 1990 لەنەجەف کوژرا و دوای خۆی کوڕە بچوکەکەی موقتەدای، بەجێهێشت وەک جێنشینی میراتی سیاسیی سەدری دووەم.

لە ساڵی 1999 وە پێشەوای سەرەکیی شیعە لە عێراقدا ئایەتوڵڵای عوزما عەلی سیستانی بووە لە نەجەف. کە بە رەگەز ئێرانییە بەڵام باکگراوندی ئایینیی نەجەفە. ئایەتوڵڵا سیستانی بۆ ریشەی ئایینیی خۆی گەڕایەوە و بانگەشەی جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەتی کرد. لەگەڵ ئەوەشدا. ئایەتوڵڵا سادق سەدر سەرکەوتوو بوو لە بوژاندنەوە و بەسیاسییکردنی ئایدێنتیتیی تائیفی شیعە. لە 20001 دا ژمارەی ئەوانەی سەردانی مە زاری حوسێنیان کرد لە کەربەلا گە یشتە 2.4 میلیۆن( نزیکەی لە سەدا 10 ی دانیشتوانی عێراق و لە سەدا 20 ی دانیشتوانی شیعە)[216] ئەوە تەنها مەسەلەی کات دەبێت بەر لەوەی کە کۆمیونیتی نوێی خوێنگەرمی شیعە بازووی جەماوەریی خۆی دەردەخات و هەست بەو نایەکسانییە دەکات کە تیایدایە لە دەوڵەتی عێراقدا.

## شیعەکان لە سەردەمی دوای سەدام

لە سەرووبەندی ئەو کردە سەربازییانەی کە سەدامیان لەسەر دەسەڵات لابرد لە 2003 دا، کارمەندەکانی ڕاگەیاندنی کۆشکی سپیی ژێردەستەیی شیعەیان لەلایەن سەدام وەکو کەرەسەیەکی پڕوپاگەندەی بەهێز بۆ ناشیرینکردنی سەدام، بەکاردەهێنا . ئەو قەناعەتە ساویلکانەی کە بەدوای ئەمەدا دەهات ئەوە بوو شیعەکان هەر لەدوای ئەوەی لەدەستی رژێمێکی شەڕانگێز دەربازیان دەبێت، بۆخۆیان یەکسەر خۆیان دەخەنە ناو حکومەتێکی سێکیولاریی کە نوێنەرایەتی هەموو گرووپە ئێسنیکیی و ئاینییەکان دەکات.[217] کەچیی، لەدوای لابردنی سەدام، وادەردەکەوێت کە بەهێزیی دامەزراوەی ئاینیی شیعە لەقۆناغە بەراییەکانی پلانی شەڕدا زۆر بەکەم گیراوە.[218] ئەم ئاراستەیە بەئاشکرا لەلای جێگری وەزیری بەرگرییە( Paul Wolfowitz) وە دەرکەوت وەختێک لە سەرەتای ئازاری 2003 دا عێراقییەکانی بە " سێکولار" و" زۆرینەی شیعە" وەسفکرد.

ئەو هەروەها ئەوەشی بە کێشە نەزانی کە پیرۆزترین مەزارگەکانی شیعەگەرایی لە خاکی عێراقدان.[219] وۆڵفویتز ڕووقایمانە هێزی ڕێکخراوە ئاینییەکانی بەهەند وەرنەگرت . دیار بوو بێئاگا بوو لەگرنگیی شارە مەزارگەکانی کەربەلا و نەجەف.( Juan Cole) پرۆفیسۆری پسپۆڕ لەمەڕ شیعە، بە گاڵتەوە گوتویەتی" فانتەسیی نیوکۆنسەرڤەتیف لەمەڕ عێراق ئێستا بەسەر عێراقی ڕاستەقینەدا دەکەوێت لەسەر ئەرزی واقیع، لە شارە مەزارگەکان و هەروەها لەشارە بچوکەکانیشدا، بەزۆری لە شارۆچکە شیعەنشینەکانی باشووری وڵات"[220]

ڕەنگە چاوەڕوان دەکرا، کە ئەندامێکی دیکەی خانەوادەی سەدر سەرەڕۆیی بەیەکگەیاندنی ئایین و سیاسەت بکات. لەو کاتەوە کە ئایەتوڵڵا محەمەد سادق سەدر کوژرا لە ساڵی 1999 دا کوڕەکەی موقتەدا سەدر خۆی شاردەوە. لەماوەی سێ ساڵی دواییدا موقتەدا بەردەوام بوو لەسەر هەوڵی ژێربەژێری بۆ ڕێکخستنی هێزی چەکداری شیعە و سەرکەوتووش بوو لە زیادکردنی شوێنکەوتوانی لە ناوچەی( مەدینە سەدری) بەغدادا. بزووتنەوەکەی موقتەدا( *جماعة الصدر الثاني*) دەستیانکرد بە شەرعیەتدان بە دەسەڵاتی گەنجانەی ئەو( سەدر ئێستا نزیکەی 30 ساڵ

تەمەنییەتی){ئەمە لە کاتی چاپکردنی دەقە ئینگلیزیەکەدا لە ساڵی 2004 دا وەرگێر} بە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە تەنها فەرمایشتەکانی باوکی کۆچکردووی سەدر شەرعیین و ئەو مەلایانەی کە بەڕەگەز ئێرانین( ڕەنگە بە جێگرەوەکەی باوکی موقتەداشەوە. ئایەتوڵلای عوزما عەلی سیستانی). هیچ دەسەلاتێکی شەرعییان نییە بەسەر شیعەی عێراقەوە.[221] موقتەدا ناوی شاری سەدام( مدینة صدام) ی گۆڕی بۆ شاری سەدر( مدینة صدر) و ئەم گەڕەکە هەژارەی کرد بە مەڵبەندی دەسەلاتی خۆی.
پاشان موقتەدا دەستیکرد بە لەناوبردنی نەیارەکانی. لەوانە، عەبدولمەجید ئەلخوئی—کە ڕەنگە تاکە کەسایەتی شیعە بووبێت کە پشتیوانی دەوڵەتە ڕۆژاواییەکانی هەبوو. ئەو پەیوەندیی باشی هەبوو لەگەڵ تۆنی بلێردا و دیار بوو کە بۆی دانرا بوو ڕۆڵێکی سەرەکیی بگێڕێت لە ئاوەدانکردنەوەی عێراقدا.[222] ئەو کە کوڕی ئایەتوڵلای عوزما ئەبولقاسم ئەلخوئیی بوو، لەلایەن هێزە ئەمێریکییەکانەوە لە 3 ی ئەپریلی 2003 دا هێنرایە ناو عیراق. بەهیوای ئەوەی شارەکانی باشوور بخاتە ژێر جۆرێک لە کۆنترۆڵی لایانگرانەی ئەمێریکاوە. خوئیی لەگەڕانیدا بۆ یەکخستنی گرووپە شیعەکانی نەجەف بەلایەنی کەمەوە 30 چەقۆی لێدرا و" لاشەکەی بەناو شاردا ڕاکێشرا و خوێنی ڕژایە سەر شەقامەکان"[223]
بەگشتیی وا دەزانرێت کە موقتەدا دەستی هەبووە لە کوشتنی خوئییدا. خۆ ئەگەر شوێنکەوتووەکانی ئەویش نەیانکردبێت. ئەو دواتر کوشتنەکەی بەکارهێنا بۆ زیادکردنی ئەو فشارەی کە خستبوویە سەر سیستانیی، کە موقتەدا وای دەبینێت کە دەستی هەبووە لە تاوانەکانی سەدام دا بە وەرنەگرتنی هەڵوێستێکی سیاسیی لە دژیدا. موقتەدا هەروەها هەڕەشەی لە ئایەتوڵلا سەید حەکیمیش کرد. برازای ئایەتوڵلا محەمەد باقر حەکیم سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق.
ئایا موقتەدا تائێت بەهێزتر دەبێت یان ئایا ئەو حیزبانەی کە زیاتر ڕەگیان داکوتاوە وەکو ئەنجوومەنی باڵا و دەعوە دەبن بە میراتگرەوەی ئەو کەواوسەڵتەیەی کە بۆ یەکەمجار سەرکردایەتی محەمەد باقر سەدر، 25 ساڵ پێشتر پۆشیی. وا دەردەکەوێت ئەگەری ئەوە نییە کە ئەو ئایدێنتیتییە تازە دەرکەوتوەی شیعەی عێراق کە بەئاگایە لە توانای

بازووی سیاسیی خۆی لە ژینگەی سیاسیی دوای سەدامدا، جارێکی تر بخرێتەوە پێگەی ژێردەستەیی رژێمێکی داهاتووی سوننەسالارەوە. ئەم هاوسەنگی هێزەی نێوان شیعەو سوننە وادەی ئەوەی پێیە کە چارەسەرکردنی پڕ تەنگ و چەڵمە بێت.

## شیعەکان: مەسەلە سەرەکییەکان

### میراتی هەڵاواردن

لەکاتێکدا هەندێک هەن کە پرسیار لەرادەی یان تەنانەت بوونی جیاوازی تائیفیی لە عێراقدا دەکەن. راستییەکە ئەوەیە کە عێراق سیستەمێکی ئەپارتایدی نارەسمیی پەیرەوکردووە هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە لە ساڵی 1920 دا. لە هەندێک بواردا. بۆ نموونە، لەبواری ئابووریی و بازرگانییدا، هیچ بەربەستێک لە ئارادا نەبووە لەبەردەم پێشکەوتنی شیعەدا. بەڵام لە رووی دەستگەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسییدا، شیعەکان نزیکەی بە تەواوی بێبەشکراون. هەر کاتێک رژێم گۆڕین روویدا بێت ئەنجامەکەی جێگرتنەوەی گرووپێکی سوننی بووە بە یەکێکی تر. بە هەمان شێوە، پلەدارە بەرزەکانی هێزی سەربازیی و هێزە ئەمنییە جیاجیاکان هەمیشە زۆرینەیان سوننە بوونە. ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە عێراق بە دوژمنایەتی تائیفی وێران بووە، بەڵام مەبەست لەجەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە دەیان( بە لکوو سەدان) ساڵ لە هەڵاواردن یارمەتییدەر بووە لە دروستکردنی ئایدێنتیتییەکی تایبەتیی بۆ شیعە وەکو خەڵکێکی چەوساوە.

هەروەک " راگەیاندنی 2002 ی شیعەی عێراق دەڵێ" گۆشەگیرکردنی بەردەوامی شیعە لەهەر بەشداربوونێکی گرنگ لە دەسەڵاتدا لە سەردەمی نوێدا، بووەتە هۆکاری گۆڕینی شیعەی عێراق بەرەو قەوارەیەکی کۆمەڵایەتیی هەستپێکراو." لەمەش زیاتر" دەقگرتنی شیعە وەکو گرووپێکی تایبەتیی پتر قەرزاری سیاسەتەکانی هەڵاواردن و سزادانە تا هەر هۆیەکی تائیفیی یان ئایینیی دیاریکراو"[224] ئەم جۆرە دەربڕینانە ئەوە دەگەیەنن کە هەڵاواردنە تائیفییەکە کەمتر لە رێگەی هەڵاواردن لە تەفسیری ئایینییدا پێناس دەکرێت و زیاتر لە رێگەی پەیوەندییەکی

چەوســاوە/چەوســێنەرەوە پێناس دەكرێت. ئەوە جیاوازییەكی سیاسییە كە ڕەنگی جیاوازیی تائیفیی گرتووە.
لادانی ڕژێمی سەدام بە دڵنیاییەوە ئەم دابەشكردنە ترادیسیۆنەی دەسەڵات دەگۆڕێــت. هــەروەک دەردەكــەوێت، زۆر زەحمەتــە كــە شــیعە جــارێكیتر ڕۆڵێكی ژێردەستانە بپــەژرێنێت لــە حكومــەتی عێراقــی داهــاتوودا. بــەڵام بەربەستەكان لەوە بەرزترن كــە دیــارن. لەگــەڵ كــۆنترۆڵكردنی هۆیــەكانی دەســەڵات و كــۆنترۆڵكردنی كانگــا نەوتییــە زۆرەكــانی عێــراق و هــەلی پێناسەكردنی" ئایدێنتیتی" ی دەوڵەتی عێراقیی یەكدەگرێتەوە. تا ئەمڕۆكــە ئایدێنتیتیی عێراق وەک ئەوەی ئێستا هەیە لەلایــەن عەرەبــە سـوننەكانەوە دیاریكراوە. لەمەوە، عێراق بەتونــدی پانعــەرەبیی و ســیكیۆلار بــووە. بــە دڵنیایەوە ئەمە دەگۆڕێت ئەگەر شیعە بەسەر سیاســەتی عێراقــدا زاڵ بــبن. ئەم گۆڕانە مەزنە لە نەخشەی دەسەڵاتدا كێشمەكێش دەخــوڵقێنێ لــە ســەر مەسەلەی ئەوەی كە كێ دەتوانێ سروشتی دەوڵەتی عێراقیی پێناس بكــات، نەک لەسەر مەسەلەی جیاوازییە ئایینیە بەمیرات ماوەكان.

## چ شتێک شیعەكان یەكدەخات

پێدەچێ تاكە تێگەیشتنێک كە تیایدا شیعەكان قەوارەیەكی تــەبا پێكبهێــنن لــەڕێی ئــەزموونی هاوبەشــیانەوە بێــت وەک قوربانییــانی هــەلاواردنێكی سیستەماتیزەكراو. لەوە بترازێت، چەند هێزێكی كەم، شــیعەیان لــە دەوری دۆزێكی هاوبەشدا كۆكردووەتەوە. لە مێژوودا، ئەو ڕێكخراوە سیاسییانەی كــە جەختیانكردووەتــەوە لەســەر دابەشــكردنی ســامان— وەكــو حیزبــی شــیوعیی عێراقیــی— بــە هــەمان شــێوازی حیزبــی بــەعس لــە هــەنگاوی" سۆشیالیســتیی" دا لــە ســاڵانی 1970 دا ڕوویــان لــە جــەماوەری شــیعە كــردووە. شــیعەكان لــە ئاســت هەڕەشــە دەرەكییەكانــدا وەک هەڕەشــەی بەریتانییــەكان لــە ســاڵانی 1920 و ئێرانییــەكان لــە ســاڵانی 1980 دا هەمیشە پشتی یــەكتریان گرتــووە. بێگومــان، بەشــە عەرەبەكــەی دەوڵــەتی عێراقیی لە ڕووی مێژوویەوە ئەو كاتەی كە ڕووبەڕووی دوژمنكاریی هێــزە دەرەكییــەكان بووەتــەوە لــە هــەر كاتێــک زیــاتر یــەككگرتوو بــووە. ئەمــە

نیشـانەیەکی بـاش نابێـت بـۆ داگیرکارییـەکی سـەربازی ئـەمێریکیی درێژخایەن.
هەرچەندە، پێدەچێت کە بـەربڵاوترین هێـزی ڕێکخـەر ئایینـە. یـەکێک لـە میراتە شومەکانی دەسەڵاتی سەدام ئەوەبوو ڕێک ئەو شـتەی خولقانـد کـە خۆی دەیویست لەناوی بەرێت—ئەویش ئایینی سیاسـییە. لـە هەمانکاتـدا سەدام سەرکەوت لە بەرگرتن لەپەیدابوونی هەر فۆرمێکی تر لە ستراکتۆری کۆمەڵایەتیی. لەناوبردنی رژێمەکەی بۆشاییەکی دەسەڵاتی جـدیی خولقانـد لە عێراقدا. ئێستاش بەهەر هێزێک پڕ دەکرێتەوە کە دەسەڵاتی دابینکردنی فەرمانداریيەکی ڕووکەشیی و خزمەتگوزارییـەکی کۆمەڵایـەتیی سـەرەتایی هەبێت بۆ خەڵکێکی بێچـارە. بـە شـێوەیەکی گشـتیی، وادەردەکـەوێت کـە ئایینی ڕێکخراو خەریکە ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە. لێرەوە حاشاهەڵنەگرە کە ئـایین ڕۆڵێکـی سیاسـیی سـەرەکیی دەبینێـت لـە دەوڵـەتی داهـاتووی عێراقدا چونکە یەکێکە لەو ستراکتۆرە کۆمەڵایەتییە زۆر کەمانەی ماوەتەوە و توانای کۆکردنەوەی جەماوەری شیعە مەزهەبیی هەیە.

## ئەکتەرە سەرەکییەکان

ئەگـەری ئـەوە هەیـە کـە ململانێیـەکی بـەردەوام هـەبێت لـەنێو سـەرکردە مەزهەبییەکان لە عێراقدا لەسەر مەسەلەی نفوز بەسەر دانیشتوانی شـیعەدا. شەڕی سەرەکیی لەنێوان مەلا عێراقییە ڕەسەنەکان و ئەوانەدا دەبێت کە بە دەسـتتێکەڵی لەگـەڵ ئێرانییەکانـدا ناویـان زڕاوە. لـەنێو ئەوانـەی دواییدا ( عەبدولعەزیز ئەلحەکیم) ە سـەرۆکی ئەنجوومـەنی بـاڵای شۆڕشـی ئیسلامیی لە عێراقدا. لە کاتێکدا ئەنجوومەنی باڵا پشتیوانیی دارایی ئێران و هێزی سەربازیی خۆی هەیە، ڕەنگە پشتیوانیی جەماوەریی لە عێراقدا بۆ ئەنجوومـەن سـنووردار بێـت. لێـرەوە، ڕۆڵـی ئەنجوومـەن ڕەنگـە کورتبکرێتـەوە بـۆ ڕۆڵـی" تێکـدەر- spoiler". ئەگـەری زۆر هەیـە کـە ئەنجوومـەن پشـتیوانی خـۆی لـە دەوری بـانگێکی ناسـاز بـۆ ئـەنتی ئەمێریکایی کۆبکاتەوە. بەمجۆرە ببێت بە بەربەستکەری ڕقی شیعە لـەدژی داگیرکاریی بەردەوامی ئەمێریکا. موقتەدا سەدر هێشتا ئـەو کەسـایەتییەیە کە لەهەموان زیاتر دەتوانێت جـەماوەری شـیعە کۆبکاتـەوە. بـەڵام بـۆ چ مەبەسـتێک هێشـتا نازانرێـت. جگـە لـە دامـەزراوەی ئـایینیی، سـەرۆک

عەشیرەتەکانیش بێگومان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە عێراقی دوای سەدامدا. بەهێزکردنی ستراکتۆرە خێڵەکییەکان لەلایەن سەدامەوە دەیان ساڵ ئاوابوونی نفوزی سەرۆک خێڵەکانی دواخست. ئەستەمە جارێکیتر ئاوا بە ئاسانیی بەبێ شەڕ واز لەو دەسەڵاتە بهێنن. هێزێکی بە زەبری یەککگرتوو لە ئارادا نییە کە سەرپەرشتی یاسا و ڕێسا بکات، ئەم فەنکشنە لەلایەن ئەوانەوە بەڕێوەدەبرێت کە توانای دابینکردنی ئاسایشیان هەیە لە ئاستی لۆکاڵییدا—واتە عەشیرەتەکان. ئەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوان کۆتایی شەڕو دامەزراندنی حکومەتێکی نوێ، چەندە درێژ بێت هێندە زیاتر دەسەڵاتی خێڵەکیی خۆیان دادەکوتن.

## بەرەنجام

بەشێوەیەکی گشتیی، شیعەکانی عێراق یەکەم عێراقیین و دووەم شیعەن. ئێسنیکەکەیان وەک عەرەب ڕەنگە سیمای ناسینەوەیان بێت، ئەمە لەگەڵ پەژراندن و وابەستەییان بە دەوڵەتی عێراقەوە. ئەگەر بڵێین " شیعەی باشوور" بەشێوەیەکی بنەڕەتیی جیاوازن لە" سوننەی ناوەڕاست" ئەوە بۆخۆی فەرامۆشکردنی ئەو پەیوەندییە مرۆییەیە کە لەنێوان ئەو دوو هەرێمەدا هەیە. پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان بەتایبەتیی لەژێر دەسەڵاتی سەدامدا تا ئەو ڕادەیە گەشەیان پێدراوە تەنانەت بۆ هەندێک عەرەبیش زەحمەتە کە خۆیان بە شیعە یان سوننی بناسێنن. ئەو سیاسەتەی سەدام کە تائیفە ئیسلامییەکان لەناو سەرژمێرییدا جیانەکرێنەوە زیاتر بەشدارییکردووە لەم ناڕۆشنییەدا.
لەگەڵ ئەوەشدا، بوژانەوەی ئایدێنتیتیی تائیفیی شیعە و ئەگەری پەیوەندی لەنێوان حەوزە و جەماوەردا پێمان دەڵێن کە داهاتووی نەخشەی سیاسیی عێراق دەبێ بگۆڕێت. لەکاتێکدا کارێکی ئەستەمە کە شیعە و سوننە وەک دوو قەوارەی جیاواز بناسێنرێن، مەسەلەیەکە بە بەردەوامیی بە کۆڵ نەخشەداڕێژەرەکانی عێراقی نوێوەیە، بەتایبەتیی لە ڕووی دەستورییەوە. حکومەتی عێراقیی و گرنگترین دەزگاکانی بەڕێوەبردن ئێستاش سەرتاپا خاڵین لە شیعە. هۆیەکانی دەسەڵات هەمیشە لەلایەن ئەو سوننانەوە کۆنترۆڵکراون کە بە گونجاو زانراون لەلایەن هەر ڕژێمێکەوە کە لە دەسەڵاتدا بووە. بێگومان، جارجار شیعە خۆی تێخزاندووە، بەڵام ئەوە

بەسە ئاوڕێک لە حکومەتـە عێراقییە یەک لـەدوای یەکـەکان بدەینـەوە تـا بۆمـان دەرکـەوێت کـە شـیعەکان گرووپێـک بـوون کـە بەتـەواوی لـە نوێنەرایـەتییکردن بێبەشـکراون. ئیـدی گرنـگ نییـە چـۆن بەشداریکردنەکەیان هەڵدەسەنگێنین. بەڵام ئەمە دەستی بەگۆڕین کردووە.

# بەندی شەش

## سوننەکان

وێنەکردنی کۆمەڵگەی عێراقیی وەک ئەوەی بەتەواویی بۆ سێ گرووپ دابەشبووە کە لەناوخۆیاندا تەباو لەگەڵ یەکتریدا دوژمنن، بێگومان سادەکردنەوەی واقیعێکی ئاڵۆزە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە هێشتا چەند راستییەکی روونی تێدایە. ئەمەش بەهۆی زاڵبوونی عەرەبە سوننەکان بەسەر دەوڵەتی عێراقدایە. هەروەکو تۆمارە مێژووییەکان پیشانی دەدەن، هەر لەسەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی عێراقییەوە سیستەمی دەسەڵات لەعێراقدا لەلایەن گرووپی دەستەبژێری جیاجیای سوننییەوە دەستی بەسەرداگیراوە. سەدام حوسێن کە خۆیشی سوننی بوو ئەم سیستەمەی دانەهێنابوو بەڵکوو بەردەوامی پێدا. ئەم نموونەیە لەگەڵ دەسەڵاتدارییەتیی بەعسییەکان لەساڵی 1968 وە، کە ئەوانیش هەر سوننی بوون، دووبارە بووەوە. لەبەر ئەوە، سادەکردنەوەی واقیع نییە کاتێ بڵێین ئەم نموونەیە یەکێکە لەراستییە بەهێزەکانی سیاسەتی عێراقیی. لای کەم تا رووخانی سەدام و رەنگە دواتریش.[225]

لەگەڵ ئەوەشدا، بێگومان ئەمە بیرۆکەیەکی سادەلەوحانەیە کە کۆمەڵگەی عێراقیی لەسێ قەوارەی لێک جیا پێکهاتووە: باکووری کوردیی، ناوەراستی عەرەبیی سوننیی و باشووری عەرەبیی شیعە. ئەوە بەسە بنەمای لێکنزیکی کوردە سوننیەکان، عەرەبە سوننیەکان، عەرەبە شیعەکان و کوردە شیعەکان لەبەرچاوبگرین بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێ لەروانگەی ئاڵۆزییەوە کۆمەڵگەی عێراقی کۆمەڵگەیەکی فرەرەنگە. بەڵام، لەکاتێکدا ئەم فرەرەنگیە لەبەرچاودەگرین، یەکێک لەو پرسیارە بنەرەتییانەی لەهەر سیستەمێکی سیاسیی دەکرێت یەک پرسیاری سادەیە : کێ حوکم

دەکـــــات؟ بێگومـــــان بـەردەوامترین سیماکانی سیاسـەتی عێراقـی مۆدێرن حوکمی عەرەبی سوننەیە. لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کەباڵادەستیی سوننە بەڕوونیی چینی کۆمەڵایەتیی بەزانـدووە. لەسـەردەمی پاشـایەتییدا. حوکمـــداریی لەلایـەن چینـی بـاڵاو ناوەڕاسـتی سـوننەوە دەسـتی بەسـەرداگیرابوو. لەسـەردەمی کۆمارییـدا. لەلایـەن چینـی ناوەراسـتی خـــوارتری سـوننە. لەسـەردەمی ڕژێمـی بەعسیشـدا. لەلایــەن سوننەکانەوە( بەگشتی تکریتییەکان) کە نزمترین چینی کۆمەڵگـە بـوون . گۆڕانێکی روون لەڕووی چینایەتییەوە دیارە لەڕەوتەکەدا بەڵام باڵادەسـتیی سوننە وەک خۆی بەنەگۆڕیی ماوەتـەوە. تاکـە ڕژێمێـک نـەبووە لەهـەموو مێژووی پڕ مەینەتی عێراقدا. هەر پاشخانێکی چینایەتیی هەبووبێت، هیچی کردبێت جگە لەبەردەوامییدان بەباڵادەستیی سوننە.

## یەکسانیی لەمەینەتییدا

ئایا سوننەکان توێژێکی خواپێداون کە لەئەزەلـەوە مـافی ئـەوەیان هـەبێت دەوڵەتی عێراقیی بەدەوڵەتی خۆیان بزانن؟ بەدڵنیاییەوە واپێدەچێت مێژوو پشتیوانیی لـەو بانگەشـەیە بکـات کـە " عـەرەبی سـوننە " و" حکومـەتی عێراقیی" بەلای کەمەوە بەتوندیی بەیەکـەوە گرێـدراون ئەگـەر بەتـەواویی هاوواتـاش نـەبن. لەگـەڵ ئەوەشـدا. هەڵەیـە گـەر عـەرەبی سـوننە وەکـو قەوارەیەکی هەماهەنگ کۆبکەینـەوە. بەقـەد هەریـەک لەگرووپـەکانی تـری عێراق ئەوانیش بەقووڵی بەشبەش بوون. دابەشبوونەکانی نێـو خۆیشـیان زیاتر ئاکاری توندوتیژیی پێوەیە تا هاوکاریی.
لەمەش زیاتر. باڵادەسـتیی بەسـەر دەوڵەتـدا زیـاتر بـەرەنجامی کێبڕکێـی نێوان سوننەکان بـووە تـا نێـوان سـوننە و شـیعە. تـا ڕووخـانی سـەدام مسۆگەرکردنی زاڵبوون بەسەر کوردو شیعەوە کـارێکی لاوەکـی خوێنـاوی بووە لەچاو ئەو گەمە سەرەکییەی کە لەنێوان سـوننەکان خۆیانـدا لـەئارادا بوو. لە کاتێکدا. نکۆڵیی ئـەوە ناکرێـت کوردەکـان و شـیعەکان زۆریـان چەشـتووە لـەژێر سـایەی ڕژێمـی سـەدامدا. بـەڵام ئـەوەش هەیـە سـوننە عەرەبەکانیش ڕەنگە هێندە و بۆی هەیە گەلێک وێرانکەرانـە و قووڵتریـان چەشتبێت ئەگەر لەڕووانگەی درێژخایەنەوە تێیبڕوانین.

بــۆ پشــتیوانی لــەم ڕایــە پێویســتە ســەیری سروشــتی ئــەو هەڕەشــەیە بکەین کە لەلایەن کوردەکان و شیعەی سیاسییەوە خراوەتــە پــاڵ ســەدام، یان هەر ڕژێمێکی تر بۆ ئەم مەبەستە. هەڕەشەکەی ئەوان( کورد و شـیعە) هەمیشە ئامانجی گۆڕینی واقیعی حاڵی هــەموو عێــراق بــووە- چ لەڕێگــەی جوداخوازی کوردییەوە لەباکوور یان فشار دروستکردن بۆ مسۆگەرکردنی نوێنەرایەتی شیعە لەدامودەزگاکانی حکومەتــدا- بــەڵام بەدەگمــەن جــەختی کردۆتە سەر حوکمکردنی شەخسی سەدام خۆی. بێگومان، ئەگەر شیعەکان بەتایبەتیی سەرکەوتوو بوونایە بەرەنجامەکەی لەناوچوونی خێــراو ڕەنگــە گەلێک خوێناوی سەدام دەبوو؛ بەڵام شتێکی" شەخسیی" نەدەبوو.
هەروەها کارێکی تاڕادەیەک ئاسان بوو بۆ سەدام کە ڕێگــە بەســەرکەوتنی هــیچ کــام لــەجوداخوازیی کــوردیی و شــیعەی سیاســیی نــەدات، ئــەمــەش لەڕێگــــەی سیاســــەتەکانی جڵــــەوکردن و تۆقاندنــــەوە کــــەزۆر بــــاش تاقیکرابوونــەوە و باریهێنــابوون، هــەروەها لەڕێگــەی پەنابردنــە بــەر" جــەماوەری ســوننە" هــەروەک بــۆ پشــتیوانییکردنی ڕژێــم لەبەرامبــەر ئیسلامگەرایی ڕادیکــاڵ کــردی(چــۆن لەســاڵی 1991 دا ڕویــدا). لەمــەش زیاتر، نەبوونی پەیوەندی جیــۆگرافی لــەنێوان کوردەکــان و شــیعەکانداو، نــــەبوونی ئایدۆلۆژیایــــەکی کۆکــــەرەوە یــــان ئامــــانجێکی سیاســــیی لەنێوانیانــدا( جگــە لــە دوژمنایەتییــەکی ئاشــکرا بــۆ ســەدام کــە ئــەویش بەردەوام نەبوو چونکە کوردەکان ناوبەناو لەهاوپــەیمانێتیی لەگەڵیــدابوون و دەهاتنــە دەرەوە ). ئەمانــە هــەموو ئــەوەیان مســۆگەر کــرد کــەهێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی کــوردو شیعە هــەرگیز بەشێوەیەکی هاوکارانــە لــەدژی سەدام کارنەکەن.[226]

وەکــو زۆربــەی دیکتاتۆرەکــان، بــەلای ســەدامەوە زیــاترین هەڕەشــەی باوەڕپێکراو و ڕاستەقینە بۆسەر بەردەوامیی دەسەڵات و ژیانی لــەناوخۆدا بوو، هەم لەنێو پلەدارەکانی ناو پشتیوانەکانی خۆی و هەم لــەنێو ئەوانــەدا کە لەڕێی دەزگاکانی حکومەت، ئاسایش و دەزگا مەدەنییەکانی دەوروپشتی خۆی دەسەلاتیان پێدرا بــوو. ســەدام شــوێنە گرنگــەکــانی بەخــەڵکانێک پڕکردەوە لەو توێژانەی دانیشتوان کە پشــتیوانی خــۆی بــوون. ئەندامــە باڵاکــانی حیزبــی بــەعس، پێکهاتــەی ریــزی ئەفســەران، دەزگــا ئەمنییــە تایبەتییەکان( لەنێویانــدا ڕێکخــراوی ئــەمنی تایبــە ت و گــاردی کۆمــاریی

تایبەت، و بازنەی بازرگانە گـوێ لەمسـتەکان). و ئـەو کەسـانەی کـە بەدەوری دەزگا حکومیی و ئیدارییەکانـەوە بـوون لـەناو عیراقـدا، ئەوانـە زۆرینەیان سوننە بوون.
هێنانەپێشـەوەی تکریتیـەکان لەلایـەن سـەدامەوە و پشتبەسـتنی بەخێڵـە سەرەکییەکان(بەتایبـەتیی- دوریـی، جبـووریی، عوبەیـدیی). مەبەسـت لێـی دڵنیابوون بوو لەپرچەککردنی رژێم بەسەربازی پیادەی سوننی دڵسۆز.[227]
لەگەڵ ئەوەشدا، کێشە هەبوو، گـەورەترین هەڕەشـە بـۆ سـەر بـەردەوامیی حوکمی سەدام هەمیشە لـەو کەسـانەوە دەهـات کـە هـەر خـۆی دەسـەلاتی پێدابوون بۆ بەهێزکردن و ملکەچیی رژێـم بـۆ خـودی خـۆی. کەسـی تـر وەک عەرەبە سوننەکان چانسی ئەوەی نەبوو کەدەستی بگـات بەکـەمترین هۆکـار کەپێویسـت بـوو بـۆ شۆڕشـکردن(ڕێکخسـتن و چـەک). و نـەک بەدەزگاکانی حکومەت. هەر لەبـەر ئـەم هۆیـە لـەژێر دەسـەلاتی سـەدامدا، چەوسـاندنەوەی سـوننە عەرەبـەکـانی ناوەڕاسـت ڕەنگـە هێنـدەی چەوساندنەوەی کوردو شیعەکان مەزن و بەربڵاو نەبووبێـت( ڕەنگـە لـە زۆر لایەنـەوە گـەلێک تونـدتر بووبێـت). هـەر کاتێـک پاکسـازیی سـەربازیی ئەنجامـدرابێت، زۆرتـرین ژمـارەی کـوژراوان لـەنێو ئەفسـەرە عەرەبـە سـوننەکاندا بـووە. پاکسـازییە سیاسـییەکانیش ڕەوتێکـی هاوشـێوەیان وەرگرتـووە، و هـەرکاتێک عەشـیرەتێکی دیـاریکراو لەلایـەن سـەدامەوە کرابێتـە ئامـانج، نزیکـەی زۆربـەی عەشـیرەتە سـوننییەکانی بەغـدادو دەوروبەری بوون. سوننە عەرەبەکان بەوەی کە لەهـەر تـوێژێکی تـر پتـر لەرژێم نزیک بوون زیاد لەهەر گروپێکی تـری عێـراق بوونەتـە قوربـانیی دەستی تونـدوتیژیی سـەدام. لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئـەو ڕاسـتییە وەک خـۆی دەمێنێتـەوە کـە لـەڕووی مێژوویـیـەوە خۆیـان بـەحوکمکردنی عێـراق گرێدەدەنەوە.
پرسیارە سەرەکییەکان بەبێ وەلام دەمێننەوە. ئەگـەر پلانـەکانی ئـەمێریکا بۆ عێراقێکی دیموکراتیی لەسـەردەمی دوای سـەدامدا جێبـەجێبکرێن، ئایـا عەرەبـە سـوننەکان کـە لەدەوڵەتێکـدا ژیـاون کـە چینێکـی دەسـەڵاتداری دەسـتەبژێری سـوننە تیایـدا زاڵبـووە هـەر لەسـەرەتای دروسـتکردنی عێراقـدا( هـەروەها لەهـەمان بـارودۆخ بەهرەمەنـد بـوون لەسـەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا)، ئایا ئەوان ئامادەن کـە حکومـەتێکی عێراقـی

دیموکراتیی قبوڵ بکەن کە شیعە تیایدا باڵادەست بێت؟ ئەوە بەسە کە سەیرێکی ئەوە بکەین کە سەدام چۆن توانی سەرکەوتووانە عەرەبە سوننەکانی' ناوەراست' کۆبکاتەوە لەساڵی 1991 وەختێک کە ڕوبەڕووی ئەگەری راپەڕینێکی شیعەکان بووەوە.
ئەوە ترسی زاڵبوونی شیعە بوو لەحکومەتدا ( هەروەها ئەو ئاکارە فەندەمێنتالیستییانە بوو پێیەوە لکابوو) کە سوننەکانی لەپشت سەدامدا کۆکردەوە و رژێمیان پاراست و زۆر درندانەش لەو پرۆسەیەدا شیعە و کوردیان داپلۆسی. ئایا سوننە عەلمانییەکان ئامادەن کە رژێمێک قبووڵ بکەن کە بەرژێمێکی ئایینی مەشرەب و شیعە مەزهەب سەیری دەکەن؟ ترسی ئەوەی ئایەتوڵاکانی شیعە لەراپەڕینەکانی 1991 دا کۆنترۆڵ بگرنە دەست بەس بوو بۆ گەڕاندنەوەی پشتیوانی عەرەبە سوننەکان بۆ سەدامێکی تەواو بێهێزکراو. چونکە ئەو تاکەکەس بوو توانای پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەوانی هەبێت. ئەمەش رێگەی بە سەدام دا جارێکی تر باڵادەستی سوننە و تکریتیی بەسەر دەوڵەتدا بپارێزێت.
ڕوداوەکانی 1991 بەروونیی مەترسییەکانی تێگەیشتن لەگرنگی دابەشبوونی تائیفیان دەرخست. هەر کاتێک بیر لەداهاتووی سەقامگیریی عێراق بکرێتەوە. هەرچەندە راپەڕینەکەی باشوور. لەواقیعدا. راپەڕینێکی جەماوەریی بوو لەلایەن عێراقییەکانەوە. کە سوننە. شیعە. بەشێک لەسوپا و بەعسییە بێزارەکانی لەخۆی گرتبوو. سەدام توانی کە سوود لەوێنەکردنی راپەڕینەکە وەکو راپەڕینێکی شیعەسالارانە وەربگرێت بۆ کۆکردنەوەی پاڵپشتیی سوننەکان. ئەم وێناندن و تێگەیشتنانە بەهێزێکی گەلێک بەتوانا دەمێننەوە لەگۆڕنکارییەکانی داهاتووی دەوڵەتی عێراقییدا.
بۆ دەستنیشانکردنی پێگەی عەرەبی سوننە لەعێراقدا. شتێکی بنەڕەتییە کە بەر لەهەر شتێک ئەوە روون بکەینەوە ئەگەر شتێک هەبێت ئەوە چییە کە عەرەبێکی سوننە لەناو عێراقدا دەناسێنێت.

## چیی وادەکات ببێتە سوننیی؟

گرێدانەوەی سوننەکان بەئۆرگانە مەرکەزییەکانی دەسەلات لە عێراقدا شتێکی بەردەوام بووە یەکسەر لەسەردەمی دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر محەمەد و قەیرانی جێگرتنەوەی. بەدەربڕینێکی دیکە. سوننەکان بۆ ماوەی

1500 ساڵی ڕابردوو یان بەڕێوەبەر یان حاکم بوون بەسەر هەرێمی عێراقەوە. مەڵبەندی حوکمی خەلافەتی عەباسییەکان لەبەغداد بوو. هەموو بیرۆکرات و بەڕێوەبەر و حوکمدارەکانی ئەو دەسەڵاتە بەکردەوە لەمەڵبەندی سوننە لەناوەراستیی عێراقەوە هەڵبژێردراون و پەروەردە کراون. گرێدانەوەی سوننە بەحوکمداریی و شیعە بەبێبەشکردن دواتر بوو بەسیمایەکی رەگداکوتراو لەسایکۆلۆژیای خەڵکییدا. لەمەش زیاتر، ئەو جیاوازیە بنچینەییەی کە لەئیسلامی سوننیدا هەیە لەنێوان کاروباری تائیفیی و دەسەلاتی ئاییندا مانای ئەوەی داوە کە سوننە عێراقییەکان سەرکۆنەی خۆیان نەکردووە لەسەر دەستگرتن بەسەر هۆکارەکانی دەسەڵاتدا لەدەولەتدا. لەهەمان کاتدا، شیعەکان، بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدا بوون کەچۆن گرێکوێرەی ملکەچکردنی دەسەڵاتە ئایینیە ناسیاسییەکان چارەبکەن لەکاتێکدا هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی بواری سیاسیی دنیایی دەدەن.

هەرچەندە سوننەکان لەعێراقدا کەمینەن، بەڵام لەجیهانی عەرەب و( ئیسلامدا) زۆرینەن. ئەمە بۆتە هۆی پەرەسەندنی پەیوەندی ناسیۆنالیستانەی عەرەبیی بەهێز لەنێوان بەغداد و پایتەختە عەرەبییەکانی ناوچەکە و شەرعییەتێکی حاشاهەڵنەگری داوەتە هێجەمۆنیی سوننە لەعێراقدا لەچاوی دراوسێکانی ناوچەکەدا. گرێدانەوەی سوننە عێراقییەکان بە ناسیۆنالیزمی عەرەبیی و، سیاسەتی عەلمانیی و، بالادەستی دەزگاکانی حکومەت دوا شێوە و بەهێزترین شێوەی خۆی لەرژێمی سەدام حوسێندا بەیانکرد: کارێکتەری حیزبی بەعس و رژێمی سەدام زیاتر بەرهەم و جێگرەوەی سروشتی دەسەلاتەکانی پێشوو بووە.

## دەستنیشانکردنی ئایدێنتیتیی سوننەکان لەعیراقی پاشایەتییدا

دەتوانین دەرکەوتنی سوننە عەرەبەکان لەنێو عێراقی نوێدا بۆ سەرەتای پێکهێنانی عێراق لە 1920 بگێڕینەوە. لەسەرەتاوە سوننەکان لەکەمینەکان بوون. بەغداد دەکەوێتە ناوجەرگەی مەڵبەندی سوننە عەرەبەکان. ویلایەتی موسڵ لەباکوورەوە. دانیشتوانەکەی بە پلەی یەکەم کورد، تورکمان و

ئاشووری بوون لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی عەرەب. بەم شێوەیە، پەیوەندییە بنەڕەتییەکانی ویلایەتی موسڵ بەرەو باکوور و رۆژهەلات بۆ تورکیا و سوریا درێژ دەبنەوە. ویلایەتی بەسرە لەباشوورەوە لەبنچینەدا بەبیروباوەڕ شیعە بوون و هەر لەکۆنەوە بەهێزترین پەیوەندییەکانیان لە رۆژهەلاتەوە لەگەڵ ئێران بووە و هەروەها لەگەڵ بازرگانە نیشتەجێکانی کەنداوی فارس بووە.[228]

لەناو عێراقدا بەگشتیی. لەسەدا 56 ی دانیشتوان شیعە بوون، لەسەدا 36 سوننە و لەسەدا 8 ناموسوڵمان( بەزۆری فەلە) بوون. زیاد لەوە، نزیکەی چارەگێکی دانیشتوانی عێراق کورد بوون. لەبەر ئەوە، یەکێتیی نیشتمانیی لەسەرەتاوە تاڕادەیەک نەبووە. کوردەکان داوای ئۆتۆنۆمیان کرد، شیعەکان حوکمی ڕاستەوخۆی بەریتانییەکانیان پێباشتر بوو تا بەر لەزاڵبوونی سوننەکان بگرن( کە بەترسەوە ئەو شێوازەیان بیردەکەوتەوە کە سوننەکان لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بۆ پاراستنی دەسەلاتیان گرتیانە بەر). هەروەها سوننەکانیش زۆر بەتوندی دژایەتی دروستکردنی دەوڵەتێکیان دەکرد کە تیایدا ئەوان دەبوون بە کەمینە.[229]

لێرەوە، پادشا فەیسەڵی یەکەم، لەپێگەیەکەوە دەستی بەحوکم کرد کە لەرووی ژمارەوە بێهێز بوو. لەڕووکاردا نوێنەرایەتی' نەتەوەی' عێراقی دەکرد، بەلام لەواقیعدا خالی کۆکردنەوەی کەمینەی سوننە بوو. ئەو نموونە حوکمکردنەی کە لەژێر سایەی مەلیک فەیسەڵدا دامەزرا بوو بەنەخشە بۆ هەموو رژێمەکانی دواتر. عەرەبە سوننەکانی پشتیوانانی فەیسەڵ. پیاوماقوڵەکان، کرانە دەسەلاتدار و کاربەدەست بۆ بەهێزکردنی شەرعییەتی رژێم.[230] پیاوماقوڵەکان هەر بەدڵسۆزی فەیسەڵ مانەوە چونکە هەردووکیان لەبیرۆکەی گەورەی پانعەرەبیزمدا هاوبەش بوون. ئەمەش خۆی بیرۆکەیەکی سوننە گەرایانەیە، هەروەها چونکە -شە ریفەکان- هیچ بنکەیەکی دەسەلاتیان نەبوو لە عێراقدا. لەمەش زیاتر، پیاوماقوڵەکان نزیکەی هەموویان لەدەوروبەری بەغداد کۆببونەوە، ئەمەش بەزۆری لەبەر ئەوەی کە بەغداد جێگەی یەکێک لەقوتابخانە سەربازییە کەمەکانی عێراق بوو.[231] بەحوکمی ئەوەی کە لەرووی عەسکەرییەوە تەیار، خوێندەوار و دەستە بژێر بوون، سەرچاوەی دەسەلاتیان بوو بە دەزگای دەوڵەت خۆی. هەروەک مالیک موفتی ئاماژەی پێدەکات" پیاوماقوڵەکان کە

نەبەسترابوونەوە بەدەستە بژێرەکـــانی ناوچــــە شارنشـــین و گوندنشینەکانیشـــەوە. لەمـــەوە پشـــتیوانێکیان نـــەبوو بـــۆ پاراســـتنی بەرژەوەندییـــەکانیان. بۆیـــان دەرکـــەوت تاکـــە ئومێـــدیان بـــۆ پێشـــکەوتنی کۆمەلایەتیی لەبەرفراوانکردنی دەسەلاتی ناوەندیی فەیسەڵدا بوو.[232] لەگـەڵ ئەوەشـدا. هەرچەنـدە شـەریفەکان لەهـەموو قـوژبنێکی رژێمەکـەی فەیسـەڵدا بەدیـدەکران. پاشـای نـوێ هەوڵیـدا بـۆ سیاسـەتێکی جـدیی و زیندوو بۆ بنیاتنانی نەتەوە (nation-building ) لە عێراقدا. ئەو بۆی دەرکـەوت هـەر دەوڵـەتێک کـە خـەڵکێکی جیـاوازی سـێ ویلایەتـە عوسمانییەکانی موسڵ. بەغداد و بەسرە لەخۆی بگرێت پێویستە نوینـەری هەموو پێکهاتـەکانی لەحکومەتـدا هـەبێت. یەکـەم کـارو گرنگتـرین کـاری مەسەلەی ئاشتکردنەوەی شیعە بوو لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا. ئەو کە بـەوەی دەزانی" باج لەسەر شیعەیە. مردن لەسەر شیعەیە و دەسەلات بۆ سوننەیە" فەیسەڵ سیاسەتێکی گرتەبەر لە هەوڵدان بۆ گرێدانەوەی شیعە بەدەوڵـەتی عیراقەوە.[233] لەگەڵ ئەوەشدا. پەیوەستی ئەو بە بیرۆکەی پانعەرەبیزمـەوە. هەروەها پشتبەستنی بەپشتیوانی توندی پیاوماقولانەکان. مانـای ئـەوەبوو دەوڵەتی عێراقیی سیمای ترادیسـیۆنی سـوننیی خـۆی پاراسـت. هـەروەها تێخزاندنی عەرەبە ناسیۆنالیستە سوننیەکان لەهەموو ئاستە ئیدارییەکانـدا نیشـانەی هـەنگاوێکی ترسـناک بـوو لەبەسـوننییکردن و بەعـەرەبکردنی دەزگاکانی دەوڵەت و کولتووری سیاسیی لە عێراقدا.[234]

## دەستنیشـانکردنی ئایـدێنتیتیی سـوننەکان لـەعێراقی کۆمارییدا

لەدوای روخاندنی پاشایەتی لەسـاڵی 1958 دا گـۆڕانێکی کـەم ڕوویـدا. هەرچەنـدە ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم لەسەر ئەوە سـوور بـوو کـە بەشـە" عێراقییـەکەی" خۆی وا وێنە بکات- کە پێوەندیی بە هەردوو خوێنی کـورد و عەرەبەوە هەیـە- بـەلام ( بزوتنـەوەی ئەفسـەرە ئازادەکـان). بەئاشـکرا پانعەرەبیست بوون و لەڕووی ئایدۆلۆژییـەوە هاوشێوەی پیاوماقوڵـەکانی رژێمی پێشوو بوون. ئەوانیش بەهەمان قوتابخانـەی سـەربازییدا تێپـەڕی بـوون و لەهـەمان ناوچـە و هـەمان چینـی ناوەراسـتەوە سـەرچاوەیان

گرتبوو.[235] ئەگەر پێکهاتەی بزوتنەوەکە لەبەر چاوبگرین. زۆرینەی زۆری بەرپرسەکانی کۆمیتەی ناوەندیی عەرەبی سوننە بوون. لەگەڵ تەنها یەک شیعە و هیچ کوردێکیشی تێدا نەبوو.[236]
حیزبی شیوعیی عێراقیی. ئەو ڕێکخراوەی کە هێندەی سوننە، شیعەش تیایدا باڵادەست بوو. پشتیوانییەکی بەهێزیشی لیدەکرا لەلایەن کوردەکانەوە. هەڕەشەی راستەقینە بوو بۆ سەر پێگەی دەستەبژێری سوننیی لەعێراقدا. ئەوەی کە بەردەوام ئەم پارتە تووشی لابرن دەبووەوە زیاتر بەهۆی هەڵویستی دژ بە پانعەرەبیزم بوو تا هەر شتێکی تر. سروشتی بەردەوامی دابەشبوونە ستوونییەکەی عێراق دەرکەوت کە ئەستەمە بۆ ڕێکخراوی چینایەتی بتوانی بەسەریدا زاڵ بێت. بەپلەی یەکەم بەهۆی ڕیگریکردنی دەسەلاتدارانی سوننییەوە.
لەکۆتایی سالانی 1950 دا کۆمەڵگەی عێراقی لەباروزروفێکی ئابووریی و کۆمەلایەتیی گەشەسەندوودا بوو ئەمەش بەکاریگەریی زیادبوونی داهاتەکانی نەوت. ئەو بزاوتە کۆمەڵایەتییەی کە لەم هورووژمی داهاتەوە سەریهەڵدا. گۆڕانێکی هاوشێوەی لەپێکهاتەی چینە سیاسییە چالاکەکاندا بەخۆوە دیت. پێشتر. عێراق لەلایەن ئینتێلەجێنسیای intelligentsia چینی ناوەراستی شارنشینەوە دەستی بەسەرداگیرا بوو. بەتایبەتیی ئەوانەی کە لەبەغداد و موسڵەوە سەریانهەڵدا بوو. ئێستا. لەگەڵ بەرزبوونەوەی بزاوتی کۆمەڵایەتی(social mobility). گوندنشینەکان بەرەو ئەو ناوچە شارنشینانە کۆچیان کرد کە لەفراوانبووندا بوون.
ئەم هورووژمە ژمارەیەکی زۆر لەتکریتییەکانی تێدا بوو لەمەڵبەندی سوننەکانەوە لەبەغداد و موسڵ. کە پاشایەتی ڕووخێنرا. تکریتییەکان لەڕێگەی زیادبوونی پەیوەندییەکان و بانگەواز بۆ خزمەتی سەربازیی تەواو جێگەی خۆیان کردبووەوە لەناو پلەدارانی هێزە سەربازییەکاندا.[237]
لەواقیعدا. سوننە لادێیە خێڵەکییەکان ئەوکاتە هاتبوونە ناوشارەکان. ئەم هۆکارە گرنگ بوو بۆ مێژووی داهاتووی عێراق. کاتێک حیزبی بەعس بۆ دووەم جار هاتە سەر دەسەلات لەساڵی 1968 دا. پاکسازیی کرد لەنێو ئەفسەرە پلەدارەکاندا لەوانەی کە هەر هەڵوێستێکی چەپگەرایی( کۆمۆنیستی یان لایەنگریی سوریایان تێدابوو). ڕەنگە تاکە گرووپ کە دەستی لێنەدرا لادێیە سوننییەکان بوون. ئەم فاکتەرە هاوشان

لەگەڵ ڕەچەڵـەکی سـوننیی سـەرۆک ئەحمـەد حەسـەن بـەکر، ئاڕاسـتەی داهاتووی حیزبی بەعس، حکومەت و دەوڵەتی داڕشت.[238]
بەلای سەدامەوە، حیزبی بەعس تەنها ئامێرێک بـوو کـە بەهۆیـەوە ئـەو و تکریتییەکانی و هاوسۆزی بتـوانن دەسـەلاتی خۆیـان بەسـەر کۆمەڵگـەی عێراقدا بسـەپێنن. کەرەسـەیەکی کاریگـەر بـوو کـە بەهۆیـەوە دەسـەلاتی خۆیان کۆبکەنەوە. هەروەها وەک پڕوپاگەندەش ڕۆڵی هەبوو. کـە بـواری دا بەڕژێم تا چەند ڕەگەزێکی شیعە و کورد بخزێنێتـە نـاو ئاستە نـزم و مامناوەندیەکانی حیزبەوە، بەبێ ئەوەی هەرگیز بواریان پێبدرێت بێنە نـاو ئەو بازنە ناوەکیانەی ڕژێمەوە کە دەسـەلاتی جـدیی تیایـدا کۆبووەتـەوە. دەسەلاتی ڕاستەقینە بەزۆریی لەدەسـتی بنەماڵـەی یەکـەمی سـەدام خۆیـدا کۆبیووەوە( لە ئال بوناسرییەکان). و کەسانێکی تری گرووپە هاوکارەکان. حیزبـی بـەعس بیرۆکەیـەکی لەنوێنەرایـەتییکردنی سیاسـیی دەسـتەبەر کردبوو بەڵام نەیدەتوانی هەڕەشەی ڕاسـتەوخۆ دروسـت بکـات بـۆ سـەر سـەدام خـۆی. لەمـەدا سـەدام تـەواو لەمەترسـیی ئـەوە گەیشـتبوو کـە ڕێکخراوێکی وەکو حیزبـی شـیوعیی عێراقیـی (حشـع) لەسـەنتەرەوە زۆر نزیک بێـت، کـە لـەوێوە دەتـوانن هـەر ڕژێمێـک لـەناو ببـەن کـە هێشـتا دەسەلاتی خۆی تۆکمە نەکردبێت( هەروەک حیزبی شـیوعی کـردی لەگـەڵ قاسم).
سەدام، لەگەلاڵە کردنی دەسەلاتیدا بۆ بوون بەسـەرۆک لەسـاڵی 1979 دا و بەڵکوو پێشتریش وەک" قەیسەری ئاسایشی ناخۆیی" لەژێر دەسەلاتی سەرۆک بەکردا، بەپاراستنی خـودی خـۆی—" لەسـەرەوەڕا" دەسـتیپێکرد بەکام شێوەی زۆر کاریگەر و گونجاوە. پاسەوانەکانی خۆی، ئـەو کۆمەڵـە پاسـەوانە تایبەتییانـەی سـەرۆکایـەتی، لەگەنجـە تکریتییـەکان پێکهێنـا بەشـێوەیەکی سـەرەکی لەبنەماڵـەی( ئـال بوناسـر). کـە تاکـە ئـەرکیان پاراسـتنی سـەلامەتی فیزیکیـی سـەرۆک، بـەڵکوو لـە واقیعـدا جێگـری سەرۆک(سەدام حوسێن بوو). سەدام کە لەناو تۆڕی ئاسایشی شەخسیی خۆیدا مەلاسدرابوو، دەزگا ئەمنییە ناوخۆکانی حیـزب و دەوڵـەتی پڕکـرد لـەپیاوانی عەشـیرەتەکەی خـۆی و ئەڵقـە لـەگوێکانی خـۆی، بـەزۆری لەشـارەکانی تکریـت، دوور، بێجـی و عۆجـەوە هێنابوویـانی. سـکۆلاری ئیسـرائیلیی ئاماتزیـا بـارام(Amatzia Baram). ووردبینانـە تێبێنـی

ئــــەوەی كـــــردووە كــــە ژمارەیـــەكی بچـــووكی خـــەڵكی دڵســـۆزی لەخۆبوردوو ئەگـەر لەچەنـد جەمسـەرێكی گونجـاوی ئـەمنیی و حكـومیی دابنرێن، دەشێ كە كاریگەریەكی لەڕادەبەدەریان هەبێت بەسەر ئاساییشـی رژێمەكەوە.[239]

لەزۆر لایەنەوە حیزبی بەعس پەردەیەك بوو بۆ ئامانجـەكانی سـەدام--- بواری پێدا خـۆی بگەیەنێتـە بـاڵاترین ئاسـتەكانی حكومـەت و بـوو بـە میكانیزمێكی دەزگایی تا بەهۆیەوە كۆمەڵگەی عیراقیی لەڕووی سیاسییەوە لەپشـتییەوە كۆببێتـەوە و جڵـەوی بكـات. پتـەوكردنی رژێـم لەڕێگـەی بونیادێكی حیزبی بەربڵاوی كارەساتبارەوە. بونیادێك كە لەسـەر شـێوەی بونیادەكـــەی حیزبـــی شـــیوعیی عێراقیـــی بـــوو. هـــەروەها لەڕێگـــەی بەخشینەوەی ئەو پارەیەی كە لەسەرچاوەكانی نەوتەوە دەهات. بەدەستهات، لەپاڵ بەستنەوەی دروشمەكانی بەعس بەو ئایدیا سـوننیانەی كـە تـا ئـەو كاتە زاڵ و بەگشتیی قبوڵكرابوون. وەكو ئایدیاكانی عروبە و، سۆشـیالیزم و ناسـیۆنالیزم. ئایـــدۆلۆژیا پانعەرەبیســـتە ســـێكیۆلارەكەی بـــەعس و جەختكردنـەوەی ئاشـكرای لەسـەر یەكسـانیخوازیی و دابەشـكردنەوەی سـامان، هاوشـیوەی ئـەو بیروبـاوەڕە سیاسـییانە بـوون كـە جـەماوەری سوننیی لەسـەردەمی پاشـایەتی و لەسـەردەمی كۆمارییشـدا پـێش ئـەوەی بەعس دەسەڵات بگرێتە دەست، بەگشتی هەڵگری بوو.[240]

لەمەوە، ئاراستەكردنی پەیامی حیزبی بەعس بەرەو بیروبـاوەڕی سیاسـیی گشـتیی سـوننەكان( رەنگـە، چەنـد تێڕوانینێكـی سـێكیولاری شـیعەش). هەروەها، بۆ دڵنیابوونـەوە لـەوەی حیزبـی بـەعس ببێتـە یەكـەم هۆكـاری پێشـكەوتنی كۆمەڵایـەتیی، سیاسـیی و ئـابووریی لـەناو عێراقـدا بـوو. تاڕادەیـەك پراكتیكێـك لەئەنـدازەی سیاسـییدا دروسـت بـوو. بونیـادی حیزبەكە جەختی لەسەر ئەو ڕۆڵە دەكـردەوە. بـەوەی شـانەكانی حیزبەكـە هەتا ئاستی گەڕەك و كۆڵان خزابوونە ناو كۆمـەڵگاوە و نفـوزی لـەوەش قووڵتر خزابووە ناو دڵ و مێشكی دانیشتوانەوە.

شانبەشانی ئەو بونیادە سیاسییە چڕەی كـە بەناوجەرگـەی كۆمەڵایەتییـدا ڕۆچوو بوو، رژێم سیمایەكی تری دیمەنی سیاسـیی عێراقـی قۆسـتبووەوە: ئـەویش سـەندیكا كرێكاریـەكان بـوون( ئـەوانیش هـەر لەلایـەن حیزبـی شـیوعیەوە پـەرەیان پێـدرا بـوو). كـە دانیشـتوانیان بـەگوێرەی هێڵـی

فەنکشنەکانیانەوە کۆکردبووەوە. لەجیاتی ئەوەی وەکو هۆکاری کۆمەڵگەی مەدەنیی کاربکەن. بەسادەیی ببوون بەهۆکارێک بەعس بەهۆیانەوە بتوانێ پراکتیزی کۆنترۆلکردنی کۆمەڵایەتیی بکات. چونکە ئەندامێتی لەسەندیکادا بەسترابووەوە بە قبووڵکردنی لەلایەن بەعسەوە. سیاسەتێکی هاوشێوە پەیڕەوکرا لەمەڕ سوپاو بیرۆکراسییەتیی مەدەنییدا.
لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە، حیزبی بەعس لەبنەڕەتەوە ئەو دروشمانەی دەرخست کە هەمیشە ڕوویان لەمەڵبەندی سوننەکان بوو لەرابردوودا. بەڵام حیزبەکە ببوو بەو 'سیکۆتینە' دامەزراوەییەی کۆمەڵگەی عیراقیی پێکەوە بەستبووەوە. ئەو تاکە میکانیزمەی کە دەشیا بەهۆیەوە پێشکەوتن دەستەبەر بکرێت. بۆ هەموو عێراق. شوێنکەوتنی دروشمەکانی بەعس بوو بەمەرجێکی پێویست بۆ بزاوتی کۆمەڵایەتیی، تەنانەت دەکرێ بڵێین بۆ ژیانێکی ئاساییشیش. بەهۆی میکانیزمەکانی( لەسەرەوە بۆ خوارەوە) ی. هەروەها بەهۆی داخوازییە خۆکردەکانی ملکەچیی بۆ ئایدیاکانی حیزب( دوایی بوون بەهاوشێوەی ئایدیاکانی" دەوڵەت" و" عیراق". لە کۆتاییدا، لەناو کەسایەتی سەدام خۆیدا جێگیر بوون). لەڕێگەی ئەمانەوە، ڕژێم بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە هێزە سیاسییە چالاکەکانی( بەپلەی یەکەم هی سوننیەکان و بەڵام تارادەیەک شیعەکانیش). جڵەو کرد و بەستنیەوە بەشەرعییەت و دەسەلاتی دەستەبژێری دڵسۆز و دەسەلاتداری سوننی و وەلامگۆی بابەگەورەی خۆیان. سەدام حوسێن.

## سوننەکان لە ڕژێمی سەدامدا

لەزۆر ڕووەوە سەدام دووبارە عێراقی دروستکردەوە. ئەگەر لەسەر وێنەی خۆشی نەبێت ئەوە بەدڵنیایەوە بەجۆرێک بوو خزمەت بەوێنەکەی خۆی بکات. مەڵبەندی عەرەبیی سوننەی عێراق. یان لای کەم ئەو ڕێژەیەی ئەوان کە بە دڵسۆزی ئەو دادەنران. کلیلی دەربازبوون و شەرعییەتی ڕژێمەکەی بوون. ئەوانەش بە نادڵسۆز دادەنران لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکان بێڕەحمانە لەپاکسازییەکاندا لەنێودەبران. یەکێک لەو ڕاستییانەی مێژووی نوێی عێراق بەردەوام پشتگوێ خراوە و گرنگیی پێنەدراوە. چەوساندنەوەی بەربڵاو و سیستەماتیکی سوننەکانە لەلایەن حکومەتی سەدامەوە. توێژی ڕۆشنبیری بەعس لەگەڵ گرتنەدەستی پۆستی

ســـــەرۆکایەتی لەلایـــــەن سەدامەوە بەکردەوە لەنێوبرا. لـەدوای نـەمانی ئەو توێژە، حیزبەکە پڕبوو لـە سـوننەی دەشـتەکیی، هـەموویان دڵسـۆزی تــەواو بــوون بــۆ ســەدام و ئارەزوویــان لــەهیچ جــۆرە پێشخســتنێکی ئایدۆلۆژیی و سیاسیی نەبوو جگە لەوەی کە لەسەرکردەوە دەهات.

بــەم هــەنگاوە، ســەدام بــەکردەوە ســەرکردایەتی سیاسـیی عێراقـی کـرد بەخێڵەکیی، هەم لـەڕووی پەیـدابوونی کۆمـەڵێک دامودەزگـای خێڵەکییـەوە کەپشــتیوانیان لەســەر فــۆرمی پۆســتی حکــومیی، بەخشیشــی دارایــی و قــازانجی لایــەنگیرییکردنی رژێــم وەردەگــرت. هــەروەها لــەڕووی ئــەو پەیوەندییە شەخسییانەشـەوە تــەعبیریان لـەکولتوری سیاسـیی دەزگاکـانی دەوڵەت دەکردەوە. سەدام خەڵکی خۆی لەپێگەکانی دەسەڵات و ئاساییشدا دانــابوو؛ بــەلام، رەنگــە لەهــەمووی گرنگتــر ئــەوەبێت ئــەو "خێــڵ"ێکــی لەدەزگاکانی حکومەت دروستکردبوو. هەرکەسێک بەجۆرێک هەڵسـوکەوتی بکردایــە وەکــو دژایــەتی دەوڵــەت لێکبدرایەتــەوە—لەمەســەلەی وەلائــی سیاسیی— توشی سزای خێڵەکییانەی سەدەکانی ناوەڕاست دەبووەوە کـە ســەدام کردبــووی بــەکولتوور و ســەپاندبووی. ســەدام ســوننی بــوو، عەشیرەتەکەی سوننی بوو؛ لەمەوە دەزگاکانی دەوڵەتەکەیشی بەپلەی یەکـەم بە سوننیەکان پڕدەکرانەوە.

بێگومان، لەناو ئایـدۆلۆژیای بەعسـدا بـوارێکی کـەم هـەبوو تەنانـەت بـۆ ددانـنان بـەوەی جیاوازیـەکی ئاشـکرا لەعێراقـدا هەیـە لەئاسـتی تائیفیـدا. بەگوێرەی ئایـدۆلۆژیای بـەعس، ئایـدێنتیتیی نیشـتیمانیی کەسـێک نـابێ بەهۆی ئایین و تائیفەوە دەستنیشان بکرێت.[241] لەگەڵ ئەوەشـدا، حیزبـی بــەعس بــەهۆی خــودی بونیادەکــەی خۆیــەوە ئــەوەی مســۆگەرکردبوو، نە نوێنەرانی شیعە و نە کورد بەکردەوە و لەڕووی کۆمەلایەتییەوە بخرێنە شــوێنێکی دەســەلاتەوە کــە دەســتێکی بــەهێزیان هــەبێت لەچالاکییــەکانی حکومــەتی ناوەندییــدا. ئامــانج و ســتراتیژییە نیشــتیمانییەکەی بــەعس لەخۆگرتنی کۆمەڵگەی فرەڕەنگ و فرەکولتووریی عیراقی بێ کێشە بوو تا ئەو جێگەیەی دەزگاکانی دەوڵەت هــەر لەدەسـتی سـوننەکاندا دەمێنێتـەوە، دیارە بەزۆری تکریتییەکان نوێنەرایەتییان دەکردن.

## پێگەی تکریتییەکان و خێڵە سوننیە هاوسۆزەکان

بەشداری خودی سەدام لەدەرکەوتنی تکریتییەکان لەدەوڵەتی عێراقدا دەتوانرێت بەروونی ببینرێت بە بەراوردکردنی پێکهاتەی یەکەم حکومەتی بەعسیی لەساڵی 1963 دا( سەدام ڕۆڵێکی کەمی هەبوو لەهەڵبژاردنی ئەندامەکانی) و دووەم حکومەتی بەعسیی لەساڵی 1968 دا. سەدام دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو وەکو جێگری سەرۆک بەکر. هەرچەندە هەموو ئەندامەکانی حکومەتی یەکەم سوننە بوون بەڵام دابەشبوون لەنێوان ئەوانەی خەڵکی بەغداد و ئەوانەی خەڵکی تکریت. پێکهاتەی دووەم حکومەت ئەوەی ئاشکراکرد کە ئێستا تکریتییەکان بالادەست بوون لەناو ڕژێمدا. ئێستا لەلایەن چینی خوارەوە دەستی بەسەرداگیرابوو نەک چینی ناوەڕاست.[242]

ئەمە بەڕێکەوت نەبوو. جاریکیتر سەدام تێگەیشتبوو هەڕەشە بۆ سەر ڕژێم سەرئەنجام لەشیعەکانەوە نایەت چونکە دەکرێ پشت بەسوننەکان ببەستێت بۆ یەککگرتن لەدژی هەڕەشەی یاخیبوونی شیعەکان( هەروەک لەساڵی 1991). ئەوەی بەلای سەدامەوە گرنگ بوو. هەڕەشەی سەرەکیی لەخودی سوننەکانەوە دەهات. لێرەوە ئامانجی یەکەمی ئەوەبوو خۆی و دەورووبەری لەئەگەری ئەوە بپارێزێت کە لەلایەن سوننەکانەوە لەناوخۆوە بڕوخێنرێت. لەسەرەتاوە. سەدام. لەلایەن چینی دەسەڵاتداری ترایسیۆنی سوننیی وەکو کەسێکی لەپڕ هەڵتۆقیو سەیر دەکرا. کەسێکی نەخوێندەوار. شەقاوەیەکی لادێیی کە هیچ ئەزموونێکی سەربازیی نەبوو. نەیارە سروشتییەکانی دەکرا چاوەڕوان بکرێت لەشارەکان و لەناو سوپاوە سەرهەڵبدەن. لەمەوە. دڵنیا بوو هێزەکانی ناو ئەم توێژانەی عێراق دەرک بەوە بکەن کە ئەستەمە پاڵنەرێکی سیاسیی دروستبکەن بۆ هەڕەشەدروستکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا. غەریزەی مانەوەی لەوەش زیاتر تێپەڕاند کە متمانە بەباشترین خەڵکانی سوننەش نەکات. تەواو ئاشکرایە ئەو تەنانەت متمانەی بەئەندامانی خێزانەکەی خۆیشی نەدەکرد. جاریکیتر دەبووایە پیرۆزبایی لێبکرێت لەسەر هەڵسەنگاندنە پڕ لە سەلیقەکەی. لێرەوە. تەنانەت پەیوەندییە هەرە نزیکەکانیشی وەکو عێراق بەگشتی کەوتبوونە ژێر ئەم سیستەمەی دەرخواردان و زۆرلێکردنەوەوە. مانەوەی سەدام بۆ

چەندین ساڵ بەخوێنی خزمەکانی خۆی دەستەبەر بوو. چونکە ئەو بەردەوام خەریکی بڕینی ئەگەری ئێرەیی ئەوانە بوو لەنزیکی خۆی بوون.
ئەمە بۆ سەدام واتای ئەوە بوو لەنێوان سێ باڵی بنەماڵەکەی خۆیدا یاریی بکات—" براکان." " ئامۆزاکان." و " پوورزاکان". دەرکەوتن و دیارنەمانی هەریەک لەم لقانە بەروونی ئەوە دەردەخات کە سەدام بەجۆرێک کاروبارە خێزانییەکانی خۆی بەڕێوە بردووە تەنانەت کەسە زۆر نزیکەکانیشی لەحاڵەتی ترس و دڵەراوکێدا ماونەتەوە.[243] سیمایەکی ئەم ستراتیژییە زۆر باش دۆکیومێنتکراوە ئەوەیە سەدام چەندین دەزگای ئەمنیی دروستکردووە دەسەلاتەکانیان هاوشانی یەکترن. تاکە دەزگای ئەمنیی لەهەموان گرنگتر دایمەزراند دەزگای ئاسایشی تایبەتییە. ئەم دەزگایە سەرلەبەر دەزگای پاراستنی سەرۆک بوو. ستافەکانی بەپلەی یەکەم تکریتییەکان بوون لەبنەماڵەی ئال بوناسرو. لەلایەن قوسەی کوڕە بچووکەکەی( بەڵام زیاتر دەستڕۆیشتووەکەی) سەدامەوە. سەرپەرشتیی دەکرا.[244] بەهەمان شێوە. پاسەوانەکانی سەرۆکایەتیی پارێزەرانی نزیکترین کەسەکانی خێڵ وخێزانەکەی سەدام بوون.
لەناو هەواڵگریی گشتییشدا تکریتییەکان بالادەست بوون و لەڕێگەی ئەم ئۆفیسەشەوە ئەوەیان مسۆگەر کردبوو بخزێنە ناو چالاکییەکانی هەموو ئۆفیسەکانی تری حکومەت و سوپاوە. لەناو سوپادا. یەکە بنەڕەتییەکانی گاردی تایبەتیی کۆماریی و گاردی کۆماریی هەر لەکۆنەوە لەلایەن تکریتییەکانەوە سەرپەرشتیی کراوە و ڕۆڵی پاراستنی رژێمیان گێراوە لەدژی هەر هەوڵێکی کودەتا یان شۆڕش لەلایەن شیعەکانەوە.[245] توێژەری ئیسرائیلی تایبەتمەند لەبواری سیاسەتیی عێراقییدا. ئەماتزیا بارام مەزەندەی ئەوەی کردووە هەمیشە ڕێژەی سەرلەشکرەکانی گاردی کۆماریی لەنێو تکریتییەکان. یان دوورییەکاندا لەسەدا 50 کەمتر نەبووە و. لەزاری کۆلۆنیالێکی ڕاکردووی گاردی کۆمارییەوە مەزەندەی ئەوەی کردووە تاساڵی 1991 نزیکەی لەسەدا 80 ی ئەفسەرەکانی لەتکریتەوە هاتوون.
ئەم بونیادە ڕەسمییانەی ئاسایش و دەسەلات بەدامەزراندنی چەند گرووپێکی میلیشیایی نارەسمیی تەواکرابوون لەوانە فیداییەکانی سەدام بەسەرپەرشتیی عودەی کوڕە گەورەکەی سەدام (ئەوەی زۆر گەمۆڕ بوو).

فیداییـەکان زۆر گاڵتـەیان پێکـرا لەئامادەکارییـەکانی داگیرکردنەکـەی عێراق لە 2003 دا بەسەرۆکایەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا. لەگـەڵ ئەوەشـدا، ڕاهێنـان و ڕۆڵیـان لەمەیدانـدا. لـەکاتی هەڵمەتـە یـەک بـەدوای یەکەکان و هەندێکجار خۆکوژییەکانیاندا لەدژی ئەو هێزانەی هاوپـەیمانان کە زۆر لەخۆیان بەهێزتر وپێشکەوتووتر بوون، دەریخست کە ملکـەچیان بۆ رژێم هاوشان بوو لەگەڵ بەڵێنـەکانیان لەمەیـدانی شـەڕدا. لەحکومـەتی مەدەنیشدا، ئاڕاستەکە دووبارە ڕووی لەدامەزرانـدنی ئەفسـەرە سـەربازییە سوننیەکان بوو تەنانەت لەنێو باشووری شیعەنشینیشدا. بۆ نموونـە، تـا سـاڵی 2000 نـەقیب موحەمـەد فـایز ئـەلحازە( ئەنـدامێکی بنەماڵـەی ئالبوناسر)، پارێزگاری شاری عەمارە بوو.
پارێزگاری بەغداد، فەریق سابیر ئەلدوریی بوو، فـەریق ئیبـراهیم هـەماش تکریتیی پارێزگاری بەسرە بـوو.[246] کەواتـە سـەدام، تکریتیـی و سـوننە دڵسۆزەکانی-- هەر کاتێک گرنگیی زیاتریان هەبووایـە-- دەخسـتە نـاو دەزگا ئەمنییەکانی دەوڵەت، پێگـە سـەربازییەکان و دەزگـا سـەرەکییەکانی کۆنترۆڵی مەدەنییەوە. حکومەتی عێراقیی ژێردەستی سەدام لەسـەر کاغـەز هـیچ جیاوازییـەکی نـەبوو لەوانـەی پێشـووی لـەو ڕووەوە باڵادەسـتی سـوننەکان وەکـو سـیمایەکی زاڵ بەسـەر دەوڵەتەکـەوە مایـەوە. لەگـەڵ ئەوەشدا، سـەدام عەشیرەتگەریی و ئـەم باڵادەسـتییەی پێکـەوە گرێـدا و بەدەسەلاتدان بەخێڵە لادێیەکانی زێدەکەی خـۆی—تکریـت، ڕۆڵـی چینـی ناوەراستی سوننەی لاواز کرد .
لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئـەو بۆچوونـەی کـە تکریتییـەکان( یـان تەنانـەت سوننەکانیش) یەکسان بـوون بـەحیزبی بـەعس، زیادەڕەوییـەو، ئامـاژەی هەڵەیەکی جدییە لەداهاتوودا ئەگـەر هـەوڵێک بـۆ لەکۆڵکردنـەوەی نفـوزی سەدام لەعێراق بەپلەی یەکەم لەکۆڵکردنەوەی حیزبی بەعس ئامانجی بێت . بەپێچەوانەی هێزە چەکدارەکان و دەزگـا ئەمنییەکانـەوە، حیزبـی بـەعس کـەمتر لەلایـەن تکریتییەکانـەوە دەسـتی بەسـەردا گیـراوە. لەبـەرزترین ئاستەکانی حیزبەکەدا( سەرکردایەتی هەرێمیی ) ڕەنگە نیـوەی شـوێنەکان بەتکریتییەکان یان دوورییەکان پڕکرابێتـەوە، هەرچەنـدە بـەر لەڕاپـەڕینی 1991 ڕێژەکـە گـەلێک کـەمتر بـوو.[247] لەبەشـی خـوارتری حیزبەکـەدا، پێکهاتـەی ئەفسـەرەکانی ڕەنگدانـەوەی پێکهاتـەی تـائیفی زۆرینـە بـوو.

لێــــرەوە. لەئاســـــتەکانی خــوارەوە و ناوەڕاســتدا. ئەندامــە شــیعەکان زیاتر دەردەکەوتن. هەرچەنــدە. ئاڕاســتەی گشــتیی سیاســەت لەســەرەوەڕا دەسەپێنرا.
لەبالاترین ئاستییدا سەدام بوو کۆنترۆڵی بەعسی دەکرد لـەجیاتی ئـەوەی بەعس کۆنترۆڵی ئەو بکات. بەتایبەتیی لەدوای پاکسـازییکردن لەحیزبەکـە یەکســەر دوای ئــەوەی خــۆی بــوو بەســەرۆک لەســاڵی 1979 دا. دەســتییپێکرد. لــەئاماژەکردن بــە لاوازیــی حیزبــی بــەعس. ئــۆفرا بۆنگیۆ(Ofra Bongio) دەڵێ" حیزبـی بـەعس لەسـاڵی 1979 وە زۆر بەسەختیی لەکارخراوە. تەنانـەت خەسـێنراوە. سـەربەخۆیی و ئۆتۆنـۆمیی خــۆی وەکــو دەزگایــەکی بڕیــاردەر لەدەســتداوە. ئەمــە جگــە لــەتوانای سنووردارکرنی دەسەلاتەکانی سەرۆک."[248]
زاڵبوونی تکریتییەکان لەناو عێراقی هاوچەرخدا زۆرباش دۆکیومێنتکراوە؛ لەگــەڵ ئەوەشــدا. ئــەوەی کــەمتر لەبــەرچاوگیراوە ئەوەیــە کــە لەگــەڵ زەقبوونەوەی چەند بنەماڵە و عەشیرەتێکی دیاریکراوی تکریت ئێرەیـی و دژایەتی خێڵەکانی تر وەدەرکەوتووە. دووبارە. ئەو هەڕەشەیەی کەوتووەتە سەر سەدام لەلایەن شیعەوە هەڕەشــەیەکی هەمیشــەیی بــووە. بــەڵام وەک هەڕەشــەیەکی حــازر ماوەتــەوە بــۆ ســەر هــەموو ســوننەی عێــراق نــەک ڕاستەوخۆ بۆ سەر سەدام. بەڵام. هەڕەشەی ناوخۆی سوننی هەڕەشــەیەکی شەخسیی بــوو. تیــری لــە ســەدام خــۆی بــوو. هــەروەک ئاماتزیـا بـارام بەشێوەیەکی ماقوڵ تێبینیی دەکات. ستراتیژەکەی سەدام لەبەخێڵەکییکردنی بونیادی سیاسیی عێراق و دانی ئەوپەڕیی گرنگیی بەهەنـدێک عەشـیرەت. هەردوو ڕێگەکەی بڕیــوە.[249] بــوونی کەســانێک لەیەکــە ســەربازییە هــەرە بەتواناکان و پێگە سیاسـییە هــەرە هەسـتیارەکاندا. کەسـانێک ( لای کــەم ئەگــەری ئــەوەیان هــەبوو) زیــاتر پەیوەســت و ملکــەچ بــوون بــۆ عەشیرەتەکانیان تا بۆ کەسی سـەدام هاوکـات هێـزو هــەلی ئـەوەی پێـدان لەسەرەتای سالانی 1970 دا هەوڵی ڕووخاننی بدەن.
عەشــیرەتی jawaine ی شــارۆچکەی حەدیســە لــەباکووری خــۆراوای بەغداد. بەدرێژایی مێژووی نـوێی عێـراق. گرووپێکـی بـەرچاوبوون. وەک بەشـێک لەناوچــەی تکریــت ( لەمــەوە دەکــرێ بڵێــین بەشـێکە لەبنکــەی پشـتیوانیی لــە ســەدام). لەسـێدارەدانی چەنــد کەسـێکی دیــاری خێڵــی

جەوایـنـــــە{ جومـــــەیلات} لەلایـــەن سـەدامەوە لەوانـە جێنـەڕاڵی هێـزی فڕۆکەوانیی( حوسێن حەیاویی). بوو بەهۆی ئەوەی جەوایـنـەکان لای کـەم بەشێکیان ببن بەدوژمنی ڕژێم.[250] نموونەیەکی تـر لـەجێنوەری 1990 دا ڕوویـــدا. کـــاتێ هێـــزە ئەمنییـــەکانی ســـەدام هـــەوڵێکی کوودەتایـــان پووچەڵکردەوە کە لەلایـەن عەشـیرەتی بـەهێزی جبـوورەوە سەرپەرشـتیی دەکرا. دەیان ئەفسـەری گـاردی کۆمـاریی جبـووریی لەسـێدارەدران. ئـەو بەرپرسـە جبووریـە تۆقێنراوانـەش دەربازیـان بـوو نێـردران بـۆ چەنـد شوێنێک نەتوانن هیچ هەڕەشەیەک دروستبکەن بۆ سەر ڕژێـم.[251]
تەنانـەت یـاخیبوونی خۆمـاڵیی بچـووک بچـووکیش بـەس بـوون بـۆ تـوڕەکردنی سـەدام. لەسـێدارەدانی سوپاسـالار محەمـەد مـەزلـوم دلێمیـی. یاخیبوونێکی ناوچەیی لێکەوتەوە لەلایەن گرووپێکی بچووکی فیدراسیۆنی عەشیرەتە دلێمییەکانەوە. کەچیی وەکو وانەیەک بۆ عەشیرەتە سوننییەکانی تـــر زۆر دڵڕەقانـــە دامرکێنرایـــەوە. ســـەدام بەتایبـــەتیی بـــەیاخیبوونی جبوورییەکان زۆر پەست بوو. چونکە ئەوان پێگەیەکی دیـارو بـەرچاویان هەبوو لەناو ڕژێمی عیراقییدا.[252] تەنانەت ( بارام ) وای بۆ دەچێت سەدام نەیدەتوانی متمانە بەعەشیرەتەکەی خۆیشی—ئال بوناسر- بکات و باسی دەستگیرکردنی زاواکەی سەدام خۆی سوپاسـالار حەمیـد شـەعبان دەکـات وەکو بەڵگەیەک بۆ ئەو شمشێرە دووسەرەی سەدام خولقاندبووی.[253]

## سوننەکان لەڕووخانی سەدامەوە

لەدوای لادانی سەدام لەسەر دەسەڵات. میدیای ڕۆژاوایی نزیکەی بەتەواویی قورسایی خستبووە سـەر پێگـەی کوردەکـان و شـیعەکان. وێنـەی پیـاوە ئایینییە شیعەکان بەعەبای درێژو ڕیشەوە لەگەڵ کـوردانی جامانـە بەسـەر شـــتێکی ئاســـایی بـــوو. لەگـــەڵ ئەوەشـــدا. ئـــەوەی زۆر بـــەرچاو بـــوو ئامادەنەبوونی هەر چالاکییەکی سیاسیی سوننەکان بوو. دەوڵەتی عێراقیی لەدوای ئەوەی پارێزەری چەند دەستەیەکی سوننی هەلبژێردراو بوو. کەوتە ناو تەنگژەیەکی کاراساتبارەوە. ڕەنگە سوننەکان لەناوبردنی ڕژێم سـەدام حوســـێنیان وەکـــو زەنگـــی مـــەرگی هێجـــەمۆنی ســـوننیی لەعێراقـــدا قبوولکردبێـــت. هـــەر فـــۆرمێکی حـــوکمکردنی دیمـــوکراتیی لـــەداهاتوودا بەزەروریی نفوزی سیاسـیی سـوننەی بـەژمارە کـەمتر دەکاتـەوە. ئەگـەر

ئەزموونـــــە مەزنەكـــــەی ئەمێریكا لەدیموكراتیزەكرنی سەركەوتوو بێت سـونەكان لەهـەموان زیـاتر شـت لەدەسـت دەدەن. بۆیـە پاڵنـەری زۆر بەهێزیان هەیە بۆ دڵنیـابوون لـەوەی شكسـتدێنێت. سێگۆشـەی بەغـداد- موسـڵ-روتبـەی مەڵبەنـدی سـونەكان دەیسـەلمێنێت سەرسـەختترین و ترسـناكترین ناوچەیـە بـۆ سـەربازە ئەمێریكییـەكان. بێگومـان، بەشـێكی زۆری ئەو هەرێمە هێزی ئەمێریكای هەر تێدانییە یان كەمی تێدایە. ئەمەش چونكە ئەو ناوچەیە پێداچوونی ئەستەمە بۆ ئەو مـەفرەزە ئەمێریكییانـەی چەكی باشیان پێ نییـە. ئـەگـەر ئـاژاوە و خۆپیشـاندانی ناڕەزایـەتی دژ بـەداگیركاریی ئـەمێریكا لەفەللوجـە ئامـاژەبن بـۆ رای گشـتیی، مەڵبەنـدی سوننیی بووە بەناوچـەی سـەرەكیی بەرەنگاربوونـەوەی چەكـداری دژ بـە بوونی بەردەوامی ئەمێریكا لەعێراقدا.

ئاستی هەستیاریی سونەكان هەر بەتوندیی لەباكووری وڵات لەدەوروبەری موسڵ و كەركوكـدا، دەمێنێتـەوە . دەسـت بەسـەرداگرتنی كـەركوك، ئـەو شـارەی كـە لەناجێگیریـەكی ترسـناكدایە. لەلایـەن كوردەكانـەوە. دواتـر هەڵبژاردنی پارێزگارێكی كورد بۆ شارەكە. كەمی پێكرا بـۆ كەمكردنـەوەی ترسی عەرەب لەوەی كـە كوردەكـان خواستی وەرگرتنـەوەی كـەركوكیان نەماوە وەك پایتەختی ناوچەكەیان. پێشبڕكێی عـەرەب-كـورد لەشـارەكەدا هێشتا خوێناویی و سەختە. ئەمێریكاش واپیدەچێت نـەتوانێت ئاشـتیی و ئارامیی بچەسپێنێت. دیارە تەنگژەكان لـەوە گـەورەترن لـەقـەڵای هەسـتی عەرەبایـەتیی سـونیدا. لەموسـڵ، دەركـەوتنی پێشـمەرگەكانی پـارتیی دیمـوكراتی كوردسـتان سـەر بـە بـارزانیی لەشـەقامەكانی موسـڵدا دەسـوڕێنەوە. ئـەویش لەخزمـەتی رەواندنـەوەی نیگـەرانیی و ترسـی سونەكاندا نەبوو.

رۆژە هەرە سەختەكان ئەو كاتە دەركەوتن كـە حـاكمی ئـەمێریكی بەسـەر عێراقـەوە، پـۆڵ بریمـەر هەوڵیـدا سیاسـەتی بریقـەداری ریشەكێشـكردنی بەعس بچەسپێنێت. بە بەكارهێنانی مۆدیلێكی ناتەبا وەك ئەڵمانیای نازیی دوای جەنگی دووەمی جیهانی، پلانەكە بۆ" ریشەكێشكردنی بـەعس " بـوو لەعێراقـدا بـەجۆرێكی هاوشـێوەی" "ریشەكێشـكردنی نـازیی" لـەئاڵمانیا. زۆریی ژمارەی ئەو كەسـانەی لـەو پرۆسـەیەوە گلابـوون. هاوشـان لەگـەڵ ئەوەی بەزۆریی سونەكان دەبوونە ئامانجی جەوهەری پلانەكە. بووە هۆی

زیاتر سوننەکان ببنە دوژمن. لەباروزروفێکی لەم چەشنە لە دەستێوەردانی دەرەکیی( چ لەلایەن ئەمێریکاوە یان لەلایەن دەوڵەتە هەرێمییەکانەوە) لەکاروباری دەوڵەتەکەدا.
هەوڵەکانی شیعە بۆ دەستبەسەرداگرتنی دەزگاکانی حکومەت و هەنگاوەکانی کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمیی و دەستبەسەرداگرتنی کەرکوک، دەکرێ پێشبینی ئەوە بکرێت کە دیارترین سیمای مێژووی سیاسیی عێراقن دەربکەونەوە— ئەویش ڕێکخستنەوەی سیاسیی و سەربازیی دانیشتوانی سوننە لەهێزێکدا بتوانێت دەسەلات بگرێتە دەست و هەموو گرووپەکانی تر بخاتە ژێر دەستییەوە. لاوازیی جەوهەری پارچەپارچەیی شیعە هێشتا هەمووان بەئاشکرایی دەیبینن. کوردەکان بەردەوام دەبن لەسەر جەختکردنەوە لەسەر ئۆتۆنۆمیی بەلاّم هێشتا لەناوخۆدا بەشێوەیەکی ترسناک بەشبەشن. سوننەکان لەکۆنەوە تەباترین و ڕێکخراوترین بەشی کۆمەڵگەی عێراقین لەڕووی سیاسییەوە. بەڵگەیەکی کەمیش لەبەردەستدایە پێشبینی ئەوە بکەین کە هەڵبگەڕێنەوە و ڕێگە بدەن میراتەکانیان لێبسەندرێت و بدرێتە کوردانی غەیرە عەرەب یان شیعە فەندەمێنتالیستەکانی دۆستی ئێران.

## سوننەکان: مەسەلە جەوهەرییەکان
## میراتی باڵادەستیی و ڕۆڵی داهاتوو لەعێراقدا

سوننەکان بۆ چەندین سەدە حوکمیان کردووە بەسەر ئەو هەرێمەی ئێستا عێراقە. لەم ڕووەوە ئەوان حاکمی" سروشتیی" عێراقن. بەلام حکومەتێکی نوێنەرایەتی دیموکراسیی راستەقینە لەعێراقدا. کە تیایدا دەسەلاتی سیاسیی بەتەواویی ڕەنگدانەوی قەبارەی دانیشتوان بێت. سوننەکان دەخاتە پێگەیەکی سیاسیی ژێرترەوە نەک هەر لەپەیوەندییاندا لەگەڵ شیعە بەڵکوو لەئاست کوردەکانیشدا. ناوچە "عەرەبە" هەرە بەهێزەکانی ئەم وڵاتە کە زۆرینە عەرەبن. بەزەحمەت دەتوانن ئەمە قبوول بکەن— بەتایبەتیی لەهەندێک شاری هەستیاری وەکو موسڵدا. بەڵام، ڕێک هەمان شت ڕوودەدات ئەگەر ئەمێریکا سەرکەوتووبێت لەدروستکردنی نوێنەرایەتییەکی دیموکراسیی لەعێراقدا. چاوەڕوانی ئەوە لەعەرەبە

سوننەکان دەکرێت کە لەشەو و ڕۆژێکدا مل بۆ پرۆسەیەک کەچ بکەن فرێیان دەداتە ژێری ژێرەوەی ڕیزبەندی سیاسییەوە.
بەلەدەستدانی دەسەلاتی سیاسیی، سوننەکان هەروەها پێناسەی دەسەڵات و نەخشاندنی ئایدێنتیتیی دەوڵەتی عێراقیش لەدەست دەدەن. تەنها سوننەکان زۆریان هەیە لەدەستی بدەن. بۆیە، عەرەبە سوننەکان پاڵنەری زۆریان هەیە نەهێڵن کارەکەی ئەمێریکا سەربکەوێت. لەم حاڵەتەدا باشترین ڕێگە لەبەردەم سوننەکاندا ئەوەیە یاری بەکارتی ناسیۆنالیزم بکەن؛ کرۆکی هێزێکی بەرەنگاری ڕێکخراو پێکەوە بنێن خۆی بۆ دەرپەڕاندنی ئەمێریکا لەعێراقدا یەکلایی بکاتەوە. گەلێک هۆ هەن بۆ کوردەکان ئومێدی مانەوەی هێزەکانی ئەمێریکا بکەن لەعێراقدا؛ شیعەکان یەکێتییەکی ڕێکخراوەییان نییە(مەگەر سەرکردەیەکی کارێزمایی ئەوە دابین بکات). ئەمە وادەکات سوننەکان سەرچاوەیەکی چاوەڕوانکراو بن بۆ بەرەنگاربوونەوەیەکی ڕێکخراو لەعێراقی دوای سەدامدا.
لەدوای لابردنی سەدامەوە، سوننەکان هیچ کەسایەتییەکیان نەبوو بەدەسەلاتێکی سیاسیی ئەوتۆوە وەکو گرووپێکی گشتیی نوێنەرایەتییان بکات لەلای دەسەلاتی کاتیی هاوپەیمانان بەسەرکردایەتی برێمەر. هەوڵەکانی شێخ زەید( سەرۆکی میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەبیی) لەناوەراستیی 2003 دا بۆ پێکهێنانی جۆرێک لەسەرکردایەتیی سیاسیی سوننیی ئەویش لەڕێگەی پشتیوانیکردنی عەدنان پاچەچیی تەمەن هەشتا ساڵ بەسەرەوە، یان سەرکردەی پاشاییەکان، پیاوماقوڵ{ شەریف} عەلی بن حوسێن بەڕێوە چوو. ئەمە بۆ خۆی نیشانەی نەبوونی ڕێکخستن بوو لەنێو سوننەکانی عێراقدا. سوننەکان، کاتێک ڕووبەڕووی ماشێنی سیاسیی بەهێزیی کوردەکان و توانای جەماوەری قەبەی شیعەکان( بەدەنگ و سەدا دوای ئەوەی تازە ئازادیی دەربڕینیان پەیداکردووە) دەبنەوە، ئێستا ئەوان پێکهاتەی بەشخوراوی کۆمەڵگەی عێراقیین. ئەمە مەسەلەیەکە لەوە زیاتر جێگەی ناسەقامگیرییەو ئیدارەی ئێستای هاوپەیمانان بۆی دەرکەوتووە. بەرپەرچدانەوەی سوننەکان دژ بەداگیرکردن و ئەو ڕیسواییەی کە تووشی هاتوون لەو دەوڵەتەدا. دەشێ لەوەندە خوێناوییتر و کاولکارانەتر بێت کە تا ئێستا هەیە.

## بەرەنجام

سوننەکان، وەک هەموو گرووپەکانی تری عێراق، بەسیاسەتی بەخشین و داپلۆسین خرابوونە سەر ڕێ، سیاسەتێک کە بەوردیی داڕێژرابوو، هەمیشەش لەگۆڕاندا بوو، چەند، گرووپێک لەسەنتەری دەسەلاتەوە نزیک بوو‌بێت هێندە ئەم سیاسەتە توونددتر بووە. سوننەکان وەک گرووپ هەمیشە لەلایەن نووسەرانەوە فەرامۆشکراون. ئەو نوسەرانەی زیاتر تیشکیان خستۆتە سەر مەینەتییە پتر دیارەکانی کورد و شیعە.

هەرچۆنێک بێت، دەبێ پێگەی سوننەکان لەعێراقدا لەبەرچاوبگیرێت چونکە ئەوان هێزی بزوێنەر بوون بۆ سەدان ساڵ لەبەڕێوەبردنی ناوچەکەدا، تەنانەت بەر لەدروستکردنی عێراق. پەیوەندییە ناوچەیەکانیشیان بەدەوڵەتەکانی تری عەرەبەوە واقیعێکی ستراکتۆریی وەها دەخاتە بەردەم ئەندازیارەکانی داهاتووی عێراقەوە ڕەنگە زاڵبوون بەسەریدا ئەستەم بێت، بەتایبەتیی ئەگەر ئەو ئەندازیارانە هەوڵی گۆڕینی سیمای سیاسیی دەوڵەتی عێراقیی بدەن بە بەشداریپێکردنی نوێنەرانی کورد و شیعە لەحکومەتدا. واپێدەچێت، بۆ ئەوەی عێراق وەکو قەوارەیەکی یەکگرتوو بمێنێتەوە، کە حکومەتەکەی لەبەغدادەوە حوکم بکات و هیچ دابەشکردنێکی دەسەلات ئەنجام نەدرێت بۆ هەرێمەکان یان دەوڵەتەکە دابەش نەکرێت، واپێدەچێت لەو کاتەدا دەبێ عێراق بگەڕێتەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆی—بالادەستیی سوننە و جێگیرترین سیستەمی حوکمکردنیش دیکتاتۆریەت دەبێت. ئەوکاتە سەدام تەنها دەشێ بۆ ئەوە لابرا بێت تا دیکتاتۆرێکی تر جێگەی بگرێتەوە ئەویش هەر{بەقودرەتی قادر} سوننە دەبێت.

# بەندی حەوت

# کوردەکان

## دەستپێک

کێشەی مێژوویی کوردانی عێراق وەبیرخەرەوەیەکی بەردەوامی سروشتی دەستکردانەی دەوڵەتی عێراقەو بەرچاوترین ئاماژەیە بۆ ئەو کێشە بنەڕەتییانەی کە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە بەربینگیان بە عێراق گرتووە. دەشێ لە دوو لایەنەوە کوردانی عێراق ببینرێن. لایەنی یەکەم و باوترینیان بینینیانە وەکو قوربانیی. قوربانیی دەستی هەردوو حکومەتی ناوەند و هێزە دراوسێکان. پێگەی دووەم و تارادەیەک دژ بەوەی تر، بینینیانە وەکو بەکرێگیراو. وەکو هێزێک لەجیاتی ئەو دەوڵەتانە کار دەکەن کە لە دژی ڕژێمی عێراقن.[254] لە هەردوو حاڵەتەکەدا، ڕاستییەکە ئەوەیە کە کوردەکان لەڕووی جیۆگرافی و سیاسییەوە لە نێو دەوڵەتی عێراقییدا پەراوێزخراون. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لە یەک کاتدا قوربانیی و بەکرێگیراویش بن.

ڕاستییەکی سادە لە کرۆکی پەراوێزکردنەکەیاندا هەیە ئەویش ئەوەیە ئەوان بەپلەی یەکەم خۆیان بە "کورد" دەزانن ڕەنگە. پاشان" عێراقیی" و بەدڵنیاییەوە خۆیان بە "عەرەب" نازانن. جێگەی قسەکردنە. ناسیۆنالیزمی کوردیی دیاردەیەکی بەهەند نەگیراو بووە لە تێگەیشتن لەگۆڕانکارییە پڕمەینەتییەکانی عێراقدا. مەسەلەی ئەوەی کە کوردەکان خەڵکێکی عەرەب نین لەدەوڵەتێکدا کەچەند ڕژێمێکی ناسیۆنالیستیی عەرەبیی بەهێز تیایدا باڵادەست بوون مانای ئەوە بووە کوردەکان وەکو هێزێکی ناوچەیی بمێننەوە. کەلەڕووی سیاسییەوە لە خەمی بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمییەکی لۆکاڵیی و لەڕووی سەربازییشەوە لە خەمی کۆنترۆڵکردنی ئەو ناوچانەدابن کەکوردەکان تیایدا زۆرینە پێکدەهێنن.[255] لەبەر ئەم ئایدێنتییە ناعەرەبییە و ئەو خواستە هەرێمییەی سیاسەتی کوردیی، کوردەکان بەدەگمەن دەستیان گەیشتووە بە پێگەی گرنگ لەحکومەتی ناوەندیی کەعەرەبی سوننە تیایدا زاڵبووە. لەوەش زیاتر، کوردەکان وەک لەسەدا 25 ی دانیشتوانی عێراق هەرگیز بەهرەمەند نەبوون لەنوێنەرایەتییەکی سودمەندانە کە لە ئاستی قەبارەکەی خۆیاندا بێت، بەڵکوو لەجیاتی ئەوە بە ڕادەیەک تووشی چەوساندنەوەو داپڵۆسین بوونەتەوە کە بە هیچ پێوەرێکی ئێسیکیی و مۆراڵیی جێگەی قبولکردن نییە.

هێشتنەوەی کوردەکان لەنێو دەوڵەتی عێراقدا باجێکی مرۆیی ترسناکی هەبووە. هەر کە کوردەکان داوای ئۆتۆنۆمی زیاتریان کردووە، حکومەتی ناوەندی بەشێوازی داپڵۆسێنەرانەی توند وەڵامی داونەتەوە. بۆ پاراستنی یەکێتیی خاکی عێراق و بۆ مانەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیی بەسەر ناوچەی ستراتیژیی وەک کەرکوک( بەکێڵگە نەوتییەکانیەوە).بەدڵنیاییەوە، سیاسەتی بەعەرەبکردن-- ئەو سیاسەتە جیاکارییەی بەئاگاییەوە کرا— کەخەڵکانی غەیرە عەرەب( لەنێویاندا کورد و تورکمان و ئاشوورییەکان) لەدانیشتوانی ئەو ناوچانەی کەلەڕووی ستراتیژییەوە هەستیار بوون یان خودان گرنگییەکی ئابووریی بوون وەک کەرکوک دەردەکران و لە جێگەیاندا عەرەب نیشتەجێدەکران— مێژوویەکی هەیە درێژ دەبێتەوە بۆ ئەو کاتەی کەعێراق هێشتا لەژێر چاودێریی بریتانیادا بوو لە سالانی 1920 دا.[256]

لـــەو ســـالانەی بـــەرایی میـــژووی عێراقـــدا، حکومـــەتی عێـــراق، دەســـتپێوەگیراو لەلایـــەن بریتانییەکانـــەوە ژمارەیـــەکی زۆری کرێکـــاری عەرەبی هێنا بـۆ کـەرکوک بـۆ پڕکردنـەوەی پێویسـتییەکانی پەرەپێـدانی پیشەسـازیی نـەوت لەکەرکوکـدا. ئەمـەش لـەپاڵ نیشـتەجێکردنی چەنـد خێڵێکـی ڕەوەنـدی عـەرەب لەسـالانی 1930دا لـەو ناوچەیـەدا. پـەتای بەعەرەبکردن لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم حکومەتی بەعسییدا لەساڵی 1963 دا سەریهەڵداو. حکومەت بەشێوازێکی دڕندانە هەستی نەتـەوەیی کـوردی کرد بەئامانج. لە یەکێک لەڕووداوەکاندا کەبەهۆی گەورەیی کارەساتەکەوە بە زەقی ماوەتەوە، ژەنەراڵ ( زەعیم) سـدیق مسـتەفا بەرپرسـی سـەربازی تازە دامەزراوی حیزبی بەعس لەسلێمانیی، نزیکەی 100 کەس دەکوژێـت لەوانەی کە بە" کەسە سەرکەوتووەکانی کورد" ئەژمارد دەکـران (باشـترین یاریکەرەکان، بـەناوبانگترین هونەرمەنـدەکان، بـەڕێزترین مامۆسـتاکان). ئەمانە هەموو بوونە ئامانجی لەناوبردن.[257]

ئەم زیادەڕەویانە تەنها تایبەت نەبوون بەیەکـەم حکومـەتی بـەعس. لـەژێر دەســـەڵاتی ســـەدامدا، ســـتراتیژی بەعـــەرەبکردنی ڕژێمـــەکانی پێشـــوو بـــەرفراوانترکراو چڕتـــر کرایـــەوە. لەهەنـــدێک کاتـــدا چـــەمکی " پاکتـــاوی ڕەگەزیی" وادەردەکەوێ گونجـاوترین وەسـفکردن بێـت بـۆ ئـەو ئاسـتەی کە سـتراتیژەکە پێیگەیشـتبوو کوردەکـانیش بـوونە بـە قـۆچی قوربـانیی کردەوەکـانی سـەدام. دەوڵـەتانی دراوسـێ و هێـزە ڕۆژئاواییـەکان بـەم چەوساندنەوەیان دەزانی، بەڵام هەروەک چۆن کارێکی ئاسـایی بـوو کـە کوردەکان پڕچەک بکرێن لەدژی سەدام، بەهەمان شێوە ئەوە کێشـە نـەبوو کە دەستیان لێبەربدرێت و وازیان لێبهێنرێت بۆ ڕەحمـەتی ڕژێمێکـی تۆڵـە ئەستێن.

ئەم میراتی ناپاکییە گەیشـتە لوتکـەی پڕلەناسـۆر و ناشـیرینی خـۆی لـە هەڵمـەتی بـەدناوی ئەنفالـدا، کـە تیایـدا سـەدام چـەکی کیمیـایی لـە دژی کوردەکان بەکارهێنا، کە بووە هۆی کوژران و بێسەروشـوێنبوونی سـەدان هــەزار کــورد.[258] کــاولکردنی شــاری هەڵەبجــە لــە بــەهاری 1988 دا هەرچەندە شتێکی نامۆتر نەبوو(لەئەنفال). یەکسەر لەدوای هەڵمەتی ئەنفال ڕوویدا، ئەویش تەنها یەکێک بـوو لـەو جارانـەی کـە کوردەکـان تـوڕەیی دەستی حکومەتی ناوەندیان چەشت. لەدوای ئەوەی شەڕکەرە کوردەکـان و

هێـزە ئێرانییـەکان ئـەو شـارە ستراتیژییەیان گـرت کـە لـە باوەشـی کۆمەڵێک تەپۆلکەی نزمدایە 70 کیلۆمـەتر لـە سلێمانییەوە دوورە. سـەدام بــە تێکەڵەیـــەکی وێرانکـــەر لەچـــەکی کیمیـــایی و تەقلیـــدیی وەڵامی دایـەوە لەڕێگـەی بـەکارهێنانی تـۆپ و فڕۆکـەوە. لـەماوەی چەنـد خولەکێکدا. لای کەم 5000 کەس مردن. بەهۆی بـەکارهێنانی تێکەڵەیـەک لەچەکی قاتوقڕی کیمیـایی و گـازی نێرڤـەوە {ئەعسـاب}. ئەگـەر ئەمـەش هێندە کارەساتبار نەبووبێت. ئاسەواری درێژخایـەنی ئـەم هێرشـە هێشـتا لەشاری هەڵەبجە کە ئێستا ئاوەدانە. هەستی پێدەکرێت. لەوانـە دەرکـەوتنی نەخۆشی زگماکیی بەرێژەیەکی بەرچاو بەرزە.[259]

ئـەو چەکانـەی بـەکار دەهـات بەرهـەمی دەوڵەتـە رۆژئاواییـەکان بـوون. وڵاتە رۆژئاواییەکان بەم تاوانانەیان دەزانـی کەلـەدژی مرۆڤایـەتی دەکـرا. کەچی هیچ نارەزاییەکی فەرمیی دەرنـەچوو. بەداخـەوە. ئەمـە نموونەیـەکی باوی مامەڵەی رۆژئاوا بوو لەگـەڵ کوردەکانـدا. کاتێـک پشـتیوانییکردنی حکومەتی عێراقیی لە بەرژەوەندی خۆیاندا بوو. وەک لەسـاڵی 1988 دا لەکاتی شەڕیدا لەگەڵ ئێران. ئاهونالـەی کـوردان فەرامۆشـکرا. کـاتێکیش حکومەتی عێراقیـی لـەدوای داگیرکردنـی کـوەیت تـەریو کـەوت. کێشـەی کــوردیی لــە خزمــەتی ئامانجـەکانی رۆژئـاوادا بـەکار هێنـرا.[260] بـە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشینە مێژووییانە ترسەکە ئەوەیە کـە لـەدوای نـەمانی سەدام لەسەر دەسەلات کوردەکان زیاد لەپێویسـت سـوودمەندی سیاسـییی بن بۆ ئەو هێزانەی کەعێراقیان داگیرکردووە. لەکاتێکدا زمانی زاڵی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکاو بریتانیا وا دەردەکەوێت پاراستنی یەکپارچەیی خاکی عێراق و بەهێزکردنی حکومەتێکی ناوەندی بێت لەبەغـداد( کەهـەتا ئێستا هـیچ رێوشـوێنێک دیـاری نـەکراوە بـۆ بـەردەوامبوونی دەسـەلاتی دیفاکتۆی کوردی لـە بـاکووردا). ئاماژەیـەکی کـەم لەئارادایـە بـۆ نـەمانی داپلۆسینی کورد.[261]

لە گەڵ ئەوەشدا. پێدەچێ ئێستا کاتەکان جیا بن لەو ساڵانەی پێشوو کـە رۆژئاوا نازی ناسیۆنالیزمی کـوردی هەلـدەگرت. دابەشـکردنی عێـراق بـە کـارگوزاریی و بــەکردەوە لەسـالانی 1991 دا لــە گـەڵ کشـاندنەوەی بەرپرسە حکومییە عێراقییەکان لە باکوور و دواتـر دامەزرانـدنی دەوڵـەتی دیفاکتۆی کوردیی دەستپێکرد. بۆ زیاتر لە دە ساڵ کوردەکان بۆ خۆیـان

هەرێمەکەی خۆیان بەڕێوەبرد؛ هەڵبژاردنی فرەحیزبی و چەندین هەڵبژاردنی لۆکاڵییان ئەنجامدا؛ چەندین دەزگای حکومی ئاڵۆزیان پەرەپێدا کە ئەرکی یاسادانان، جێبەجێکردن و دادوەریان لەخۆگرتبوو؛ هەروەها، وەکو نوێنەری هەرێمەکەی خۆیان، سەربەخۆ لەبەغداد، مامەڵەیان لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی دەکرد. لەساڵی 1991-وە کوردستانی عێراق ناوچەی گواستنەوە(transition) بووە، ناوچەیەک کە دەکرێ بڵێین بە شێوەیەکی بەردەوام لە پێشکەوتندا بووە. لەخەڵکێکی چەوسێنراوەو بێبەشکراوەوە کە حکومەتێکی ناوەندی بەهێز زاڵبوو بەسەریاندا، کوردەکان هەڵپەی ئەوەیان هەبووە کەسەرکەوتنێکی ماقووڵ بەدەست بێنن لەو شوێنەدا کەلەهەموو ڕوویەکەوە دەوڵەتە تەنها ناو نەبێ. لە هەنگاوە بەراییەکانەوە بەرەو سەربەخۆیی کە لەگەڵ هەڵایسانی شەڕی کەنداودا لەسالای 1990-1991 هاویشتیان، کوردەکان پێشکەوتنێکی مەزنیان بەدەست هێنا لە گەیشتن بە ئامانجیان لەمافی دیاریکردنی چارەنوسی خۆیان—لەمەوە زەنگی ئاوابوونی عێراقی یەککگرتوویان لێدا. پێدەچێ زۆر سەرکەوتووبووبن. ئاشکرایە کێشەیەک کە ئێستا هەیە ئەوەیە چۆن دەکرێ جارێکی تر کوردستان بە دروستیی بخرێتەوە ناو دەوڵەتی عێراقەوە، لەهەمان کاتیشدا خواستە ئۆتۆنۆمییەکانی پارتە کوردییەکان و خەڵکی کورد نابین بکرێت. بێگومان، لە ئامادەکارییدا بۆ ڕوخاندنی سەدام، پارتە عێراقییە بەرهەڵستکارەکان( بە کوردەکانیشەوە) هاوشانی ئیدارەی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکا، پێدەچوو کتێبە مەنهەجییەکانی زانستی سیاسییان قوتدابێت، چونکە ئەو کاتە، وتارە سیاسییەکان و ڕاگەیانراوە ڕەسمییەکان لێوانلێو بوون لە ئاماژە کردن بۆ" فیدراڵیزم" " دیموکراسیی، "بەشکردنی دەسەلات-devolution" و" پێکەوە کارکردن-consociation". هەموو ئەمانە هێنران و بران لە هەوڵیاندا بۆ دڵنیاکردنەوەی کوردەکان کە هەمووان بەرژەوەندی ئەوانیان لە دڵدایەو جۆرێک لەئۆتۆنۆمی کوردیی جێگەی قبوڵە لەدوای ڕووخانی سەدام. لەگەڵ ئەوەدا، پەژراندنی هەندێک پرینسیپی بەرز لەپێناوی دروستکردنی بەرەیەکی یەککگرتوودا شتێکەو، بەڵام جێبەجێکردنیان لەسەر ئەرزی واقیع لەعێراقێکی شێواودا شتێکی ترە. بیرۆکەکانی هێشتنەوەی کوردستان لەنێو

سنووری دیاریکراوی عێراقدا. بەو شێوەیەی کە لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکاو، ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی و کوردەکان خۆیانەوە خراوەتە ڕوو، جەخت دەکاتەوە لەسەر بە لامەرکەزیکردنی(Decentralization) دەسەلاتی ناوەندی دەوڵەت و بەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ کوردەکان. لەگەڵ ئەوەدا، ئەم شێوازەی حکومەتێکی ناوەندی بێهێزکراو کەدەسەڵات بدات بەکورد پێشتر لەمێژووی عێراقدا دەرکەوتوەو، هەمیشە بە پێچەوانە کەوتۆتەوە کاتێک دەسەڵاتی ناوەندی هێندە بەهێز بووە کە بتوانی زاڵبێتەوە بە سەر دەسەلاتە لاوەکییەکاندا. ئەگەرێکی کەم هەیە بۆ گریمانەکردنی ئەوەی کە چەمکە کوردییەکانی ئۆتۆنۆمیی هاوشێوەی ئەو ئاستەی ئۆتۆنۆمیین کە ئەمێریکا، یان هەر دەسەڵاتێکی تر کە بۆ دواجار لەبەغداد دەردەکەوێت بە کوردی ڕەوا دەبینن. وادەردەکەوێت، مێژوو هەڕەشەی خۆدووبارەکردنەوە بکات، چونکە کە کوردەکان بێشک هەوڵی پاراستنی دەستکەوتەکانیان دەدەن وەکو بەکرێگیراو سەیریان دەکرێت، دواییش کە ئۆتۆنۆمییەکەیان و خواستەکانیان دەکرێن بە قوربانی مسۆگەرکردنی دەسەلاتی عێراقێکی نوێ، ئەو کاتە دەبن بە قوربانیی.

ئەگەر کوردەکان قوربانیی هەمیشەیی ناجێگیری عێراق بن و ئێستاش پێشڕەوی هێزەکانی دابەشکردن بن، گرنگە کە بە تەواوی ئەوە دەستنیشان بکەین کوردەکان چۆن و بۆچیی " جیاوازن" و لێرەوە ناتوانن لەناو ستراکتۆری دەوڵەتی عێراقدا جێبگرن. لە پاڵ لە بەرچاوگرتنی جیاوازیە ئێسنیکیی، زمانیی و کولتووریەکانەوە کەکوردەکان لە عەرەبەکان جیا دەکەنەوە، پێویستە ساتە سەرەکییەکانی مێژووی پڕ مەینەتی کوردەکان بخرێنە ڕوو، ئەمەش بۆ ئەوەی لەو کارەساتە بگەین کە بە ئەزموونی کوردییەوە لکاوە لە عێراقدا. لە1991-وە ئەوەی کە بیری لێنەدەکرایەوەو ئەوەی کە چاوەڕوان نەدەکرا بوو بەواقیع: چەمکێکی دەوڵەت-نەتەوە" ی گەلێک سەرنجڕاکێش کە یەکێک لەسێ پێکهاتە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی عێراقیی تیایدا بالادەستە لە باکووری عێراقی' خودان سەروەرییدا -sovereign" دەرکەوتووە. کوردستانی عێراق نزیکەی هەموو ئەو سیفاتانەی هەیە کە بە شیوەیەکی باو بەستراونەتەوە بە" دەوڵەتبوون" ەوە—هەرێمێکی

بەڕوونی دەستنیشانکراو، سیستمێکی کارای بەڕێوەبردن، کۆنترۆڵکردن و بەکارهێنانی شەرعییانەی هێزی سەپاندن.[262] دەکرێ بڵێین، دابەشکردنی عێراق دە ساڵ پێشتر لەگەڵ دروستکردنی دەوڵەتێکی جیادا لە باکوور دەستپێکرد.

## کوردەکان کێن؟

کوردەکان گەلێکی دێرینی هیندۆ-ئەوروپین، لە ڕووی ئێسنیکەوە جیاوازن لە دراوسێ عەرەب و تورک و ئێرانییەکانیان. بە زمانی خۆیان قسەدەکەن( کە کوردییە بە چەند دایەلێکتێکی جیاوازەوە) و ترادیسیۆنێکی کولتووریی پڕ شانازییان هەیە کە جیایە لە هی دراوسێکانیان.[263] کوردەکان کە لە میدەکانەوە هاتوون( ئەو گەلەی کە لە پەیمانی کۆنی ئینجیلدا باسیکراوە). لەو ناوچە شاخاویە وشکانییانە دەژین کە دەکەونە زنجیرە بەرزاییەکانی زاگرۆس و تۆرۆس و پۆنتیاکPontiac ەوە، کەوتوونەتە هەردوو دیوی سنوورە تازە و دەستکردەکانی عێراق، ئێران، تورکیا و سوریاوە. دەستەوستان بوونی هێزە دراوسێکان لە گەیشتن بە ناوچە شاخاوییە بەرزەکان یارمەتی کوردەکانی داوە تا کولتووری تایبەتیی خۆیان و شێوازی ژیانی خۆیان بپارێزن. بەڵام بەڵای گەورە لە مێژوودا لە بوونی نەوت دا بووە لەژێر دەشتاییەکانی لای باشووری شاخەکانەوە؛ نەوت بۆتە هۆکاری دەستتێوەردان لەڕابردوودا و ئەمڕۆش وەکو خاڵێکی گرنگییدانی جیۆپۆلیتیکیی دەمێنێتەوە.
زۆرینەی کوردەکان( لای کەم لەسەدا 75) موسوڵمانی سوننەن(کە ئەویش ئایینی زۆرینەیە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا). نزیکەی لەسەدا 15-یان موسوڵمانی شیعەن( کە ئەویش ئایینی زاڵە لە ئێراندا). ئەو ڕێژەی لەسەدا 10 یەی دەمێنێتەوە پەیڕەوی لەچەند ئایینێکی کۆن دەکەن لەوانە ئێزیدیی( ئاینێکی سینسکریتیە—{ تێکەڵەیەک لە دوو یان زیاتر بیروباوەڕی ئایینی یان ئایینی و فەلسەفیی-وەرگێڕ} ). هەروەها چەند لقێکی ئایینی کۆنی زەردەشتیی. ئەم ئایینانە کۆنترن لە ئایینە یەکخواپەرستەکانی یەهودیی، مەسیحیی و ئیسلام و لە سەرتاسەری

ئاسیادا شوێنکەوتوویان هەیە و مەڵبەندی چەند پێشەوایەکی ڕوحیشیان لە کوردستانی عێراقە.
کوردەکان لای کەم لەڕوانگەی قەبارەی دانیشتوانەوە زۆرن. هەرچەندە لەبەر هۆکاری سیاسیی مەحاڵە خشتەیەکی دیمۆگرافیی دروستمان دەستبکەوێت لەمەڕ کوردەکان لەو ولاتانەدا کە تێیدا نیشتەجێن. ڕەنگە ژمارەیان تا 25 میلیۆن ببێت. کە دابەشبوون بەسەر تورکیا(12 میلیۆن). عێراق(5 میلیۆن). ئێران(6 میلیۆن). سوریا(1 میلیۆن). یەکێتی سۆڤێتی پێشوو(1 میلیۆن). و لای کەم یەک میلیۆن لە هەندەران لە ئەوروپا. ئەمێریکای باکوور و ئوستڕالیا دەژین وەک بەشێک لەکوردانی تاراوگە.[264] بەمشێوەیە. کوردەکان چوارەمین گەورەترین گرووپی ئێسنیکیی پێکدەهێنن لە ناوچەکەدا( لەدوای عەرەب و تورک و ئێرانییەکان) بەڵام خاوەنی دەوڵەتی خۆیان نین. لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. عەرەبەکان چەند دەوڵەتێکی عەرەبییان هەیە. تورکەکان دەوڵەتێکی تورکی خۆیان هەیە( هەروەها چەند دەوڵەتێکی تری" تورکیک" لە ئاسیای ناوەڕاستدا هەن). جوولەکەکان دەوڵەتی ئیسرائیلیان هەیەو. ئێرانییەکانیش یەکێک لە کۆنترین" دەوڵەتانی" ناو مێژوویان هەیە. قەوارەیەکی هاوشێوەی کوردیی نییە بە ناوی کوردستان. ئەو دەستکەوتانەی کە 3 میلیۆن فەلەستینی بە دەستیان هێناوە گەلێک زیاترە لەوەی کەنزیکەی 30 میلیۆن کورد بە دەستیان هێناوە. دەوڵەتێکی دەستکردی تر. یۆگۆسلاڤیا. هەڵوەشێنراوەتەوە بۆ ئەو قەوارانەی کە پێکیان دەهێنا. کۆسۆڤۆی بچووکیش بە زیانکرنێکی زەروور بۆ سەر نەخشەی سیاسیی حیساب دەکرێت. کەچیی کوردەکان وەکو گەورەترین خەڵکانی بێدەوڵەت. بەبێ ولاتێکی نەتەوەیی خۆیان دەمێننەوە. ئەم بێدانییە. هێزێکی سەرەکییە بۆ ناسەقامگیریی هەرچی زیاتریش بەو شێوەیە دەمێنێتەوە لە نێو سیاسەتی هەمیشە گۆڕاوی هەڵبەزو دابەزی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

## ڕەوشی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی

پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی کوردەکانی عێراق ڕەنگدانەوەی لەبەریەکڕاچوونی ئەو پشێوییەیە. گەلێکی کۆن و(هەندێک جار

پـــەراوێزکراو) لـــەخۆی گرتووە. کە لە ساتەکانی دوایی مێژووەکەیاندا کەوتونەتە بەر ڕەحمەتی هێزەکانی تازەگەرییەوە. کوردەکان کە لە بنەڕەتدا ڕەوەندی نیمچە- شوانکارە بوون، بونیادی کۆنی پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتیی و سیاسـیی کـوردیی هـەر لـە بەرایـیەوە خێڵەکییانـە بـووە. بـە هەنـدێ سـنوورەوە لـە سـەر بنـەمای خزمایـەتیی و بنـەچـە. خێـڵ یەکەیـەکی سۆسیۆپۆلیتیکیی بووە.[265] خزمایەتی بە کردەوە سیمای دەستنیشـانکەری ئەندامێتی خێڵ بـووە. بـەڵام ئاشـکرایە. لەگـەڵ بـەرفراوانبوونی خێڵـەکان دابەشبوون دەرکەوتووە. لەمەوە چەندین خێڵی کـوردیی ڕەنگـە ڕەچەڵـەکی خۆیان بگێڕنەوە بۆ جیابوونەوە لە خێڵە گەورەکانی تر.

لە پاڵ خزمایەتییـدا میکـانیزمی وەرگرتنـی دەسـەڵات بـەمیرات هـەبووە. کـە کـۆنترۆڵکردنی دەسـەڵاتی سـەرۆک خێـڵ بـەم شـێوازە بـاو بـووە. سیمایەکی تری خێڵایەتی کوردیی لەو تۆپۆگرافیە تایبەتییـەوە هـاتووە کـە چالاکییەکانی ڕۆژانەی کوردانی دیـاریکردووە. پەرتپـەرتبوونی سروشـتی جیۆگرافی کوردستان. بە شـاخە بـەرزەکان و دۆڵـە قووڵەکانیـەوە. مانـای ئەوەبووە کە تێکەڵییەکی سنووردار هەبووە لـە نێـوان خێڵەکانـدا. ئەمـەش ڕێگـەی بـەوە داوە کـە هـەر یـەکێکیان بـە ڕێژەیـەکی دیـاریکراو بـە گۆشـەگیریی لـە ئـەوانی دیکـە بژیـن. لـەم بارودۆخـە گۆشـەگیریەدا. خێڵە کوردەکان( دەکرێ بڵێین عەقڵییـەتی خێڵەکییانـەی کـوردیش) وەکـو چەند قەوارەیەکی سەربەخۆ ماونەتەوە. کـە لـە نێـوان خۆیانـدا پێشـبڕکێ دەکەن و بەشێوەیەکی مێژوویش لە پەڕاندنی گۆڕانـدا هێواشـن. بـەڵام مێژووی عێراق لـە سـەدەی بیسـتەمدا مێژوویەکـە کـە گـۆڕان بـە سـەریدا سەپێنراوە.

ئاسـەوارەکانی مۆدێرنـە بـە سـەر ئـەو سیسـتەمەدا کـە سیسـتەمێکی سۆسیۆپۆلێتیکی خێڵەکیی بووە. نیگەرانیی و فشاری لەگەڵ خۆی هێنـاوە. زاڵبـوونی خێڵـەکان لـە بـاکووری عێراقـدا ڕووبـەڕووبووەوە لـە گـەڵ بـەرفراوانبوونی مەڵبەنـدە شارسـتانییەکان. بەتایبـەتی هـی هـەولێر و سلێمانیی. ئەم شارانە بوونە چەقی گەشەسەندنی ڕێکخراوی سیاسیی سەر بەچینی ناوەڕاست کـە بـە ڕادەیـەکی زۆر لـەژێر کاریگـەری ئایـدۆلۆژیای سیاسـیی چەپـدا بـوون. ئـەم دابەشـبوونە بـوو لـە نێـوان گرووپـە سۆسـیۆپۆلێتیکە خێڵەکییـەکانی جیاکـان کـە ملکـەچ و گوێڕایـەڵی بـێ

پێچوپەنا و بێ پرسیار بوون بۆ سەرۆک خێڵەکانیان و ئەو خەڵکە چەپە نا خێڵەکییە شارستانییەی کە هەوڵیاندا ئایدیاکانی سۆسیالیزم و( ناسیۆنالیزم) پەرەپێبدەن—ئەو دابەشبوونەبوو—کەبوو بەو خاڵە لاوازەی کە ئەمڕۆ لەناو سیاسەتی کوردییدا لە کاردایە.

لە کاتێکدا کوردەکان گەورەترین گرووپی ئێسنیکیی ڕەسەنن لە جیهاندا کە تائێستا بە بێ دەوڵەت مابنەوە، بە درێژایی مێژوو شکستیان هێناوە لە پەرەپێدانی ئایدێنتیتییەکی یەککگرتوو. ناسیۆنالیزمی کوردیی، کە ڕووبەڕووی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتانە بۆتەوە کە تیایدا نیشتەجێن، لەگەڵ سەرکردایەتیەکی سیاسیی نا لێهاتوو و پارچەپارچە و نەبوونی ئایدێنتیتییەکی یەککگرتوو کە سنووره داسەپاوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ببەزێنێت. ئەم ناسیۆنالیزمە زۆر لەوە بێهێزتر بووە کە شانبەشانی ئەجێندای گەلێک ڕێکخراوی ناسیۆنالیستیی تری دەوڵەتەکانی تورکیی و ئێرانیی و عێراقیی ببێتەوە. بۆ شکستپێهێنانی کوردەکان ئەو دەوڵەتانەی کە زاڵبوون بەسەر چەند پارچەیەکی هەرێمی کوردەکاندا بەزۆری پەنایان بردۆتە بەر توندوتیژیی و. ئەمەش لەهیچ شوێنێک هێندەی عێراقی سەدام دەرنەکەوتووە.

ڕۆژئاوا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە لە چاوپۆشیی لەئاست ئەو تاوانە گەورانەی کە لە دژی کوردەکان ئەنجام دراون. بێگومان، کوردەکان هەمیشە بوونەتە قوربانی واقیعە جیۆگرافیە زاڵەکان. وەکو ئەگەری هەڕەشەی ئێران بۆ سەر ناوچەی کەنداوی فارس، یان هێزی ئابووریی عێراقی پشتئە ستوور بە یەدەگە نەوتییەکانی. ڕاستییە تاڵەکە ئەوەیە. لەم سەردەمەدا کە تۆنی بلێر باس لە" سیاسەتێکی دەرەکی مۆراڵییانە" دەکات و جۆرج بوشی کوڕ جەخت دەکاتەوە لە سەر مافی دیموکراتییانەی عێراقییەکان، پێکهاتەی سروشتی نەوتی کوردستانی عێراق و بەرژەوەندی دەوڵەتانی دراوسێ و کۆنەپارێز، ئەمڕۆ هەروەک سەردەمی دامەزراندنی عێراقن، سەدەیەک پێشتر، کاریگەرییان چۆن بووە بە سەر سیاسەتی دەرەکی زلهێزەکانەوە، هەنووکەش هەر وایە.

## گەشەسەندنی بزاڤی نەتەوەیی کوردیی لە عێراقدا، 1918-1991

مێژووی تازەی کوردەکان لەعێراقدا (لەساڵی 1991-وە) بەتوندی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوان( کوردەکانی عێراق)، میللەتێکن خاوەنی ئاستێکی بەرزی ئایدینتیتیی هاوبەشcommunal {دەستەجەمعیی}ن، کە دەخوازن بین بە واقیعێکی دەزگایی لای کەم لە دەوڵەتی داهاتووی عێراقدا ئەگەر لەوەش زیاتر نەبێت.[266] مێژووی کوردەکانی عێراق لێوانلێو بووە لە خەباتێکی بێئامان لە دژی دەسەڵاتی بێشوماری دەوڵەتی سوننە-سالاری عێراق، کە سوور بووە لە سەر پاراستنی یەکپارچەیی خاکی وڵاتەکەو پێگەی سوننەکان تیایدا. سەدام هەرگیز کەسێکی ناوازە نەبوو لە هەوڵەکانیدا بۆ دامرکاندنەوەی کوردە شۆڕشگێڕەکان. بە سادەیی، ئەو لەوانەی پێشووی خۆی ئامادەتر بوو بۆ پەنابردنە بەر توندوتیژیی دڕندانەتر. لێرەوە، شتێکی باش دەبێت کە بەدوای مێژووی سەختی گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی کوردیی بکەوین بە درێژایی مێژووی عێراق، دیارترین کەسایەتییەکانی ئەو گۆڕانکارییانە دەستنیشان بکەین تا سەردەمی دوای 1991.

پێویستە سەردەمی دوای 1991 بە جیا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، چونکە بە هەموو ماناو مەبەستێکەوە، کوردستان(لە دوای 1991)، بوو بە وڵاتێکی جیاواز و سیماکانی بزاوتە سیاسییەکەی گۆڕان، چونکە کوردستان هەرچی زیاتر، بوو بە هەرێمێکی بە دامودەزگاییکراو لە سایەی حکومەتێکی خۆماڵییەوە. بە درێژایی مێژووی مۆدێرنی عێراق زۆرجار بزوتنەوەی سیاسیی کوردیی ئالۆز و شێواو بووە. پارتە سیاسییەکان، خێڵەکان، بزوتنەوە، میلیشیا، کۆمەڵە سیاسیی-ئابووریەکان و بیروباوەڕە ئایینییەکان لە گەڵ دەستێوەردانی دەرەکیی و ململانێی شەخسیی سەروسەکوتی هەبووە—ئەمەش بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی چالاکییەکی سیاسیی ناجێگیر و زۆرجار پڕ توندوتیژیی. بە چاوتروکانێک بۆی هەبوو دۆستەکان بگۆڕێن بەدوژمن، بە پێچەوانەشەوە، وەختێک پێویستی کرد سەرسەختترین دوژمنەکان بین بە دۆستی گیانیی بەگیانیی. لەگەڵ ئەوەشدا، سیمای بەردەوامی ژیانی سیاسیی کورد

بێتوانایی سەرکردایەتی سیاسیی کوردیی بووە لە وەرگێڕانی زمانی سادەی ناسیۆنالیزمی کوردیی بۆ هاوسۆزیەکی سیاسیی و سەربازیی ڕاستەقینە لە سەر ئەرزی واقیعدا لەکاتی مامەڵەکردن لە گەڵ بەغدادا.
لە جیاتی ئەوە پارتە کوردییەکان هێزە کەمەکانی خۆیان بۆ شەڕی دژ بە یەکتر بەکارهێناوە لە پێشبڕکێی ناوخۆیی خۆیان لە سەر سەرکردایەتییکردنی بزوتنەوەی سیاسیی کورد لە عێراقدا. ئەم جۆرە شەڕانە هەر لە ڕووی سەربازییەوە ماڵوێرانکەر نەبوون، لە ڕووی سیاسیی درێژخایەنیشیەوە، ئەم شەڕانە ماڵوێرانکەر بوون، چونکە بەغداد سوودی لەم خەوشە سروشتییانەی سیاسەتی کوردیی وەرگرتووە. زۆرجار، "سەرکەوتنی" کوردیی تەنها سەرکەوتنی پارتێکی سیاسیی بووە بەسەر نەیارەکەیدا. ئەمە لە پاڵ ئەوەدا کە خودی پێوەندیی نێوان کوردەکان و بەغداد لە ڕووی مسۆگەرکردنی هەر جۆرێک لە ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردان بە کەمی گۆڕاوە.
کەچیی لە گەڵ ڕژێم گۆڕیندا بە سەرکردایەتی ئەمێریکا، کوردەکان کەوتنەوە بەر ڕووناکیی و لەپڕ سەرکردە و ڕێکخراوە کوردییە جیاوازەکان بوونە میوانی بەردەوامی سەر هەواڵە جیهانییەکان؛ جەلال تاڵەبانیی و مەسعود بارزانیی( سەرۆکەکانی هەر یەک لە یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و پارتیی دیموکراتی کوردستان) بوون بە نمونەی تەقلیدیی سەرکردە سیاسییە پێشکەوتووەکان، وەکو ئاماژەیەک بۆ ئەوەی کە عێراقییەکان دەکرێ ببن بە دیموکراسییخواز و ئاشتییخواز. ئەگەر بواریان پێبدرێت. وا پێدەچوو کە مەسەلە بەرتەسکەکان وەلانرابن، چونکە سەرکردە کوردەکان، کە لەگەڵ گرنگییپێدانی چڕی میدیاکان ڕانەهاتبوون وا خۆیان پیشان دەدا کە یەکگرتوون و دڵسۆزن لە هەوڵدانیاندا بۆ لێدانی سەدام.
پێویستە هەڵسەنگاندنێک بۆ ئەوە بکەین، ئاخۆ ئەم لێکنزیکبوونەوەیە چەندە ڕاستەقینەیە و دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردیی لە باکووردا چەندە سەرکەوتووە. لە کاتێکدا ئێستا پارتە سیاسییە کوردییەکان یەکێک لە بەتواناترین هێزەکانن(ئەگەر بە تواناترین نەبن). لە ناو هەلومەرجی دوای-سەدامدا. پێویستە کە لە مێژووی سیاسیی ئەو ململانێ و نەیارییە تێبگەین کە تا ئێستاش کاری

پارتە سیاسییە سەرەکییەکان و سیاسییەکان ڕەنگرێژ دەکات. هەروەها لە وەش حاڵی ببین کە ناسیۆنالیزمی کوردیی چۆن بە درێژایی ناوەراستی سەدەی بیستەم لە عێراقێکدا پەرەی سەندووە کە زیاتر لەڕێگەی توندوتیژییەوە حوکمی بە سەر کوردەکانی خۆیدا کردوە تا دڵڕاگرتن.

## دەوڵەت دروستکردن و کوردەکان دوابەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم

دوا بەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم، کوردستان داشی شەترەنجی زلهێزەکان بوو. هیوای دەوڵەتێکی کوردیی کە لە لایەن بریتانییەکانەوە باسی لێوە کرابوو لە بەین برا دوای ئەوەی دەرکەوت نیگەرانییە جیۆپۆلیتیکیەکانی ناوچەکە گرنگییان زیاتر بوو بۆ بریتانییە سەرکەووتوەکان و تورکیای ئاشتبووەوە. لە دوای هیوا بەراییەکانی دەوڵەتێکی کوردیی کە لە خۆڵەمێشی ئیمپراتۆری عوسمانیەوە سەریانهەڵدا. دژایەتیکردنی ئەتاتورک هاوکات لەگەڵ سروشتی پەرتەوازەیی سەرکردایەتی کوردیی و فێڵ و پلانەکانی بریتانییەکان، مانای ئەوە بوو کە کوردستان بە سەر ئەو بەشانەی ئێستایدا دابەشکرا. زەرورەتی بەرهەمهێنانی قەوارەیەکی سیاسیی لەبار لە ناوچەی باشووری میزۆپۆتامیا (ویلایەتەکانی بەسرەو بەغداد) وای لە بریتانییەکان کرد کە خیانەت لە بەڵێنەکانی پێشوویان بکەن لە مەڕ ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردەکان. بە فیعلیش سەرەنجام بەشی باکووری کوردیی بەسترایەوە بە بەغداد و بەسرەوە بۆ پێکهێنانی عێراق. چەند حیساباتێکی سیاسیی، سەربازیی و ئابووریی لە پشت ئەم بڕیارەوە بوون. تەنانەت لەم کاتەشدا، بریتانییەکان سووربوون لە سەر ئەوەی کە عێراق لە لایەن

سوننەکانەوە دەستی بە سەردا بگیرێت نەک شیعەکان. تەنانەت ئەگەر ناچاریش بن کوردەکان بە سوننە حیساب بکەن؛ لە ڕووی سەربازییەوە، لە چیاکانەوە زۆر باشتر دەکرا بەرگری لە میزۆپۆتامیا بکرێت تا لە دەشتایەوە. لەوەش گرنگتر ئەوە بوو کە چەند ئاماژەیەک هەبوون بۆ بوونی کانگای نەوت لە هەرێمی کوردیی لە کەرکوکدا.
دەرکەوت کە ئەم قەوارە سیاسییە لەبارە تەنها هێندە لەبار و کارپێکراوە کە حکومەتی ناوەندیی ئامادە بێت هێز بۆ جڵەوکردنی یاخیبووە کوردەکان بەکار بێنیت. ئەو میتۆدانەی کە بریتانییەکان لە دوای سەردەمی شەڕی جیهانیی یەکەمدا بەکاریان هێنابوون بە بەرنامە بۆ ڕێنماییکردنی ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق. لە سەرەتادا بریتانییەکان پەنایان برد بۆ ڕاکێشانی کوردەکان بۆ ناو حکومەتی عێراق بە دڵڕاکێشانی سەرۆک هۆزە بەهێزەکان لە ڕێگەی دانپێدانان و بەهێزکردنی بونیادی لۆکاڵی خۆیان. یارمەتی دارایی دەدرا بە سەرۆک هۆزەکان. هەروەها پشتیوانیی سەربازییش پێشکەش دەکرا بۆ ملپێکەچکردنی هۆزە سەرەکییەکان. بە دڵنیاییەوە، ئامانج لەمە ڕاگرتنی کۆنترۆڵی بریتانییەکان بوو بە سەر هەرێمی کوردییدا. بەڵام لە دوای ئەوەی کە دەسەلاتی لۆکاڵیی شێخەکان بەهێز بوو، دەریشکەوت کە بریتانییەکان ئامادە نین دەسەلاتی زیاتریان پێبدەن، حکومەتی ناوەندیی و سەرپەرشتیارە بریتانییەکانیان گەڕانەوە بۆ بەکارهێنانی ئامرازەکانی داپڵۆسین دژ بە دروستکراوە سەرسەختەکانی خۆیان.
بەناوبانگترینی ئەم کەسایەتییە کوردانەی پێشوو شێخ مەحمود بەرزنجیی بوو لە سلێمانیی. ئەو کە سەرۆک هۆزێکی دیار بوو، لە لایەن بریتانییەکانەوە پەروەردەکرا بوو تا دەوری حاکمی لۆکاڵی ناوچەکە ببینێت. کەچیی، دوای ئەوەی کەڵکەڵەی سەرکردایەتی نەتەوەیی کەوتەسەری و گوێڕایەڵی خەڵکیی مسۆگەرکرد، بریتانییەکان ڕوویانکردە بۆمبارانی ئاسمانیی و گازبارانکردنی گوندەکان بۆ ڕێگەلێگرتنی.[267] ئەم شێوازە لە پێوەندی نێوان بەغداد و کوردستانی عێراقدا ڕەنگیدایەوە تاکۆتایی ئەم سەدەیە(بیستەم). لەگەڵ ئەوەشدا، کە توانای کڕینی پاڵپشتیی کوردەکان زیادی کرد بە زیادبوونی داهاتەکانی نەوت.

هـەمان سـامان پارمـەتی بەغدادی دا بۆ ئەنجامدانی شاڵاوی سەربازیی زۆر کارەساتبار لە دژی کوردەکان.
دەسـەڵاتپێدان و زیندووکردنـەوەی بونیـادی خێڵـەکیی لەکوردسـتاندا، کـە تیایـدا ئاغـا بـەرچاوەکان خرانـە شـوێنی دەسـەڵات لـە سەرتاسـەری ناوچەکەدا. هەرگیز نەبوو بە مایەی نیگەرانیی بریتانییـەکان و حکومـەتـی عێراقیی. ڕەنگە سەرکردایەتی خێڵـەکیی بـۆ زۆرێـک لـە کـوردان شـتێکی ئاسایی بووبێت. بەڵام ئەمە لە سەردەمی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییدا لـەعێراق و کوردستاندا ڕوویدا و زۆرێک لە خەڵکیی ڕقیـان لـە پێگـەی خـوازراوی خێڵـەکان و ئـەو دەسـەڵاتە دەبـۆوە کەهـەیان بـوو.[268] چینێکـی نـوێی ناخێڵەکیی لە خەڵکانێکی خوێندەوار و پسپۆڕ، کە پشتئەسـتوور بـوو بـە سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمۆنیستی لـە ڕوسـیادا. بـەرە بـەرە لـەو شـارانەی کوردستانی عێراقدا دەردەکەوت کە بە خێرایی لە بەرفراوانبووندا بوون.
کەواتـە. کۆتـایی جـەنگی جیهـانی یەکـەم دەرکـەوتنی دوو دینامیکیـەتی بەخۆوە دیت کە هەردووکیان بەرهەمی دەستێوەردانی بریتانییەکان بـوون. یەکـەم" باشـووری" کوردسـتان خزێنرایـە نـاو عێـراق بـەهۆی چەنـد هۆکارێکەوە کە بەدەربوون لە دەسەڵاتی خـودی کوردەکـان و خرایـە ژێـر دەسـەڵاتـی حکومـەتی عـەرەبیی. ئەمـەش لـە ئـان و سـاتی سـەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردییدا. دووەم. دەسەڵاتپێدانی سەرۆک خێڵەکان لە لایـەن بریتانییەکانـەوە ململانێـی لـە نـاو کوردسـتاندا خولقانـد. ئەمـەش لەگـەڵ سەرهەڵدانی چینێکی ناخێڵـەکیی سیاسـیی نوێـدا لـە شـارەکاندا. میراتـی هەردوو ئەم دینامیکە هێشتا لە عێراقی ئەمڕۆدا ئاشکران.

## دامەزراندنی پارتیی دیموکراتی کوردستان

سـەرهەڵدانی ناسـیۆنالیزمی کـوردیی لەعێراقـداو دابەشـبوونی لەمێژینـەی نێوان خێڵەکان و شارییەکان هەردووکیان پێکەوە لـە دامەزرانـدنی پ.د.ک دا هاتنـــە ئـــاراوە.[269] پ.د.ک کـــۆنترین و دامـــەزراوترین قـەوارەی سیاسـیی کوردەکـانی عێراقـە. پارتـە سـەرەکییەکانی تـریش لە نێویاندا (ی.ن.ک)ە کە ئەویش لە دابەشبوونەکانی نـاو خـودی پ.د.ک ەوە پێکهـات. پ.د.ک لەسـاڵی 1946 دا دامـەزرا و ڕەنگدانـەوەی ئـەو سۆزە نەتەوەییـە بـوو کـە لـەدوای جـەنگی جیهـانی یەکەمـدا لـە عێراقـدا

دەرکــــــــــەوت. پ.د.ک کـە لـە سـەر شـێوازی حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران( حـدکا) دامـەزرا. هـەر لـە بەراییـەوە هاوپەیمانییـەکی ناجێگیر بوو لەنێوان خێڵەکان و توێژی ڕۆشنبیری شاردا. هـەر لایـەکیان سـەرکردایەتییەکی تایبـەتییان هـەبوو. خێڵـەکان لـە ژێـر کـۆنترۆڵی بەنفوزترین سەرۆک خێڵی ئەو کاتە بوو کە مەلا مستەفای بارزانیی بوو.
تـوێژی ڕووناکبیرەکـانیش{ ئینتێلەجێنسـیا intellegensia } لـە ژێـر کۆنترۆڵی دەستەیەک لە کەسایەتیە ڕووناکبیرەکاندا بوون. وەکو ئیبـراهیم ئەحمەدی شاعیرو دواتـر شـاگردەکەی protégé { پرۆتیـژێ. وشـەیەکی فرانسییە- وەرگێڕ} جەلال تاڵەبانی: پێوەندیەکی شـێواو بـوو کـە تیایـدا دوو گـرووپ کۆکرابوونـەوە کەشـتی هاوبەشـیان کـەم بـوو لـە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە. بۆ نموونە. چەپـە شـارییەکان خێڵـەکانیان بەدواکـەوتوو و فیودالْ دەزانی. کە چەنـد سـەرۆکێکی کـەم کـەڵکی لێـوەردەگرن لـە سـەر حیسابی جەماوەری زۆرینە. لەمەوە. ئـەوان لەگـەڵ ئـەو سیاسـەتانە بـوون کـە ئامانجیـان دابەشـکردنەوەی یەکسـانانەی زەویـی بـوو--- ئەمـەش هەڵوێسـتێک بـوو بـە ئاشـکرا هەڕەشـەی دەکـرد لـە سـەرۆک هۆزە دەسەڵاتدارەکان کە نفـوزی سیاسـییان ڕاسـتەوخۆ بـە ڕێـژەی ئـەو خاکەی کە لە ژێر دەستیاندابوو گرێ درابوو.
لە گەڵ ئەوەشدا. بـەبێ گوێدانـە بەرژەوەندییـە چینایەتییـە جیاجیاکانیـان هەردوو گرووپەکـە پێویسـتیان بـە یـەکتر بـوو. مـەلا مسـتەفا پێگەیـەکی گرنگی لەناو بزوتنەوەی نەتەوەیی کورددا دابین کردبوو لە عێراقدا وەکـو سەرکردەیەکی ئیلهامبەخش کە لە پێنـاوی بەرژەوەندییـەکانی گەلەکەیـدا لـە چیـا سـەختەکانی بـاکووردا دەجەنگا. توانـا ئـەفسـانییەکانی لە بەرپەرچدانـەوەی شـاڵاوە سـەربازییەکانی حکومـەتی عێراقییـدا مانـای ئەوە بوو کە ئەو پێگەی ڕێز و سەرسامی داگیر کردبـوو لـە دڵ و زەینـی کوردە خێڵەکییەکان و ( هەنـدێک لـە شارنشـینەکانیش). ئـەو بـەکردەوە. خاڵێکی کۆکەرەوەی نەتەوەیی بوو --- کەسـایەتییەکی کاریزمـایی بـوو کە شەرعییەتی ئەخلاقیی دەدا بە هەر بزوتنەوەیەکی سیاسیی کوردیی.
بـەلام. زەمینـەی دەسـەڵاتی جـەماوەریی کـوردیی هـەرچی زیـاتر دەبـوو بـە شارسـتانیی. هـەروەها میتـۆد و ئـەزموونی ڕۆشـنبیرەکان لـە گـەڵ پەرەسەندنی چالاکیی سیاسیی ڕێکخـراودا هـەرچی زیـاتر گرنگـی پەیـدا

دەکرد. ئینتێڵەجێنسیا. لە لایەن کوردانی ناوچەی سلێمانیی یان دانیشتوانی شارە گەورەکانی عێراقەوە دەستی بە سەردا گیرا بوو لە نێویاندا بەغداد. دیارترینی ئەمانە ئیبراهیم ئەحمەد و پاشان جەلال تالەبانیی بوون. ئیبراهیم ئەحمەد کەسێکی خوێندەواری شارستانیی کورد بوو. خالیی بوو لە سۆزی خێڵەکییانە و بیروباوەڕێکی سۆشیال-دیموکراتیی بە هێزیشی هەبوو. ئەزموونی وەکو ڕێکخەری چالاکییەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان-ئێران. {حدکا} لە عێراقدا لە سەرەتای سالانی 1940دا. هاوشان لە گەڵ کارامەیی لە ڕێکخستنی هێزە سیاسییەکاندا. ئەو توانا ڕێکخراوەیی و پاشخانە ئایدۆلۆژییە زەروورەی پێدا بوو کە بتوانێت باڵی چەپی ناو کوردانی عێراق مۆبەلایزە بکاتەوە.
لێرەوە، مەلا مستەفا شەرعییەتی دابینکردبوو. ئیبراهیم ئەحمەدیش شارەزایی ڕێکخستن و زانیاریی بۆ چۆنێتیی کارکردن لە نێوەندی شارستانیی و نیشتمانییدا هەبوو. لە پێناوی ئەوەدا کە بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردیی پەرە بستێنێت بۆ ئەودیوی شۆڕشی بەرتەسکی خێڵەکییانە ۆ وتارنوسینی ناو شارەکان. مەلا مستەفا هاوپەیمانێتییەکی ناجێگیریی لە گەڵ ئینتێڵەجێنسیای شارییدا ئیبراهیم ئەحمەد بەست. ئەم یەکێتییە گەلێک گرنگ بوو چونکە هۆزەکان و ڕۆشنبیرەکان چەند ناوچەیەکی جێوگرافی جیاوازیان داگیرکردبوو. ئەو خێڵانەی کە لایەنگری مەلا مستەفا بوون لە باکووری رۆژئاوای کوردستانی عێراقدا نیشتەجێ بوون. لە ناوچەی چیا بەرزەکان. لە کاتێکدا ڕۆشنبیرەکان لە شارە گەورەکانی سلێمانیی و کەرکوک و بە ڕێژەیەکی کەمتریش لە شاری هەولێر نێشتەجێ ببوون. بەمشێوەیە پ.د.ک دامەزرا کە مەلا مستەفا سەرۆکی بوو. لە سەرەتادا ئەو هەولێدا کە بە سەر پارتەکەدا زاڵبێت ئەویش بە دانانی چەپڕەوێکی ملکەچ( هەمزەعەبدوڵڵا) بە سکرێتێری گشتیی. کەچی لە گەڵ کەوتنی هەرەسی کۆماری کوردیی مەهاباد لە ئێران لە ساڵی 1947 دا و دواتر دەربەدەربوونی مەلا مستەفا بۆ یەکێتی سۆڤێت. ئیبراهیم لەساڵی 1951 بە سکرتێری گشتیی هەڵبژێردرا و پارتەکە لە لایەن ڕۆشنبیرەکانەوە دەستی بە سەردا گیرا.[270]

## بەرەو دابەشبوون

رژێمی پاشایەتی عێراق. لە ساڵی 1958 دا لە لایەن عەبدولکەریم قاسمەوە ڕووخێنرا. لە دوای ئەوەی قاسم پشتیوانیی پ.د.ک ی لە کوودەتاکەدا بە کارهێنا. هەر زوو چەند سیاسەتێکی گرتەبەر کە بە تایبەتیی بۆ پارچەپارچەکردنی توانای سیاسیی کوردەکان داڕێژرا بوو. ماوەیەکی کەم لە دوای وەرگرتنی دەسەڵات زنجیرەیەک ڕیفۆرمی کشتوکاڵیی خستەکار کە بۆ بێهێزکردنی بەرژەوەندیی خێڵە موڵکدارە گەورەکان داڕێژرابوو. بە هۆی ئەمەوە. هاوپەیمانیی نێوان خێڵەکان و شارییەکان تێکوپێکدرا. ئەو خێڵە موڵکدارانەی کە ددانیان دەنا بە دەسەڵاتی سەربازیی مەلا مستەفادا. لە گەڵ بارزانییدا گەیشتنە ڕێککەوتنێک کە بەو هۆیەوە بارزانیان دنەدا دژ بە حکومەتی عێراقیی لە بەرامبەر پشتیوانییکردنی هۆزە کوردییە سەرەکییەکاندا بجەنگێ. بە پێچەوانەوە. ڕێکخراوە کوردییەکان( جوتیاران و ئەندازیاران و شتی تر) لایەنگیری خۆیان بەخشی بەو بەشەی پ.د.ک کە سەر بە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی بوو. چونکە ئەوە لە بەرژەوەندیی ئەماندا بوو کەسیاسەتەکانی قاسم بپەژرێنن و ئەو سیستمە فیوداڵییە بێهێز بکەن کە لە کوردستاندا بڵاو بوو لەو کاتەدا.[271]

لە 1960 دا کوردستانی عێراق لە نەهامەتییدا بوو. مەکتەبی سیاسیی پ.د.ک بەردەوام بوو لە ددانپێدانان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا لە بەر زەرورەتی سیاسیی. لە گەڵ ئەوەشدا لە دەرەنجامی ڕیفۆرمی کشتوکاڵییەوە خێڵەکان زۆرتر رادیکاڵ بوونەوە. قەیرانێکی لە نێوان کوردەکان و بەغدادا خولقاند. پ.د.ک بەهۆی پێوەندییەکانییەوە تێوەگلێنرا. دوای ئەوەی قاسم پێشنیارێکی هاوبەشی مەلا مستەفا و پ.د.ک ی ڕەتکردەوە لەمەڕ مافی کوردەکان لە ئاداری 1961 دا. مەلا مستەفا بانگەوازێکی بلاوکردەوە بۆ هەموو کوردەکان بۆ چەکهەڵگرتن لەدژی هێزە عێراقییەکان—ئەمەش بە فیعلی ئاماژەدانبوو بۆ دەستپێکردنی شۆڕشی کوردیی لە عێراقدا—لە11ی سێپتەمبەردا.

لە دوای ئەوەی کوودەتاکەی فێبریوەری 1963 قاسمی لابرد و بەزوویی کورسی دەسەڵاتی لە بەغداد. بە حیزبی بەعس دا. مەلا مستەفا لە جیاتی

گەلی کورد سیاسەتەکانی پەژراند بەبێ ڕەزامەندی پێشینەی مەکتەبی سیاسیی پ.د.ک. لە هەموو ئەمانەش خراپتر، ئەو ڕازییبوو بەئاگربڕ بە بێ بەشداریی مەکتەبی سیاسیی و لەوەش زیاتر هاوپەیمانێتییەکی لەگەڵ حیزبی بەعسدا پەژراند. کە ڕێگەی دا بە گەڕانەوەی ئارەزوومەندانەی هێزەکانی حکومەت بۆ ناوچەکە و حیزبەکانی هەڵوەشاندەوە(لەنێویاندا پ.د.ک) کەچی بواریدا بە خێڵەکان بەردەوام بن لە سەر چالاکییەکانیان. ئەم ماوەیە نوقڵانەی دەرکەوتنی دابەشبوونێکی بە ڕووکار حەتمی پێبوو لە نێوان خێڵەکان و ئینتێلەجێنسیای کوردا. سیاسەتەکانی بەغداد و پەژراندنیان لە لایەن مەلا مستەفاوە. سەریکێشا بۆ جیابوونەوەی ناسیۆنالیستەکانی شار لە سەرکردایەتی خێڵەکیی. ئەم شەڕی بەیەکداشاخان و تۆڵە ئەستاندنەوەیە هیچی ئەوتۆی نەکرد بۆ پتەوکردنی هێزی یەکێتیی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد.
لەو کاتەدا کە بەعس بۆ دووەم جار لە ساڵی 1968 دا دەسەڵاتی گرتەوە دەست. مەلا مستەفا هێزێکی سیاسیی پێشەنگ بوو لە ناوچەکەدا. دەسەڵاتی حەتمیشی بەسەر باکووری عێراقدا هەبوو. ڕژێمی بەعسی ناچارکرد کەگفتوگۆی لە گەڵدا بکەن. سەدام حوسێن. جێگری سەرۆک کۆمار و دوژمنی سەرسەختی داهاتووی کوردان. خۆی چوو بۆ کوردستان و لە گەڵ مەلا مستەفادا دانیشت. بەعسییەکان کە لەو کاتەدا لە خەمی سەقامگیریی ڕژێمی بەعسی ساوادا بوون. لەو کاریگەریە خراپە دەترسان کە مەلا مستەفا دەکرا هەیبێت بە سەر سیاسەتی عێراقییەوە. ئامادە بوون کەموزۆر هەر شتێک ببەخشن کە زامنی مانەوەی خۆیان بکات. بێگومان. سەدام کاغەزی سپیی دا بە مەلا مستەفا کە ئەو سەرکردە کوردە دەیتوانی داخوازییەکانی لەسەر بنوسێت. سەدام لەگەڵ خۆیدا ڕێککەوتنێکی بردەوە بۆ بەغداد تا ئەو کاتە باشترین سازش بوو پێشکەش بە کوردەکان کرابێت. ئەو مامەڵەیە بە ڕێککەوتنی ئادار ناسراوە. ئەمە وانەیەکی ڕیسوایی بوو کە سەدام هەرگیز لێی خۆشنەدەبوو و لە بیری نەدەکرد.
بە گویرەی ڕیککەوتنی ئادار پێنج کورد خرانە ناو کابینەی حکومەتی عێراقەوە. ڕێگەدرا بە زمانی کوردیی، وەک زمانی فەرمیی. بڵاوکراوە و چاپەمەنیی بە زمانی کوردیی بە یاسایی کرا. لە نێو

کێشــە هەڵپەســێراوەکاندا حاڵەتی کەرکوک و ئـەو میکانیزمـە بـوو کـە بە هۆیەوە ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەستنیشان دەکـرا. لـە کاتێکـدا بـەعس بـە فیعلـی گەمـەی بـەکات دەکـرد. کوردەکـان بـە هـەردوو دەسـتەکانیان ئـەو هەلانـــەیان قۆســـتەوە کـــە پێشکەشـــیان کرابـــوو. یـــەکێک لـــە گفتوگۆکـــەرە کوردەکـــانی ڕێککـــەوتنی ئـــادار. ســـامی عەبـــدولرەحمان کە وەزیـری کاروبـاری بـاکووریش بـوو لـە حکومـەتی تـازە دامـەزراوی عێراقدا. کە دواتریش یەکێک بوو لە ئەکتەرە سیاسییە کاراکـانی دەوڵـەتی دیفاکتۆی سالانی 1990 ەکان. ماوەی سالانی 1970 بۆ 1974 – ئـەو ماوەیـەی کەبـەگوێرەی ڕێککـەوتنی ئـادار بـەڕێوەدەچوو—وەسـفی ئـەو ماوەیەی کردووە بە" سەردەمی زێڕین". لە ماوەی ئەم سـالانەدا کوردەکـان شارەزاییان پەیدا کرد لە سەر ئیدارەی لۆکالیی و حکومکردنی ڕاستەوخۆ. ئـەو شـارەزاییانەی کـە لـە سـالانی 1990 ەکانـدا دەرکـەوت بـە کـەڵک بوون.[272]

کـــەچیی ڕێککەوتنەکـــە تەمـــەنی کـــورت بـــوو. کـــە ڕژێمـــی بـــەعس بەرەبـەرە بناغـەی دەسـەلاتەکەی پتـەو دەکـرد. دژایـەتیی مـەلا مسـتەفا لە بەرامبەر بەغداد زیاتر دەبوو. بەعس پاڵنەرێکی ئەوتۆی نەبوو بۆ ملدان بە داخوازییەکانی کـورد لـە سـەر مەسـەلەی خـاک. مـەلا مسـتەفاش هـیچ چارەیەکی دیکەی نـەبوو جگـە لـە ملدان یـان پـەنابردن بـۆ پشـتیوانیی دەرەکیی. ئەو کە هەمیشە سەرکردەیەکی بـەعیزەت بـوو. ئـەوەی دووەمـی هەڵبژارد. کوردەکـان ڕەتیـانکردەوە کـە سـنوورەکانیان لـە گـەڵ ئێرانـدا دابخـەن و داوای یارمـەتییان لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکان کـردو پشـتیوانی ئیسرائیلیشـیان پەژرانـــد. حکومـــەتی عێراقیـــی کـــە توشـــی ئەگـــەری دەستێکەڵکردنی کوردەکان لەگەڵ سێ لە نەیارەکانی ڕژێم ببۆوە. جـارێکی تر پەنای بردە بەر ئامرازی تاقیکراوەی پلانگێڕیی .

لەسـاڵی 1974 دا دەسـتیکرد بـە جێبـەجێکردنی شـێوازێکی کلـک و گوێکراوی ڕێککەوتنی ئادار( کەبەیاسای ئۆتۆنۆمی ناودەبرێت)گفتوگـۆی لە گەڵ بارزانییدا نەپەژراند. بەڵکوو لە گەڵ 600 کەسـی دژ بـە بـارزانی لە نێویاندا هەندێک لە وانەی باڵی ئەحمەد- تاڵەبانی. مەلا مستەفا یاسـای ئۆتۆنۆمی ڕەتکردەوە و جارێکی تر خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕکردن لە دژی بەغـداد. چـاوەڕوانی ئـەوەی دەکـرد کـە پشـتیوانی ئێـران بـە ئامـانجی

دەگەیـەنێت. بـە کـەڵک وەرگـرتن لـە ئـەزموونی ڕابـردوو جێگـەی سەرسورمان نەبوو کە ئەم ستراتیژە شکشتی هێنا.
وەکـو بەڵگەیـەکی بـەرچاوی سـادەیی بـەرخوردی کوردەکـان لـە گـەڵ وردەکارییـەکانی دیپلۆماسـییەت و ئـەو خێراییـەی کـە دەکـرێ مامەڵە( سیاسییەکان) تیایدا بکـرێن و نـەکرێن. سـەدام بەرەکـەی لـە ژێـر پێیاندا دەرهێنـا. لـە6 ی ئـاداری 1975 دا، لـە کۆنفرانسـی ڕێکخـراوی وڵاتانی هەناردەی پێترۆڵ(OPEC) لـە جـەزائیر، سـەدام و شـای ئێـران هەموو جیاوازییە هەڵپەسێردراوەکانیان یەکلاییکرەوە. هەردووکیان لە سـەر دابینکردنـی ئاسایشـی سـنوور ڕێککـەوتن. سـەرچاوەی ژیـانی پێشـمەرگە کوردەکـانی مـەلا مسـتەفا لـە نێـوبرا. بـارزانیی بانگـەوازی کۆتاییپێهێنـانی شۆڕشـی کـوردیی ڕاگەیانـد لـە23 ی ئـاداری 1975 دا. داوای پەنابەری لـە ئێـران کـرد و هـەرگیز بـە زینـدوویی نەگەڕایـەوە بـۆ کوردستان. پ.د.ک وەکو هێزێکی سیاسیی لە نێوبرا و حکومەتی عێراقیی بە زوویی کەوتە جوڵە بۆ دەستبەسەرداگرتنی کوردستان. وا پێدەچوو کـە خەبات بۆ قەوارەیەکی کوردیی لە عێراقدا بە هـۆی دەستەوسـتانی بـەرەی خێڵەکی و ڕۆشنبیران بۆ دروستکردنی بەرەیـەکی یـەکگرتوو لاواز ببـوو. هاوکات ئەمانـە لـە گـەڵ زیـادبوونی توانـای بـەغداد لـە سوودوەرگرتن لە جیاوازییەکانیان مکۆمتر بوو.
حکومەتی عێراقیی کە سوور بوو لـە سـەر پرسـیار نەخسـتنە سـەر بـاری ئێسنیکیی شاری کەرکوک لە داهاتوودا، دەستی دایە هەڵمەتێکی بەرفراوان کە مەبەست لێی گۆڕینی سیمای دیمۆگرافیی هەموو کوردستانی عێراق بوو بـە هـەولێر و دهـۆک و سلێمانییشـەوە بـەڵام بـە تایبـەتیی کـەرکوک. ناوچە گوندییەکان چۆڵکران و دانیشـتوانەکەی لـە ئۆردوگاکـانی نزیکـی شـارەکان نیشـتەجێکران. حکومـەت تەنانـەت سـنوورە ئیدارییـەکانی کەرکوکیشـی دارشـتەوە بـۆ مسـۆگەرکردنی ئـەوەی کـە عەرەبـەکان بـبن بە زۆرینە لە ناوچە سەرەکییەکانی شارەکەدا. هەروەها پارێزگای کـەرکوک ناوی کرا بە( التأميم)( کەماناکەی دەبێتە" خۆماڵییکردن"). بـۆ ئـەوەی تـام وبۆیەکی ناسیۆنالیستانەی عەرەبیی زیاتری پێبدات. ڕێکخراوی چـاودێری مافی مرۆڤ مەزەندەی ئەوە دەکات کە چەند سەد هـەزارێک لـە خـەڵکانی غەیرە عەرەب لە شوێنەکانی باکوور دەرکراون و بـەرەو چەنـد شـوێنێکی

باشـــووری عێـــراق یـــان بەرەو ئـەو کامپانـە { ئۆردوگـا } بـراون کـە دەکەونە بەینی ڕێگـا سـەرەکییەکان لـە نێـوان سـالانی 1976 و 1986 دا.[273]

کەواتە سەرەتای حـەفتاکان و لـە لوتکەکەیـدا 1975، خـاڵی گۆرانکـاریی بوو لە بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردییـدا لـە عێـراق. لـەو سـەردەمەدا کوردەکـان بـەرزترین ئاسـتی ئۆتۆنـۆمیی و پەرەسـەندنی سیاسـییان بەخۆیانەوە دیوە هەتا ئەمڕۆ. کەچیی ناشارەزایی خۆیـان لـەو سـەردەمەدا دەرخسـت لـە مامەڵـەکردنیان لـە گـەڵ دەوڵەتـە دەرەکییەکانـدا و بێهێـزی خۆیشیان دەرخست لە مامەڵەکردنیان لە گەڵ ڕژێمی بەعسدا. دوای ئەوەی بە ڕووکار مافـە ئۆتۆنۆمییـەکانی خۆیـان مسـۆگەر کـرد لـە کوردسـتاندا. دەسـکەوتەکە لـەدەسـت دراو سـەدام بـە ئاسـانی ململانـێ سیاسـییەکەی لێبردنەوە. مەلا مستەفای" نەمر" ی ناچار کرد بە وازهێنـانێکی پێشـوەخت و زوو.[274]

## دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

ئـاوابوونی مـەلا مسـتەفا بوارەکـەی تـەواو ئـاوەڵاکردەوە بـۆ سـەرکردە سیاسییەکانی بـاڵی چـەپ. تـا بـاڵی سیاسـیی خۆیـان دریـژ بکەنـەوەو شۆڕش زیندووبکەنەوە. دیـارتریـنی ئـەو سـەرکردانە جـەلال تاڵـەبانیی و کەسایەتییەکانی تری پ.د.ک بوون. کوڕەکانی مـەلا مسـتەفا، ئیـدریس و مەسـعود بـەردەوامبوون لـە سـەرکردایەتییکردنی پ.د.ک. هەرچەنـدە لە ئاوارەییدا بوون لە ئێران. بەڵام دەسەڵاتەکەیان ئـەو کاتـە ڕووبـەڕووی بەرەنگاری شەپۆلێکی نوێی سەرکردە سیاسییەکان بۆوە. ئـەوەی جێگـەی گرنگییەکی تایبەتیی بوو دەرکەوتنی چەنـد گرووپێکـی چـەپڕەو بـوو. لـە نێویانـدا" کۆمەڵـە" ی ماویسـت. کـە لـە لایـەن نەوشـیروان مسـتەفا ئەمینەوە سەرکردایەتی دەکرا بە پشتیوانی تاڵەبانیی { تا خاڵە شـەهاب و هاوڕێکانی و ئارام تێدا نـەچوون. نەوشـیروان. ڕۆڵـی بـەرچاوی نـەبوو-وەرگێـڕ} هـەروەها بزوتنـەوەی سۆشـیال دیمـوکرات بـە سـەرکردایەتی کەسێکی کارێزمـایی وەک" عـەلی عەسـکەریی". ئـەم دوو پێکهاتـە لـەژێر سـەرکردایەتی تاڵەبانییـدا یـەکیانگرت و (ی.ن.ک) یـان لـە1ی جـونی

1975دا پێکهێنا. ی.ن.ک تەواو جیاواز بوو لە پ.د.ک. ددانی نەنا بەمافی لەپێشینەی هیچ هۆزێک لە سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردییدا لە عێراق، بە ئاشکرا ڕقی لەو ڕۆڵە هەبوو کە بارزانییەکان دەیاننواند. ئەوانیان تاوانبار دەکرد لە سەر شکشتهێنان و لە بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد. بنکەی پشتیوانیی ی.ن.ک لە ناوچە شارییەکانی کوردستانی عێراقدا بوو—بە تایبەتی لە سلێمانیی و هەولێر و کەرکوک—بەڵام پارتەکە شوێنکەوتوانێکی بەرچاویشی هەبوو لە نێو دانیشتوانی کوردی بەغدادا.

کوردستانی عیراق لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا پڕبوو لە چەند ڕێکخراوێکی سیاسیی-سەربازیی نوێ کە شەڕیانبوو لە سەر دەسەڵات و ناوچەکانی قەڵەمڕەوییی، لە کەش و هەوایەکی پڕ لە کێشمەکێشی توندا. جار جارە، ئەو جیاوازییە ناوخۆییە لە مێژینانە سەریاندەکێشا بۆ توندوتیژیی. بۆ نموونە لە یەکێک لە پێکدادانە توندەکاندا لەساڵی 1978، ی.ن.ک بەتواناترین کەسایەتییە سیاسییەکانی خۆی لە دەستدا. ئەویش کاتێک عەلی عەسکەریی لە لایەن هێزەکانی پ.د.ک—ەوە بە سەرکردایەتی سامی عەبدوڕەحمان لە هەکاریی گیراو کوژرا. لە دەستدانی ئەو کەسەی کە باڵی میانەڕەوی ی.ن.ک بوو (کۆمەڵە زۆر ڕادیکاڵتر بوو)، لاسەنگییەکی سیاسیی لە نێو ی.ن.ک دا دروستکرد، کە دەبووایە تاڵەبانیی چارەسەری بکات؛ تا ئەمڕۆش کاریگەرییەکانی هەر هەستیان پێدەکرێت. ئاماژەکانی ئەمەش لەوەدا بەرچاودەکەون کە زۆرینەی سەرکردەکانی ی.ن.ک سەر بە چەپە توندڕۆکانن و هەمووشیان لە کۆمەڵەوە سەرچاوەیان گرتووە.

پ.د.ک—یش هەروەها زنجیرەیەک ناتەبایی ناوخۆیی بەخۆیەوە دیتووە. وەکو وەبیرخەرەوەیەکی ناتەباییەکەی نێوان مەلا مستەفاو ئیبراهیم ئەحمەد. سامی عەبدولڕەحمان لەسەر پرینسیپە چەپڕەوانەکانی خۆی پێیدا گرت و لە گەڵ ئیدریس بارزانیی) کوڕی مەلا مستەفا( کە بیرکردنەوەیەکی خێڵەکییانەی هەبوو). کەوتە ناکۆکییەوە. جارێکی تر پ.د.ک لە کۆتایی ساڵانی 1970دا لێکهەڵوەشا. لەوێوە سامی عەبدولڕەحمان پێڕی ئینتێلەجێنسیای لە گەڵ خۆیدا بردو پارتی گەلی دیموکراتی کوردستانی(KPDP) لەدژی پ.د.ک دامەزراند بەڵام بە هیچ شێوەیەک دۆستی ی.ن.ک—یش نەبوو. هاوشانی ئەوە،

گرووپـه ئیسـلامییەکانیش پشـتیوانییەکی جـەماوەری نوێیـان پەیـداکرد. دوای ئەوەی کوردەکان لە بیری خێڵەکیی پ.د.ک و ئەجێندای چەپڕەوانەی تاڵەبانیی تەکینەوە.
سەرکەوتنی بـەرچاوی شۆڕشـی ئیسـلامیی لـە ئێرانـدا لـە سـاڵی 1979 پاڵنـەرێک بـوو بـۆ دامەزرانـدن و پەرەسـەندنی چەنـد ڕێکخراوێکـی ئیسـلامیی لـە کـورد عێراقییـەکان. لـە نێویانـدا بزوتنـەوەی ئیسـلامیی لـە کوردسـتان بەسـەرۆکایەتی شـێخ عوسـمان عبدولعـەزیز و دوای ئـەویش براکەی مەلا عەلی عبدولعەزیز جێگەی گرتەوە. پەرەسـەندنی پەرتـەوازەیی لە ناو سیاسەتی کوردییدا ڕێگر بوو لـە دەرکـەوتنی بەرەیـەکی یـەکگرتوو کە بەهۆیەوە ڕووبـەڕووی ڕژێمـی بەعسـی بەغـداد ببنـەوە. هـەروەها ئـەم حاڵەتـــــە وای لـــــەکوردەکان کـــــرد کـــــە لـــــە لایـــــەن هێزە دراوسێکانەوە بەکاربهێنرێن، کە پەرتەوازەیی سیاسیی کوردەکانیـان بـەکارهێنا بـۆ پەرەپێـدان و پشـتیوانییکردنی چەنـد گرووپێکـی جیاجیـا لە دژی سەدام. بەهـەمان شـێوە، سـەدام پشـتیوانیی لـە چەنـدین گرووپـی کوردیی کرد بۆ شەڕکردن لە گـەڵ بـرا کوردەکانیانـدا، ئەمـەش بـاکووری عێراقی گۆڕی بۆ ناوچەیەک لە شەڕی نـاوخۆ و دەسـتێوەردانی دەرەکیـی کە گەیشتە قۆناغیکی نالەباری نێوەزمەئاسا. بەڵام ئـەم نێوەزمەیـە بـەرەو ئەوە دەچوو کە بۆ کوردەکان بەرەو ترسناکیی زیاتر بڕوات.

## جینۆساید و دواخستنی Reprieve

دوابەدوای شۆڕشی ئیسلامیی لە ئێراندا لە ساڵی 1979، سـەدام حوسـێن هەلەکـەی قۆسـتەوە بـۆ تێسـرەواندنی گـورزێکی جـەرگبڕ لـە ئێـران و گێڕانەوەی ئـەو شـوێنانەی لـە دەسـتی دابـوون بـە گـوێرەی ڕێککـەوتنی جـەزائیری سـاڵی 1975. لـە 22 ی سـێپتەمبەری 1980 دا سـەدام هێرشەکەی کردە سـەر ئێـران. کوردەکـان خۆیـان لـە ناوجەرگـەی شـەڕدا دۆزیەوەو بارودۆخ ناچاری کردن وەک داردەست شەڕ بکەن. بە درێژایـی ساڵانی هەشـتاکان، ئێـران و عێـراق هـەردووکیان پشـتیوانییان لـە چەنـد پارتێکی جیاجیـای کـوردیی لـە دژی یـەکتری دەکـرد. بـەڵام لـە زۆربـەی کاتەکاندا کوردەکان لە بەرەی هێزەکانی ئێرانـدا خۆیـان دۆزییـەوە. دوای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ چالاکی ئێرانیی/ کـوردیی لـە بـاکووری عێراقـدا،

سەدام چەند شێوازێکی دڕندانەی گرتەبەر بۆ لەناوبردنی یەکجارەکیی ئەو هەڕەشەیەی لە لایەن یاخیبووە کوردەکانەوە کەوتبووە سەر ڕژێمەکەی. سەدام فەرمانیدا بە شالاوی "ئەنفال". کەبۆ چۆڵکردنی سیستەماتیکییانەی ناوچە گوندنشینەکانی کوردستانی عێراق داڕێژرابوو. بۆ نەهێشتنی هێزی پێشمەرگە لە ناوچەکەدا. هەروەها بۆ دابڕینی پارتە کوردییەکان لەو پێویستییانەی کە یارمەتیان دەدات لە سەرهەڵدانەوەو هێشتنەوەی هێزی سەربازییان لەناوچەکەدا. ئەو شالاوە کە بەحەماسەتەوە لەلایەن ئامۆزاکەی سەدامەوە( عەلی حەسەن ئەلمەجید) کە دواتر بە(عەلی کیمیایی) ناسرا بەهۆی کارە بەدناوەکانیەوە. بەڕێوە چوو. کاولکردنی نزیکەی 4.000 گوندی کورد بە چەکی تەقلیدیی و کیمیایی بەخۆوە دیت لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە.[275]

گوندنیشینەکان لە چەند شوێنێکی گشتیی دەستنیشانکراودا (موجەمەعات) {ئۆردوگا} کە کەوتبوونە نزیک شارەکان و بنکە سەربازییەکانەوە. "چارکران" و نیشتەجێکرانەوە. لە مارسی 1988 دا سەدام ئەو تاوانەی ئەنجامدا کە لە لایەن زۆر کەسەوە بە گەورەترین تاوانەکانی دەژمێردرێت. ئەویش بۆمبارانکردنی شاری هەڵەبجە بوو بە چەکی کیمیایی و گازی نێرڤ{ئەعصاب}. دوای ئەوەی کە هێزەکانی ی.ن.ک— و ئێرانییەکان ناوچەکەیان داگیرکرد. لە ماوەی چەند سەعاتێکدا 5.000 هاولاتی مەدەنیی کوژران. ئەمەش کاولکارانەترین بەکارهێنانی چەکی غەیرە تەقلیدیی بوو لە دژی خەڵکانی مەدەنیی لە شەڕی جیهانی دووەمەوە.

تا ساڵی 1990. کوردەکان لە ئەوپەڕی نەهامەتییدا بوون. شالاوی ئەنفال پێشمەرگەی لە ناوبردوو و ناوچە گوندییەکانی کوردستانی عێراقیش چۆڵ ببوون. لە رووی سیاسییەوە. پ.د.ک بەهۆی پارچەپارچەبوونی ناوخۆیەوە بێهێز ببوو. ی.ن.ک—یش تازە لە سەرئێشە ئایدۆلۆژییەکانی خۆی چاکدەبۆوە—سەرئێشەی پەیڕەوکردنی " کۆمۆنیزمی" ڕووت یان دوای" سۆشیالیزمێکی" ناسیۆنالیستانە بکەون. بوونی هەردوو پارتەکە لەکوردستانی عێراقدا سنووردار بوو: لە جیاتی ئەوە دەبوایە لەدەرەوەی ئێراندا چالاکیی بکەن. وا پێدەچوو کەشانازییەکانی ماوەی ئۆتۆنۆمیەکەی 1970 بەتەواویی لەدەست دەرچوو

بوون—بەڵام ئۆتۆنۆمیی و سەربەخۆیی ڕاستەقینە وەختێک بە سەر کوردەکاندا دەبڕا کە لە ئەوپەڕی نەهامەتیی و پەرتەوازەیی سیاسییدا بوون.
هەڵەی داگیرکردنەکەی کوەیت لە لایەن سەدامەوە لەساڵی 1990دا بەرایی زنجیرەیەک ڕووداو بوو کە بەرەنجامەکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیفاکتۆی کوردیی و قۆناغی یەکەمی دابەشکردنێکی لەباری عێراق بوو. لە دوای دەرپەڕاندنی هێزە عێراقییەکان لە کوەیت لە لایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە لە سەرەتای 1991 دا، چەند ڕاپەڕینێکی جەماوەریی لە باکوور و باشووری عێراق سەریانهەڵدا. لە کوردستانی عێراقدا، ڕاپەڕینی کوردیی لە 4ی ئاداردا لەڕانیە دەستیپێکرد[2] و هەر زوو بە شارە سەرەکییەکانی کوردستاندا بڵاوبۆوە. دوای ئەوەی کە ڕەوتی ڕووداوەکان ئاشکرا بوون هێزەکانی پ.د.ک و ی.ن.ک جڵەوی ڕاپەڕینەکەیان وەرگرت. لە 19ی ئاداری 1991 دا کوردستانی باشوور بۆ یەکەمین جار لە ساڵی 1970- وە لە ژێر کۆنتڕۆڵی کوردییدا بوو. بەڵکوو دەکرێ بڵێین لەو کاتەوە کە کوردستان لکێنرا بە عێراقەوە نزیکەی 70 ساڵ پێشتر.[276] بەڵام، جارێکیتریش، هەروەک سەردەمی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، ڕۆژئاواو هێزە دراوسێکان ئامادەنەبوون کە هەرێمی کوردیی وەک بەشێکی سەربەخۆ لە بەغداد ببینن.
ڕاپەڕینەکانی کورد و شیعە ڕەنگە لە واشینگتۆن و لەندەندا ترسی زیاتری خولقاند بێت تا لە بەغداد. بەجێگەی داخەوە دەرکەوت کە کەوتنی سەدام چاوەڕواننەکراو بوو ئەنجامێکی پەسەندیش نەبوو بۆ بارودۆخەکە. ڕۆژئاوا" ڕۆژەکۆنەکان"ی پێ باشتر بوو، ڕۆژانی پێش سەردەمی کوەیت، بە دڵنیاییشەوە نەک سیستەمێکی سیاسیی نوێ کە بواری تێدا بێت بۆ هەڵتۆقینی کوردستانێکی سەربەخۆ. لێرەوە، سەرکەوتنی کوردو شیعەکان

---

[2] لە 4ی ئاداری 1991 دا ڕاپەڕینێکی جەماوەریی لەئۆردوگای زۆرەملێی "خەبات" دا سەریهەڵدا، بەڵام نەیتوانی لە سنووری ئۆردوگاکە دەربچێت ونوردوگاکە لەژێر هەڕەشەی گەورەی هێزەکانی حکومەتی عێراقییدا بوو، بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر لە 5ی ئاداردا ڕاپەڕینی جەماوەری گەورە لە شاری ڕانییەوە سەریهەڵدا و لەوێوە پەرەیسەند بۆ سەرجەم شارەکانی تری کوردستان{وەرگێڕ}.

تەمەنی کورت بوو چونکە ئەو پشتیوانییەی لە هاوپەیمانەکان چاوەڕوان دەکرا سەرینەگرت. سەدام گاردە کۆمارییەکەی بەرەو ناوچە ڕاپەڕیوەکان بەڕێکرد و لە 28 ی ئاداریشەوە کوردەکان بە ناچاریی شارە گەورەکانیان بەجێهێشت ڕوویانکردە چیاکانی سەر سنووری ئێران و تورکیا. جارێکی تر کەرکوک لە لایەن هێزەکانی حکومەتەوە پەلاماردرا—ئەو هێزانەی کە سوور بوون لە سەر ڕەشکردنەوەی هەر شوێنەوارێکی غەیرە-عەرەبی شارەکە. هەروەک ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ(HRW) تێبینیی کردووە، کۆچی بەکۆمەڵی کوردەکان لە کەرکوکەوە لە دوای ڕاپەڕینی 1991ـەوە بوو بە دەرکردنێکی هەمیشەیی. ئەمەش بەهیچ شتێکیش جگە لە لادانی سەدام چارەسەر نەدەکرا.[277]

لە سەرەتای ئەپریلدا. کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دیمەنی ماڵوێرانیی و دەردەسەریی مرۆیی مەزنیان لەشاخەکانی زاگرۆسەوە بڵاودەکردەوە. پیاو و ژنانیان نیشان دەدا بە بەرچاوی سەربازانی تورکی و ناتۆوە(NATO). باوەشیان لە یەکتری داوەو لە سەرمادا ڕەقببوونەوە. سەربازانی ئەمێریکاییش بە ڕووکار دەستەوستان بوون لە هاوکاریکردنیان. لە 5 ی ئەپریلدا. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری 688 ی پەسەندکرد کە داوای کۆتاییهێنانی دەکرد بە داپلۆسینی هاوڵاتییان لەعێراقدا. بەڵام. لە واقیعدا ژمارەی ئاوارەکان بەردەوام لە زیادبووندا بوو. هاوپەیمانەکان هەوڵیاندا کە کێشەکە چارەسەر بکەن بە دامەزراندنی" ناوچەیەکی ئارام"ی بچووک لە نزیک دهۆک لە28 ی ئەپریلدا. بەڵام. ئەمە مانگێک دواکەوت و نزیکەی یەک میلیۆن کورد تا کۆتایی مانگەکە گەیشتنە سەر سنووری تورکیا و زیاتریش بەڕێگاوە بوون.[278] هەرچەندە سەدام حوسێن بەهۆی شکستەکەی کوەیتەوە لە پەلوپۆ کەوتبوو لە کۆی 18 پارێزگا جڵەوی 15 ی لە دەستدابوو. سەرکردایەتی کوردیی هیچ چارەیەکی تری نەبوو جگە لە هەڵکردن لە گەڵ ڕژێم لە پێناوی بەرگرتن لەو کارەساتە مرۆییەی کە لە چیاکاندا ڕووی دەدا.

هەردوو لایەنەکە بێهێز بوون. سەدام نەدەیتوانی بەتەواوی دەستی بە سەر باکوورد ڕابگات و نەدەشیتوانی بەردەوام بێت لەسەر دابینکردنی بودجەی

کــــاره مەدەنییـــــەکانی لە خەزێنە بەتاڵـەکانی بەغـدادەوە. کوردەکـان توانـــای ئـــەوەیان نـــەبوو کـــە هێزەکـــانی حکومـــەتی ناوەنـــدیی لە ناوچەکە نەهێڵن. ئەنجامەکە، بنبەسـت بـوو. جـارێکی تـر چارەنووسـی کەرکوک سەلماندی کە بەربەستێکی سەختە لە بەردەم ئاشتییەکی گونجـاو لـە نێـوان حکومـەت و کوردەکانـدا. لـە ئۆکتۆبـەردا، سـەدام هـەموو ئۆفیسـەکانی حکومـەتی لـە بـاکوور کێشـایەوەو گـەمارۆی ئـابووریی خستەسەر کوردستانی عێراق. بەمـە بۆشـاییەکی بەجێهێشـت کـە ئیـدارەی مەدەنی نزیکەی 4 ملیۆن کەسی پەککەوت.[279] بـەڵام، کـەرکوک لـە ژێـر کۆنترۆڵی توندی بەغدادا مایەوە. لە بەر ئەوەش کـە ناوچـەی نژەفڕینـی ئەمێریکی چەند مایلێک لەولای کەرکوکەوە بوو، سەدام ئازاد بوو لـە سـەر بەردەوامبوون لە سەر تەکنیکی تاقیکراوەی بە بەعەرەبکردن.
بەمشـێوەیە دەوڵەتـە دیفاکتۆکـە لـە دایـک بـوو. ئەگـەر بڵێـین کـە لە دایکبوونەکەی لە بارودۆخێکی شـێواودا بـوو ئـەوە بۆخـۆی شـێواندنی واقیعەکەیـە. هێشـتا، ئـەم قـەوارە ناوازەیـە چەنـد دەزگایـەکی حکـومیی دەربازکرد و پەرەی پێدا کە بەشێوەیەکی زۆر بـاش خزمـەتی کوردەکـانی کــرد. دەتـــوانرێ هۆیـــەکانی لـــە دایکبوونەکـــەی لـــە تایبەتمەندییـــە جیۆپۆلیتیکەکانی عێراقی ئەوکاتەدا بدۆزرێنەوە. بێهێزیـی سـەدام لـە گـەڵ بێئۆمیـدیی گـەلی کـورد و سـەرنجی کۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتیی، ڕێگـەیان خۆشـکرد بـۆ دەرکـەوتنی کوردسـتانێک لـە ژێـر کـۆنترۆڵی کوردییـدا. کوردەکـان بـە کـردەوە خواسـتە لەمێژینەکـەیان بـۆ خۆبـەڕێوەبردن مسـۆگەرکرد. ئەمـەش بـە ڕێکـەوتێکی مەترسـیدار نـەک بـەپلانێکی هۆشیارانەو داڕێژراو.

## گەشەسەندنی بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردیی لە عێراقدا 1991-2003

ڕەنگە شتێکی چاوەڕوانکراو بێت کە دەرکەوتنی لە ناکاوی "کوردستانی عێراق" وەکو دەولەتێکی دیفاکتۆ نیگەرانییەکی زۆری لە تاران و ئەنقەرە دروستکرد. بە هەمان شێوە پایتەختە ڕۆژئاواییەکانیش تووشی سەرسوڕمان بوون کاتێک لوتیان تەقییەوە بە وەفدە دیپلۆماتییەکانی ئەو قەوارە نوێیە کە داوای هاوکاری دوو لایەنەیان دەکردو. داوای پشتیوانی ڕۆژئاوایان دەکرد بۆ لادانی سەدام لەسەر دەسەلات. هەروەها بەڵێنی ئەوەیان دەدا کە حکومەتێکی پلۆرالیستی دیموکراسیی لە باکووری عێراقدا دادەمەزرێنن ئەمەش وەکە یەکەمین قۆناغی جێبەجێکردنی فیدرالیزم لە سەرتاسەری ولاتەکەدا. وا دیار بوو هێشتا گەلێک زوو بوو بۆ سیاسەتمەدارە ڕۆژئاواییەکان کە بەبێ چەندوچوون ئەمە قبوڵ بکەن. دەرکەوتن و مانەوەی ئەو دەولەتە دیفاکتۆیە جێگەی شەرمەزاریش بوو بۆ بەغداد. چونکە سەدام ئەو کاتە چاوەڕوانی ئەوەی کردبوو کە سەرکردایەتی کوردی پەرتەوازە ملکەچی دەسەلاتەکەی ببن نەک بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی ناوچەیەک و خەڵکێک بگرنە ئەستۆ کە شەڕ ماڵوێرانی کردبوون و کەوتبوونە بەردەم داهاتوویەکی نادیارەوە. بەلام، ئەوەی کە قەوارە ساواکە هەولّی بۆ دەدا مانەوە بوو. هەرچەندە ئەنقەرەو بەغداد و تاران لە ساڵە بەراییەکانیدا چەندی توانیان کێشەیان بۆ نایەوە و زەحمەتیان دایە بەر.

## دامەزراندنی حکومەتی کوردیی

لە دوای 19ی ئایاری 1992—ەوە نیگەرانی هێزە ناوچەییەکان زیادیکرد. ئەویش ئەو کاتەی کە کوردانی عێراق هەڵبژاردنی لۆکاڵیان ئەنجامدا و ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستان(پارلەمان)یان دامەزراند. ئەنجامەکانی هەڵبژاردن ڕەنگدەرەوەی جیاوازییە باوەکانی کۆمەڵگەی کوردیی بوون هەر لە ناوەراستی سەدەی بیستەمەوە. لە هەڵبژاردنەکاندا پ.د.ک و ی.ن.ک نزیکەی یەکسان بوون. هەر یەک لەو دوو پارتە نزیکەی لە سەدا 50 ی کورسییەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانیان

بەدەسـت هێنـا و ئاشوریەکانیش 5 کورسیان پێدرا لە کۆی 105 کورسیی ئەو تاکە ئەنجومەنەی یاسادانان.

دوای ئەوەی پارتە سەرەکییەکان هاوسەنگ مانەوە. سیستەمێکی" هاوبەشی دەسـەڵات(Power-sharing)" ی 50-50 هاتەکایـەوە کـە تیایـدا دەسـەڵاتە سـەرەکییەکانی جێبـەجێکردن بـە هاوبەشـیی بـوون. مەسـعود بارزانی( کە ئێسـتا سـەرۆکی پ.د.ک-ە) و جـەلال تاڵـەبانیی(سـکرتێری گشتی ی.ن.ک) لە دەرەوەی ئۆفیسەکانی حکومەتـدا مانـەوە. بـەڵام وەکـو چاودێری سیستمە سیاسییەکە لە نوسینگە حیزبیەکانی خۆیانـەوە کاریـان دەکـرد.[280] سیسـتمە سیاسـییەکە چەنـد درزێکـی ڕیشـەیی مەترسـیداریی تێکەوت. مانـەوەی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتانیش(ح.هـ.ک) ڕاسـتەوخۆ کەوتبووە سەر پاراستنی هاوکاریی نێوان پ.د.ک و ی.ن.ک. بـەڵام. دوای ئەوەی هێـزە دراوسـێکان کەوتنـە بـەردەم ئەگـەری سیسـتمێکی دەوڵـەتی کاراوە لە کوردستانی عێراقـدا. شـێلگیرانە دەسـتیان دایـە تێکـدانی ئـەو سەقامگیرییەی کە هەر خۆی لەرزۆک بـوو. ئـەویش بـە هانـدان یـان زۆر لێکردنـی پ.د.ک و ی.ن.ک بـۆ ئەنجامـدانی کـرداری سیاسـیی(هەنـدێک جاریش سەربازیی) لە دژی یەکتری. لە ساڵی 1993دا دەوڵەتە دیفاکتۆکە لە مەترسی ئەوەدا بوو کە بە هۆی دەسیسە سیاسییەکانی تورکیا و ئێـران و عێراقەوە لێکهەڵوەشێت.

بە دڵنیایەوە. هیچکام لە پ.د.ک و ی.ن.ک بێتاوان نەبوون لـە ڕۆچـوونی کوردستانی عێراق بەقووڵیی بۆ ئـاگری شـەڕی نـاوخۆ. هـەردوو پارتەکـە بەردەوام بوون لەسەر دوژمنایەتیی هاوبەش و پێشبڕکێیان بـوو لـە سـەر داهات. نفوز و ئیمتیازات. حکومەتی کوردستانیش ببوو بەو سەکۆیەی کـە شەڕەکەیان تیادا دەکرد. مەسـعود بـارزانی. وەکـو کـوڕی مـەلا مستەفای سەرکردەی ئەفسانەیی و سەرۆکی ڕەنگە گـەورەترین پێکهاتـەی خێڵـەکیی ناوچەکە و سەرۆکی بێ ململانێی دامەزراوترین پارتی کوردیی. بە مـافێکی حاشـاهەڵنەگری خـۆی دەزانـێ کـە سـەرکردایەتی بزوتنـەوەی نەتـەوەیی کوردیی لە عێراقدا بکات.

بە هەمان شێوە. جەلال تاڵەبانییش. بە مێژوویەکی درێژەوە لـە بەشـداریی لە دۆزی کوردییدا و وەکو پێشڕەوی هەڵسوڕاوی سیاسیی نەوەکەی خۆی. بە کۆڵێک شارەزایی سیاسیی لە ڕادەبەدەریشەوە. هەروەها وەکو سەرۆکی

پارتێکی سیاسیی چالاک و زیندوو —ئەو پارتەی کە ڕەگو ڕیشەیەکی شاریی و( گەلێک جەماوەریی) هەبوو. ئەویش پێی وابوو کە ئەو باشترین جێگرەوەیە بۆ سەرکردایەتییکردنی کوردانی عێراق. دوای ئەوەی کە سیستمی 50-50 ی هاوبەشی دەسەلات بە فیعلی حکومەتی کوردیی لە پەلوپۆ خست. هەردوو پارتەکە چەند کوتلەیەکی هاوبەشیان لە ناو بونیادی حکومەتە نوییەکەدا داتاشی.

بەم شێوەیە. کۆسرەت ڕەسوڵ. سەرۆک وەزیرانی ی.ن.ک— کەسایەتییەکی خاوەن پێگەی بەرچاو لە ناو ی.ن.ک دا. دەشکرێت بڵێین. بە دڵنیاییەوە سەرۆکی داهاتووی پارتەکە-- کەسانێک کە لە خۆیەوە نزیک بوون بەرزی کرانەوە بۆ پێگەکانی دەسەلات. لەو لاشەوە پ.د.ک سەرگەرمی چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی بوو بەسەر ئەنجومەنی نیشتیمانییدا. چونکە جەوهەر نامیق(لە مەکتەبی سیاسیی پ.د.ک) سەرۆکی پەرلەمان بوو. پ.د.ک هەروا بەردەوام بوو لە دەستبەسەرداگرتنی خاڵی سەرەکی کەڵەکەکردنی داهات لە زاخۆ لەسەر سنووری تورکیا. بەو شێوەیە بە تەواوی دەستی ڕادەگەیشت بەسەر ئەو سەرچاوەیەی داهاتدا کە ی.ن.ک لێی بێبەش بوو. دەزگاکانی ئاسایشی(ح.ه.ک) بوون بە داردەستی دوو پارتەکە. هەر یەکێکیان سیخوڕی دەکرد بەسەر ئەوەکەی تردا و حکومەتی کوردیی بە تەواوی بێدەسەڵات ببوو لە چارەسەرکردنی ئەو کێشە گەورانەی کە کاریگەریان هەبوو بەسەر ناوچەکەوە. چونکە سیاسییەکان. بیرۆکراتەکان و کارمەندەکانی حکومەت سەرقاڵی بەزاندنی هاوکارەکانی خۆیان بوون لە وانەی کە لە دەسەڵاتدا پێکەوە هاوبەش بوون.

ئەو دوژمنایەتییەی کە لە نێوان پ.دک و ی.ن.ک دا بەردەوام بوو جگە لەم جیاوازییانەی سەرەوە چەند فاکتەرێکی تری هەبوو. جیاوازییە ئایدۆلۆژییەکان زۆر کەم بوون؛ هەردوو پارتەکە ڕوویان کردبووە سەنتەری ڕێڕەوی سیاسیی و هەوڵیان دەدا خۆیان وەکو چەپی میانەڕەو وێنە بکەن( ئەڵبەتە لەگەڵ باوەڕبوون بە پێشڕەویی بارزانییەکان لە ناو پ.د.ک دا) کە هەلپەی بەدەستهێنانی سەرکردایەتییکردنی بێ ڕکابەری بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردیی لەخۆگرتبوو. پێشبڕکێی نێوان ئە و دوو ڕێکخراوە سیاسییە هەمیشە بە پێشبڕکێیەکی شەخسیی ماوەتەوە و

چرپۆتـــەوە. کێشـــە لەســـەر چەنـــد شـــتێکی وەکـــو دەســـت بەســـەرداگرتنی داهاتـــەکان و چەنـــد ململانێیـــەکی سیاســـیی ســـادە. ئەگـــەر ئـــەو ململانـــێ شەخسییە بەس نەبوویت بۆ لێکهەڵوەشاندنەوەی کوردستانی عێراق( کە بە دڵنیاییەوە بەس بوو). ئابووریی سیاسیی عێـراق لـە سـاڵانی 1990دا ئامـاژەی دەکـرد بـۆ ئـەوە کـە ئیـدی لێـرەوە دینـامیکێکی تـر هاتـە نـاو پێشـبڕکێکەوە-- ئـەویش دەسـت بەسـەرداگرتنی گواسـتنەوەی نایاسـایی نەوتی عێراق و داهاتەکانی بوو.

سەدام ڕێگایەکی گواستنەوەی نـەوتی بـە قاچـاغیی دروسـتکرد کـە بـەو ناوچانەدا تێدەپەڕی کە لە ژێـر دەسـەلاتی پ.د.ک دا بـوو. لـەم کارەشـدا ئەندامە لەپێشەکانی بنەماڵەی بارزانیی بەشداریەکی ڕاستەوخۆیان هـەبوو. ئەو باجەی کە لەم بازرگانییە وەردەگیـرا لـە خـاڵی تێپـەڕبوون لـە نێـوان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی سەدام و ناوچـەی ژێـر دەسـەڵاتی کـوردیدا دواتـر بەرەو تورکیا. لەگەڵ ئەو داهاتانەی کە لە خزمەتگوزارییەکانـەوە بەدەسـت دەهات. ئەمانە هەموو مانای ئەوە بوون کە هەر کەسێک کۆنترۆڵی دەـۆک و زاخۆی بەدەسـتەوە بێـت بـۆی هەیـە هەفتانـە چەنـدین ملیـۆن دۆلاری دەست بکەوێت. ئەمە گەنجینەیەک بوو کـە پـارتیی ئـەو کاتـە دەوڵەمەنـد ببوو ئامادە نەبوو دەست بەرداری بێت. گەنجینەیەکیش بوو کە ی.ن.ک ی هەژار پێویسـتی پێیبـوو بـۆ ئـەوەی کـە جۆرێـک لـە هاوسـەنگی دارایـی (لەمەوەش سەربازیی) فەراهەم بێنێت لە گەڵ پ.د.ک کە لـە بـەهێز بوونـدا بوو.

## لە یەکێتییەوە بۆ پەرتەوازەیی

زۆر زەحمەت بوو بۆ سیستەمی سیاسیی کـوردیی کـە بەرگـەی ئـەو دوو فشـــارە نـــاوخۆیی و دەرەکییـــە بگرێـــت و دەریشـــکەوت کـــە تێکـــدانی ئارامییەکەی تا ڕادەیەک ئاسانە. تا ساڵی 1994 کۆبونـەوەی چوارقـۆڵی لە نێوان ئێران و عێراق و تورکیا و سوریادا ئەنجام دەدران. لە سەرەوەی ئەجێنداکان مەسەلەی دەوڵەتی دیفاکتۆی کوردیی و چۆنێتی تێکدانی بـوو. ئەو پێشـبڕکێ بونیادییـە نـاوخۆیی و لەمێژینانـەی کـە لـە نێـو(ح.هـ.ک)دا هەبوون ئاماژە بوون بۆ ئەوەی کە دروستکردنی تەنگژە هیچی نەدەویست جگە لە پاڵنانێک لێرەو پزیسکێک لە وێ—لەو شوێنە جیۆگرافیەشدا یـەک

نەدەكەوت لە هیچ كام لەم دوانە. ساڵی 1994 شەڕێكی ناوخۆیی سەخت لە نێوان پدک و ینک دا هەڵگیرسا بوو. كە زیاتر لەسەر دەست بەسەرداگرتنی داهاتەكان بوو تا لەسەر سەركردایەتییكردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی كوردیی.

هاوكات لە گەڵ ئەم ململانێ كوردییە ناوخۆییەدا. چەند كاراكتەرو ئەجێندایەكی سیاسیی نوێ دەركەوتن. ئیسلامی سیاسیی دیاردەیەكی بەهێز بوو لە نێو سیاسەتی عێراقییدا بۆ چەند دەیەیەک و كوردستانیش پشكی تەواوی خۆی پێبڕا بوو لە پارتە سیاسییە ئیسلامییەكان. هەندێك لەم پارتانە لە نێویاندا بزوتنەوەی ئیسلامیی كوردستان هەر لە كۆتاییەكانی حەفتاكانەوە دامەزرا بوون و لە ماوەی ساڵانی 1980 دا لە دژی ڕژێمی سەدام شەڕیانكردبوو. بەڵام. ئەوە گەشەسەندنی دەوڵەتە دیفاكتۆكە و ناسەقامگیرییەكەی دوایی بوو كە سیمایەكی باوی كوردستانی عێراق بوو لە ناوەڕاستی ساڵانی 1990 دا كە هەل و بواری ڕەخساند بۆ پارتە ئیسلامییەكان تا ببن بە هێزێک لە ناوچەكەدا.

جەماوەرییترین پارتی ئیسلامیی كوردیی لە كۆن و ئێستاشدا. یەككگرتووی ئیسلامی كوردستانە (ی.ئ.ک) بە سەركردایەتی سەلاحەدین بەهادینە و بەشێكە لە برایانی موسوڵمان( ئەو ڕێكخراوە سیاسییەی كە بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاوبووەتەوە). یەككگرتوو هێزی پێشمەرگەی نییە و وەكو پارتێكی" شەڕنەكەر" پشتیوانییەكی جەماوەریی مەزنی هەیە. بەڵام ئەوەی كە زیاتر سەرنجی نێودەوڵەتی ڕاكێشاوە. گرووپە ئیسلامییە میلیشیاكانە بە تایبەتیش ئەنسارولئیسلامی سەر بە ئەلقاعیدە. ئەنسار كە لە بنەڕەتدا ناوی (جوندولئیسلام) بوو. لقێكی ئەو پارتە ئیسلامییانەیە كە پێشتر ڕەگیان داكوتیوە. لە نێویاندا (ب.ئ.ک) و كۆمەڵی ئیسلامی كوردستان(ک.ئ.ک) بە سەرۆكایەتی مەلا عەلی باپیر—سەركردەیەكی سەربازیی كۆنە خەڵكی شاری ڕانیەیە. ئەنسار وەكو كۆكەرەوەیەكی گرووپەكانی ناو باڵی سەربازیی ئەو بزوتنەوانەیە كە زیاتر مەیلیان بە لای كاری چەكدارییەوە بوو. دەگوترێت كە پشتیوانی دارایی لە قاعیدەوە وەرگرتووە و چەندین عەرەبی ئەفگانیش لە ناو ڕیزەكانیدا هەبوون. لە ساڵی 2000 ەوە. ئەنسار بەرەو ئەوە دەچوو نیگەرانییەكی ئەمنیی گەورە بۆ پدک و ینک دروست بكات.

لـــه ئـــاداری 2000 دا فرانســۆ هــەریری پیــاوی بڕواپێکــراوی بــارزانیی لــە لایــەن چەنــد بکــوژێکی ســەر بــە ئەنسارەوە لـە کاتێکـدا کاروانەکەی بە ناو شەقامەکانی هەولێردا ڕەتدەبوو کوژرا. نزیکەی ساڵێک دواتــر، ئەنــدامی ســەرەکی مەکتــەبی سیاســیی ی.ن.ک د. بەرهــەم ســاڵح، بەختی هەبوو کە لـە هـەوڵێکی کوشتن لـە سلێمانیی دەربــازی بــوو. لـەو هەوڵەدا ژمارەیەک لە پاسەوانەکانی کوژران. ی.ن.ک هەرگیز نەیتوانی کـە هێرشێکی سەربازی ئـەوتۆ بکاتــە ســەر مۆڵگاکـانی ئەنسـار لـە بیـارە و تەوێڵە کە بتوانێت ئەو هەڕەشەیە لە ناو ببات، چونکە گومانی ئەوە هــەبوو کە ئەنسار یارمەتی لۆجیستی لـە ئێرانـەوە وەردەگرێـت. لـە جیـاتی ئـەوە تاڵەبانیی ناچار بوو کە چاوەڕوان بکات هێزەکـانی ئـەمێریکا لـە بـەرایی 2003 دا بــێن و ژێرخــانی ڕێکخراوەکــە لــە ڕێگــە ی بۆردومــانێکی ئاسمانییەوە تەفروتونا بکات. ئەمەش لە ڕۆژە بەراییــەکانی ئۆپەراسیۆنی ئازادی عێراقدا. بەڵام، هەرچەنـدە کـە هـیچ بنکەیـەکیان نـەماوە، بـەڵام وا پێدەچێێت بە دڵنیاییەوە ئەنسـار یـان پاشـکۆکانیان وجـوڵێکی ژێـر بــە ژێریــان هێشــتۆتەوە لــە ســەرتاپای باکووردا بــە ســەرتاپای عێراقیشــدا بڵاوبوونەتەوە.

چەند گرووپێکی تری غەیرە کوردیش کۆچیان کرد بەرەو ئەو شوێنەی کە بە "عێراقـی ئـازاد" ناسـراوە. لەوانـە هــەردوو گرووپـی ئۆپۆزسـیۆن کـە ئەمێریکا پشتیوانیان دەکات، ویفاقی نیشتمانیی عێراقیـی(INA) سـەر بـە د. ئەیاد عەللاویی کۆنە بەعسیی و کۆنگرەی نیشـتیمانیی عێراقیـی(INC) بـە سـەرۆکایەتی ئەحمــەد چەلــەبی. هــەردووکیان بارەگــای ســەرەکیان لــە سەلاحەدین لە نزیک هەولێر جێگیرکرد. پ.د.ک و ی.ن.ک دوو بەشـداری چالاک بوون لە نێو گرووپـە ئۆپۆزسـیۆنیە عێراقییەکانــدا. دوو پێکهاتــەی هەرە بەرچاوی ناو چـەتری(INC)یـش بــوون. کــەچی، تەنانــەت لــە ژێــر چەتری(INC)یشدا ململانــێ لـە نێــوان پ.د.ک و ی.ن.ک هــەر بــەردەوام بوو، دوای ئەوەی پێوەندییەکانی نێوان ئەو دووانە بەرەو تێکچوون چــوو لە دوای هەڵبژاردنەکانی 1992 ەوە، زۆر جار چەلەبیی وەکـو ناوبژیکـار کاریدەکرد و هەندێک سەرکەوتنی سنووردارێشی بــە دەســت هێنــا. بــەڵام نەیتوانی کە ڕێگە بگرێت ململانێکە پەرە نەستێنێت بۆ شــەڕێکی نــاوخۆی گەورە لە ساڵی 1994 دا، کە تیایدا ی.ن.ک هەولێر و سلێمانی داگیر کرد

و پ.د.ک یـــش تـــوانی کۆنترۆڵی ناوچەی نەوک—ئەو شوێنە بە نرخەی کە سەرچاوەی کەڵەکەکردنی داهات بوو—و بەشـەکانی بـاکووری شاری هەولێر و لە ژێر دەستی خۆیدا بهێڵێتەوە.

وەک ئاماژەیەک بـۆ دینامیکـەکانی دوایـی نێـو ئۆپۆزسیۆنی عێراقـی، ی.ن.ک پێوەندی توندی خۆی هێشتەوە لەگەڵ INC. بەڵام پدک ڕەوتێکی زیاتر وورییایانـەی گرتەبـەر. جیاوازییـەکانی ئـەم پێوەندییانـە وەختێـک بەدەرکەوت کە INC و ی.ن.ک هێرشێکیان ئەنجامـدا لـە دژی هێزەکـانی سـەدام لـە بـاکووردا لـە ئـاداری 1995 دا.[281] لـەم سەرکێشـییەدا کـە لە کۆتاییدا دوای ئەوەی پشتیوانی ئەمێریکا سـەری نـەگرت( ئەمـەش بـۆ یەکـەمجار نـەبوو) شکسـتی هێنـا. ی.ن.ک هاوکـارێکی تـەواو بـوو. بـە پێچەوانەوە، پ.د.ک ئامادە نەبوو کە بگلێتە ناو شەڕێکەوە کـە هەڕەشـەی لە پرۆژەی دوولایەنـەی ئـاودیوکردنی نـەوت دەکـرد لـە گـەڵ سـەدامدا و مەترسـی ئـەوەی هـەبوو کـە سەربکێشـێت بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەیـەکی سەرتاسەری لە گەڵ گاردی کۆماریدا. وەزعی نێوان ی.ن.ک و پ.د.ک هەر بە شلەژاویی مایەوە بە درێژایـی سـاڵی 1995 و نیـوەی یەکـەمی سـاڵی 1996. وا دیار بوو لە جوندا شەڕو شۆڕ جارێکی تـر سـەرهەڵدەداتەوە. ی.ن.ک پ.د.ک ی بـەوە تۆمـەتبار دەکـرد کـە دایـەلۆگێکی نهێنیـی هەیـە لـە گـەڵ بەغـدادا. لـە کاتێکـدا پ.د.ک بەرپـەرچی دەدایـەوە بـە تۆمەتبارکردنی ی.ن.ک بەوەی کە هاوکاریی لە سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامیی ئێـران وەردەگرێـت. لـە ناوەڕسـتی مـانگی ئۆگۆسـتدا هـەرچی زیاتر لـە بەرامبـەر پێوەندییـەکانی ی.ن.ک و ئێرانـدا نیگـەران دەبـوو و زنجیرەیـەک بانگـەواز و داخـوازی دا بەئیـدارەی ئـەمێریکی بـۆ مسۆگەرکردنی ئاسایشی پ.د.ک. کەس گوێی لە بانگەوازەکانی بـارزانیی نەگرت. بـە تایبـەتیی دوای ئـەوەی بـارزانیی بـە هاوپـەیمانێکی گونجـاو دانەدەنرا لە باکوور لە دوای ئـەوەی پشـتیوانیی لـە هەوڵـەکانی پێشـووی ئەمێریکا نەکرد. بارزانیی دوای ئەوەی هیچ پەناگەیەکی نەما ڕووی تێبکات بۆ لابردنی ئەو هەڕەشەیەی تووشی پ.د.ک هاتبوو لـە لایـەن ی.ن.ک—ەوە، هاوکات تووشی عێراق هاتبوو لە لایەن چەکدارانی ئێرانییەوە. سەدام هەلەکەی قۆستەوە بۆ یارمەتییدان و شڵەقاندنی بارودۆخی سیاسیی کـورد. ئەم حاڵەتە هەروا هەلێکی نـاوازەی خسـتە بـەردەم سـەدام بـۆ دەرکردنـی

ملّـۆزم ئەحمـەد چەلـەبی وINC لـە بارەگاکانیانـدا لەکوردسـتانی عێراقداو ڕیسواکردنی سەرپەرشتییارەکانیان—وڵاتە یەکگرتووەکان.
لە بەرەبەیانی 31ی ئۆگۆستی{ 31 ی ئاب} 1996 دا هێزە عێراقییـەکان بە هاوکـاریی پێشـمەرگەکانی پ.د.ک شـاری هـەولێریان داگیرکـرد. هـەر بـە پەلـەش بەدوایـدا INC و ی.ن.ک لـە شـارەکەو دەوروبەریـدا دەرپەڕێنران. INC چەنـد سـەد کەسـێک لـە شـوێنکەوتوەکانی لەدەسـتدا کاتێک کەمپەکانی لە قوشتەپە.10 کیلۆمەتر لە باشووری هەولێرەوە کەوتنـە بەردەستی گاردی کۆمارییەوە ئەوانیش پیاوەکانی ئەحمەد چەلەبییان گـرت و لـەناویان بـردن. ئەگـەر بـەهۆی کۆسـرەت ڕەسولیشـەوە نەبووایـە-- سەرۆک وەزیـران و فەرمانـدەی سـەربازی ی.ن.ک—ئـەوا ی.ن.ک.یـش سەدان پێشمەرگەی لەدەست دەدا. ئەو شەڕێکی پاشەکشەی وەهای کرد کـە چووەتە ناو فۆلکلۆری ی.ن.ک—ەوە. ی.ن.ک دوای ئەو تێکشکانە بەرەو سلێمانیی و پاشـان بـەرەو ئێـران هـەڵات. بەمـەش سـەرتاپای کوردسـتان کەوتە ژێردەستی بارزانییەوە—ئەگەر بۆ مـاوەیـەکی کـەمیش بێت. دوای ئەوەی هێزەکـانی سـەدام پاشەکشـەیان کـرد. تاڵـەبانیی دوای ئـەوەی لـە ئێراندا یەکیانگرتەوە دژە هێرشێکی ئەنجامـدا و پ.د.ک ی لـە سـلێمانیی دەرپەڕاند. ئەو هێڵی ئاگربەستەی کە دوای ئەم شەڕانە دیاریکرا لە نێـوان ئـەم دووانـەدا—کـە لـە باشـوورەوە بـۆ بـاکوور درێـژ دەبێتـەوە. لە کۆیسنجاقەوە تا حاجی ئۆمەران—بوو بـە سـیمایەکی چەسپاوی سـەر نەخشەی سیاسیی کوردستانی عێراق.[282]

## بەرەو بەدامەزراوەییکردن

لە ساڵی 1996—ەوە بەشی ژێر دەسەلاتی کوردیی بەسەر دوو ناوچەدا دابەش بـووە. ئیـدارەی سەرانسـەری دهـۆک و بەشـێکی زۆری ئیـدارەی هەولێر بە پایتەختیشەوە لە ژێر قەڵەمڕەوی پ.د.ک دا مایەوە. بەم شـێوەیە پ.د.ک بەشی باکووری خۆراوای لەژێر دەستە. سەنتەری حکومەتەکەیشـی لە شاری هەولێردا جێگیرە. بارەگا سەرەکییەکانی پ.د.ک—یش دەکەونـە سـەڵاحەدین لـە نزیـک هـەولێر. ئیـدارەی سەرانسـەری سـلێمانیی لەگـەڵ بەشێکی زۆری ئیدارەی کەرکوک(هەرچەندە خودی شارەکەی تێدا نییـە) و بەشێکی بچووکی ئیدارەی هەولێریش لە ژێر دەسەلاتی ی.ن.ک دا مایەوە.

دامو دەزگا حکومییەکانی ی.ن.ک بە گشتیی لە شاری سلێمانییدا جێگیرن. بونیادی پارتەکەش دابەشبووە بەسەر ئەم شارە و بارەگای مەکتەبی سیاسیی لە قەڵاچوالانە.
حوکمکردن لە هەریەک لەم دوو دەوڵەتۆکە دیفاکتۆیەدا بە دەستی حیزبی باڵادەستەوەیە لە ناوچەکەدا. هەردوو پارتەکەش بە فیعلیی سیستەمی تاکە حیزبیی پەیڕەو دەکەن. لە پاش دوا خولی شەڕی بێئەنجامی نێوان پ.د.ک و ی.ن.ک لە ساڵی 1996 دا. بارودۆخی ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمییە بە شێوەیەکی بەرچاو بەرەو پێش چوو. بە تایبەتی بە بەراورد لەگەڵ باقی بەشەکانی تری عێراق. بە گوێرەی بەندەکانی بڕیاری 986 ی نەوت لە بەرامبەر خۆراکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکاندا. لە سەدا 13ی داهاتی نەوتی هەناردەی عێراق بۆ ئیدارەی باکوور دەستنیشانکرا. ئەمەش ئاستی گوزەرانی بە شێوەیەکی بەرچاو بەرەو پێش برد. پەرەسەندنەکانی باکوور بوون بە جێگەی سەرنجی باقی بەشەکانی تری عێراق و کوردستان نازناوی" کوەیتی بچووک" ی وەرگرت بەهۆی ئابوورییە گەشەسەندووەکەی. ئەم پەرەسەندنە ئابوورییانە هاوکات بوون لەگەڵ ئاساییبوونەوەی پێوەندییەکانی نێوان دوو پارتەکە ئەویش بەگوێرەی ڕێککەوتنامەی واشینگتۆنی سێپتەمبەری 1998 بەسەرپەرشتی ئەمێریکا. ئەو ڕێکەتننامەیە داوای هاوکاری زیاتری کرد لە نێوان ی.ن.ک و پ.د.ک هەروا داواشی کرد کە لە داهاتوودا جەخت بکرێتە سەر هەڵبژاردنی فرە حیزبیی بۆ یەکخستنەوەی هەردوو دەوڵەتۆکە و دوو ئیدارەکە.[283] هەردوو حکومەتە کوردییەکە هەرچەندە پارچەپارچە بوون. هەرچی زیاتر بەرەو دامەزراوەیی دەڕۆیشتن. کابینەکانیان لە هەولێر( بە سەرۆکایەتی نێچیرڤان بارزانی، برازای مەسعود) و لە سلێمانیی(بە سەرۆکایەتی د.بەرهەم ساڵح) جێگیر ببوون. تا ساڵی 2001 ماوەی دە ساڵ بوو ژیانی کوردەکانی عێراقیان لەبەر دەستدا بوو.[284]
ئەمە ڕاستییەکی سادەیە. بەڵام ڕاستییەکیشە کە چەند کاریگەرییەکی جدیی هەیە لەسەر لکاندنەوەی کوردستانی عێراق بە عێراقەوە. ئەو کەسانەی لە ساڵی 1991دا تەمەنیان 10 ساڵ بووە ئێستا لە 2004 دا 24 ساڵەن و یادەوەرییەکی کەمیان هەیە لە سەر ژیان لە ژێر سایەی ڕژێمی سەدامدا. ئێستا کوردیی زمانی ستانداردە نەک عەرەبی: ئابووریی و دراوێکی

جیــــــاواز(کوردەکـــــــان بـــەردەوامبوون لەســــەر بـــەکارهێنانی دینـــارە کۆنەکە نەک ئەو دینارە نوێیەی کە سەدام لـە دوای داگیرکردنـی کوەیـت چاپی دەکرد). سەری کێشا بەرەو دەرکەوتنی ئابوورییەک کە سەربەخۆ لـە بەغداد کاری دەکرد؛ حکومـەتیش لـە بـاکووردا پەیوەسـتە بـە کاروبـاری" کوردیی"ەوە نەک"عێراقیـی" یـەوە. بـە هـەموو مانـاو مەبەسـتێک. ئێسـتا خەڵکی باکوور زیاتر کوردیین تـا عێراقیـی و دووبـارە لکاندنـەوەیان بـە عێراقەوە شەڕێکی زەحمەت دەبێت. لە دوای تێکدانی سـەنتەری بازرگـانی جیهانی لە سێپتەمبەری 2001 دا. دواتر لابردنی سـەدام لەسـەر کورسـیی دەسەڵاتەکەی لە بەغداد لـە بـەهاری 2003 دا. ئـەم دووبـارە لکاندنـەوەی کوردسـتانی عێـراق بـە عێراقـەوە جێگـەی مشـتومڕێکی ڕاسـتەقینە و گەرموگوڕە.

## 11ی سێپتەمبەری 2001 و کوردەکانی عێراق

11ی سێپتەمبەر ئەو هاوسەنگییە هەستیارەی کە کوردە عێراقییـەکانی بـە سەلامەتیی لەو جیۆپۆلیتیکە تایبەتییەی لە باکووری عێراقـدا تیایـدا بـوون گۆڕی. ناماقوڵییەکە لەوەدا بوو. مانەوەی دەوڵەتە دیفاکتۆ کوردییەکـە بـەو شێوەیەی کە هەبوو بەسترابووەوە بە مانەوەی خودی سەدام. هەتا سـەدام لەسـەر دەسـەلات بـوو کوردەکـان و بەتایبـەتیی پ.د.ک پێوەندییـەکی تـا ڕادەیەک سوودمەندانەیان لەگەڵ بەغدادا هـەبوو. لـەو کاتـەدا ڕژێـم لـەوە بێهێزتر بوو کە بتوانێ هێزو دەسەلاتی خۆی بۆ ماوەیـەکی درێـژ خایـەن بەسـەر بـاکووردا بسـەپێنێت ئاسـەوارەکانی سـزاکانیش لـە پـەلوپۆیان خستبوو. کوردەکـان کـەناڵێکی بەکـەڵکیان خسـتە بـەردەم بـۆ شـکاندنی سزاکان و پێکەوەنانی داهات. لەگەڵ لابردنی سەدامدا وەزعەکە لە بناغـەوە گۆڕا.

لەلای سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی ئاشکرا بوو کە سەدام حوسـێن لـــە کـــارە تیرۆرســـتییەکانی 11ی ســـێپتەمبەرەوە دەگلێنرێـــت. بـــەلای سەرکردایەتی کوردیشەوە ئومێدەکە لەوێـدا بـوو. بـەلام. لـە هـەموو پارتـە ئۆپۆزسـیۆنە عێراقییـــەکان زیـــاتر. پ.د.ک و ی.ن.ک زۆریـــان هـــەبوو لەدەستی بدەن. کە جۆرج بوشی کوڕ ڕووی بەرەو عێراق وەرگێـڕا. پـد.ک

و ی.ن.ک باش لەوە بە ئاگابوون کە هەموو ئەو دەستکەوتە سیاسیینەی کە لە لە ساڵی 1991ـــەوە بە دەستهاتوون خەریکە بە هۆی گۆڕانی وەزعی حازرەوە دەکەوێتە ژێر هەڕەشەوە. ئەمە ئەوەیە کە دەکرێ ناوبنرێت " گێژاوی کوردی/Kurdish dilemma". شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە خواستی شەخسیی ئەندامانی سەرکردایەتی کوردیی و زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردی عێراق ئەوە بوو کە ڕوخانی سەدام و دامەزراندنی دیموکراسیەتێکی فرە حیزبیی ببینن لە عێراقدا. بەلاّم. ئەو زەرەرەی چاوەڕوان دەکرا لە داهاتی حیزبەکان(بەتایبەتی پ.د.ک) و پێگەی سیاسیی لە عێراق و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و لە ئارامیی و ئاساییشی کوردستانی عێراق بکەوێت گەر هاتوو هەر هەوڵێکی ڕژێم گۆڕین بەرەنجامی پێچەوانەی لێبکەوێتەوە. ئەمانە ئەو کاتە و ئێستاش جێگەی نیگەرانی گەورەن.
لە ئەندێشەی سیاسەت داڕێژەرانی ئەمێریکا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەو دەوڵەتانەشدا کە بەرژەوەندییان لێرەدا هەیە. کوردستانی عێراق بەشێکە لە عێراق. سیاسەتی ئەمێریکا زۆر بە ڕوونی نیشانی دەدات کە دەوڵەتێکی کوردیی ئەنجامێکی پەسەندکراو و چاوەڕوانکراو نییە. لێرەوە ستراتیژیەتی کوردیی لە ئاست ڕژێم گۆڕیندا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئامانجە کۆنەکەیان لە وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمیی لە بەغدادەوە و هەوڵدان بۆ مسۆگەرکردنی جۆرێک لە دەسەلات بەسەر ناوچەی کەرکوکی پڕبایەخ لە ڕووی ستراتیژیەوە.
کێشەی سەرەکیی کوردە عێراقییەکان لە عێراقی دوای سەدامدا ئەوەیە کە لە هەڵوێستێکی لاوازدان. ئەگەرێکی زۆر کەم هەیە کە ناوچەی دژە فڕین بەردەوام بێت. لە ئەپریلی 2003دا سزاکان هەڵگیران و هیچ بڕیارێکیش دەرنەکراوە بۆ دابینکردنی پشکێکی تایبەتیی بۆ کوردەکان لە داهاتی نەوتی عێراقیی. لەوەش زیاتر. ئاودیوکردنی بە قاچاغی نەوت لە ڕێی موسڵەوە بە ناو دهۆکدا چیدی میکانیزمێکی سەرچاوەی داهات نییە بۆ پ.د.ک. بە دڵنیایەوە. ترسی هەرە گەورە لەوەدایە کە جارێکی تریش کوردەکان بکرێنەوە بە قوربانیی چەند بایەخێکی جیۆپۆلیتیکی گەورەی تر کە ئەویش پاراستنی خاکی عیراقە. ئەمەش بە ڕێگەدان بە هەر

حکومەتێکێک لە بەغداد بە کاری ناپڵۆسین لە دژی باکووری سەرکەش و لەخۆبایی.
هەروەها لێرەدا چەند مەسەلەیەکی دەزگایی ئیداری سەرەکی هەن کە دەبێ باس بکرێن لە نێویاندا. پد.ک و ی.ن.ک ڕەنگە میلیشیایەکی 80 هەزار کەسیان هەبێت. ئەگەر گرووپەکان ی تریشی بخرێتە پاڵ ژمارەکە لە 100 هەزار تێدەپەڕێ. پێشتر سیاسەتی ئەمێریکیی ئاماژەی بەوە دابوو کە هەوڵنادرێت یەکسەر کوردەکان چەکبکرێن. لە کاتێکدا نزیکەی هەموو میلیشیاکانی تر فەرمانیان پێکراوە هێزەکانیان نەهێڵن و چەک دابنێن. بەڵام. بوونی میلیشیایەکی کوردیی سەربەخۆ هەڕەشە لە بەردەوامی یەکێتیی عێراق دەکات. لەشکرێکی سەربەخۆ کە توانای ئەوەی هەبێت بەرەنگاری دەسەڵاتی ناوەندی بکات و سەرپشک بێت لە نواندنی سیاسەتێکی دەرەکیی سەربەخۆ. بەڵام بۆ کوردەکان پاراستنی هێزی پێشمەرگە گرنگییەکی پراکتیکی وسیمبۆلیی هەیە. نایانەوێت چیدی دەستەوستان بن لە ئاستی دوژمنکاریی هەر حکومەتێکی عێراقی داهاتوودا دژ بە کوردستان. ڕەنگە ئەو قسانە پوچەڵ بکرێنەوە کە ئاماژە بە ئامادەیی کوردەکان دەکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی پێشمەرگە ئەگەر ئەو نائارامییەی کە ئێستا لە عێراقدا لە ئارادایە بەم شێوەیە بەردەوام بێت.

## کوردەکان: مەسەلە سەرەکییەکان

### میراتی ململانێ

کوردەکان وەکو گەورەترین نەتەوەی بێدەوڵەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا (دەکرێ بڵێین لە جیهانیشدا). سەرچاوەیەکی بەردەوامی ناسەقامگیریی بوون لە ناوچەکەدا. ئەو هەوڵانەی کە دراون بۆ تواندنەوەی (assimilation)ی کوردەکان بە زۆر—دیارترینیان لە تورکیا و عێراقدا—بە زۆری شکستیان هێناوە. هەم لەبەر ئەوەی کە کوردەکان هەستکردنێکی قووڵیان بە"تایبەتی (uniqueness)" خۆیان و ئایدێنتیتی خۆیان هەیە. هەم لەبەر ئەوەش کە ئامادە بوون بەرگریی لە خۆیان بکەن نەک ملکەچی بکەن بۆ هێزە باڵادەستەکان. کوردەکان" یاخییبووە" بنەڕەتییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن. ناوچەکەش بە گشتیی

هەرگیز ئاشتیی بە خۆیەوە نابینێت هەتا چارەسەرێک بۆ کێشەی کوردی نەدۆزرێتەوە. ڕەنگە باروبۆخی ئێستای باکووری عێراق سەرەتای چارەسەرێکی وەها بێت. بۆ دواجار کوردەکان شتێکی هەستپێکراویان هەیە نیشانی بدەن کە تەعبیر لە نەهامەتییەکانیان بکات. ئەزموونی ناسکی کوردەکان، سەرەڕای هەموو کۆسپەکان و چاوتێبڕینە ترسناکەکانی هێزە دراوسێکان، دەربازی بووە و گەشەی سەندووە.
ئەوانەی کە بەم دواییانە سەردانی کوردستانی عێراقیان کردووە بە حەماسەتەوە باس لە دەرکەوتنی کۆمەڵگەیەکی پلۆراڵ و لێبوردەیی ڕاستەقینە دەکەن، کە تیایدا حکومەتی کوردیی هەوڵێکی زۆری داوە بۆ زامنکردنی مافە سیاسیی و کولتورییەکانی هەموو ئەو گرووپانەی کە لە ناوچەکەدا نیشتەجێن. تەنانەت هەندێکیان باس لە دەرکەوتنی ئایدێنتیتییەکی"کوردستانیی" دەکەن کە هەموان بە کوردو تورکمان و ئاشوورییەوە تیایدا هاوبەشن. ئەمەش وەکو بەرەنجامی ئەو ئەزموونەی کە هەموویان لە ساڵی 1991 ەوە تیایدا بەشدار بوون. مێژووی عێراق بە ڕوونیی نیشانی دەدات کە کوردەکان سەرسەختانە ئامادەن شەڕ بۆ مافی چارەنووسی خۆیان بکەن و هەرگیز ناتوانرێت بە شێوازی سەربازیی بشکێنرێن. تەنانەت دڕندانەترین و پڕلەشکرترینی ڕژێمەکان لە مێژووی عێراقدا—ئەوەی سەدام لە ساڵانی 1980 دا—نەیتوانی سەرکەوتن لە دامرکاندنەوەی ڕوحی بەرەنگاری کوردەکاندا بەدەست بێنێ. کەمتر لە سێ ساڵ لە دوای کارەساتی شاڵاوەکانی ئەنفال، جارێکی تر کوردەکان کەوتنەوە بەرەنگاریی ئاشکرا لە دژی دەسەڵاتی ناوەندیی.
ئەو ڕێژە ئۆتۆنۆمییەی کە ئەمڕۆ کوردەکان بەدەستیان هێناوە بەرهەمی سەدەیەک خەباتی چەکدارییە. هیچ بەڵگەیەک لە ئارادا نییە وای بۆ بچین کە کوردەکان ئامادەن ئەمە بکەن بە قوربانیی بەبێ شەڕ. لێرەوە، کەمترین شتێک بۆ لکاندنەوەی کوردەکان بە دەوڵەتی عێراقەوە وەک سیستمێکی سیاسیی دوای سەدام، پێویستە کە تیایدا پلۆرالیزم، کولتوریی لێبوردەیی و ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەیی زۆر لە ئارادا بێت—ئەمەش ڕێک جۆرێکە لە حکومەت کە هەرگیز عێراق بەخۆیەوە نەدیتووە. تەنانەت ئەگەر بشکرێت بگەنە ڕێککەوتن لەسەر ڕژێمێکی لەم چەشنە، کوردەکان هیچ هۆیەکیان نییە کە متمانە بەوە بکەن کە ئەو گەرەنتییانە لە داهاتوودا ڕێزیان

لێدەگیرێت. بە دڵنیاییەوە، مێژوو پێمان دەڵێت کە کوردەکان زۆر گێل دەبن ئەگەر ئەم جۆرە گەرەنتییانە بە رووکار وەربگرن. رژێمە عێراقییەکان، لە کاتی بێهێزیاندا ئامادەبوون کە شتی زۆر بە کوردەکان ببەخشن، تا ئەو کاتەی هێز و دەسەلاتی خۆیان لە ناوەند کۆدەکەنەوە و دواتر پەشیمان دەبنەوە. کرۆکی کێشەی کوردیی لە عێراقدا بریتییە لە ناتەباییەکی بنەڕەتیی لە نێوان ئەو ڕێژە ئۆتۆنۆمییەی کە کوردەکان داوای دەکەن و ئەوەش کە حکومەتی ناوەندیی ئامادەیە قبووڵی بکات. لە کەش و هەوایەکی گونجاوی هاودەنگیی و متمانەدا دەشێ ئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت بە لام کوردەکان نزیکەی لە لایەن هەموانەوە دڕیغییان لێکراوە.

## میراتی خیانەت

ئەو قسە کوردییە باوەی کە دەڵێ" کوردان هیچ دۆستێکیان نییە جگە لە چیاکان" لە ڕاستیدا ڕەنگدانەوەیەکی پڕاوپڕی ئەزموونی کوردییە لە ماوەی سەدەی بیستەمدا. نزیکەی هەموو هێزەکانی ناوچەکە لە کاتێک لە کاتەکاندا"دۆستێک"ی کاتیی کوردەکان بوون. کوردەکان بە بەردەوامیی لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل و ئێرانەوە بەکارهێنراون بۆ تێکدانی ڕەوشی دەوڵەتی عێراقیی. هەر کە بە ئامانجە ستراتیژیەکانیشیان گەیشتوون وازیان لێهێناون تا بە چارەنووسی خۆیانەوە سەربنێنەوە. بە دڵنیاییەوە، ئەگەر لە ڕوانگەی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقەوە سەیری بکەین، کوردەکان بە حەماسەتەوە هەر هەوڵێکیان قۆستۆتەوە بۆ خیانەتکردن بە دەوڵەتی عێراقیی— لە هەموان دیارتر لە ماوەی شەڕی ئێران- عێراقدا-- ئەوەی لە هەردوو لای هاوکێشەکەدا رووی لەکزییە کالای متمانەیە. ڕەنگە ئاسەوارەکانی شەڕی 2003 ئەم نموونە مێژووییە بشکێنێت.

دوای ئەوەی کە جارێکی تر بوونەتە هاوپەیمانی ولاتە یەکگرتووەکان لە دژی حکومەتی ناوەندیی، ڕەنگە بەرژەوەندیی کوردەکان بەرگریی لێبکرێت بەبێ گوێدانە حیساباتی ستراتیژی گەورەتر. یان، ڕەنگە یەکێک لە ناو ئیدارەکەی بوشدا ندان بەوەدا بنێت کە ئەگەر دیموکراتیزەکردن ئامانجی دوور مەودا بێت کەواتە نابێ ئەو پرۆسەیە بە قوربانییکردنی ئەو تاکە بەشەی عێراق( کەم تازۆر تاکە بەشی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیش) بێ

کــه بـــه دیمۆکراســـیی دەچێـــت. ئەگـــەر ئەزموونـــە ناســـکەکەی کوردستانی عێراق لـە پلۆڕالیزم و لێبوردەیی پارێزگاریی لێنـەکرێت، بـە دڵنیاییەوە دەربازی نابێت. ئـەو کاتانـەی کـە کوردەکـان شـەڕیان لەگـەڵ حکومەتی ناوەندییدا نـەکردووە ڕووی چەکـەکانیان لـە یـەکتری کـردووە. هەوڵێکی زۆر کەمی دەوێت بۆ هێزێکی دەرەکی(با بڵێین تورکیا) یان هـەر حکومەتێکی ناوەندیی بەهێز بۆ تێکدانی ئەو ئەزموونە کوردییـە. ئـەویش دەکرێت بە هاندانی لایەنێک بێت لـە دژی ئەوەکـەی دیکـە. ئەگـەر وڵاتـە یەکگرتووەکان بە جدیی لەگەڵ دیموکراتیزەکردندایـە نـابێ ڕێگـە بـدرێت شتێکی وەها ڕوو بدات.

## تەعریبکردن و باری کەرکوک

بـاری کـەرکوک لـەمێژە خـاڵی نـاکۆکیی بـووە لـە نێـوان کوردەکـان و حکومەتە عەرەبیە عێراقییەکاندا. کەرکوک بۆ کوردەکان پایتـەختی ڕوحـی ناسـیۆنالیزمی کوردییـە؛ بـە لای حکومەتـە عەرەبیەکانیشـەوە دەسـت بەسەرداگرتنی کەرکوک یەکسانە بە دەستبەسەرداگرتنی چاڵـە نەوتـەکانی. دەستڕاگەیشتنی کوردەکـانیش بەسـەر داهاتـەکانی نـەوتی کەرکوکـدا بـۆ خۆی هۆکاری ئابووریی پێویستیان بۆ دابین دەکات تا لە دەوڵەتی عێـراق جیاببنەوە.

بـەلای سـەدامەوە تـەعریبکردنی ناوچـەکانی بـاکوور لـە سـەردەمی دەسەڵاتەکەیدا خزمەتی بە چەندین ئامانج دەکرد. ئەو هێشتا لە بیری بوو کە کوردەکان چەندە بە حەماسەتەوە داوای کەرکوکیان دەکرد و داخوازییە بەردەوامەکانی سەرکردایەتی کوردیشی لەبیر بوو لە هەوڵیاندا بـۆ دەسـت بەسەرداگرتنی شارەکە. وەک دەرکردنەکانی حەفتاکان و هەشـتاکان بـەس نەبوو‌بێت، کوردە دەرکراوەکان لـە ڕاپەڕینـەکانی 1991 دا ویسـتیان بـە شەڕ دەسەلاتی بەغداد بەسەر شارەکەدا نەهێڵن. لەمەوە، حکومەتی عێراقـی دەبووایە. یەکەم، داهاتووی عەرەبیی شارەکە و نەوتەکەی مسـۆگەر بکـات.

دووەم. دەرپەراندنی غەیرە عەرەبەکان لە ماڵەکانیان و ناچارکردنیان بە ڕاکردن بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستان قورسیاییەکی زۆری دەخستە سەر دەسەلاتی تازەی کوردیی. ئەمەش قورساییەک بوو کە ئەوان ڕەنگە لە توانایاندا نەبووبێ بەرگەی بگرن.
خێزانە غەیرە عەرەبەکان بەشێوەیەکی سیستەماتیکیی لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی حکومەت و بەرپرسەکانی حیزبی بەعسەوە دەکران بە ئامانج و گوشاریان دەخرایە سەر تا ئەم هەنگاوانە بنێن: (1) بە فەرمیی ئایدێنتیتیی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن ئەویش بە خۆ ناونووسکردن وەکو عەرەب.(2) ببن بە ئەندامی حیزبی بەعس (3) ئەگەر لە تەمەنێکی گونجاودا بن. بچنە ناو یەکێک لە میلیشیاکانی سەر بە ڕژێم( لە وانە سوپای قودس و فیدائییەکانی سەدام).[285] ئەگەر ئەم هەنگاوانە نەهاوێژران(بەزۆرییش وەها بوو). ئەو خێزانە بەدبەختە دەردەکراو ناچار دەکرا کە بچێتە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردیی. دوای گەیشتنیان بەوێ. دەسەلاتی لۆکاڵیی هیچ چارەیەکی تری نەبوو ئەوە نەبێ کە بیانخاتە چەند خێوەتگەیەکەوە لە قەراغی شارە گەورەکان. یان ڕێگەیان بدرێت لەو شوێنانە نیشتەجێ بن کە پێشتر کاولکراون یان لە گەڕەکە هەژارەکاندا.
ئاستی ژیانی ئەم کوردە"کەرکوکیی" یانە لەوپەڕی نزمییدا بوو. بە زۆریش دەکەوتنە دەرەوەی پرۆگرامی نەوت بەرامبەر بە خۆراکی UN. چونکە ناسنامە و پسوولەی بایەعییەکانیان لێسەندرابووەوە. بە هەموو پێودانگێک. ئاوارە کەرکوکییەکان بە ڕەسمی لە لایەن حکومەتی عێراقیی و UN ەوە بوونیان نەبوو. ئەو زەوییانەی کە لەلایەن دەرکراوە غەیرە عەرەبەکانەوە بەجێدەما لە لایەن حکومەتەوە ئەو عەرەبانەی تێدا نیشتەجێ دەکرا کە دڵسۆزی ڕژێم بوون. هەندێک ڕاپۆرتیش باس لەوە دەکەن کە فەلەستینییەکانیش مافی نیشتەجێبوونیان پێدرا بوو لە ناوچەکەدا.
دەرکراوە غەیرە عەرەبەکان هەمیشە لە خەیاڵی ئەوەدا بوون کە بە زووترین کات بگەڕێنەوە زێدەکەی خۆیان. لەگەڵ ڕووخاندنی سەدامدا ئەو ڕۆژە هات. کەرکوک لەگەل ناوچە تەعریبکراوەکانی تردا. هەڕەشەی ئەوە دەکات کە ببێتە شارێک لە ململانێی ئێسنیکیی و ئەگەری ئەوەش هەیە کە ببێتە زۆنگاوی خوێن چونکە دەرکراوە غەیرە عەرەبە گەڕاوەکان هەوڵی دەرکردنی دانیشتوانە نیشتەجێبووەکەی دەدەن.

## بەرەنجام

کەبڵێین، کوردەکان خۆشییان لەسەدەی تیژتێپەڕی بیست نەکرد، ئەوە ڕاستیی نەپێکراوە . کێشەی ئەوەی کە عەرەب نین و کەمینەن لە دەولەتێکی لە بنەڕەتدا عەرەبزادە لە پاڵ ململانێی ناوخۆییە جەوهەریەکانیان، بۆتە هۆکاری ئەوەی کە مێژووی کوردی عێراق لە دامەزراندنی دەولەتی عێراقەوە پڕاوپڕ بووە لە کارەسات لە دوای کارەسات. بەداخەوە، ئاماژەیەکی کەم لە ئارادایە پێمان بڵێت کە سەدەی نوێ موژدەبەخشی پێشکەوتنی زیاترە. کوردەکانی عێراق کە هێشتاش لە ناو پێوەندییەکانی کۆلۆنییە سنوور دروستکەرەکاندا گیریان خواردووە، لە ڕێی ململانێوە توانیویانە کە هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیی لە عیراقدا پێکەوە بنێن، کە دژ بە حەزو خواستی زۆربەی لایەنەکان ماوەتەوە. بەلام بە شێوەیەکی باش خزمەت بە خەڵکی ناوچەکە دەکات. لێرەوە، ئایا کوردستانی عێراق ئەو نمونەیەیە کە ئێمە هەمووان پێویستە لە باشماوەی بەشەکانی تری عێرقدا خەباتی بۆ بکەین؟ یان ئایا دەکرێ لە ڕاستییدا ڕێگەچارەی ڕاستەقینەی" کێشەی عێراق" بێت—وەک نموونەی دابەشکردنی دەولەتێک کە نەدەبوایە لە سەرەتادا دروست بکرێت؟ ئەگەر بڕیارە کێشەی عێراق چارەسەر بکرێت، پێویستی بەوە زیاترە تەنها شوێنی ڕژێمی دیکتاتۆریی پڕ بکرێتەوە.

هەوڵە بەردەوامەکانی هێشتنەوەی عێراق بەیەکەوە، توندوتیژیی و دیکتاتۆریی بەرهەم هێناوە. ڕەنگە هیچ ڕێگە چارەیەکی تر نەبێت بۆ پاراستنی یەکێتی خاکی دەولەتەکە. ئەگەر عێراق وەکو دەولەتێک"شکست" نەهێنێت، چارەنوسی ئەوەیە کە بە زۆرداریی حوکم بکرێت. ئۆلتێرنەتیڤەکە دابەشکردنی دەولەتی عێراقییە. دەکرێ بڵێین کوردستان ئەو دوومەڵە گەنیوە بووە کە شەرعییەتی دەولەتی عێراقی بەتاڵکردووەتەوە. بەلام دەشێ ئێستا تەلیسمێک بێت بۆ گواستنەوەیەکی ئاشتییانە لە ڕێگەی دابەشکردنێکی گونجاوەوە. شتێکی حاشاهەلنەگرە، کوردەکان کێشەی ناوخۆیی گەورەیان هەیە، کەچیی هێشتا توانیویانە بۆ ماوەی زیاد لە دە ساڵ بە هاوکاری UN و کۆمەلگەی نێودەولەتیی بەسەر قەوارەیەکی زیندوودا ڕابگەن. بەدەر لە ئیسرائیل و تورکیا، دەکرێ

کوردستان نزیکترین شوێن بێت لە قەوارەیەکی دیموکراسیی کارا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. ئەگەر پاراستنی ئەمە بە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردییەوە پەیوەست بێت، پێویستە بە جدیی بیر لەم ڕێگە چارەیە بکرێتەوە.

# بەندی هەشت

# تەنگژەی دیمۆکراسیی

## پێشەکیی

لـە کـاتژمێر هەشـتی دوا نیـوەڕۆی ڕێکـەوتی 19 ی مارسـی 2003 دا مۆڵەتە 48 کاتژمێرییەکەی ئیدارەی بوش کە بۆ سەدامی دانابوو تا عێراق جێ بهێڵێت ئێکساپایەر بوو. دوای ئەوە بە ماوەیـەکی کـورت، کەمپـەینی لابردنی ڕژێمی سەدام لە ڕێگەی هێزەوە کە بە "پرۆسەی ئـازادیی عێـراق" ناوزەد کرا بە شێوەیکی جدیی دەستیپێکرد. لەوەش گرنگتر، ئەم مێژووە سـەرەتایەکی بەرجەسـتەش بـوو بـۆ دەسـتپێکردنێکی نۆکتریـنی شۆڕشگێڕانە لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئـەمێریکا، واتـە سیاسـەتی پـەنابردن بـۆ جـەنگ وەک هۆکـارێکی پاراسـتنی ئاساییشـی نیشتمانیی ئەمێریکا. بابەتێکی تری گرنگ پەیوەست بەو مەسەلەیە، بـەڵام کەمتر جێی سەرنج بووە، ئەوەیە کە هێرشکردنە سەر عێراق ئاماژەیەکە بۆ "یەکـەم کایـەی نەخشـەیەکی مـەزن بـۆ بیناکردنـەوەی ئەخلاقییانـەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست".[286] نەخشـەیەک کـە لـە لایـەن "پلانگێڕەکـان" ی موحافیزکارە نوێکان لە ناوەوە و دەرەوەی ئیدارەی بوش، کە زۆر بەر لـە

ڕووداوەکـــانی یـــانزەی سـێپتەمبەر کێشـراوە. لای کـەم بەشێکیشـی، ندان پیانانــە بــەوەی کــە سیاســەتی تەقلیـدیی پشـتیوانییکردنی ئــەو دیکتاتۆرانــەی کــە جێـی متمانــەی ئـەمێریکان بـەڵام سـەرکوتکارن، ئیتـر سیاسەتێکی گونجاو نییە.

ڕووداوەکـانی یـانزەی سـێپتەمبەر بـە ڕوون و ئاشـکرا سـەلماندیان کـە ناوچەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت زەلکاوێکـە سـیخناخ بـە ڕق و قینـە دژی ئـەمێریکا. هـەروەها سـەرزەمینی ئـەمێریکا چییتـر پـارێزراو نییـە لـە کاریگەرییــەکانی ئــەو نەفرەتــە. لــە جیــاتی چارەســەرکردنی هۆکــارە ڕاستەوخۆکانی ئەو قینە- پاڵپشتیی ئەمێریکا بۆ ئیسـرائیل، بـوونی بنکـە سەربازییەکانی ئەمێریکا لە سـعودییە، گـەمارۆی ئـابووریی سـەر عێـراق- پلانەکەی ئەمێریکا جەختی لەسەر ئەو هۆکارە بنـەڕەتیی ڕوواڵەتیانـە بـوو کە بە سەرچاوەی هەستی دژە ئەمێریکایی لێک دەدرێنەوە، واتە سـەرکوتی سیاسیی و هەژاریی. قسەو باس ئەوەیە ئەگەر دەست بۆ چارەسـەری ئـەم کێشانە ببرێت ئەوا زەلکاوەکە وشک دەبێت. هێڵە سـەرەکییەکانی پلانەکـە بێ پێچ و پـەنا و ئاشـکرایە. ڕژێمـی بەغـداد لابـەرە و دیمۆکراسـیی بـۆ عێراق بێنە. لەحاڵێکدا ئەگەر عێراقێکی دیمۆکراتیی پتەو دابمەزرێت دەبێتە چرایـەکی گەشـاوە لـە نـاوەنـدی شـەوەزەنگی سـەرکوتکارییدا. ڕژێمـە سەرکوتکارەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. یەک لە دوای یەک دادەڕوخـێن (جا ئەوە بە هاوکاریی بێت یان نـا) و لـە شـوێنیاندا تـەپڵی سـەرکەوتنی دیمۆکراسیی و گەشەکردن لێدەدرێت.

بەم شێوەیە، ناوچـەی "ئاشـتیی دیمۆکراتیانـە-Democratic Peace "لە جەرگەی جیهانی عەرەبییـدا سـەرهەڵدەدات. هەرێمەکـە بـۆ هەتاهەتایـە سەلامەتتر دەبێت بۆ هەر یەک لە ئەمێریکا و ئیسـرائیل. پلانەکـە ئـەوەش دەسەلمێنێت کە بردنەوەی جەنگی دژە تیرۆر لە مەیدانەکانی شـەڕ نابێـت. بەڵکوو لە ناو دڵ و مێشـکی تیرۆریسـتە چاوەڕوانکراوەکـانی دوارۆژ لـە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبێت. لە ڕوانگەی هەندێک کەسـەوە، ئـەوەی کـە پێـی دەگوترێـت بیـردۆزی تەشـەنە کردنـی دیمۆکراسـیی "دیمـۆکراتیی دۆمینـۆ Democratic Domino" وەک کـارێکی زرنـگ و زیـرەک دەبینرێت و بۆ هەندێکی تریش ئەوپەڕی گێلییە. بـەڵام ئـەوەی کـە کـەس ناتوانێت گومـانی لـێ بکـات ڕادەی تـەماعی ئـەو بیردۆزەیـە. یـەکێک لـە

چاوێره شلەژاوەکان ئاوا وەسفی کرد "بەجورئەترین ئەزموونی ئایدیالییە لە مێژووی سەرجەم مرۆڤایەتییدا".[287] بوش لە وتارێکیدا کە لە فێبریوەری 2003 دا لە بەردەم پەیمانگای پرۆژەی ئەمێریکیی پێشکەشی کرد، ئەوەی ڕۆشن کردەوە -ڕەنگە یەکەم جاری بێت لە بەردەم جەماوەردا- کە بیرۆزی دۆمینۆ دیمۆکراسیی بووەتە سیاسەتی ڕەسمی ئیدارەکەی:
بەرژەوەندیی ئاشکرای جیهان، لە بڵاوبوونەوەی بەهاکانی دیمۆکراسییدایە، لەبەر ئەوەی گەلانی سەربەست و سەقامگیر، ئایدۆلۆژیای کوشتن بەرهەم ناهێنن. ڕژێمی تازە لە عێراقدا دەبێتە نموونەیەکی بەرچاو بۆ سەرفرازیی گەلانی تری ناوچەکە.[288] کاتێک سەرۆکی تاکە وڵاتی زلهێزی دنیا ئەم لێدوانانە دەدات، خەڵک هەوڵ دەدەن سەرنجی بدەنێ. لە ئێستا بەولاوە، ڕاستگۆیی ئیدارەی بوش بەستراوەتەوە بە توانستی لە جێبەجێکردنی ئەو پەیمانانەی کە بە خەڵکی عێراقی داوە. لە گەڵ داگیرکردنی عێراقدا، ئەمێریکا ڕێچکەیەکی گرتە بەر کە ڕەنگە یان بە "لای کەم بنیاتنانەوەی ئەخلاقیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست" یان بە کارەسات کۆتایی بێت. هەر ڕێگایەک بێت، ڕێچکەکە لە بەغدادەوە دەست پێ دەکات. ئەگەر ئەمێریکا پەشێوی لە عێراق بەرپا بکات، یان وەک دەسکەوتێکی کۆلۆنیالیی، نەک بنیاتنانەوەی کەشو هەوایەکی ئاشتیی و دیمۆکراتیی ئەو کاتە دەرەنجامە نەخوازراوەکانی بۆ ستراتیژیی و بەرژەوەندییەکانی ئەمێریکا لە ناوچەکەدا بە گشتی ڕووخێنەر دەبێت، کە ئەگەری سەرکەوتنە چاوەڕوانکراوەکەی ئەمێریکا لە چوارچێوەی ئەو ڕەهەندە پڕ مەترسیەدا تەماشا بکرێت.

## ڕەوشی مێژوویی

کاتێک بنیاتنەرەوەکانی دەوڵەت، دەست دەکەن بە پرۆسەی بەیەکەوەلکاندنی پاشماوەکانی عێراق، ئەوان هەست بەوە دەکەن کە زۆر کەم لە ماددەی خاو هەیە بۆ ئەوەی کاری لە سەر بکەن. عێراق وڵاتێکی دەسکردی بەریتانیایە، لە پارچە وردوخاشبووەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە پێکەوە لکێنراوە. دوو بڕیاری سەرەکیی بەریتانییەکان- لکاندنی ویلایەتی موسڵ کە کورد تیایا زۆرینە بوون، بە ویلایەتی بەغداد

و بەسرە کە عەرەب تیایدا زۆرینە بوون و بەردەوام بوون لە سەر کولتووری عوسمانییەکان لە بەڕێوەبردنی عێراق لە لایەن کەمینەی سوننەی عەرەب- کاریگەرانە عێراقیان بە چارەنوسێکی ئازاربەخش سپارد. بە درێژایی مێژووی عێراق، هەرگیز کورد ئامادە نەبوون کە بەشداری دەوڵەتی عێراق بکەن. بەردەوام بەڵام بە پچڕپچڕیی لە بیستەکان و دواتریش لە کاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا. کورد زۆر سەرسەختانە جەنگین بۆ ئەوەی داکۆکیی لە سەربەخۆیی خۆیان بکەنەوە لە دژی کۆنترۆڵی ناوەند. ئایدێنتیتیی دەسەڵات لە بەغداد هەرگیز بۆ کورد مەسەلەیەکی گرنگ نەبووە.

لە ساڵی 1961 بۆ ساڵی 1991، کوردەکان پەیڕەوی جۆرێک لە جەنگیان کردووە کە دەکرێت بە ئاستی نزمی شەڕی ناوخۆیی لە دژی دەسەڵاتی مەرکەزی پێناسە بکرێت. لە هەندێک کاتدا، هەروەک لە 1975، 1988، و 1991 دا، شەڕ گەیشتە ئاستی هەرە بەرزی خۆی. لە دوای 1991 ەوە، هەرێمی کوردیی وەک دیفاکتۆی دەوڵەتێکی سەربەخۆ ئاسا فەنکشنی کردووە. دامەزراوەی سیاسیی، هێزی سەربازیی و کۆمەڵگەی مەدەنیی کارای کامڵ بیوو. بەبێ خەبات و تێکۆشان "چاخی زێڕین"ی کوردستان بەدی نەدەهات. پاراستنی ئەوبارودۆخە کەمترین داواکاریی کوردەکانە لە بارودۆخی دوای سەدامەوە. لە ڕاستییدا، ئەستەمە کە چۆنییەتی یەککگرتنەوەی کوردەکان لە گەڵ دەوڵەتی عێراقدا بخەیتە پێش چاو، بەتایبەت ئەوە لەبەر چاو بگرین کورد هەرگیز لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا تێکهەڵکێش نەبووە.

ئەوەش زەحمەت نییە لەوە تێبگەیت کە بۆچیی لە دوای کەمپەینی ئەنفالەکان لە ساڵی 1988 وە سەرکوتی دڕندانەی ڕاپەڕینی 1991 پەیوەندیی هاوسەنگانە لە نێوان کورد و حکومەتێک کە عەرەبەکان تێیدا باڵادەستن لە چاونوقاندنێکدا بەدی نایەت. لە تێڕوانینی عەرەبەکانەوە، کورد هەمیشە لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا خائین بوون و ئامادەن کە هاوپەیمانیی لە گەڵ هەر هێزێکی بێگانەدا بکەن بۆ شەڕ کردن لە گەڵ خەڵکی عەرەبدا. کەم لە عەرەبەکانی عێراق فرمێسک بۆ کوردی هەڵەبجە دەڕێژن. زۆریان وا بیر دەکەنەوە کە کورد ئەو شتەی کە شایستەیەتی وەریگرتووە، لە تۆڵەی خیانەتکردنیان بە مەسەلەی عەرەب.

دابەشبوونی تایەفیی (سوننە و شیعە) هەمیشە ئاڵۆزتر بووە. شیعەکان کۆمەڵێکی چوونیەک نین و رادەی بەیەکدالکانی جیۆگرافی لە نێوان سوننە و شیعە هەمیشە لەوەی نێوان کورد و عەرەب زیاتر بووە. لەشارە پیرۆزەکانی باشوور. رابەرانی ئایینی شیعە جاروبار دابەشبوونی تایەفییان بە واتای سیاسیی پڕ کردۆتەوە. بەڵام بە شێوەیەکی تەقلیدیی سروشتی سێکیولاری هەموو رژێمەکانی کۆماری عێراق و ئەو هەوڵانەی کە لە لایەن رژێمە یەک لە دوای یەکەکانەوە بە تایبەت رژێمی بەعس. بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروباری ئایینی لە باشوور. وەک سیاسەتێکی سێنتراڵیی ئامانج بووە. لەوەش بەولاوەتر. گەلێک گرووپی ئیسلامیی. وەک حیزبی ئەلدەعوە و ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامیی. نیازی ئەوەیان ئاشکرا کردووە کە ئەگەر پێویستی کرد دەست بۆ هۆکارە توندوتیژەکان دەبەن بۆ بڵاوکردنەوەی شۆڕشی ئیسلامیی. بۆیە رادەی بەسیاسییکردنی دابەشبوونی تایەفیی. دەبێتە هەڕەشە لەسەر یەکپارچەیی خاکی عێراق. و گەڕانەوەی نزیک بە 400000 رادیکاڵی ئایینییش زیاتر بەنزین بە سەر ئاگرەکەدا دەکات.

بەهەرحاڵ. ئەو رادەیەی کە ئایین لە ناو کۆمەڵگای شیعەدا بەگشتیی بە سیاسیی کراوە. پێدەچێت سنووردار بێت. لە رووی مێژووییەوە. رەشبینیی شیعە جەختی لەسەر باڵادەستیی سوننە کردووەتەوە بەسەر هەموو پایەکانی دەسەڵات لە دەوڵەتی عێراق دا. لە زۆربەی کاتەکاندا. چارەسەرکردنی کێشەی کورد و بەردەوامیی باڵادەستیی سوننە بەمانای ئەوە بووە کە توندوتیژیی دراوێکی سەرەکییە بۆ ئیدارەکردنی عێراق. سووڕی توندوتیژیی- جا چ لە لایەن حکومەتەوە لە دژی گرووپە یاخیبووەکان پەیڕەو کرابێت یان بە پێچەوانەوە - کات دوای کات لە هەڵکشاندا بووە. ئەوە رێکەوت نییە کە دڕندەترین سەرکردەی عێراقیی (سەدام) لە هەموویان درێژ خایەنتر بووە. رەنگە عێراق بەو پێکهاتە جیۆگرافییەی ئێستای. بە بێ سەرکردەیەکی بەهێزو دڵڕەق کە سەرۆکایەتیی دەوڵەتێکی ناوەندیی بەهێزی یەکگرتوو بکات. ئیدارە نەکرێت. لە گەڵ تێپەڕبوونی کاتدا. داهاتی نەوت هێندەی سەروەت بە دەوڵەتی عێراق بەخشی کە بتوانێت بخزێتە ناو خەڵکەوە و دەسەڵاتی خۆی قایمتر بکات.

لە ژێر حوکمڕانیی سەدام لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا ئەم پرۆسەیە گەیشتە لوتکەی خۆی، کاتێک دەوڵەتی عێراق، کە خرابووە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی حزبی بەعس (و لەوانەش سەدام، دەستی بەسەر ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی عێراقدا گرتبوو. خواستی چێکردنی ئایدێنتیتییەکی نەتەوەیی ساختەی عێراقیی بە گوروتینێکی زۆرەوە لە سەردەمی سەدام پیادە دەکرا. ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە لە ئارادا بوون تێک شکێنران و بە پەیوەندیی دەستکرد لە سەر بنەمای دڵسۆزیی بۆ سەدام و لە ڕێگەی حزبی بەعسەوە جێیان پڕ کرایەوە. ئامانج پەرتەوازەکردنی خەڵکی عێراق بوو، ئینجا بنیاتنانەوەی ئیدگای شکۆمەندانەی "پیاوی عێراقی" بوو- بوونەوەرێک کە خۆی لە سەرووی دابەشبوونە تایەفیی و نەتەوەییەکانەوە ببینێت و خۆی بە قەرزارباری لایەنگیریی بۆ دەوڵەتی عێراق و "سەرۆکە مەزنەکەی" بزانێت.
ئەوە هەوڵێکی پاڵەوان ئاسا بوو، بۆ بنیاتنانی ئایدێنتیتییەکی کۆمەڵگیر بۆ خەڵکی عێراق؛ پێکهاتەیەک بوو لە ئەندازەی کۆمەڵایەتیی بە شکلێکی بەرفراوان و لەگەڵ بڕێکی زۆر لە داو و دەرمانی توندوتیژیی{ زەبروزەنگ}. بەڵام هەروەک چۆن هەموو ڕژێمەکانی پێشوو نوشوستیان هێنا، ئەم هەوڵەش شکستی هێنا. لە بەر ئەوەی، ئاشکرایە کە ئەستەمە بتوانرێت ئایدێنتیتییەکی عێراقیی وا بنیات بنێیت کە شیعە و سوننە پێکەوە کۆبکاتەوە و لە هەمان کاتیشدا کوردیش لە باکوور لە خۆ بگرێت. ئەو حاڵەتانەی کە یەکێتیی نیشتمانیی تێدا دەرکەوت زۆر دەگمەنن وە مەودایەکی زەمەنیی زۆریشیان لە نێواندایە. سەرهەڵدانی ساڵی 1920 لە دژی بەریتانییەکان، بەرگری سەرسەختانە لە نیشتمان لە دژی ئێران لە نێوان 1980-1988 بووە هۆی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان زۆرینەی عەرەبی عێراقیی، بەڵام هیچ شتێکی بۆ پێکەوەلکاندنی کورد نەکرد.

عێراق وڵاتێکە کە ئیدارەکردنی هەمیشە کارێکی سەخت بووە. لە گەڵ تێپەڕبوونی کاتیش، پەیتا پەیتا سەختتر بووە، ئەمەش نەک هەر بەهۆی دابەشبوونە ناوخۆییەکانی عێراقەوە، بەڵکوو بەهۆی ئەوەی کە بۆ هێزە دەرەکییەکانیش زەحمەت بووە دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق وەرنەدەن. لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە، جارناجار نزیک

بە سەرجەم هێزە ناوچەییە گرنگەکان (لەوانەش ئیسرائیل، یەکێتی سۆڤێت و ئەمێریکا)، بیریان لە بەکارهێنانی نابەشبوونە ناوخۆییەکانی عێراق بۆ دەسکەوتە ستراتیژییەکانی خۆیان کردووەتەوە.
بەگشتیی ئەم دەستتێوەردانانە لە قاڵبی پارە بەخشیندا بووە یان بە کورد یان بە پارتە ئیسلامییە شیعییەکان لە پێناو لاوازکردن و ناسەقامگیریی رژێمی ناوەندییدا. رەنگە هاندانی شۆڕش لە باکوور و باشوور خزمەتی بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی هێزە هەرێمییەکانی کردبێت، بەڵام کورد و شیعە باجێکی قورسی کارکردنیان وەک خزمەتکاری ئەو دەوڵەتانە داوە. یەکگرتوویی دەوڵەتی عێراقیش لە ئەنجامی ئەوەدا زیانی بەرکەوتووە. بە هۆی ئەو تەگەرە مەزنانەوە کە لە دەست تێوەردانە دەرەکییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، پەیدابوونی هەستی هاوبەشی یەکێتیی نیشتمانیی عێراقی بۆتە کارێکی مەحاڵ.
ئەوە ڕۆشنە کە زاڵبوون بەسەر میراتی ئازاربەخشی هەشتا ساڵەی عێراقدا کارێکی زەحمەتە. لە نەبوونی دەوڵەتێکی بەهێزی ناوەندییدا کە ئامادە بێت لە پێناو بەرقەرارکردنی ئاسایشی ناوخۆیی دەست بۆ هێز ببات، ڕۆژگار ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئایا دەکرێت عێراق وەک قەوارەیەکی یەکگرتوو بمێنێتەوە. کێشە ڕاستەقینەکە ئەوەیە، هەمیشەش وەها بووە، کە دیمۆکراسیی لە عێراقدا کۆتایی بە باڵادەستیی سوننە بەسەر پێکهاتەی دەسەڵاتدا دێنێت. گومانی تیانییە کە پیادەکردنی شێوازێک لە شێوازەکانی هاوبەش بوون لە دەسەڵاتدا دەبێتە هۆی پاراستنی کەمینەی سوننەی عەرەب. یان لای کەم هەلی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێنێت کە لە شێوازی ئیدارەکردنی دەوڵەتدا ڕای خۆیان بڵێن؛ بەڵام هەرجۆرە شێوازێکی دیمۆکراسیی ئەوە دەخوازێت کە سوننە لە بەشێک لەو دەسەڵات و کاریگەرییە دەست هەڵبگرن کە ئێستا لێی بەهرەمەندن.
لە نێوان تاریک و ڕووندا { لەچاونوقانێکدا} سوننەکان لە پێگەیەک دا کە تێیدا باڵادەست بوون دەچنە پێگەیەک کە تێیدا ژێردەستن. پەژراندنی ئەمە بۆ سوننە کارێکی ئاسان نییە. ئەگەر مێژوو ڕابەر بێت، ئەوە دەردەکەوێت کە پێکهاتەی عەرەبی لە عێراقدا لەکاتی هەڕەشەی دەرەکییدا زۆر زیاتر یەکگرتوو بووە. لە دەسپێکدا هەڕەشە لە لایەن بەریتانییەکانەوە بوو لە دەیەی بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا. دواتر

هەڕەشـــــە لەلایــــــەن ئێرانییەکانــەوە لـە 1980-1988 وە بـوو. گریمانەی زۆر هەیە کە هێزەکانی ناگیرکاری ئەمێریکا هەمان ئەنجام بدەنە دەستەوە.

## چیی پێویستە بۆ سەرکەوتن؟

وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکا ناتوانێت لە ڕێگـای بـەکارهێنانی چەکـەوە عێـراق دیـمـۆکراتییزە بکـات. ئـەوە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت بـە پلەیـەکی کەمتریش ناتوانێ. دەبێت ئەوەش بگوترێت هیچ شتێک لـەوە زیـاتر کـار ناکات، کە دیمۆکراسـیی پێویسـتی بـە ڕەزامەنـدی ئـەو خەڵکـە هەیـە کـە حوکمڕانی دەکرێت. دیمۆکراسیی ناکرێت بەسـەر خەڵکێکـدا بسـەپێنرێت کە پێی ڕازی نیین. لە حاڵی حازردا، ئەگەر بە نەرم و نیانیی دەری ببڕین، گومانێکی قووڵ لە ئامانجەکانی ئەمێریکا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیـە. لە ڕاستییدا، ڕاپرسییەکان لە ئـەورووپای ڕۆژئـاوا ئامـاژە بـەوە دەکـەن کـە هاوپەیمانە تەقلیدییەکانی ئەمێریکا جەنگ لـە دژی عێـراق بـە جـەنگ بـۆ دەستڕاگەیشتن بە سـەرچاوەکانی نـەوت دەبیـنن. لـە جیهـانی عەرەبییـدا هەواڵەکە زۆر لەوە خراپترە. نەک هەر ئیدارەی بوش لەوێدا ناجەماوەرەییە. بـەڵکوو ئـەو کەمـە ڕاپرسـییانەی کـە هەیـە ئـەوە دەردەخـەن زۆرینـەی عەرەبـەکان پێیانوایـە یـانزەی سـێپتەمبەر برینێکـی خـۆکردە و بـۆ ئـەو مەبەستە داڕێژراوە کە پاساوی جەنگی خاچپەرستەکان "کروسەید" لە دژی موسوڵمانان بدات.

جەنگ لە دژی عێراق هیچی لە بەرژەوەندی باشترکردنی خەملاندنی بـوش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەکرد. تەنگژەی ئەمێریکا ئەوەیە چۆن بتوانێـت قەناعەت بە هەرێمێک بکات کە بەقووڵی بە گوومانە و بە میـراتیش ناحـە زە بــە ئــەمێریکا. کــەوا شــەڕ لــە دژی عێــراق تــەنها ســەرەڕۆییەکی نیۆئیمپیریالیســتی neo-imperialist دڕندانــە نییــە لــە پێنــاو کۆنترۆڵکردنی نـەوتی دووەم وڵاتـی جیهـان لـە ڕووی یـەدەگی نەوتـەوە. ڕێکورەوان. لە جەنگی بەدەست هێنانی دڵ و هـۆش دا. ئـەمێریکا نمـرەی سەر کارتەکەی نزیک بووەتەوە لە سفر. ئەگـەر گەشـبین بـین، ئـەمێریکا ڕەنگە چانسێکی تری هەبێت.

ئەگەر بنیاتنانەوەی ئابووریی، سیاسیی و کۆمەڵایەتیی لە عێراقدا لایەنگریی جەماوەریی فراوانی هەبێت لە ناو خەڵکی عێراقدا، ئەوسا ڕێگەایەکی درێژ لە بەردەمدایە بۆ ئەوەی بە خەڵکی ناوچەکە بسەلمێنرێت ئەمێریکا مەبەستی چاکی هەیە. ئەوەی ئایا ئەمێریکا ئەو هەلەی بۆ دابین دەبێت بۆ ئەوەی ئەم کارە بکات یان نا، زیاتر بەندە بە کاردانەوەی خەڵکی عێراق بۆ داگیرکردنی سەربازییانەی ئەمێریکا. ئەگەر ئەمێریکا بەڵێنەکانی بەجێ نەهێنێت، ئەوا هەموو هەستێکی دۆستانە زوو لەدەست دەچێت. لە حاڵی حازردا، خەباتی ئەمێریکا بۆ دابین کردنی نزمترین ئاستی یاسا و سەقامگیرییە. مەسەلەی دابینکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان لەو لاوە بوەستێت، بارودۆخەکە زۆر بێ ئومێدانەیە.

## چیی پێویستە بۆ پتەوبوونی دیمۆکراسیی؟

ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە بزانرایە، ڕەنگە جیهان لێواولێو لە دیمۆکراسییەکی سەقامگیر و تێکسمراو دەبوو. گەشبینیی دەیەی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو دەرهەق بە ئاسانیی بەدیمۆکراسییکردنی ئەو وڵاتانەی کە هیچ پێشینەیەکیان لەسەر دیمۆکراسیی نییە، ناچار کراوە ڕووبەڕووی ئەزموونێکی واقیعیانە بێتەوە کە زۆر ئاسوودە نییە. تەنها پێنج یەکی ئەو سەد وڵاتەی کە لە قۆناغی گواستنەوە بۆ دیمۆکراسیی دادەنران، بە ئاراستەیەکی دروستدا دەڕۆن. زۆربەی زۆری ئەو وڵاتانە یان بۆ هەمان ئاستی پێشووی سەرکوتکاریی گەڕاونەتەوە. یان وا دەردەکەون لە هەرێمێکی خۆڵەمێشییدا کە کەوتووەتە نێوان دیمۆکراسیی و سەرکوتکارییەوە چەقیون و بەخێرایی بە هیچ لایەکدا ناکەون. بە شێوەیەکی گشتیی، قۆناغی گواستنەوە لەو ناوچانەدا سەرکەوتوو بووە کە تایبەتمەندیی چڕی جیۆگرافیی/ کولتووریی دیاریکراویان هەیە (ناوەندی ئەورووپا و ئەمێریکای لاتین). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تیۆری بە دیمۆکراسییکردن لە سەر بنەمای "هەموو کەس دەتوانێت ئەوە بکات" پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە.[289] ئەوە ڕۆشنە کە ئەندازەکردنی دیمۆکراسیی لەوە قورسترە کە پێشتر پێشبینی دەکرا.

هەندێک لەو ئاستەنگانەی کە رووبەڕووی دیمۆکراسیی دەبنەوە، لە لایەن فرانسیس فۆکۆیاماوە تیشکیان خراوەتە سەر. ئەو تێزێکی (کە تا رادەیەک جێگەی مشتومڕ نییە) دەربارەی بەهێزکردنی مۆدێلەکانی دیمۆکراسیی کە " چوار ئاستی رسکانی دیمۆکراسیی تێدا پەیدا دەبێت" وێنە کردووە.[290] ئاستی یەکەم، لە هەموو ئاستەکانی تر رووکەشانەترە. پێودانگە بەهاییەکان دەربارەی بیرۆکەی دیمۆکراسیی لە خۆ دەگرێت- بیرۆکەکە ئەوەیە دیمۆکراسیی بەرقەرار نابێت ئەگەر خەڵک باوەڕی پێی نەبێت. بەڵام بە تەنها باوەڕبوون بە شەرعییەتی دیمۆکراسیی بەس نییە بۆ مسۆگەرکردنی دیمۆکراسیی پایە پتەو. لە خوار ئەم ئاستەوە{ مەبەست لە ئاستی دووەمە کە بەدوای یەکەمدا دێت}، دیمۆکراسیی لە سەر بنەمای دامەزراوەکان پتەو دەبێت- دەستوورەکان، سیستەمی هەڵبژاردن، پارتە سیاسیەکان و هاوشێوەکانیان.
ئاستی سێیەم کۆمەڵگای مەدەنیی دەگرێتەوە- پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی خۆڕسک درووست بوو (گرووپەکانی بەرژەوەندیی، میدیای سەربەخۆ، گرووپەکانی مافە مەدەنییەکان) کە لە دەرەوەی کایەی کۆنترۆڵی دەوڵەتدا هەن و ئەرکی کارلێککردنی دەوڵەت و تاکەکان دەبینن. دواجار، ئاستی چوارەم، کە قووڵترین ئاستە. " هەندێک دیاردە دەگرێتەوە لە وانەش پێکهاتەی خێزانیی، ئایین، بنەما مۆراڵییەکان، هۆشیاری ئێسنیکیی، هاوڵاتییبوون و هەندێک دابونەریتی مێژوویی تایبەت".[291] ئەمەش ناوەندی کولتووری سیاسییە. لێرەدا دوو تێڕوانینی گرنگ لەم شیکارەدا سەر دەردەهێنن. یەکەمیان ئەوەیە کە ئێمە لە ئاستی یەکەمەوە بەرەوە ئاستی چوارەم دەجوڵێین- لەتەنکاییەوە بۆ قووڵایی- لە بەر ئەوە گۆڕانکاریی زۆر هێواشە و بەدیهاتنی زۆر زەحمەتە. گۆڕینی دامەزراوەکان زۆر لە گۆڕینی کولتوور ئاسانترە.
ئەو بابەتە زۆر جێگای مشتومڕ نییە. دووەمیشیان دیمۆکراسیی تەواو بەرقەرار نابێت ئەگەر لە ناو کولتووری سیاسییدا رەگی دانەکوتابێت. لێرەوە، رەنگە کۆمەڵگا باوەڕ بە شەرعییەتی مۆراڵیانەی دیموکراسیی بکات و دامەزراوەی گونجاو لە شوێنی گونجاو دابنێت. بەڵام لە ئاستی سێیەم و چوارەم دەرگیری کێشەی سەرەکیی دەبێت. چونکە ئەوە لە

دەرهوەی پێوانـــــــــــــــە کۆمەڵایەتییەکانمایـــە. هـــەروەک لـــە گوتـــەی فۆکۆیامادا هاتووە،

من لەوە بەولاوەتر دەڕۆم کە باس لەوە بکـەم کـە پێوانـەی کۆمەڵایـەتیی بـەر بەربەسـتێکی مـەزنی دیـواری خشـتی سـوورەوەکراو دەکـەوێت... ئاسـتەنگە ڕاسـتەقینەکان کـە کاریگـەری لەسـەر چۆنییـەتی ژیـان لـە دیمۆکراسییە مۆدێرنەکاندا دادەنێت دەبێت دەست و پەنجە لـە گـەڵ نرمـە کولتـووریی و کۆمەڵایەتییەکانـدا نـەرم بکـات، وا دەردەکـەون کـە لـە تەنیاییدان و دوورن لە دەستڕاگەیشتن بـە دامـەزراوەکان و دەرەنجام لـە سیاسەتی گشتییش دوورن.[292]

ئەم هەڵسەنگاندنە، بەداخەوە لە گەڵ بەڵگە ئەزموونییەکانی چەند ساڵی ڕابـردوودا چوونیـەکن، ئـەوە پێشـنیار دەکـەن لـە باشـترین حاڵەتـدا پتەوبوونی دیمۆکراسیی هێواشـە، پرۆسـەیەکی ئازاربەخشـە کـە تـەنها لـە پـەراوێزدا کاریگـەریی لەسـەر دامـەزراوە کاراکـان دادەنێـت. هـەروەها دەربارەی گەورەیی ئەو ئاستەنگانەی کە دێنـە سـەر ڕێگـای بونیاتنـەرانی دیمۆکراسیی لە عێراقدا، چاوخشاندنێکی قووڵ دەدات بە دەستەوە.

## ڕێگەچارەکانی ئەمێریکا

لـە سـەروبەندی هەڵگیرسـاندنی شـەڕدا، هـەرگیز مەبەسـتەکانی ئـەمێریکا دەرهەق بە بنیاتنانەوەی عێراق لە دوای جـەنگ ڕۆشـن و پێکەوەگرێـدراو نەبوونـە. زۆر ووردبینانـەتر، کۆمـەڵێک لـە پێشـنیار کنـە کـراون، کـە ڕەنگدانەوەی بۆچـوونی جـودا بـوون لـە ئیـدارەی بوشـدا لەسـەر ڕادە و ماوەی تێوەگلانی ئەمێریکا لە دوای جەنگ . شێوازی حکومەتی عێراقیی و ماوەی داگیرکاریی سەربازیی ئـەمێریکیی لـە خانـەی هـەڵهێنان و گریمـان دابوو. بەڵام لە جەوهەردا دەکرێـت سـێ ڕێگـەچارەی سـەرەکی ئـەمێریکا دەست نیشان بکرێن: داگیرکاریی کورت ماوە، تێیدا ئەمێریکا بـە جـدیی هەوڵەکانی خۆی بەرێـدەخات بـۆ دامەزرانـدنی سیسـتەمێکی دیمـۆکراتیی کارا، ئینجا عێراق بـەجێ دەهێڵێـت و سـەروەریی تـەواو دەگێڕێتـەوە بـۆ حکومەتێکی هەڵبژێردراو؛ داگیرکردنی درێژماوە (دە ساڵ یان زیاتر)، لـەو ماوەیەدا ئـەمێریکا سـەرتاپای کۆمـەڵگای عێـراق دادەڕێژێتـەوە و هـەوڵی چڕوپـڕ دەدات بـۆ ڕیشـەداکوتانی دیمۆکراسـیی لـە وڵاتـدا؛ داگیرکـاریی

سەربازیی کورتماوە (دوو ساڵ). هێزەکانی ئەمێریکا لە عێراق دەکشێنەوە بەڵام دامەزراندنی حکومەتێکی دەسکەلا {کارتۆنیی} لە عێراقدا بەشوێن خۆیدا دێنێت.[293]

دیارە جۆرەها ئەگەری بێشومار هەن کە ئەم تێزە سەرەکییانە دەگۆڕن. بەڵام بەسەر یەکەوە تەماشای بکەین. ئەوە دەردەکەوێت کە ئەم سێ ڕێگەچارەیە زۆربەی ئاڵوگۆڕە مومکینەکان لە خۆدەگرێت کە بۆ وەڵامدانەوەی سەرجەم ئەو پرسە سەرەکییانەی بەرەو ڕووی ئەمێریکا دەبنەوە لەو کات و ساتەدا: یەکەم. ئایا ئەمێریکا مەبەستێکی ڕاستەقینەی هەیە بۆ بە دیموکراتیزەکردنی عێراق: دووەم ئەگەر وایە تا چ ڕادەیەک ئەمێریکا پابەندە بەوەی – لە ڕووی کات. خەزێنە و خوێن – ەوە خۆی بۆ ئەو ئەرکە تەرخان بکات: سێیەمیش. لە کاتی داگیرکاریی و دواتریش. تا چ ڕادەیەک ئەمێریکا مەبەستییەتی. کۆنترۆڵی خۆی بەسەر عێراقدا پیادە بکات؟

## ڕێگەچارەی یەکەم: دیمۆکراسیی سپات -Democracy lite

گریمانەی ئەو ڕێگەچارەیە ئەوەیە کە ئەمێریکا ئامادەیە؛ کات. وزە و سامانی بەرچاو بۆ پرۆسەی دیمۆکراتیزەکردن لە عێراقدا تەرخان بکات – بەڵام تێوەگلانی سەربازییانەی ئەمێریکا دەسبەجێ لە گەڵ هاتنە سەرکاری یەکەم حکومەتی دیمۆکراتیی هەڵبژێردراو کۆتایی دێت. ئەڵبەتە هەندێک لە هێزە نێونەتەوەییە ئاشتیپارێزەکان جێگیر دەکرێن بۆ ئەوەی یارمەتیی حکومەتی بە دیمۆکراتییانە هەڵبژێردراو بدات کە سەرپێ بکەوێت. بەڵام دوای ئەوە ئەزموونی دیمۆکراسیی عێراق بە چارەنووسی خۆیەوە جێ دەهێڵرێت. قاڵبی ئەم ڕێگەچارەیەی "دیمۆکراسیی سپات" بەگشتیی لە ئەزموونی بۆسنیا یان کۆسۆڤۆوە سەرچاوە دەگرێت و گریمانەی سەرەکیی ئەوەیە کە بەبێ تێوەگلانی بەرچاو و ڕاستەوخۆی دەرەکیی سەرکەوتوویی پرۆسەی دیمۆکراسییی کە لە عێراقدا سەر هەڵدەدات.. کارێکی ئەستەمە.

لەکاتێکدا کە دیمۆکراسیی لە هەندێک شوێن کە بە نەڕەخساو دادەنرێن وەک هیندستان، لە گەشەکردنی بەردەوامدان، مۆرۆڤ ناتوانێت بەتەواویی مەسەلەی ریشەداکوتانی دیمۆکراسیی لە عێراقدا بخاتە لاوە. بەڵام بەهەر هەڵسەنگاندنێکی واقیعیانە، ئەوە دەردەکەوێت کە پێشبینیی باش ناکرێت. تێزەکەی فۆکۆیاما بۆ چینەکانی پتەوبوونی دیمۆکراسیی یارمەتییدەرێکە بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێک ئاستەنگ کە دێنە پێشەوە. لە ماوەی دووساڵی داگیرکاریی سەربازییدا، ئەمێریکا واقیعیانە دەتوانێت هیوا خواز بێت، کاریگەریی لە سەر گەشەکردن لە دوو رووکەشترین ئاستدا کە لە لایەن فۆکۆیاما پێناسە کراون— پێوانەیی و دامەزراوەیی – ئەگەری کۆمەڵگایەکی مەدەنیی کارا و چالاک لەسەر لە سەر خاپوورەی سیاسیی عێراق و لە کاتێکی کورتی دیاریکراودا دابمەزرێت. ئەگەرێکە نزیکە لە سفر لە لاوازییدا؛ بە هەمان شێوەش لەوە دەچێت ئەگەری ئەوەی کە پێودانگ و بەهاکانی دیمۆکراسیی ئاوێتەی کولتووری سیاسیی عێراقیی بێت لە چەند دەیەیەکی کەم دا. ئەگەرێکی زۆر لاوازە. باشترین شتێک کە ئەمێریکا هیوای بەدیهاتنی بخوازێت لە ماوەی دوو ساڵدا ئەوەیە کە دیمۆکراسیی لە هەردوو ئاستی پێوانەیی و دامەزراوەییدا لە عێراقدا بەرقەرار بێت. بەڵام لێرەشدا، هەندێک ڕێگری جدیی، تا ڕادەیەک چارەنەکراو هەن کە پێویستە بەسەریاندا زاڵ بین.

## ئاستی یەکەم: دیمۆکراتیی پێودانگیی

لە ئاستی یەکەم—ئاستی پێودانگیی—چ بەڵگەیەک هەیە ئەو بسەلمێنێت کە خەڵکی عێراق دیمۆکراسیی بە سیستەمێکی دروست و شەرعیی حوکمڕانیی دەزانن؟ پێ دەچێت کە زۆر لە ڕووخسارە ناسراوەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیی لە هەندەران قەناعەتیان بە شەرعییەتی مۆڕاڵیی دیمۆکراسیی هەبێت. بەڵام زۆرینەی ئەو رووخسارانە، چەند دەیەیە لە دەرەوەی عێراق ژیاون، زۆربەیان لە وڵاتە لیبراڵ دیمۆکراتەکانی رۆژئاوا. بۆ نموونە ئەحمەد چەلەبیی، سەرۆکە دەستوپێ سپییە نازدارەکەی کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقیی، لە سەرەتای دوورکەوتنەوەی لە عێراق لە ساڵی 1958 دا ژیانێکی زۆر خۆشگوزەرانی هەبووە. ئەوە جێگای سەرسوڕمان دەبێت، ئەگەر چەلەبیی شەرعیەتی دیمۆکراسیی نەپەژرێنێت.

بـەڵام لـە چـاو زۆربـەی خـەڵکی ئاسـایی عێراقـدا، لـە چەنـد دەیـەی ڕابردوودا چەلـەبیی و زۆر یـەک لـە کەسـایەتییە باڵاکـانی ئۆپۆزیسـیۆن، وەک لە ئەستێرەیەکی تر ژیابن وایە.
گرووپە بەرهەڵستکارەکانی تر – بۆ نموونە ئەنجومەنی بـاڵای شۆڕشـی ئیسلامیی و ئەلدەعوە -- وا ناسراون کـە زۆر زیـاتر درێژنگـن، تەنانـەت دژی شێوازی ڕۆژئاوایی دیمۆکراسیین؛ و ئەو دوو گرووپەش بەرەو ئـەوە دەڕۆن کە کاریگەرییان لـە عێـراق زۆر لـە کاریگـەریی گرووپـەکانی وەک چەلەبیی زیـاتر بێـت. لـە ڕاسـتییدا، سـەرجەم مەسـەلەی ناهـاتووی ڕۆڵـی سەرکردە ئیسلامییەکانی شیعە ( پێ دەچێت زۆر مەزن بێت) نیگەرانییەکی گرنـگ لـە سـەر مەسـەلەی هـاوڕێکبوونی پێوەنـگـەکانی دیمۆکراسـیی ڕۆژئاوایی و ئەوانەی ئیسـلامی سیاسـیی دێننـە پێشـەوە هەیـە. لـە سـەر ئاستی ئیجرائییدا، بیرۆکەی چارەسەرکردنی کێشەکان بە ئاشـتییانە و لـە ڕێگەی میکانیزمی دامەزراوەیی دیمۆکراسـییەوە هـیچ کێشـەیەک دروسـت ناکات، بەڵام لە ئاستی واقیعدا، لە گەڵ دیمۆکراسییدا کۆمـەڵێک لـە بـەهای جۆراوجۆر دێن -- لە بابەتی هاویەکسانی ڕەگەزیی، هـەڵبژاردنی گشـتیی، ئـازادی بیـرورا، پەژراندنی ئەوانـەش لـە لایـەن دامـەزراوە ئایینیـەکانی شیعەوە مەسەلەیەکی زەحمەتە.
بەڵام دەرهەق بە عەرەبی سوننە، هاتنی دیمۆکراسیی، تەنانـەت لـە ئاسـتی ئیجرائییشدا، بەمانای کۆتاییهاتنی باڵادەستیی سوننە دێت بەسەر دەوڵەتی عێراقـدا، سـەرەڕای ئەوانـەش، پابەنـدبوونی دژە ئیمپیریالیسـتیی و دژە زایۆنیستیی و هەستی پـان-عـەرەبیی هەمیشـە لـە سـێکوچکەی سـوننەوە هـەڵقولاوە، ئـەوە گەشـبینییە ئەگـەر پێمـان وابێـت عـەرەبی سـوننە بـە شێوەیەکی پێودانگییانە سیستەمێکی دیموکراتی قبووڵ بکەن کە لـە لایـەن ڕۆژئـاواوە، هێـزی "ئیمپیریـالیزم" ( ڕاسـتەوخۆش لـە لایـەن هێزێـک کـە هاوپـەیمانێکی سەرسـەختی ئیسـرائیلە) "سـەپێنراوە" بەسـەر عێراقـدا، و ئـەوەش گـەرەنتیی ملکـەچبوونی سیاسـییان دەکـات لـە دەوڵـتی عێراقـی دواڕۆژدا.
کەمبوونی ئاگایی لە ناو خەڵکی ئاسـایی عێراقـدا، مایـەی بـێ ئومێدییـە، بەگوێرەی ئامارێکی تازە، عێراقییەکان بەتـەواوی کەمتەرخـەمن دەربـارەی سروشتی سیستەمی سیاسیی کە لە دوای جەنگ لە عێراقدا دێتە ئاراوە. بە

نیگەرانییەوە. زۆرێک لە عێراقییەکان تامەزرۆی گەڕانەوەی "چاخی زێڕینی" دەیەی حەفتاکانن. سەردەمێک کە هیچ ئاماژەیەکی لیبڕاڵیی سیاسیی تێدا بەدی نەدەکرا. عێراقییەک گوتی. " بەر لە جەنگ و سزا ئابوورییەکان. دیناری ئێمە بەهێز بوو. توانای کڕینمان جێگای ئێرەیی پێبردنی وڵاتە عەرەبییەکان بوو. ئێمە دەمانەوێت بگەڕێینەوە ئەو دۆخە پڕ لە خۆشگوزەرانییە کە باوانمان تێیدا بوون لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا".[294] بە ڕەچاوکردنی ئەو مەینەتییە لە ڕادەبەدەرانەی کە عێراقییەکان لە بیست ساڵی ڕابردوودا بەرەو ڕووی بوونەتەوە. جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئاسایش و مانەوە لە ژیاندا سەرەتاییترین نیگەرانیی زۆربەی عێراقییەکان بێت. گفتوگۆی ناڕۆشن دەربارەی شەرعییەتی مۆڕاڵی سیستەمی سیاسیی بە پلەی یەکەم نایەت. ئەمەش ئاماژەیەکی دڵخۆشکەر نییە بۆ پێشکەشکردنی سیستەمێکی سیاسیی کە بەشداربوونی جەماوەریی دەخوازێت و بەندە لە سەری.

## ئاستی دووەم: دامەزراوە سیاسییەکان.

لەبنەڕەتدا. بڕیارگەلێک پەیوەستە بە جۆری سیستەمی هەڵبژاردنەوە گرنگن. لە وانەش ئایا سیستەمی سەرۆکایەتیی بێت یان پارلەمانیی. ڕادەی دەسەڵات کە بۆ حکومەتی ناوەند دادەنرێت بە بەراورد بە هەرێمەکان جێگەی بایەخە. بەڵام مەسەلەی مەرگ و ژیان نین. لە حاڵەتی عێراقدا. گومانی تێدا نییە کە زۆربەی پارتە گرنگەکان لە ڕووی تیۆرییەوە ڕازین کە دەبێت کورد و شیعە و سوننە (ڕەنگە تورکمان و ئاشورییەکانیش) لە دەسەڵاتدا هاوبەش بن. ئەم شێوازە لە دابەشکردنی دەسەڵات. دەکرێت لە ڕێگەی جۆراو جۆرەوە دابین بکرێت. دەسەڵاتێکی تەنفیزی کە لە کوردێک و سوننەیەک و شیعەیەک پێکهاتبێت چارەسەرێکی ڕۆشنە ( هەرچەندە ئەو گرووپانە بە دروستی نوێنەرایەتی ناکرێن بەشێوەیەک کە ڕەنگدانەوەی ڕێژەی دانیشتوان بێت). لە پشت ئەوەوە کێشەکە دەردەکەوێت.

ئایا هەر یەک لەو گرووپانە مافی ڤیتۆیان بەسەر بڕیارە سیاسیەکاندا هەیە. لەم حاڵەتدا ئەو سازدانە دەبێتە هۆی بنبەستی هەمیشەیی. یان بڕیارەکان لەسەر بنەمای حوکمی زۆرایەتی دەدرێن. کە لەم حاڵەتەشدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن عەرەبەکان لە ڕێگەی زۆری ڕێژەی دەنگەوە باڵا دەست دەبن بەسەر کورددا؟ حاڵەتی یەکەم ئەو چوارچێوەیە بوو کە لە ساڵی 1995دا بۆ حوکمڕانیی بۆسنیا داڕێژرا بوو. بۆسنیا نموونەیەکە کە زۆر شتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. لە بەرئەوەی نزیکییەکی هەیە لە گەڵ سروشتی باروودۆخێک کە بەرەو ڕووی عێراق دەبێتەوە، ئەویش گرژیی ئێسنیکیی و گرژیی ئایینیی پێشبینی کراوە. کە هاوکاتە لە گەڵ ئارامییەکی ڕووکەشیی لە لایەن داگیرکاریی هێزە ڕۆژئاواییەکانەوە دابین کراوە.

لە حاڵەتی بۆسنیادا. هەر یەک لە سێ گرووپە سەرەکییەکە (کرواتیی، بۆسنیایی و سربەکان) لە ئەنجومەنێکی سەرۆکایەتیی هاوتادا نوێنەرایەتی دەکرێن. لە کاتێکدا کە خودی پرۆسەکە نائاسایی و ئاڵۆزە، هەر گرووپێک ڤیتۆی هەیە بەسەر بڕیارەکانی سەرۆکایەتییدا. لە گەڵ ڕێگرییە تەقلیدییەکانی چاودێریی و باڵانسدا. بڕگەکانی دەستووری بۆسنیا ئەو گەرەنتییە گرنگانەی دابین کردووە کە بۆ پاراستنی مافی کەمینەکان پێویستە. سیستەمێکی لەو شێوەیە بۆ پاراستنی کوردەکانیش لە عێراقدا پێویستە پیادە بکرێت. کێشەیەک (کە لە عێراقیشدا قابیلی خۆ لێ لادان نییە) ئەوەیە لە ئەنجامی نەبوونی بنەما سەرەتاییەکانی باوەڕ بەیەکتریکردن لە نێوان گرووپەکاندا. سیستەمی چاودێریی و باڵانس دەبێتە هۆی ئیفلیجبوونێکی نیمچە تەواوی حکومەتی ناوەندیی. لە هەموو بارێکدا. دەستووری بۆسنیا بۆتە مایەی کارەسات بۆ هەموو لایەنە پەیوەندییدارەکان. بۆتە هۆی ئەوەی کە گرژیی ئێسنیکیی زیاتر بکات نەک کەم بکاتەوە.

تازەترین هەڵبژاردنی بۆسنیا لە ساڵی 2002 دا دەسکەوتێکی مەزنی پارتە سیاسییە نەتەوەیی/ئێسنیکییە قین لە دڵەکان بوو. ئەوانەی کە ئێستا لە پرۆسەی سیاسیی دەوڵەتی شکستخواردوی بۆسنیادا باڵادەستن. ڕەنگە بوونی بەردەوامی هێزەکانی ناتۆ ڕێگری سەرەکیی بووبێت لە سەر هەڵدانی توندوتیژیی سامناک لە بۆسنیادا. ئەم هاوتەریببوونە لەگەڵ

عێراقــــی دوای ســــەدام دژواریەکی بەدوادایە. قووڵترین تەنگژە کە لـە گەڵ پرینسیپی هاوبەشبوون لە دەسەڵاتدا دێـت. هـەروەک لـە ئەنجومـەنی سەرکردایەتی هاوبەشدا هەیە. ئەوەیە کە نوێنـەرەکان مـەیلی بـەهێزکردنی دابەشبوونی ئێسنیکیی و ئایینیان هەیـە (هـەروەک لـە حاڵـەتی بۆسـنیادا دەبینرێت). فەراهەمکردنی زامنی دەستووریی و دامـەزراوەیی بـۆ ناسـینی هەبوونی گرووپی لە یەک جـودا رەنگـە تـەنها خزمـەت بـە هانـدانی ئـەو گرووپانە بکـات بـۆ ئـەوەی کـە وەک کیـانێکی جیـاواز هـەڵس و کـەوت بکەن.[295]

سەرەڕای ئەوانەش بڕیاردان دەربارەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان ڕێـک و ڕاست پەیوەستە بە بڕیاری دابەشکردنی دەسەڵات لـە نێـوان ناوەنـد و هەرێمەکاندا. لە پەیڕەوکردندا مەسەلەی فیدراڵیزم (دابەشـکردنی دەسـەڵات لـە نێـوان ناوەنـد و حکومەتـە هـەرێمیی/ناوچەییەکانـدا) کارەسـاتێکی سیاسییە. جارێکیتر. هەندێک نـەگونجانی کـەم لـە ڕووی تیۆریـەوە هەیـە لەسـەر مەسـەلەی گواسـتنەوەی هەنـدێک دەسـەڵات لـە ناوەنـدەوە بـۆ هەرێمـەکان. بـە هـەرحاڵ، ئـەوە ڕۆشـنە کـە هـەر گرووپێکـی عێراقـی تێگەیشتنی زۆر جیاوازی لەوی تر هەیە لەسەر ئەوەی لە پراکتیکدا چـۆن ئەوە دەکرێت. نیشانەی ئەم جیاوازییە لەتێگەیشتن پێشنیارێکی کۆنگرەی نیشتیمانیی عێراقییە (ئای ئێن سی). لـە ماڵپـەڕی ئـەلیکترۆنی (ئـای ئـێن سی) ئەوشێوازەی کە بۆ عێراقێکی دیموکرات لەگەڵ سیستەمێکی فیدراڵیی و حکومەتێکی ناوەندیی زۆر بەهێز پێشکەشکراوە زۆر یارمەتیدەر نییـە. بەڵام کێشەکە لێرەوە سەرچاوەی گرتووە. ڕەنگە ئەوە ڕێک ئەو شتە بێـت کە حکومـەتی دیمـۆکراتیی ناوەنـد دەخوازێـت. بـەڵام تـا ئـەو جێگایـەی دەسەڵات ڕادەستی هەرێمەکان بکرێت. ئەوان لە ناوەندی دەسێنن: کەوابێت لێـرەدا ناکۆکییـەکی بۆمـاوەیی هەیـە لـە نێـوان فیـدراڵیزم و حکومـەتی ناوەندیی بەهێزدا.

گەڵاڵەکەی ئای ئێن سـی لـە بناغـەدا بـێ مانایـە. نزمتـرین هاوبەشـیی لـە چارەنووسسازییدا لەخۆ دەگـرێ. "ڕاگەیانـدنێکی زارەکییـە" دەیـەوێت ئـەو ناکۆکییە قووڵـە هـەڵمژێت کـە لـە نێـوان گرووپـە عێراقییەکانـدا لـە سـەر مەسەلەی فیدراڵیەت لـە ئارادایـە. بـە دەربڕینێکـی سـادەتر: لـەوە ناچێـت کوردەکان بە هیچ ڕێگەچارەیـەک ڕازی بـن ئەگـەر کـەمتربێت لـەو ڕادەی

ئۆتۆنۆمییەی کە لە سالّی 1992 وە لێی بەهرەمەندن؛ بەرهەڵستکارە سوننەکان و شیعە سێکیولارەکان دەیانەوێت دەوڵەتێکی خاوەن دەسەلاتی ناوەندیی بەهێز بگێڕنەوە؛ هەروەها ئیسلامییە شیعییە بەرهەڵستکارەکانیش دەیانەوێت لە هەندێک بواردا (ئایینی، پەروەردەیی) ئۆتۆنۆمیان هەبێت، بەلام لە هەمان کاتدا دەوڵەتێکی ناوەندیی بەهێز پەسەند دەکەن. بارەکە بەو ئاراستەیەدا کەوتووە، ئەو ڕادە ئۆتۆنۆمییەی کە لە لایەن کوردەوە داوا دەکرێت، تا ڕادەیەکی زۆر لە لایەن گرووپەکانی تر شایانی ڕەزامەندیی نییە.

کاتێک دەچینە ناو وردەکارییەکانەوە، زەلکاوەکە قووڵتر دەبێتەوە. کوردەکان پشتگیریی "فیدراڵیزمی ئێسنیکیی" دەکەن، بە جۆرێک کە سنووری هەرێمەکان هاوتای دابەشبوونی ئێسنیکی بێت؛ گرووپی تر (لەوانەش تورکەکان) بە ڕاشکاوی ئەو جۆرە فیدراڵیزمە لە بەرژەوەندیی "فیدراڵیزمی هەررێمەکان" ڕەت دەکەنەوە . بەجۆرێک کە سنووری هەرێمەکان مەرج نییە لەگەڵ دابەشبوونی ئێسنیکیی هاوچوون بێت. هێڵەکانی جەنگی داهاتوو کێشراون. کوردەکان بە ئاشکرا دەیانەوێت ناوچەیەکی جیایان هەبێت کە تێیدا کورد زۆرینەی بالاّ دەست بن و شەڕی ئەوەش دەکەن کە سنووری هەرێمەکەیان کەرکوکیش لە خۆ بگرێت.

بەهەمان ڕادەی ئارەزوو، خەڵکی تورکمان – کە ژمارەیان لە دەوری یەک میلیۆندایە، بەچڕیی نیشتەجێبوونیان لە کەرکوک و موسڵە – بانگەوازیان بۆ دامەزراندنی "یەکەیەکی فیدراڵیی" تورکمانیی دەکەن کە شارەکانی کەرکوک و موسڵ لە خۆ بگرێت. ئەو فۆرمۆلەیە لە لایەن تورکیاوە پشتیوانیی دەکرێت، و تورکەکان ئامادەیی خۆیان بۆ دەستتێوەردانی چەکداریی دەربڕی لە حاڵەتی لکاندنی کەرکوک بە هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردییەوە. تا ئەم ڕادەیە، هەموو ئەوانەی خراونەتە ناو گفتوگۆی پەیوەست بە عێراقی دوای سەدام بە سادەیی لە قسەکردن لەسەر ئەم جۆرە مەسەلانە کە قابیلی تەقینەوەن دوور دەخەنەوە.

لە پشتی مەسەلەی سنوورکێشانی هەرێمەکان، مەسەلەیەکی زۆر ریشەییتر کە پێویستە بە جدیی وەربیگرین مەسەلەی چۆنییەتی دابەشکردنی دەسەلاتە لە نێوان ئاستەکانی حکومەتدا. لەو مەسەلە هەستیارانەی کە پێویستە چارەسەر بکرێن (تەنها دووانیان ناو دەهێنرێن) هەلومەرجی

ئـایین و رۆڵـی ئایینـدەی هێـزە میلیشـیاییەکانە. لـە حاڵـەتی یەکەمـدا کێشەکە لێبووردەیی ئایینی نییە -- لە ڕاسـتییدا عێـراق تۆمـارێکی باشـی لەم بوارەدا هەیە-- بەڵکوو لە ڕادەی ئەو ئۆتۆنۆمییەدایە کە بۆ دامـەزراوە ئایینییـەکان لـە باشـووری شـیعەدا دابـین دەکرێـت. پێـدەچێت کـە داخوازییەکانی شیعە. هەر وەک لە "ڕاگەیاندنی شیعەکانی عێراق "ی ساڵی 2002 دا ڕەنگـی داوەتـەوە ئۆتۆنـۆمی "حـەوزە عیلمییـەکان" و مـافی دامەزراندنی خوێنـدنگا سـەربەخۆکان، زانکۆکـان و دامـەزراوەکانی تـری لەچەشنی وانە وتنەوەی ئەکادیمیی بێت.[296]

لە ڕووی مێژووییەوە، ئۆپۆزیسیۆنی ئـایینی ڕێکخـراو لـە دژی حکومـەتی ناوەندیی لە دامەزراوە پەروەردەییەکانـەوە سـەری هەڵـداوە و کەسـایەتییە ئایینییە ناودارەکان پشتگیرییان کردووە. دوژمنکـاریی وەک وەڵامێـک دژ بـە هـەوڵی ڕژێمـە بەئاشـکرا سـێکیولارەکانی ناوەنـد سـەری هەڵـدا (بـە تایبەتیی حزبـی شـیوعیی پشـتگیریی لـە ڕژێمـی قاسـم و ڕژێمـی بـەعس دەکـرد) کـە هـانی مەسـەلەی مـافی تاکـەکان و ئازادییـەکانیانی دەدا – بەتایبەت گۆڕان لە دۆخی ژناندا—و هەوڵیان دەدا سـەرچاوە داراییـەکانی دامەزراوە ئایینیەکان و ژێرخانە پەروەردەییەکان کۆنترۆڵ بکەن.

وا پێدەچێت لە دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعسەوە، بە هۆی گەڕانەوەی نزیک بە نیو میلیۆن شیعەی دوورخراوە بۆ ئێران، ئیسلامی شیعیی رادیکـاڵتر بێتەوە. ڕەنگە هەبوونی چەند مەزاری پیرۆزی شیعە لە عێراق (بە تایبـەتی مەرقەدەکانی کەربەلا و نەجەف) ببێتە هۆی وەرچەرخانی باشووری عێراق بۆ پێگەیەکی لەبار بۆ فەندەمێنتالیزمی ئیسلامیی. گەشـەکردنی پەیوەنـدیی لە نێوان مـەکۆی فەندەمـەنتالیزمی ئیسـلامیی لـە باشـوور و دیمۆکراسـیی لیبراڵیی و سێکیولاریی لە بەغداد مەسـەلەیەکی سەرنجڕاکێشـە کـە دەبێـت تێبینیی بکەین. پرسـیاری سـەرەکیی کـە دێتـە پـێش ئەوەیـە ئایـا مـەیلی زۆرینـەی دانیشـتوانی شـیعە بـەلای دیمۆکراسـیی لیبراڵـی ڕۆژئاواییـدا دەچێت یان بەلای بەرنامەی ئایینییدا.

چـی بکرێـت دەربـارەی زۆربـوونی لەشـکری تایبـەت لـە عێراقـدا کـە مەسەلەیەکی هەستیارە و پڕ لە کێشەیە. بۆ فاکتـەری ئاشـکرا، لـە زۆربـەی سیسـتەمە فیدراڵییەکانـدا، هێـزە چەکـدارەکان خراونەتـە ژێـر کـۆنترۆڵی حکومەتی ناوەندییەوە. تەنانەت لە وڵاتێکی وەک سویسرا، کە یەکێکـە لـە

ولاتـــــــه هـــــــــــەره نامەرکەزییەکانـــە. مـــادەی 58 ی دەســـتوور بەئاشکرا دەڵێت "بـەکار هێنـانی لەشـکر مەسـەلەیەکی فیدراڵیـە". عێراقـی دوای سـەدام لـە ڕووی هـەبوونی ژمارەیـەکی زۆر لـە هێـزی میلیشـیایی پرچەک، هاوشێوەی ئەفگانستان دەبێت. هەر یەک لەو هێزانە بـەرگریی لـە زەمینی ناوچەیەکی دیاریکراو دەکەن و پێ ناچێت هیچکام لەو میلیشیایانە ئامادەییان تێدابێت چەک دابنێن. بۆ ئەوەی هەندێک بیرۆکەمان هەبێت لـە سەر قەوارەی کێشەکە. ئەوە گرنگە کە تێبینـی بکرێـت لـە کـاتی جەنگـدا. (لای کەم) پێنج هێزی سەربازیی سەربەخۆی جیاواز لە باکووری عێراق لـە کـاردابوون –ئەمـە بێجگـە لـە هێزەکـانی تـورک و هاوپـەیمانان. ئەگـەر ژمارەیەکی زۆری میلیشیا خێڵەکییەکانیش کە لە سەراسـەری عێراقـدا بـڵاو بوونەتەوە. بخرێتە سەریان. قەوارەی کێشەی ئاسایشـی ناوخۆییمان بـۆ ڕوون دەبێتەوە.

بەڵام کێشەی ڕاستەقینە دوو هێزە کوردییەکـەن ( پـارتیی و یـەکێتیی). لـە ژێر ڕۆشنایی مێژووی تازەی پەیوەندیی نێـوان کـورد/عـەرەب دا. مەحاڵـە کوردەکـان بــە ئاسـانیی هێـزی پێشــمەرگە هەڵبوەشـێننەوە. لـە ڕووی مێژوویەوە، بەرگریی سەربازیی سەرسـەختانەی کـورد لـە دژی دەسـەڵاتی ناوەند تاکە شتێک بووە کە ئۆتۆنۆمیی بۆ کورد دەستەبەرکردووە. بـەڵام ئەگەر پێشمەرگە بمێنێتەوە. ستاتۆی یاساییان چیی دەبێت لە عێراقی نوێی فیدراڵدا؟ کاتێک دێت حکومەتی عێراق هەوڵ دەدەات سەروەریی یاسـا لـە کوردستانی عێراقدا بسەپێنێت. ئەمە چۆن دەکرێت؟ ئێمە تـەنها ئەگـەرێک بە نموونە دەهێنینەوە، لە زۆربەی دەیەی نەوەتەکاندا. تورکەکان بەهرەمەند بوون لە مـافێکی نافـەرمیی لـە "ڕاوەدوونـانی تونـد" (مـافی پەڕینـەوە لـە سنووری تورکیـا و عێـراق) لـە چوارچێـوەی هـەوڵی درندانـەیان لـە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان (پـی کـەی کـەی ) { پەکەکـە}. لـە ڕاسـتییدا زۆربەی ئەو ماوەیە. بە بیانووی شەر دژی یـاخیبوون و بەرهەڵسـتکاریی. هێزە سەربازییەکانی تورکیا بەشێک لە خاکی عێراقیان داگیر کردبوو.

کارێکی زۆر ئاسانە سیناریۆیەک بخەینە پێش چاومان کە تیایدا گرووپـە سەرەکییەکانی کورد لە سەر ئەوەی ئایا ئەم بارودۆخە پێویستە بەردەوام بێت یان بەرتەسک بکرێتەوە و لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا دەرگیـربن. لـە سایەی ئەم سیناریۆیەدا چۆن بڕیاری حکومەت دەسەپێنرێت؟ واقیع ئەوەیە

بوونی لەشکرگەلێکی سەربەخۆی پرچەک. قاڵ بووەوە لە جەنگ لە باکووردا مانای ئەوە دەگەیەنێت کە حکومەتی ناوەندیی ناتوانێت بڕیارەکانی بسەپێنێت. کوردەکان رەنگە گوێ ڕایەڵ بن یان نەبن. بەڵام لە حاڵەتی گوێڕایەڵ نەبووندا. هەر هەوڵێک لە لایەن حکومەتی ناوەندییەوە بۆ سەپاندنی یاسا دەبێتە هۆی خوێنڕشتن. کێشە قووڵەکە لەوەدایە کورد پێویستە. بسازێن – بەتایبەت لەسەر مەسەلەی سۆزداریی وەک باروودۆخی شاری کەرکوکی زەنگین بە نەوت— هێشتا هیچ هاندەرێک بۆ هەڵهێنانی ئەم هەنگاوە لە ئارادا نییە. لەم بارەی ئێستادا کە کورد توانیویانە دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن. و توانای ئەوەیان هەیە بەرگریی لە خۆسەپاندن بکەنەوە. جا ئەوە چ لە رێگەی پیادەکردنی دەسەڵاتی ڤیتۆ بێت یان سەربازیی لە رێگەی پێشمەرگەکانیانەوە.

وێڕای ئەوەش. هەر وەک هەندێک لە پسپۆڕان پێشنیاریان کردووە. ئەگەر کورد یاساییانە رێگەی هێشتنەوەی لەشکرەکەیان پێ بدرێت وەک یەکەیەکی میلیشیایی فیدراڵیی. بۆچیی یەکە فیدراڵییەکان کە لە داهاتوودا لە ناوچەکانی تر دێنە ئاراوە هەمان مافیان پێ نەدرێت؟ ئایا دەبێت میلیشیای بەهێزی بەدر. سەر بە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی کە ژمارەیان – 10000-15000 دەبێت و لە لایەن ئێرانەوە پشتگیری دەکرێن هەمان مافیان هەبێت؟ ئەوە بە کوێ دەگات؟ باروودۆخی بۆسنیا تەنها هاوشێوەیەکی واقیعیی ئەم جۆرە سازمەندەییەیە. لەوێ هەر پێکهاتەیەک "قەوارەیەک" هێزە سەربازییەکانی تایبەت بەخۆی دەپارێزێت – بەم شێوەیەش. توانای بەرهەڵستییکردنی حوکمڕانیی ناوەندییان هەیە. لە کردەوەدا. ئەمە حکومەتێکی ناوەند ئیفلیجی بەرهەم هێناوە کە توانای سەپاندنی ئارەزووەکانی نییە.

ئێستا بۆسنیا جگە لە ناو لە هەموو شتێکی تردا دوو وڵاتی جیاوازە. باروودۆخێکی هاوشێوە کوردەکان خۆشحاڵ دەکات. بەڵام ئەوە بە مانای کۆتایی هاتنی عێراق وەک قەوارەیەکی یەکگرتوو دێت. دەکرێت دژە ئارگومێنتێک لە لایەن ئەوانەی کە گەشبینن بەرامبەر چارەنووسی عێراقی دیموکرات و فیدراڵی دروست بکرێت. ئەویش ئەوەیە کە ئەم ئاراستەیە دەکرێت پێچەوانە بکرێتەوە. ئەویش لە رێگەی سازان و تەوافوقەوە. رەنگە ئەوە ڕوو بدات. بەڵام لە مێژوودا ئەم ئاراستەیە هاندەری سەرەکیی

نەبووە لە نێوان کورد و ناوەندیا. هەروەها گرنگە ئەوە تێبینی بکرێت ئەگەر بچینە پشتی ووردەکاریەکانەوە. لە وێنەیەکی مەزنتریا جێ پێیەکی کەم بۆ گەشبینی بەدی دەکرێت. فیدراڵیزم شێوازێکی زۆر پێشکەوتووی دیمۆکراسییە. سەرکەوتوویی سیستەمە فیدراڵییەکان بەندە لەسەر هەبوونی سیستەمێکی دیمۆکراتی جێگیر. جێگای سەرسوڕمان نییە کە هەموو نموونە ڕاستەقینەکانی سازمەندەیی فیدراڵیی کەوتوونەتە ئەوروپای ڕۆژئاوا (بۆ نموونە سویسرا، نەمسا، ئەڵمانیا). یان لە جیهانی ئەنگلۆ-سەکسۆنی (وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکا، کانەدا، ئوسترالیا).
جگەلەمانەش، هەندێک نموونەی دابڕاوی فیدراڵیی کارا هەیە ( بەرازیل و هیندستان) بەڵام تۆمارەکە باش نییە. ئاشکراترین دەرەنجام (کە لەلایەن زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان پشتگیری دەکرێت). ئەوەیە کە مەرجەکانی فیدراڵیزمی سەرکەوتوو لە مەرجەکانی دیمۆکراسییەتی سەرکەوتوو زیاترن.[297] پێداویستییە بنەڕەتییەکان تا ڕادەیەکی زۆر هەمان شتن. ( سازان لە نێوان بڕیار دروستکەراندا، ئامادەیی بۆ لەیەکگەیشتن، پەڕاندنی سەروەری یاسا و هەبوونی دادگای سەربەخۆی بەهێز کە ناوبژیی بکات لە کاتی سەرهەڵدانی کێشە سیاسییەکاندا. هەروەها هی تریش). بەڵام ئەمانە نەک هەر بەتەنها لە ناو لق و پۆپەکانی حکومەتی ناوەندییدا، بەڵکوو لە هەموو ئاستەکانی حکومەتدا پێویستن.
فیدراڵیزم بە ناچاریی و بەپێویستیی لە "سیستەمێکی تا ڕادەیەک ئاڵۆزی دابەشکردن و هاوبەشبوونی دەسەڵات و هێز پێک دێت". کە ئەمەش لە لایەن خۆیەوە ئەوە دەخوازێ " جەماوەرێک بێ خاوەنی کولتوورێکی سیاسیی پارمەتییدەر یان لای کەم گونجاو بێت"[298]. ئەگەر قسەی یەکێک لە پسپۆرە دیارەکانی بواری فیدراڵیزم تەتەڵە بکەین کە دەربارەی فیدراڵیزمە دەڵێ " یەکەیەکی زانیارییە کە لە ئەرزی واقیعدا پەڕژێنراوە". کە "هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنیی بنەمایەکی سەرەکییە بۆ بیرۆکەی فیدراڵیزم"؛ بێجگە لەوە، "ناسیونالیزمی ئێسنیکیی یەکێکە لە سەرسەختترین هێز کە دژی بیرۆکەی فیدراڵیزم"ە. لێرەشەوە "مانەوە و بەردەوامبوونی فیدراڵیزمی ئێسنیکیی لە هەموو جۆرەکانی تر ئەستەمترە".[299] کێشەکە لەوەدایە کە بەدی هاتنی سادەترین لایەنی بنیاتنانەوەی سیاسیانەی عێراق لە هەندێک جۆری کاری دیمۆکراسییدا

دەبێت. بەڵام لەسەرووی ئەمانەشەوە، بەرقەرارکردنی شێوازێکی فیدراڵیزمە کە بۆ هەموو لایەک مایەی پەژراندن بێت کە توانای لە خۆ گرتنی دابەشبوونە ئیسنیکییەکان و گرژییە مەزهەبییەکانی هەبێت.
بەڵام رەنگە قووڵترین ئاستەنگ بەرەو رووی بنیاتنەرانی دەوڵەتی عێراق بێتەوە ئەوە بێت کە عێراق هەمیشە لە لایەن حکومەتێکی ناوەندیی بەهێزی سەرکوتکارەوە حوکمکراوە. لە راستیدا وا پێدەچێت کە ئیدارەکردنی عێراق لە لایەن رژێمە دیکتاتۆرەکانی ناوەندەوە بەرهەمێکی لۆژیکانە بێت بۆ حوکمڕانییکردنی وڵاتێکی لە بنەڕەتدا دەستکرد، کە لەناو ئەو هەموو جۆرە دەرگیریە تایەفییانەدا دەتلێتەوە. ئەگەر مەسەلەکە بەو شێوەیە بێت، دەست کۆتاکردنی دامەزراوەکانی حوکمڕانییکردنی رژێم (حزبی بەعس، گرووپە میلیشیا جۆراو جۆرەکان، دامودەزگا ئەمنییەکان، تاد.) -- کە لە جەوهەردا وەک دامەزراوەی کەتیرەیی وان و دەوڵەتی عێراق بە یەکگرتووی دەهێڵنەوە-- ئەگەر ئەمە بخەینە پاڵ نامەرکەزییکردنی دەسەڵات لە ناوەندەوە بۆ هەرێمەکان، رەنگە ببێتە هۆی دەستپێکردنی سەرەتای کۆتایی دەوڵەتی عێراق.

## سوودەکانی رێگەچارەی یەکەم

لە روانگەی ئەمێریکاوە، سوودە ئاشکراکانی رێگەچارەی یەکەم، ئەوەیە کە سەربازەکانی ئەمێریکا بێ زیان بەرکەوتن لە عێراق و لە ماوەیەکی تا رادایەک کورتدا دوور دەخرێنەوە. لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا عێراق وا پێدەچێت جێگایەکی زۆر مەترسییدار بێت بۆ سەربازەکانی ئەمێریکا و کەمبوونەوەی پشتگیریی ناوخۆ بۆ هێرشە بەردەوام و گران وەستاوەکان (لە رووی پارە و قوربانییەکانەوە). رەنگە رۆڵێکی جدیی هەبێت لە دیارییکردنی ماوەی داگیرکارییدا. هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە نۆڤەمبەری 2004 دا رەنگە لێرەدا یەکلاکەرەوە بێت. ئەگەر سەربازانی ئەمێریکا تا ئەوساش دەرگیری هێرش و جەنگی خوێناویی لەلایەن هێزی بەرهەڵستکارە سەرسەختەکانەوە بن، ئەوا مەیلی رێکخستنی کەمپەیین لەسەر بنەمای "کورگەل بهێننەوە بۆ وڵات" دەبێتە شتێکی بەرهەڵستنەکراو.
بێجگە لەوەش، ئەگەر ئەمێریکا لای کەم بتوانێت کە دەست بە پرۆسەی بنیاتنانەوەی ژێرخانی عێراق بکات، و دەستوورێکی نوێ و حکومەتێکی

هەڵبژێردراوی دیمـوکراتیی لەدوای خۆی لە عێراق بەجێ بهێڵێت. ئەوە بـە جۆرێک لە سـەرکەوتن دادەنرێـت. ئـەمێریکا دەبێتـە ڕزگارکـەری خـەڵکی عێـراق لـە سـەرکوتکاریی سـەدام و هاوکـات دامـەزراوەکانی حـوکمڕانیی دیموکراسـیی بنیـات دەنێـت. دواتـریش لـێ دەگـەڕێت خـەڵکی عێـراق حوکمڕانیی خۆیان بکەن. ئەوسا ڕۆیشتنی هێزەکانی ئـەمێریکا لـە لایـەن زۆرێک. ڕەنگە بەشـی هـەرە زۆری، عێراقییەکانـەوە پێشـوازیەکی گـەرمی لێبکرێـت؛ لێـرەدا هـەڵاواردنێکی ئاشـکرا کوردەکـانن. ئەوانـەی کـە لـەوە دەترسن کە "گورگان خواردوو بکرێن". وە ئەم نیگەرانیەش بەڵگەی خۆی هەیە.

## گرفتەکانی رێگە چارەی یەکەم-

یەکێک لە گرفتە هەرە دیارەکانی رێگـەچارەی یەکـەم ئەوەیـە کـە چانسـی جێکەوتبوونی دیموکراسیی لە عێراقـی دوای داگیرکـاریی ئـەمێریکادا زۆر لاوازە. ڕەنگە لە ماوەی دوو ساڵدا هەندێک پێشکەوتنی مانادار لە بـواری بنیاتنانەوەی ژێرخانی مادیی عێراقـدا بـەدی بـێن؛ هێـزە ئەمێریکییـەکان ڕەنگە بتوانن تا ڕادەیەک یاسا بسەپێنن. بەڵام ئەوە ئاشکرایە ئەوەی لـەم ماوە کورتەدا بەدی دێت زۆر سنووردارە. لە ژێـر قورسـایی سـاڵانێک لـە جەنگ و سزای ئابووریدا. ژێرخـانی کۆمەڵایـەتیی عێـراق داڕووخـاوە و دۆخی ئابووریی لە عێراقدا لە حاڵەتێکی کارەسات بارداییە. بیرۆکراسییەتی عێراق بەحاڵ نووزەی تیا ماوەو لە حاڵی حازردا عێراق هێزی چەکدار یان هۆکاری پاراستنی ئاسایشـی نـاوخۆی نییـە. بـە کـورتیی، پێویستە کـە دەوڵەتی عێراق سەراپای بنیات بنرێتـەوە. ئەمـەش لـە مـاوەی دوو سـاڵدا بـەدی نایـەت. بنیاتنـانی دامـەزراوە دیموکراسییەکان لـە دەوڵەتێکـدا کـە بناغەکەی قرپۆکە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت.

ڕێککەوتنی گرووپە عێراقییە جۆراوجۆرەکان لە سەر نەخشـەی دامـەزراوە دیموکراسییەکان، خـۆی لـە خۆیـدا. سـەرەکییترین بەربەسـتە و ئـەمێریکا ناتوانێت خۆی لە خۆتێهەڵقورتاندن و ڕۆڵگێڕانی گرنگ لەو پرۆسـەیەدا لا بـدات. گرنگیـی ئـەو ڕۆڵـە لەوەدایـە کـە تـەنها ئەمێریکایـە دەتوانێـت چوارچێوەیەکی سەرکوتکاریی فەراهەم بکات بۆ ئەوەی گرووپەکان ناچـار بکات کە لە نێوان خۆیاندا بسازێن. وە لە کاتێکدا کە جیـاوازی بنـەڕەتیی

له سەر شێوازی حکومەتی نوێدا هەیە. خۆلادان لەم کارە دەبێتە مەسەلەیەکی مەحاڵ. تەنها ئەمێریکایە کە دەتوانێت گەرەنتیی ئەوە بدات کە گرووپەکان پابەند دەبن بەو ڕێککەوتنامانەی کە واژۆی دەکەن. بەڵام ئەم گەرەنتییە هەر تا ئەو جێگایە بڕ دەکات کە هێزێکی بەرچاوی ئەمێریکیی لە عێراق دا بمێنێت.

لەو ڕووەوەی کە ئەمێریکا بە ناچاری دەگلێتە ناو "لایەنگرییکردن"ی بەرژەوەندییەکانی گرووپێک لە دژی ئەوی تر. ڕۆڵی ئەمێریکا ڕۆڵێکی خۆتێهەڵقورتێنەرانە دەبێت. بۆیە ئەوشتانەی گرنگن بەلای ئەمێریکاوە دەخزێنە ناو دەستووری عێراقەوە. خۆلادان لەوەش کارێکی مەحاڵە. بەڵام بەمانای ئەوە نێت کە ئەمێریکا نەک هەر سیستەمێکی حوکمڕانیی دیاریکراو دەسەپێنێت بەسەر عێراقدا (عێراقییەکان ئازادن لەوەی کە هەر سیستەمێک هەڵبژێرن کە خۆیان دەیانەوێت – تا ئەو جێگایەی کە دیمۆکراسیی بێت). بەڵکوو ئەمێریکا میکانیزمی ئەو جۆرە سیستەمەش دەسەپێنێت. هەرکاتێک کە سەربازانی ئەمێریکا عێراقیان جێهێشت و هیچ هێزێکی باڵادەست نەمێنێت بۆ سەپاندنی ڕێکەوتنامەکان. ئەو سیستەمە تا ئەو جێگایە بڕ دەکات کە هەموو لایەنەکان بە سیستەمێکی شەرعیی بزانن. ئەگەر سیستەمێک لەلایەن هێزێکی دەرەکییەوە سەپێنرابێت و ئامادەش نەبێت بمێنێتەوە و بەرگریی لەو سیستەمە بکات کە هێناویەتە سەرکار. ئەوا کەم کەس دەتوانن لۆژیکییانە پێشبینیی ئەوە بکەن ئەو سیستەمە شەرعییەتی بەرفراوانی لە دیدگای خەڵکی عێراقەوە هەبێت.

ئەوەی ئاسانتر باوەڕی پێ دەهێنرێت ئەوەیە کە ئەو سیستەمە چۆنە بەوشێوە تەماشا دەکرێت. سیستەمێک دەربڕیی لە بەهاکانی ئەمێریکا دەکات نەک هی خەڵکی عێراق. لە ماوەی دوو ساڵدا. ئەمێریکا لەوانەیە بتوانێت دەرهەق بە حوکمڕانی دیمۆکراسیی بڕوا بە خەڵکی عێراق بهێنێت (هەرچەند گرووپە جیاوازەکان زۆر بە بەرفراوانیی لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە لەسەر شێوە و شێوازی دیمۆکراسیی لە پراکتیکدا): هەروەها لە تواناناداییە دەستورێکی وەها دابڕێژرێت دەسەڵات لە ڕێگەی نوێنەرایەتییەکی بەرفراوانەوە دابەش بکات لە گەڵ پاراستنی مافی کەمینەکاندا.

بـــــەمجۆرە. ئـــــەمێریکا واقیعبینانــە دەتوانێـت هیـوای بـەهێزبوون و سـەرپێکەوتنی ئـەو دوو ئاسـتەی دیمۆکراسـیی بخوازێـت کـە لـە لایـەن فۆکۆیامـاوە پێناسـە کـراون (دیمۆکراسـیی پێـودانگیی و دامـەزراوەیی). ئـەوەی لـەو مـاوە کورتـەدا بـەدی نایـەت پتـەوبوونی ئاسـتە قووڵـەکانی کۆمەڵگای مەدەنیی و کولتووری سیاسـییە. کۆمەڵگایـەکی مـەدەنیی پـڕ لـە جوڵە و کولتوورێکی سیاسیی یارمەتییدەر ناتوانرێت بـە هـەمان شـێوازی دامەزراوەکان "ئەندازەسازیی" بهێنرێتـە ئـاراوە. بەتایبـەت لـە هەلومـەرجی دوو ســاڵدا. بـەڵام بەتـەواویی لــەو ئاسـتانەدا ســەرکەوتنی ئـەزموونی دیمۆکراسیی لە عێراقدا دیاری دەکرێت.

## ڕوانگـەی دیمۆکراسیی لـە عێـراق بـە گـوێرەی ڕێگـەچارەی یەکەم

لە عێراقی دوای پاشەکشەی هێزەکانی ئەمێریکادا. دیمۆکراسیی چانسێکی زۆر باشـی نییـە بـۆ ئـەوەی بەزینـدوویی بمێنێتـەوە. هـیچ یـەکێک لـەو مەرجانـەی کـە یارمەتییـدەرن بـۆ پتـەوبوونی دیمۆکراسـیی لـە عێراقـدا بوونیان نییە. بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابووریی – کۆمەلایەتیی، سیاسـیی، ئابووریی و مادیی— لە سەروبەندی دەستپێکردن دایە: خودی سیسـتەمی سیاسیی لە ڕوانگەی زۆر لە عێراقییەکانەوە لەوە دەچێت بـە سیسـتەمێکی ناشەرعیی و نامۆ و سەپێنراو لە قەڵـەم بـدرێت: کوردەکـان جـارێکیتر بـە مرومۆنیی دەبینرێنەوە و پشت بەوە دەبەستن کە داواکانیان بخرێنە سـەر کاغەز و لە دەستووردا جێگیر بکرێن، ئەویش ڕەنگە دەسـەڵاتی ناوەنـدیی کە عەرەبەکان تێیدا باڵادەستن پێیەوە پابەند بێـت یـان نـەبێت: بێگومـان هەندێک گرووپی دیاریکراوی عەرەبە سوننەکانیش تووشی ڕەشبینی دەبن بەهۆی لەدەسـتدانی دەسـەڵات و جێگـە و ڕێگـەیان: گرووپـە شـڕەخۆر و ڕاووڕووتچییەکانیش هـەوڵی لـەباربردنی ئـەزموونی دیمۆکراسـیی دەدەن. ڕووخانـدنی دیمۆکراسـیی زۆر لـە بنیاتنـانی ئاسـانترە. دیمۆکراسـییەکی نەچەسپیو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بـە پەنجـەمۆری ئـەمێریکا ڕووپـۆش کرابێ، دەبێتە ئامانجێکی ئاسان.

لـــــــەم بارودۆخــــــــەدا. پەژرێنـــدراوترین دەرەنجـــامی رێگـــەچارەی یەکەم خەباتی درێژخایەنە بۆ کۆنترۆڵکردنی هۆکارەکانی دەستڕاگەیشتن بە دەسەڵات. لە سایەی حوکمڕانیی دیمۆکراسییدا. ئەو خەباتـە لـە رێگـەی هـەڵبژاردنی گشـتییەوە یـەکلا دەکرێتـەوە. بـەڵام لـە عێراقـدا کێبڕکـێ بـۆ دەسەڵات هەرگیز لەو ڕێگایـەوە یـەکلا نەکراوەتـەوە. کێشمەکێشـی نێـوان گرووپە سەردەستەکانی سوننە هۆکاری باوی گۆڕینی رژێمـەکان بـووە لـە عێراقدا دەستگرتنی چالاکانە بەسەر ئامرازە سەرکوتگەرەکانی دەوڵەتدا لە لایەن گرووپێکەوە دەرەنجامی کێشمەکێشەکانی دیاریکردوە. لە ژمارەیەک کوودەتاکاندا خوێنڕشتنی بەدواوە بووە. بەڵام هیچ کامیان نەبوونەتە هۆی بەرەوڕووبوونـــەوەی چەکدارییانــــەی درێژخایـــەن لــــە نێـــوان گرووپـــە ناکۆکەکانـــدا. دەســـەڵات لـە دەوڵـەتی عێراقییـدا هەمیشـە لـە ناوەنـــدا کۆبووەتەوە و دەوڵەتیش هەمیشە دامودەزگای سەرکوتکەری پێشکەوتووی هەبووە (سوپا و دەزگاکانی ئاسایشی ناوخۆ). ئەوەش ئـەوە دەگەیـەنێت ڕابـەرە نوێکـان کـە دەهاتنـە سـەرحوکم لـە رێگـەی کوودەتـاوە. هـەموو دامودەزگای دەوڵەتێکی سەرکوتکاریی دەست لێ نەدراویان بـە میـرات بـۆ بەجێدەما.

بەمجۆرە. گواستنەوەی دەسەڵات کەمترین ئـاڵۆزیی کۆمەڵایـەتیی بـەدواوە دەهات و کـۆنترۆڵکردنی ژمارەیـەکی کـەم لـە کلیلـەکان. کـە بەشـێوەیەکی ستراتیژییانە لە هەندێک دامەزراوەی سـەرکوتکارییدا دەبینرانـەوە. بـەس بوو بۆ دەسەڵات گرتنە دەست. عێراق دوای دوو ساڵی تر هیچ لـە عێراقـە کۆنەکە ناچێت. ئەگەر هەموو شتەکان بـە گـوێرەی پـلان بڕۆنـە پێشـەوە. عێراق دەوڵەتێکی دیمۆکراتیی دەبێت کە تیایـدا دەسـەڵات بـە شـێوەیەکی بەرچاو. لە چاو جاراندا نا مەرکەزیی کراوە. دەزگـا سـەرکوتکارییەکانیش رۆڵێکی زۆر ناسەرەکییتر دەگێڕن. دەزگا و ڕێکخراوە ئەمنییەکانی سـەدام لە بابەتی گاردی کۆمـاریی. گـاردی کۆمـاریی تایبـەت و تەنانـەت سـوپای عێراق لە بەر یەک هەڵوەشێنراونەتەوە. لەوانەیە کە هێـزە سـەربازییەکانی عێراق سەرلەنوێ ڕێکبخرێنەوە بەڵام هەرگیز توانای جارانیـان نابێـت. لـە بەر ئەوەی دەسەڵاتەکان بەسەر دامودەزگاکاندا پەڕاگەندە کراوە. بۆیە هەر هەوڵێک بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات بە شوێن چوونـە دەرەوەی هێزەکـانی ئەمێریکادا لەڕادە بەدەر ئاڵۆزتر دەبێت بە بەراورد لە گەڵ ڕابردوودا.

چییتر ئیمکان نییه دەست بەسەر دەوڵەتی عێراقدا بگیرێت لە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی هەندێک لە کلیلە سەرەکییەکانی دەسەڵات. وێڕای ئەوەش، پێشبڕکی بۆ دەسەڵات گرتنە دەست چییتر لە ململانێی گرووپە ڕکابەرەکانی سوننەدا قەتیس نامێنێتەوە. ئەمە دەروازەیەکە بۆ تێکهەڵپڕژانێکی کۆمەڵایەتیی مەزن. ئەگەر ئەمە هاتە دی، مەرج نییە جەنگێک بێت کە لە ڕق و کینەی ئێسنیکیی یان تایەفییەوە سەرچاوە بگرێ، هەرچەندە لەوانەیە کە ئەوەش بقۆزرێتەوە. بەڵکوو شەڕەکە لەسەر کۆنترۆڵکردنی بونیادەکانی دەوڵەت دەبێت کە تا ڕادەیەکی زۆر لاوازبوون. لەوە دەچێت ئەم سیناریۆیە تژیی بێت لە ڕەشبینییەکی زێدەڕۆییانە. بەڵام بە دڵنیاییەوە زۆر لەو ئۆڵتێرنەتیڤە لە ڕاستییەوە نزیکترە کە پێیوایە دیمۆکراسیی ڕیشە دادەکوتێت و سەرپێ دەکەوێت لەو سەر زەمینە ڕەقەنە. ئەگەر ئامانجی ئەمێریکا گۆڕینی عێراق بێت بۆ وڵاتێکی دیمۆکراسیی ودواتریش سەرتاپای خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش، هیچ لەوە ناچێت کە ڕێگەچارەی یەکەم بتوانێت ئەم ئامانجە بپێکێت. لەوانەیە هێزێکی دەرەکیی بتوانێت کە دیمۆکراسییەکی سەرکەوتووانە بەسەر عێراقدا بسەپێنێت، بەڵام ئەوە زۆر زیاتر لە دوو ساڵ دەخایەنێت.

## ڕێگەچارەی 2: داگیرکاریی درێژخایەن

ڕێگەچارەی 2 وای دادەنێ، پابەندبوونێکی گەورەوگران( 10- 15 ساڵ ) لەلایەن ئەمێریکاوە هەبێ. لەو ماوەیەشدا عێراق وەک خاوەندارییەتی ئیمپیریالیی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ. هەموو بڕیارە گرنگەکان لەلایەن بەڕێوەبەرانی ئەمێریکییەوە دەدرێن. هێزی سەربازیی ئەمێریکیی بوونێکی بەرچاوی دەمێنێ لە دابینکردنی گەرەنتیی بۆ سەقامگیریی ناوخۆیی. هەروەها ستراکتۆری ئابووریی، کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، سەرلەنوێ و سەرلەبەر چێدەکرێنەوە. لەم ماوەیەدا هیچ ئاماژەیەک بۆ ئەوە نییە، کە عێراق دەستی بڕوات بەسەر سامانەکانیدا؛ هەموو بڕیارە گەورەکان لەلایەن هێزە داگیرکارەکانی ئەمێریکاوە دەدرێ و

دواتر بەسەر عێراقییەکاندا دەسەپێنرێ( پێیانخۆش بێ یان نا). بەلام ئامانج دارشتنی بناغەیەکی پتەوە بۆ پاشەڕۆژی عێراق. ڕوونترین نموونەش بۆ ڕێگەچارەی 2. داگیرکاریی ئەمێریکا بۆ ئالمانیا و ژاپۆن لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم.

لەبنەڕەتدا، ئەمێریکا پێویستیی بە کۆپییکردنەوەی ئەو پێهەڵسانەیە کە لە ژاپۆن و ئالمانیا نواندی. لەهەندێ ڕووەوە، هاوتەرییبی ولێکچوون هەیە. لەنێوان چێکردنی دیمۆکراسیی لە عێراق لەگەڵ ئەوەی لە ئالمانیا و ژاپۆن چیی پێویست بوو. سیستەمی پەروەردە لەعێراقدا سەرتاپای پێویستی بەدارشتنەوە هەیە. ژمارەیەکی نەزانراو لەخەڵک، پێویستیان بەوە هەیە بە " دووبارە پرۆگرامکردن" دا تێپەڕێنرێن. پاش ئەوەی 30 ساڵ دەسەڵاتی بەعس بەرنامەڕێژی کردبوون. ئابووریی پێویستیی بە دووبارە بنیاتنانەوە هەیە لە خوارەوە بۆ سەرەوە. ڕێژەی گەندەڵیی گەیشتووەتە ئاستی پەتا epidemic و پێویستە لەڕەگەوە هەڵکێشرێ. چەندین نەوە لەعێراقییەکان بەو ئایدیایە پەروەردەکرابوون کە ئەمێریکا و ئیسرائیل، دوژمنە سەرسەختەکانی خەڵکی عێراقن، پێویستە ئیشیان لەسەربکرێ- بەمشێوەیە لیستەکە درێژ دەبێتەوە.

دەوڵەتی عێراق پێویستی بەدووبارە بنیاتنانەوە هەیە، پێش هەر تەقەلایەک بۆ چاندنی دیمۆکراسیی تێیدا. بەپێچەوانەی باروبۆخی ئالمانیا و ژاپۆنەوە، ئەمەیان پێویستی بەوەیە لە ناوجەرگەی ناوچەیەکی پڕ لە دوژمنکارییدا بکرێ. هەروەها دەبێ لەکاتێکدا بکرێ، کە وڵاتێکی شەقوپەق پێکەوە بنووسێنرێتەوە. ژاپۆن و ئالمانیا، لەو کاتەدا هۆمۆجینییەسترین { چوونیەک} وڵاتی سەر ڕووی زەویی بوون، کەچیی عێراق وانییە. ئەگەر ئەمێریکا دەیەوێ چانسێک بدات بەدیمۆکراسیی بۆ ئەوەی درێژە بەژیانی بدات لەعێراقدا، ئاستێک لەپابەندبوونی دەوێ، لای کەم یەکسان بێ بەو ئاستەی کە بۆ ژاپۆن تەرخانکرا. ئەمەش مانای داگیرکارییەکی سەربازیی درێژخایەن. شایانی بیرهێنانەوەیە کە دیمۆکراسیی بەسەر ژاپۆنییەکاندا سەپێنرا- ئەمێریکا دیمۆکراتیزەکردنی لەسەرەوە سەپاند. تەنانەت ئەمێریکا دەستووری ژاپۆنیشی نووسی، دواتر خستیە سەر سکەیڵ لەڕێی پارلەمانی ژاپۆنییەوە.

ئەمە داگیرکارییەک بوو کە تێیــــــــدا" ژەنــــــــەراڵ MacArthur و کۆماندارییەکــەی، وەک دەســەڵاتدارانی نیۆکۆلۆنیــالّیی کەڵــەگا، کــە هــیچ لێپرسینەوەو رەخنەگرتنێک لەسەریان نەبوو، بەهەمیشەیی وەک ئیمپراتــۆر ودارودەســتەکەی کــەس دەســتی بــۆ نــابرن."[300] ئەمــە لــە وتــەکانی چاودێرێکــدا هــاتبوو، " دواهــەمین پــەراوەی ناشــیرین لــە لووتبــەرزیی کۆلۆنیــالیی ناســرابوو بــە" بــارگرانیی پیــاوە ســپی پێســتەکە."[301] زۆر ژیارییە بۆ سەرکەوتنی ئەم پرۆژە نیۆکۆلۆنیالییەی کە فیگەر و دەموچاوی ئیمپراتۆر بوو، لەرێگەی ئیمپراتۆرەوە بــوو کــە MacArthur، ملکــەچیی ژاپۆنییەکانی مسۆگەر کرد. فیگەری لەم چەشنە لەعێراقدا بوونی نییە.

سەرەڕای ئەوەش، داگیرکاریی ســەربازیی درێژخایــەنی ئــەمێریکا، بــەلای کەمەوە لەکۆتایی ماوەکــەدا، هەنــدێ ئاســۆ بــە چێکردنــی دیمۆکراسیی و توانــــای گیــــان بەبەرکردنــــەوەی لەعێراقــــدا پــــێ دەدات. فەنکشــــنی چارەنووسساز، کە هێزەکانی ئــەمێریکا دەتــوانن دەستەبەری بکــەن وەک چوارچێوەیــەک بــۆ ســەقامگیریی، پاڵپشــتیی بکــرێ بــە هەڕەشــە ( یــان بەکارهێنانی ) هێزی سەرکوتکەر. ســەوداکان ، دەکــرێ سازشــیان لەســەر بکــرێ بــۆ گەیشــتن بەکۆدەنگییــەک، لــە رێــرەوی ئــەو پرۆسێســی سەوداکارییەی haggle بەسەر دەستووردا دێت، دەشێ بەتۆبزیی بکــرێ، چونکە ئەمێریکا دەتوانێ گوێڕایەڵیی زامن بکات. بۆ نموونــە ســەودایەک بەگریمانەوە لە نێوان کوردەکان و عەرەبەکاندا بکرێ، بە مانــەوەی شــاری کــەرکوک لــەدەرەوەی هــەرێمی ئۆتۆنــۆمیی کــوردیی، لەبەرامبەریشــدا کوردەکــان داهــاتێکی ســالانەی گەرەنتییــداریان لــە کێڵگــە نەوتییــەکانی کەرکوک بەربکەوێ.

لەسەر بناغەی ئەزموونەکانی مێژوو، کوردەکــان زۆر ســاویلکەن naïve بڕوا بەوە بهێنن حکومــەتی ســێنترال کــە عــەرەب بەســەریدا زاڵــە، رێــزی سەودایەکی لەم چەشنە بەتەواویی دەگرێ. بوونی درێژخایــەنی هێزەکــانی ئەمێریکا، گەرەنتیی ئەوە دەدات، کە هــەموو لایەنــەکان بــە رێکەوتنــەکانی نێوانیانەوە پابەندبن. باشیی ئەمە، ئەوە دەبێت کە دیمۆکراســیی عێراقیــی، دەتوانێ فەنکشن بکــات تەنانــەت لــە نــەبوونی متمانەشــدا لــەنێو گرووپــە عێراقییەکاندا. خۆزگە بە تێپەڕبوونی کات، نوێنەرە سیاسییەکانی گرووپــە

عێراقییـــەکان ڕۆژانـــە بەریەکدەکەون لە باروبۆخێکی سەقامگیردا. تا پێوەندیی متمانە دروست بێ.
ســەرەڕای ئەمانــەش. بــۆ چارەســەرکردنی زۆر گیروگرفتــی دامــەزراوە سیاسییەکان. ئامـادەبوونی ئـەمێریکا بـە درێژخایـەنیی. ئاسـانکاریی بـۆ گەشەکردنی کۆمەڵگەی سیڤیل دەکات. هەروەها بۆی هەیە سەرەتایەک بـێ بۆ کولتووری سیاسیی دیمۆکراسیی لەعێراقدا. لەکۆتایی 10-15 سـاڵ لـە داگیرکاریی سـەربازیی. ئـەمێریکا کۆمـەڵێ لـە دامودەزگـای سیاسـیی کـە بــەقووڵیی پێکەوەگرێـــدراون. بەجێـــدەهێڵێت. لـــەڕووی ئایدیالییـــەوە. دیمۆکراسیی عێراقیی دەچەسپێ لە ئاسـتی کۆمەڵگـەی سـیڤیلدا. ئەوسـاش هەندێ چانسی دەبێ بۆ ئـەوەی ببـێ بـە دیاردەیـەک کـە پشـت بـەخۆی ببەسـتێ. بـەڵام زۆر گرنگـە ددان بەگـەورەیی ئـەو ڕووبەڕووبوونەوانـەدا بنێین. کە لێرەدا بەپێش دێـن. چەسپاندنی دیمۆکراسـیی لـەو دوو ئاسـتە قووڵەدا کە لەلایەن فوکویاماوە دەستنیشانکراون. ئاسان نییـە. چونکـە بـە تێرمێکی سانا. شتێکی کەم لە کەرەسەی خاو هەیە. تا کاری لەسەر بکرێ.

## ئاستی 3: کۆمەڵگەی سیڤیل{ مەدەنیی}

کۆمەڵگـەی سـیڤیل دەکـرێ پێناسـە بکـرێ بـەمجۆرە" سـتراکتۆرێکی کۆمەڵایەتییـە کـە خۆبـەخۆ پێکهـاتووە. جیاکراوەتـەوە لـە دەوڵـەت بـۆ پێکهێنـانی بناغـەی دامودەزگـا سیاسـییەکان."[302] ئـەم سـتراکتۆرە کۆمەڵایەتییـە پێکهـاتووە لـە شـتگەلێکی تـر. گرووپـە چالاکـەکانی بەرژەوەنـدیی. گرووپـەکانی چـاودێریی. کۆمیونێتییـە بەشـداربووەکان و میدیای ئازاد- بۆ زۆرکەس بریتییە لە" مەرجێکی پێویستی پێشوەختە بـۆ دامودەزگا دیمۆکراتییە سەقامگیرەکان"[303] هەندێکی تر تێرمی " سەرمایەی کۆمەڵایەتی" یان بەکاربردووە. بۆ ئامـاژەدان بـە یەدەکگـەلێک لـە " بـڕوا. نۆرم و تۆڕەکان" کـە فـابریکی کۆمەڵایـەتیی وڵات پێکـەوە دەبەسـتێتەوە. لێرەشەوە زۆر بەگەورەیی کاردەکاتە سەر ئاسۆی سیستەمێکی دیمۆکراتیی کارا.[304] بۆ بەکارهێنانی بەیەکچوواندن. کۆمەڵگـەی سـیڤیل چینـەخاکێکی سەرەوەیە کە تێیدا دامودەزگا دیمۆکراتییەکانی تێدا تۆودەدرێ{ تـۆودان}. جۆری خاکەکەش دیاریی دەکات. ئەگەر تۆوەکان لە عێراقدا بڕوێن.

لەعێراقدا. پرۆسێسەکە لەو شوێنەوە دەستپێدەکات. وەشاندنی تۆوەکان وەک ئەوەیە. بەسەر کۆنکریتدا بکرێ. چەرخی زێڕینی کۆمەڵگەی سیڤیلی عێراقیی لە دوایین ساڵەکانی پاشایەتییدا بوو. تەنانەت ئەوساش. کۆمەڵگەی سیڤیل لە دەستەبژێر{ ئیلیت} ەکان پێکهاتبوو. بەهیچ شێوەیەک بۆ ناو زۆرینەی جەماوەر دانەچۆڕیبووە خوارەوە. لە 1968 ەوە. بەعس بۆ جاری دووەم. دەسەلاتی بەدەستەوە گرت. کۆمەڵگەی سیڤیل لەعێراقدا بوونی نەمابوو. سروشتی رژێمە تۆتالیتارییەکان ئەوەیە کە کۆمەڵگەی سیڤیل. بەئاگاییەوە بەرکەنار بخەن. چونکە بوونی ئەم ستراکتۆرە کۆمەلایەتییە سەربەخۆیانە لەپشت کۆنترۆڵی راستەوخۆی دەوڵەتەوە. بە هەڕەشە دادەنرێ. هیچ کەسێ نابێ کاریگەریی ئەوە کەمبکاتەوە کە چۆن حیزبی بەعس سەرکەوتووبوو لە تێکوپێکدانی هەر نیشانەیەکی کۆمەڵگەی سیڤیل. کە مابووبێتەوە لەدوای ژێروژوورکردنی پاشایەتیی لە 1958 دا. سەبارەت بە ستراکتۆرە کۆمەلایەتییەکان لەدەرەوەی دەسەلاتی رژێم. هەموویان هەڵوەشێنرانەوە. کەرتوپەرتکردنی خەڵکی عێراق- کە هەوڵێکی کۆنکریتیی لەخۆگرتبوو بۆ رۆچوونە ناو هەستی گەنجەوە. بۆ ئەوەی جگەرسۆزیی بۆ رژێم زۆر توندوتۆڵتر بێ تا بە پێوەندییە خێزانییەکان دەگات- زۆر وێران بۆ سەر پاشەرۆژی هەر پێشبینییەک بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی سیڤیل کارابوو.

لەهەمان کاتدا. لەدوای 1991 ەوە. رژێم گەشەی بەهەندێ ستراکتۆری تر دا. بەتایبەتیی. نەوەدەکانی سەدەی رابردوو. عێراق سەرهەڵدانی "نیو عەشیرەتچییەتیی" neo-tribalism بەخۆیەوە بینی. لادانێکی گومڕاو سەیر بوو لە بەها ترادیسیۆنەکانی عەشیرەت. تێکەڵکراو بە بەرژەوەندیی ماددیی و بەقورگداکردن بۆ کۆمەڵێ عەشیرەت لەسەر حیسابی هەندێکی تر. بە تێڕوانینێکی گەشبینانەوە( بەپەرگیریی). عەشیرەتەکان بۆی هەیە هەندێ شێوازی سەقامگیریی لە دوای سەدام دەستەبەر بکەن. زۆر لە عەشیرەتەکان جیاوازییە تایەفییەکانیان بڕیوە. بەمشێوەیە خزمەتی یەکپارچەیی دەکەن تا بە دابەشبوونی دانیشتووانە عەرەبەکەی عێراق دەگات. زۆرتر واقیعییانەتر. زۆروبۆریی ئەم عەشیرەتگەلە چەکدارانە. کە راهاتوون بەوەی سەربەست بن. تا لەژێر کۆنترۆڵی سێنترالدا بن. ئەگەری

خراپبوونی هەلومەرجەکەی لــێ دەکەوێتــەوە، بــەوەی وەک هاوشــێوەی سەرلەشکرەکانی ئەفگانستانیان لێ بێت.
بەخێوکردنی تۆوی کۆمەڵگەی سیڤیل لەعێراقدا. پرۆسێسێکی دووردرێـژ و سەختە. دەستبەرکردنی کۆنتێکستی کۆمەڵایەتیی، ئـابووریی و سیاسـیی لــەخۆ دەگــرێ و بــۆ دروســتبوونی گرووپــە میانڕەوەکــان، لەچەشــنی سەندیکاکان، ڕێکخراوە جەماوەرییەکان، پارتە سیاسییەکانی کە خۆیان بۆ پرۆسێسی دیمۆکراتیی تــەرخان دەکــەن. لەهــەمان کاتیشــدا. لــە ئــەمێریکا دەخــوازێ، بڕیــاری قــورس بــدات، بــۆ مامەڵــەکردن لەگــەڵ گرووپــە" پەرگیرەکان". لەچەشنی ئیسلامییە فەندەمێنتالیستەکان، گرووپــەکانی ئــەنتی زایۆنیست یان زۆر گونجاوتر گرووپەکانی ئەنتی ئەمێریکایی.

## ئاستی 4: کولتووری سیاسیی

لەقووڵترین ئاستدا. کولتووری سیاسیی، چەندین فاکتــەر دەگرێتــەوە، وەک ئــایین، بــەهای مــۆراڵیی، ئاگــایی ئێســنیکیی و شــتی لــەو چەشــنە. ئەمــە قووڵترین توێژی خاکە کە تــۆوی ڕوواوی germinated ئینســتیتیوتە دیمۆکراتییــەکانی . بــەرەگێکی بــەهێز و پتــەو تێــدا داکــوتراوە. ئەمــەش قووڵترین ئاستە کە دیمۆکراسیی پێویســتە نغــرۆ بێــت تێیــدا بــۆ ئــەوەی بەتەواویی توندوتۆڵ بێ. هەروەها ئاستێکە دەکەوێتە پشت نەخشەسازیی سیاســیی و کۆمەڵایەتییــەوە. بــە دەربڕینــی فۆکۆیامــا" کولتــوور دەکــرێ پێناسە بکرێ بــە خوویــەکی ڕاشــناڵیی{عــەقلانیی} و ئێســیکیی، لەڕێگــەی ترادیسیۆنەوە دەگوازرێتەوە."[305] کولتوور بــەخێرایی نــاگۆڕێ، بــەڵام بــە هاتنە پێشەوەی نەوەکان دەگۆڕێ.
لێــرەدا، بەدڵنیاییــەوە، پرســیاری ســەخت دێتــە پێشــەوە، ئایــا نــۆرم و بەهاکانی پێوەست بە ترادیسیۆنی دیمۆکراتیی لیبراڵیی ڕۆژئــاواوە، لەگــەڵ نــۆرم و بــەهاکانی جڤــاکی عــەرەبیی و ئیســلامییدا دەگــونجێن. ئەمــە دیبــەیتێکی ئــاڵۆزە( بــەلای کەمــەوە) و شــتێکە کــە نــاتوانرێ بســەلمێنرێ لەهــەردوو بارەکــەدا. بــەڵام بــە تاقیکردنــەوە، ڕێکــۆردی دیمۆکراســییە

سەقامگیرەکان لە جیهانی عەرەبدا، باش نییە. لە 2001 دا، بەرزترین قۆناغی دیمۆکراسیی لەجیهاندا، 121 ( 63 لە سەد) لە 192 وڵاتی جیهان، حکومەتی هەڵبژێردراوی دیمۆکراتییان هەبوو. لە 16 دەوڵەتی عەرەبیی، هیچیان دیمۆکراتیی نەبوون. هیچ دەوڵەتێکی عەرەبیی هەرگیز حوکمێکی دیمۆکراتیی بۆ ماوەیەکی درێژ نەبووە.[306]
نزیکترین نموونە کە جیایی هەبێ لێرەدا، بەراستیی هەر عێراقە. لە سەردەمی پادشایەتییدا، لای کەم توانیتی دەست بە شێوەیەک لەدیمۆکراتییوونی ماقووڵەوە بگرێ. بەلام بەهیچ شێوەیەک ئەم دیمۆکراسییە بۆ ناو کولتووری کۆمەڵ، شۆڕنەبووەوە. لەباشترین دۆخدا، دەکرێ بەوە پێناسە بکرێ کە ئۆلیگارشییەکیoligarchy هەڵبژێردراو بوو. ریکۆردی وڵاتە ئیسلامییەکان کەمێک باشترە. لە 2001 دا لەناو 45 وڵاتی ئیسلامییدا، کەموسڵمانان زۆرینەن، 11 یان حکومەتی هەڵبژێردراوی دیمۆکراتییان هەبوو. بەهەرحاڵ، بەسەرنجدانەوە، ئەم فیگەرە ئەو وڵاتانەش دەگرێتەوە، وەک نایجیریا. کرێدتی دیمۆکراتییەکەی، لەباشترین دۆخدا بەو نیوەناچڵییەشەوە شایانی قایلبوونە. سەبارەت بەو وڵاتانەی بەپێی ستاندەردی رۆژئاوا بە " ئازاد" پۆلێن دەکرێن، تەنێ یەک نموونە - مالی Mali – هەیە.
هیچکام لەمانە، گفتوگۆ لەسەر ئەوە ناکات کە دیمۆکراسیی عەرەبیی یان ئیسلامیی دوو واتای دژبەیەکن oxymoronic. بەڵکووو قەبارەی ئەو کارانە تۆخدەکاتەوە کە دەبێ لە عێراقدا بکرێن. چێکردنی عێراقێکی سەرکەوتوو، پتەو لە دیمۆکراسیی، دەستکەوتەکانی ئەمێریکا لە ئاڵمانیا و ژاپۆن کاڵدەکاتەوە. دەبێتە یەکەمین دیمۆکراسیی عەرەبیی یەکانگیر، بەتەواویی فەنکشن بکات لە مێژوودا. بۆ ئەوەی دیمۆکراسیی لەعێراقدا بتوانێ لەسەرپێی خۆی بووەستێ و سەرکەوتوو بێ، لەلایەن ئەمێریکاوە پابەندبوونێکی زۆر گەورەی دەوێ.
عێراق( جگە لە کوردستانی عێراق) هیچ خۆشییەکی لە فەنکشنکردنی کۆمەڵگەی سیڤیل، لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردووەوە نەبینیوە و هەرگیزیش کولتوورێکی سیاسیی دیمۆکراتیی نەبووە. زۆرجار لەمێژووی عێراقدا، کێشەی سیاسیی لەرێی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە چارەسەرکراوە، نەک لەرێی سندووقەکانی دەنگدانەوە. عێراق

دیمۆکراسییەکی مات نییە. چاوەڕێی تەقینەوە بکات. تا تەوقی چەوسانەوە دابماڵێت. کۆمەڵگەی سیڤیل و ئەو کولتووری سیاسییەی یارمەتییدەر دەبێ، دەبێ لە خاڵێکەوە چێبکرێ و ئەمەش کاتی دەوێ. بۆی هەیە چەندین ئەوەی بوێ. داگیرکاریی 10-15 ساڵ لەداگیرکاریی ئەمێریکا، کەمترین کاتە کە دیمۆکراسیی بیەوێ. بۆ ئەوەی لەعێراقدا چانسی سەرکەوتنی هەبێ.

## باشییەکانی ڕێگەچارەی 2

لەڕووی چۆنایەتییەوە ئەم ڕێگەچارەیە. لە ڕێگەچارەی یەک جیاوازە. ددان بەوەدا دەنێ، کە هێنانی دیمۆکراسیی بۆ عێراق لە بەرژەوەندیی ستراتیژیی ژیاریی ئەمێریکادایە. هەروەها دەستەبەرکردنی ئەمەش پێویستیی بەپابەندبوونی گەورەوە هەیە لە دابینکردنی دەرامەت و هێزی مۆریی. پابەندبوون بەم قەبارە گەورەیە. بەشێکی بۆ قایلکردنی ئەو ڕاڕاییە دەڕوات، کە ئەمێریکا سوورە لەسەر دیمۆکراتیزەکردنی ڕۆژهەڵاتی ناڤین. لە ماوەی 10-15 ساڵدا. عێراق دووبارە لەنووکەوە بۆ نووک بنیات دەنرێتەوە. ژێرخانی نەوت، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێشوو. شتە بەکەڵکە ژیارییەکان بگەڕێنرێنەوە، تۆڕی کۆمەکی کۆمەڵایەتیی، کە عێراق شانازیی پێوەدەکات، دەکرێ بنیات بنرێتەوە. ئەمێریکاش دەتوانێ حکومەتێکی سیستەم دیمۆکراتیی بەجێبهێڵێت، پاش دەرچوونی توانای بەرگرییکردنی لەخۆی هەبێ. لەم ماوەیەدا. یاساو نیزام، خۆپاراستن لەدژی خۆتێهەڵقورتاندنی دەرەکیی و سەقامگیریی کۆمەڵایەتیی لەلایەن هێزە سەربازییەکانی ئەمێریکاوە دەپارێزرێن. گرووپەکانی " تالانچیی- spoiler " لەڕەگوڕیشەوە هەڵکەنرێن و پاکبکرێنەوە. لەڕووی ئایدیالییەوە، لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا ئەڵقەی توندوتیژیی کەدەرگیری پێوەندییەکانی کوردو عەرەب ببوو، تێک دەشکێ. هەروەها عێراقێکی دیمۆکراتیی، سەقامگیر و گەشەکردوو، چانسێکی زۆری هەیە وەک نەتەوەیەکی سەرکەوتوو.

## خراپییـــــــــەکانی ڕێگەچارەی 2

دوو ڕێگریی ئاشکرا بۆ ئەم ڕێگەچارەیە هەیە. یەکەم، روون نییە تا کـوێ ڕای گشتیی ئەمێریکا ئامادەیی تێدایـە بەرگـەی ئـەم داگیرکارییـە بگـرێ، وێڕای پێکانێکی زۆر لە ئەمێریکاییەکان، دەرامـەتێکی ئـابووریی زۆریـش بـەفیڕۆ دەڕوات. ئـەو گریمانـەی کـە خـەرجی داگیرکـاریی و دووبـارە بنیاتنانەوەی عێراق، دەکرێ لە دەرامەتەکانی خودی عێراق بێـت( لای کـەم لـە کورتمـاوەدا). گریمانەیـەکی هەڵەیـە. زۆربـەی شـیکردنەوەکان وای دەقەبڵێنن، کە نزیکەی 6 ساڵ دەخایەنێت، پێش ئـەوەی ژێرخـانی نـەوتی عێراق بۆ بەرهەمهێنانی نەوت بە ئاسـتی پـێش سـاڵی 1991 بکەوێتـەوە گەڕ. لەهەمان کاتدا، ژێرخانی فیزیکیی و کۆمەڵایەتیی عێراق دەبێ نـۆژەن بکرێتەوە، تێچوونی ئەمەش، ئەگەر بە ڕێکوپێکی بکرێ، خـۆی لـە سـەدان بیلیـۆن دۆلار دەدات. تـەنێ تێچـوونی داگیرکردنەکـە، مانگانـە خـۆی لـە سەروو یەک بیلیـۆن دۆلارەوە دەدات. ئـەو هەواڵانـەی کـە دەڵـێن خـودی دەرامەتەکانی عێراق بدرێ بـە پرۆسـەی داگیرکـاریی سـەربازیی وڵاتەکـە، پێناچێ لەلایەن خەڵکی عێراقەوە بەباشیی وەربگیردرێ.

بەڵام زۆرترین مەسەلە، کە هەوێ سیاسیی بەدوای خۆیدا دەهێنێ، مەسەلەی پێکانی ئەمێریکاییەکانە. هێورکردنەوەی وڵاتێک بەقەبارەی عێـراق، بـەبێ زیـانێکی زۆر تـەواو نـاکرێ، هـەروەها چەنـد ژمـارەی کوژراوەکـان بەرزبێتەوە، ڕای گشتیی گوشار بۆ کشانەوەی هێزە ئەمێریکاییەکان چڕتر دەکاتەوە. بەسادەیی، ڕای گشتیی ئەمێریکا تەواو ئامادەنەبوو بۆ قـەبارەی ئەم زیانـە زۆرە. لەڕاسـتییدا ئیـدارەی بـوش، پـێش دەسـتپێکردنی شـەڕ، پێشبینی ئەوەی دەکرد، کە هێزەکانی ئەمێریکا لەعێراق، پاش تـەواوبوونی شـەڕ لـە مـاوەی 60 ڕۆژدا دەکشـێنەوە. بەپـەژارەوە woefully ئـەم قەبلاندنە، بەتەواویی سەلمێنرا، وانییە.

بـەڵام گـەورەترین گرفتـی ڕێگـەچارەی 2، ئەوەیـە لـە بنەڕەتـەوە لـە عێراقییـەکان دەخـوازێ، بـۆ مـاوەی 15 سـاڵ دەسـتبەرداری yield سەروەریی وڵاتەکەیان ببن. لەم ماوەیەدا، ئەمێریکا کـۆنترۆڵی سـەرچاوەی سـامانە عێراقییـەکان دەکـات، بڕیـار دەدات، کـێ حیزبێکـی سیاسـیی"پـەژرێنراوە" یـان نـا، پـەراوەی مۆنۆپـۆلیی خـۆی بەسـەر توندوتیژییدا دەکات، هەروەها سیستەمێکی سیاسیی، لە دەستکردی خۆی

بەسـەر خـەڵکی عێراقـدا دەسـەپێنێ. بەسـادەیی. زۆر نادروسـتە. پێشبینی ئەوە بکرێ کە زۆرینەی عێراقییەکان ئەم جۆرە داگیرکردن و ئەو ماوە زۆرەیـان پـێ هـەرس بکـرێ. لەڕاسـتییدا یـەکێ لـەو شـتە کەمانـەی لەهەنووکەدا عێراقییەکان لەسـەری یەکدەنگن. ئـەو حـەزە هاوبەشـەیە کـە دەیەوێ داگیرکاریی بەزووترین کات کۆتـایی پـێ بێـت و کـۆنترۆڵکردنی عێراق بۆ عێراقییەکان بگەڕێتەوە. تەنانەت هاوپەیمانی پێشووی ئەمێریکا. لەچەشنی INC بەئاشکرا رایانگەیاند. داگیرکاریی درێژخایەن رێگـەچارە نییە. تەنها کوردەکان پێدەچێ پاڵپشتیی لە ماوەیەکی درێژ لـە داگیرکـاریی بکـەن. تـا هێزەکـانی ئـەمێریکا بوونیـان لەسـەر خـاکی عێراقـدا هـەبێ. کوردەکان چانسێکی باشیان هەیە. بۆ دەستگرتن بەو ئۆتۆنۆمییەی کـە لـە باکووری عێراقدا هەیانە.

بـەڵام کاردانـەوەی دانیشـتوانی عـەرەبی عێراقیـی بـۆ داگیرکارییـەکی دوورمەودا. کەمتر پێشوازیی لێدەکرێ. بریتانییەکان پێشتر بەم رەهەنـدەدا گوزەراون. رێگایەیەکـە لـەخوێن هەڵکێشـراوە. بریتانییـەکان لـەو باجـەی دایان. وانەیان وەرگرت. تەنێ رێگـای زامـن بـۆ یەکخسـتنی دانیشـتوانی عەرەبی عێراقیی ئەوەیە بە زەبری هێز. عێراق داگیربکـرێ و سیسـتەمێکی حکـومیی بێگانـە alien کـە شـەرعییەتی جـەماوەریی نـەبێ بسـەپێنرێ. رژێمـی پاشـایی و سـەپێنراوی هاشـمیی لەلایـەن بریتانییەکانـەوە. تاڕادەیـەکی بـاش سـەلماندی کـە توندوتۆڵـە. بـەڵام هـەرگیز نـەیتوانی کۆمانـداری رێـز و خۆشـەویسـتییەکی بـەربڵاو بکـات. لەبەرئـەوەی زۆر بەخراپیی دەستی لەگەڵ بریتانییەکان تێکەڵکردبوو.

لـەماوەی دەسـەڵاتی راسـتەوخۆدا (1920-1932 ). بریتانییـەکان رووبەڕووی راپەڕینێکی گەورە بوونەوە. کە دانیشتوانی عـەرەبی عێراقیـی یـەکگرتوو بـوون تێیـدا( 1920 ). هـەروەها نەحەوانـەوەی بـەردەوامی کوردەکان لە باکووردا. بریتانییەکان پەنایان بۆ ژەمەدەرمانی { مەبەست لە سـرنجی زەبروزەنگـە-وەرگێـڕ} پـڕ لەتونـدوتیژیی بـۆ کـۆنترۆڵکردنی نیزامorder بردو ئەمێریکاش دەبێ ئامادەیی تێدا بێت هەمان کار بکات. بەڵام ئامانجی بریتانییەکان تەنێ بۆ هێوربوونەوەی عێراق و دابینکردنـی هەندێ شێوازی نیزامـی نـاوخۆیی بـوو. ئـەمێریکا بەرزخوازییـەکی زۆر زێتری لە ئەرکی گۆڕینی عێراق بۆ دیمۆکراسـییەکی کـارا. هەیـە. ئەمـەش

بەشــداریيەكی فــراوان و چالاك لەخەڵكی عێراق دەخوازێ. شتێكی گەشبينييە چاوەڕێی ئەوە لە عێراقييەكان بكەی، كە بەبەربڵاويی شێتگيرن بەوەی لەلايەن دەوڵەتێكەوە حوكم دەكرێن، كــە بەرپرســە لــە وێرانكردنــی عێــراق و مردنــی ســەدان هــەزار عێراقيــی بــەهۆی ئابلۆقــەی ئــابووريی و شەڕەوە.

رێگــەچارەی 2. بــەورديی بەرجەســتەيی ئــەو مەودايــە لــە پابەنــدبوون دەخوازێ كە دێمۆكراسيی لە عێراقدا بتــوانێ بــۆ دوور مــەودا بمێنێتــەوە بەڵام لەڕووی سياسييەوە نەگونجاوە. ئايينده هەرگيز زامن نــاكرێ. بــەڵام ئــەو بەرەنجامــەی زۆر رێــی تێــدەچێ لــە رێگــەچارەی 2 دا، ئەوەيــە بــە تێپەڕبوونی كات، قەڵسيی نێوخــۆيی لەســەر ئــەوەی تــەڕايی لــەئابووريی ئــەمێريكادا ببــڕێ و شــەپۆلی ناكۆتــای interminable تورەكــە تــەرم body bag ی گــەڕاوە لــە عێــراق، خەســتوخۆڵتر ببێتــەوە. هــەروەها بــەرگريی لــە عێراقــدا دژی " نيــۆ- كۆلۆنيــال" ی داگيركــاريی تونــدتر دەبێتەوە. لێرەدا ئەمێريكا بۆی هەيە كۆتايی پێ بهێنێ بە ڤيرژنی خۆيــەوە لەچەشنی كەرتی خۆرئــاوا{ مەبەســت لــە فەلەســتينە}. بــەڵام لەمەودايەكــدا. كورتــەباڵان لــەوەی بتــوانن هــيچ بكــەن كــە چــۆن ئيســرائيلييەكان دەبــێ مامەڵەی لەگەڵدا بكەن.

## كێ عێراقی دێمۆكراتيی دەوێ؟

لەئاستی هەرێمييەوە سەيربكرێ. مەسەلەكە بــە پــانوپۆريی دەبێتــە ئــەوەی، كێ يارمەتيی عێراقێكی بەهێز، سەقامگير، گەشەكردوو و دێمــۆكراتيی دەدا يــان نايــدا؟ ئەگــەر ئــەمێريكا ســەركەوتوو بــوو بــەدوور لــە هــەموو پێشــبينييەكان، كــێ ئــەم دەرەنجامــەی بــەلاوە پەســەندە؟ مێــژوو ئامــاژە بــەگرنگيی ئــەم مەســەلەيە دەدات. بــەدرێژايی مێــژووی عێــراق، بــەڵام بەتايبەتيی دوای 1958، يەكێ لە فاكتــەرە ســەرەكييەكانی ناســەقامگيريی نــاوخۆيی عێــراق، بــۆ خوليــای خۆتێهــەڵقورتانی هێــزە دەرەكييــەكان، بــۆ تێكدانی ئەو باڵانسە فشۆڵەی ئێتــنيكيی و تايــەفيی دەگەڕێتــەوە. عێــراق ئامانجێكی سانايە، زۆر ساناتر لە وڵاتەكانی تری ناوچەكە، زۆر جــاريتر، ئەمــە بووەتــە هــۆی خۆتێهەڵقورتانــدنی هێــزی گــەورەی دەرەكيــی و كوردەكانيــان وەك هێــزی بريكــار surrogate لەهەمبــەر حكومــەتی

سێنترالّدا بەکار هێناوە. لەهەندێجاری تردا ئێران شیعەکانی باشووریان وەک تابووری-پێنجەم fifth column بەکارهێناوە.
لیستی ئەو وڵاتانەی کە نەیانتوانیوە بەرگەی هەڵچوونەکانیان بگرن لە دەستتێوەردان، دوورودرێژە، لەوانە، ئەمێریکا، عێراق{ بۆی هەیە ئێران بێ و بە هەڵەی چاپ عێراق نووسرابێ}، سوریا، ئیسرائیل، یەکێتیی سۆڤێت، ئوردن، کوەیت، تورکیا و عەرەبستانی سعودییە ( لەڕاستییدا، نزیکەی هەموو دەوڵەتانی ناوچەکە)، شیمانەی ئەوە هەیە ئەمە دەبێ رابگیردرێ، بۆ ئەوەی دەوڵەتی عێراق لە سایەی سەقامگیرییدا و بۆ بەخێوکردنی رەگوریشەی دێموکراسیی خۆشیی ببینێ. لەنێو دەوڵەتانی ناوچەکەدا، کەمێکیان پێیان خۆش دەبێ عێراقێکی بەهێزو دێموکراسیی هەبێ. بەلاّم بۆ زۆرینەی دەوڵەتانی ناوچەکە، ویستویانەو دەیانەوێ حکومەتی ئایدیال بۆ عێراق، وەک رژێمی سەدامی لە قالّبدراو بەفۆرمێکی لاواز بێ، بەدڵنیاییەوە بەهێز نەبێ، دێموکراسییەکی گەشەکردوو، هاوپەیمانی رۆژئاوا نەبێ. عێراق گەمارۆدراوە بە کۆمەڵێ وڵات (وەک ئەگەر، جگە لەوڵاتی کوەیت)، بەرژەوەندیی جێگیریان هەیە کاتێ ببینن ئەزموونی دێموکراسیی لەعێراقدا شکستی هێناوە.
رێی تێ ناچێ بیر لەوە نەکرێتەوە ئەمانە بەشوێن قورسایی خۆیانەوە نەبن، بۆ ئەوەی کاربکەنە سەر رەوتی رووداوەکان لەعێراقدا. بەدڵنیاییەوە، ئێران، سوریا و عەرەبستانی سعودییە بەسەرکەوتنی ئەمێریکا خۆشحالّ نابن، هەر هیچ نەبێ، دوو دەوڵەتی یەکەم ناتوانن هاوکار بن، چونکە وا بیردەکەنەوە کە نۆرەیان دێت ببنە دەستێ دۆمینەی داهاتوو، عێراقێکی دێموکرات و سەقامگیر، دەستی ئەمێریکا دەکاتەوە بۆ ئەوەی سەرنجی بۆ شوێنی تر بڕوات. ئێران ئەندامێکی سەرەکییە لە " تەوەرەی شەڕ". سوریاش دەبێ بترسێ لەوەی ئەندامەتیی بەڕێوەیە. ئەم دوو دەوڵەتە هەموو جۆرە هاندەرێکیان هەیە بۆ ئەوەی نەهێڵن ئەمێریکا سەرکەوتوو بێ. گومانی تێدانییە ئەمێریکا ئاگاداریی توند دەردەکات دژی دەستتێوەردان لە ناوخۆی عێراقدا- ئەم دەستتێوەردانانە لە فۆرمی بەکارهێنانی هێزی بریکار دەبێ لەکوردستان و باشووری عێراق، وەک هەمیشەش وابووە. لەمەش واوەتر، سەختە، بهێنرێتە پێش چاو، چۆن

میرنشـــینەکانی کەنـــداو ئامبازی دیموکراتیزەکردنی خۆرهەلاتی نـاڤین دەبن بە دەستی رووتەوە.
بەتایبەتیی، بنەماڵـەی دەسـەڵاتداری سـعودییە کـە ماونەتـەوە لەدەسـەڵاتدا بـەرزگاربوونیان لـە هەڕەشـەی ئیسـلامییەکان، بـەهۆی هەریەکـە لـە بەقورگداکردنی پارەو دەستگرتن بە جێکەوتکردنی ئیسلامی سیاسیی و سیستەمی کۆمەلایەتی توندڕۆیانەوە بووە. بەلام ئەمە کـارێکی زۆر قەبـەو سامناکە. ئەگـەر بـەهاکانی لیبراڵـی رۆژئـاوایی بهێنرێنـە نـاو سیسـتەمی سعودییەوە، بەخێرایی لەتری tumbling پێ لێـدەدات .لەبـەر رۆشـنایی ئەمەدا. عەرەبستانی سعودییە هەموو جۆرە پاڵنەرێکی هەیـە. رێگـە نـەدات ئەمێریکا لە عێراقدا سەرکەوتوو بێت. پێدەچێت پێوەندارترین پرسیارێک بـەم باسـەوە، ئـەوەبێ ئایـا خـودی ئـەمێریکا دەیـەوێ دیموکراسـیی بەسەرکەوتن بگـات. ئەمـە بەنـدە بـەوەی چیـی لەئەنجامـدا پەیـدا دەبـێ. لـەرووی مێژوویـیـەوە ئـەو ئایدۆلۆژیانـەی بەسـەرکەوتوویی جیاوازییـە ئێتـنیکیی و تایەفییـەکانی سـمیوە، وەک ئـەنتی ئیمپیریـالیزم، ئـەنتی زایۆنیزم، پانعەرەبیزم، ئیسلام و کۆمـۆنیزم، هیچیـان سـەرنجی ئـەمێریکا راناکێشن. شوێنەکانی تـر (وەک نموونـە، روسـیا، بۆسـنیا و کۆسـۆڤۆ ) بەڵگەی ئەوە نیشان دەدەن، کاتێ خەڵکیی لـە دەسـت و دەوری حـوکمێکی تۆتالیتاریی رزگاریـان دەبێـت، زۆر هەسـتکردنیان ساویلکانەیە و بـەرەو پەرگیریی هێزە سیاسییەکان دەجولێن.
وردکردنەوەی خەڵکی عێراق، پێوەندییە ترادیسـیۆنییەکانی لـە دلسـۆزیی، بۆ ئەو مەودایە بـردووە، خـەڵکیی دەسـتبگرن بـە ئایـدۆلۆژیای پێشـووتر کەوایان لێدەکات بەشـێک بـن لەشـتێکی گـەورەتر. ئەگـەر ئەمـە خـۆی وا دەربڕێ کە بوژاندنەوەیrevitalization ئیسلامیزم یـان ئایـدۆلۆژیای توندڕۆی عەرەبیی بێت، ئەوسا ئەو حیزبە سیاسییانەی بـۆ رەنگدانـەوەی ئەم هێزانە دروست دەبن. تـا داگیرکـاریی هێزەکـانی ئـەمێریکا بـەردەوام بێت، لەگەڵ رۆژئاوادا سۆزدار نابن. ئەگـەر دیموکراسـیی هەنـدێ حیزبـی بەرهەمهێنا کە ئامبازی ئەم ئایدۆلۆژیایانە بن- زۆر سەختە پێشبینیی ئەوە بکرێ کە ئایدۆلۆژیای میانڕەو سـەر دەردەهێنـێ- ئـەو کاتـەش ئـەمێریکا دەبێ بڕیار بدات، بە ئا یان بـە نـا. مـل-دەدات abide بەبەرهـەمی ئـەم پرۆسێسـە، ئایـا ئـەمێریکا حکومـەتی هـەڵبژێردراوی پانعـەرەبیی، ئـەنتی

زایـــۆنیی دەپـــەژرێنـــێ؟ ئەمـــەش پێـــدەچێ شکســـتی ســـەراپای ئامانجەکان بێت. ئەو بەرەنجامەی زۆر ئەگەری هەیە، ئـەمێریکا لەپشتی پەردەوە خۆی تێهەڵقورتێنێ بۆ زامنکردنـی ئەنجامـەکانی هـەڵبژاردنێکی " گونجاو". بەڵام هەرچەندە ئەمێریکا خۆی بەرەو ئەم کاروکردەوانە مەڵاس بدات، کە کەمتر لە حکومەتێکی رەسەنی "عێراقیی" دەچێت، ئەوسا پتـر لـە ســەپاندنێکی کۆلۆنیالیانـــە دەچێـــت. بریتانییـــەکان پێشـــتر ئەمـــەیان کردووە.[307]

## رێگە چارەی 3: رژێمی بووکەشووشە

رێگەچارەی سێ، لە زۆر رووەوە رێگەچارەیەکی کەموکورە. بەپانتاییەکەی، ئـــەم رێگەچارەیـــە، هـــەڵبژاردنی بووکەشووشـــەیەکی عێراقییـــە بـــە "دەموچاوێکی" عێراقییەوە بۆ داگیرکاریی سەربازیی ئەمێریکا. رۆڵـی ئـەم بووکەشووشەیە رازییکردنی خەڵکی عێراقە بۆ ئەوەی هاوکاریی هێزەکانی ئەمێریکا بکەن. گوایە ئـەمێریکا دۆستی خـەڵکی عێراقـە، نـەک دوژمـن. بەشێوەیەکی گشتییش، بۆ کاڵکردنەوەی باڵادەستیی گشـتیی ئەمێریکایـە. پاش تێپەربوونی دوو ساڵ بەسەر حـوکمی راسـتەوخۆی ئـەمێریکادا، لـەو ماوەیەی هەندێ ژێرخانی عێراق بنیاتنرایەوە. هێزە چەکدارەکان و پۆلیس لـە بەعسـییەکان پاککرایـەوەو سـەرلەنوێ دارێژرانـەوە. نـەوتی عێـراق بەگەرخرایەوە. ئیتر حـوکمی راسـتەوخۆی ئـەمێریکا تـەواو دەبـێ و بـە" دەموچاوە" هەڵبژێردراوەکە." جێگەی دەگیرێتەوە. هەندێ فۆرم لـە پرۆڤـەی دیمۆکراتییدا ( بۆی هەیە بە وریاییەوە کۆنترۆڵ بکرێ ) نمـایش دەکـرێ. بووکەشووشەش بە زۆرینەیەکی رەهاوە هەڵدەبژێردرێ بۆ ئـەوەی ئـەرکی بـەرێوەبردن لەئەسـتۆ بگـرێ. بـەڵێن دەدا کـە پابەنـدی نۆرمگـەلێکی دیمـۆکراتیی بـێ، بـۆ پێکهێنـانی دەسـتوورێکی نـوێ بـۆ حکومـەتی دیمـۆکراتیی عێـراق، لـە پێنـاوی سـەرجەم چـین و توێژەکـانی عێراقـدا کاربکات.

لـە پشـتی پـەردەوە، رژێمـی بووکەشووشـە زۆر بەخەسـتیی پشـت بـە ئـەمێریکا دەبەسـتێت. هـەروەها ئـەمێریکا لەسـەر ئاراسـتەی کارنامـەکان، خـاوەن قسـەی دوایـی دەبێـت. ئـەمێریکا دەسـت بەچەنـد بنکەیـەکی سەربازییەوە لە عێراقدا دەگرێ، بـۆ ئـەوەی پۆلیسـیی{ کەڵـەگایی} بەسـەر

ناوچەکەدا بکات. هەروەها بۆ ئەوەی دڵنیابێت لە "سەقامگیریی" رژێمی نوێ لەساتە سەخت و دژوارەکاندا. سێناریۆیەکی لەم چەشنە دەکرێ. چ بەدیزاینگ design یان بە رێکەوت. گەشە بکات. وەک دیزاینگ ئاماژە بەوە دەکات. " شەپۆلی گەورەی دیموکراسیی". کە ئەمێریکا بەڵێنی دابوو عێراقی تێدا نغرۆ بکات. لەوێشەوە رۆژهەڵاتی ناڤین. دروێەکی شاخداری دروستکراو بوو.

بە نیشاندانی ئەوەی شەڕ رەوگەی یەکەمە لە شالاوەکەدا بۆ ئازادکردنی گەلێکی چەوساوە لە رۆژهەلاتی ناڤیندا. ئیدارەی بوش مەبەستی پەیداکردنی لایەنگریی بوو بۆ شەڕ لەتەواوی چین و توێژەکانی خەڵک ( خەڵکی عێراق. رای گشتی ئەمێریکا و رای جیهانیی). بەلام ئامانج هەرگیز دیمۆکراتیزەکردنی عێراق نەبوو. ئامانج هەمیشە چاندنی سەرکردەیەکی گوێ لەمست بوو لە دڵی جیهانی عەرەبییدا. ئەم سەرکردە ئایدیالە زۆر جیاوازیی نابێ لەسەدام حوسێن( بۆ نموونە زۆردار بێ. تا بتوانێ یەکپارچەیی خاکی عێراق بپارێزێ و سێکیولاریش بێت ). بەلام پێویستە لەسەری زۆر دۆستانەتر بێت. گەرەنتیی لەسەر هەناردنی نەوت بۆ رۆژئاوا بدات. هێزەکانی ئەمێریکا دەتوانن عەرەبستانی سعودییە جێبهێڵن بەچارەنووسی خۆیەوە. عێراق بۆ ئەمێریکاش بنکەیەکی ئۆپەراسیۆنی ژیاریی و ستراتیژیی دەبێ بۆ پۆلیسییکردن ( یان بۆ بەسەرداداندا) بەسەر ئەو رژێمانەی گرفت دروست دەکەن ( ئێران و سوریا ) .

رێی تێدەچێ ئەم سێناریۆیە. ئەوە هەڵبداتەوە. دیمۆکراتیزەکردنی عێراق ئامانجی سەرەکیی بووە. پاش ماوەیەکی کورت لە مانگی هەنگوینیی. کە شاگەشکەی ئازادیی. ئۆپەراسیۆنەکە دڵنیا دەکاتەوە. راستییش وەک شۆکێک بەدەردەکەوێ. عێراق- جێگەی شانازیی جیهانی عەرەب و جێگەی پیرۆزترین ئارامگای ئیسلامیی شیعەکان- ئێستا بەتەواویی لەژێر دەسەلاتێکی بێگانەدایە. خراپتریش لەمە. لەلایەن تەوەرەی قێزەونی ئەمێریکاییەکان- زایۆینستەکانەوە خراوەتە ژێر رکێفەوە. رابەرە مەزهەبییە ناودارەکان لە ئارامگای شارەکانی باشوورەوە. کە پاڵپشتیان نزیکەی نیو میلیۆن ئاوارەیە لەئێران. بەدەنگی بەرز لە دژی داگیرکاریی شوێنە پیرۆزەکان و کافرە داگیرکارەکاندا وەستاونەتەوە. " وەزارەتی

کاروبـاری ئـاییینی " کـە تازە دامەزراوەو لەلایـەن ئـەمێریکاوە بـەڕێوە دەبرێ. هـەوڵی کپکردنـی ئۆپۆزیسـیۆن دەدا. [308] بێزاریـی زیـاد دەکـات ولەلایەن گرووپە ڕێکخراوەکانی شیعە وەک ئەلدەعوەو ئەنجومـەنی بـاڵای شۆڕشی ئیسلامییەوە لە عێـراق. سـووتەمەنیی بەسـەردا دەکـرێ. هـەروەها لەلایەن ئێرانەوە بەجیا کۆمەک دەکرێن.

بێزاریـی دەروازە بـۆ تێـرۆر دەکاتـەوە. هێـزە داگیرکارەکـان بوونەتـە نیشـانەی کەمپـەیینی مەرگچێنـە خۆکوژەکـان. ئـەو شـەپۆلە بەردەوامـەی تابووتەکان کە دەگەڕێتەوە بۆ واشینگتۆن. ڕای گشتیی ئـەمێریکای لـەدژی شـەڕ وەرچەرخانـدووە. ئـەمێریکا زۆر نائومێدانـە ڕێگەیـەکی دەوێ. بـۆ کێشـانەوەی هێزەکـانی لـەعێراق بـێ ئـەوەی ئـابڕووی بچـێ. حکومەتـە کارتۆنییەکە خراپترین ڕێگەچارە پێشکەش دەکات. لەڕاستییدا ئەمە تـەنێ دانەیەکە لەنێو کۆمەڵێ سێناریۆدا کـە ئەگـەری جێبـەجێ بوونیـان هەیـە و ئەمێریکا هەڵسێ بە کشانەوەی لەپڕ. بەبێ ئـەوەی عێراقێکـی دیمـۆکراتیی بەجێ بهێڵێ. بێگومان ئەگەری سێناریۆی زۆر ڕەشبینتریش هەن کە ڕێیان تێ دەچێ روو بدەن. تەنانەت ئەگەر داگیرکاریی ئەمێریکا لـەلای خـەڵکیی ئاسایی عێراق. بە بەرینیی جێـی پەژرانـدن بێت. هێشـتا ئەگـەری چەنـد گرووپێک هەیە کە بەرهەڵستکاریی بکەن. لەوانە ئیسـلامییە تونـدڕۆکان و بگرە تا بە یەکە یاخییەکانی فیداییەکانی سەدامیش دەگات.

ئەگـەری ڕوودانـی کێشـەی تونـد لـە نێـوان ئێسـنیکەکان ( یـان نێـوان هۆزەکان) لە عێراقی پۆست سەدامدا بـەرزە. بەتایبـەتیی شـاری کـەرکوک بـۆمبێکی کاتییـەو چـاوەڕێی گرگـرتن دەکـات{ ڕاپۆرتەکـەی بەیکـەر- هامیلتۆن. سـەبارەت بەکـەرکوک لێـرەوە سـەرچاوەی گرتـووە-وەرگێـڕ}. نزیکەی 300000 کورد لـە کامـپ و گەڕەکـە هەژارنشـینەکاندا. بۆسـەر مـاڵی خۆیـان لـە کـەرکوک چـاوەڕێی گەڕانـەوەن. خـانووی ئەمانـە لـە هەنووکـەدا لەلایـەن ئێسـنیکی عەرەبەکانـەوە داگیرکـراوە. لەئـەنجامی سیاسەتێکی داڕێژراوی" تـەعریب" سـەدامەوە. تورکـەکانیش چاوەڕوانیی ئـەوە دەکـەن. ئەگـەر دانیشـتوانی بـەژمارە زۆری تورکمـان هەڕەشـەیان لێبکرێ. بە هێزی سەربازییەوە خۆیانی تێهەڵدەقورتێنن. ئەگەری ناکۆتا بۆ توندوتیژیی ناوخۆیی کە لابردنی ڕژێمی سەدام دەروازەی بـۆ کردەوەکـە لەلایەن هێزەکانی ئەمێریکاوە پێویستیی بە کۆنترۆڵکردن هەیە.

پرسیار ئەوە نییە ئایا هێزەکانی ئەمێریکا دەتوانن ئەم فەنکشنە جێبەجێ بکەن ( بێگومان دەتوانن). بەڵکووو تاکەی رای گشتیی ئەمێریکا ئامادەیی هەیە بۆ لەدەستدانی گیانی ئەمێریکاییەکان و بۆ بەدەستهێنانی ئاشتیی لەعێراقدا. بەدڵنیاییەوە لە ژێر باشترین سێناریۆدا. گۆڕینی رژێم. مزگێنیی بۆ ماوەیەک لە ئارامیی و سەقامگیریی دەبەخشێ کە بتوانرێ سیستەمێکی دیمۆکراتیی فەنکشنی تێدا بکات و جێبکرێت. بۆی هەیە ئەمە رووبدات. بەڵام ئەگەر نەبوو. دەبێ پێشبینی ئەوە بکەین کە زمانی ئیدارەی بوش زۆر زیرەکانە دەگۆڕێ. وشەی "دیمۆکراسیی" لە دیسکۆرسی فەرمیی دەردەکرێ exorcise ؛ وشەی "سەقامگیریی" بەتوندیی جێگەی دەگرێتەوە. رۆڵی ئەمێریکا لە ئازادکردنی عێراقدا دەکەوێتە قەیرانەوە- رۆڵیشی لە بنیاتنانی دیمۆکراسییدا کاڵ دەبێتەوە. پێمان رادەگەیەنن. خەڵکی عێراق پێویستە بۆ خۆیان دیمۆکراسیی رۆبنێن. بەڵام ئەو رژێمەی لەو جێگەیەدا دادەنرێ. لەباشترید دۆخدا، بەکەمترین ئاست دیمۆکراتیی دەبێ. هەروەها ئاسۆکانی دروستبوونی سیستەمێکی سەقامگیر و دیمۆکراتیی لە عێراق.
لەناوەڕۆکدا سفر دەبێت.

## لایەنە باشەکانی رێگەچارەی 3

رێگەچارەی 3 بە بێ پەرچەکردار نابێت. نەک هەر ئەوەی هێزەکانی ئەمێریکا لادەبات لەشوێنێکی زۆر پڕمەترسییداو لەکاتێکی کورتخایەندا، بەڵکوو رێگە بە ئەمێریکا دەدات. کە خۆی دوور بگرێ لەو تۆمەتەی کە روانینی خۆی سەبارەت بە حکومەت لەسەر خەڵکی عێراق دەسەپێنێ. بەرپرسیارییەتیی بۆ جێکردنی دیمۆکراسیی دەخرێتە سەر شانی خەڵکی عێراق. لەهەمانکاتدا ( پێ دەچێ ) ئەمێریکا ئەوە زامن بکات. کە نفوزی بەسەر رژێمی نوێوە دەمێنێ. تەنانەت کاتێ هێزەکانی ئەمێریکا لەسەر شانۆش نەمێنن. هەروەها رژێمی بووکەشووشە. لە ئەمێریکا خۆش دەبێ. سەبارەت بە بەرپرسیارییەتیی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەندێ مەسەلەی

سەخت و دژواردا. کە بۆی هەیـــە بتەقنـــەوە- وەک ئـــەوەی چـــۆن دەسەلاتێکی هاوسەنگ و پەژرێنراو دروست دەکرێ. لەناو حکومەتی نوێدا کـە سـوننەو شـیعەو کـورد لـەخۆبگرێ. هـەروەها چـۆن سـازان لـەنێوان کێشمەکێشەکاندا دەکرێ. ئەوانـەی داوای حکومـەتێکی سـێنترالّیی بـەهێز دەکەن و ئەوانەی ناسێنترالّیی سیستەمی سیاسیی دەخـوازن. بـەکورتیی، ئەمێریکا زۆر بەسادەیی خۆی دەکشێنێتەوە لەو گرفتانەی گـرێ کوێرەیـان هەیە و دووچاری چێکردنی دیمۆکراسیی لەعێراقدا دەبنەوە. بەرپرسـیاریی بۆ چارەسەرکردنی ئەمانە، دەدرێ بە رژێمـی عێـراق. سـەرەڕای ئـەوەش، رژێمێکی لەم چەشنە بەلای حکومەتێکی سێنترالّی بـەهێزدا وەردەچـەرخێ. ئەمە زامنی سەقامگیریی دەکات( لای کـەم بەشـێوەیەکی کـاتیی). هـەروەها پاسەوانی یەکێتیی خاکی عێراقیش دەکـات. تەنانـەت ئەگـەر بەدڵنیاییـەوە دیمۆکراتییش نـەبێ. رژێمـی دانـراو، بـۆ خـەڵکی عێـراق پێشـکەوتنێکی بەرچاوە. هەر رژێمێکی بووکەشووشە بەدیارییکراویی، لەرووی مۆراڵییەوە لە رژێمی سەدام پەسەندتر دەبێ. ناکرێ پێچەوانەی ئەوە نەبێ.

## لایەنە خراپەکانی رێگەچارەی 3

وێڕای ئـەوەی لـە سەرنجڕاکێشـیی رێگـەچارەی 3 دا دەردەکـەوێ، بـەڵام زیانێکی قورس لە بەرژەوەندییەکانی ئەمێریکا دەدات. هـەروەها بەهـەموو ئەگەرەکانەوە بۆ عێراق بە کارەسـات کۆتـایی دێـت . سـەرەڕای مسـۆگەر رووداني ئـەو پڕوپاگەندانـە، پێچەوانەکەیشـی هەیـە. رێگـەچارەی سـێ وا دەخوێنرێتەوە کە ئەمێریکا بۆ هێنانی دیمۆکراسیی بۆ عێراق، پاشەکشە لە بەڵێنـەکانی دەکـات. کۆمیـونیتیی نێونەتـەوەیی خـاوەن گومـانی قـووڵ، خراپترین گومانیان دێتە دی. حوکمدان لەسەر جەنگی ئەمێریکا- بریتانیـا بەشێوەیەکی کۆنەپەرستانە دەبێ. کە شـەڕێکی دەسـترێژکارانە بـووە دژی دەوڵەتێکی جیهانی سێ لەخوتوخۆڕایی، بۆ بەرژەوەندی تەسـکی خۆیـان. پڕوپاگەندەکانی سەرۆک بوش کە " ژیـانی عێراقییـەکان و سەربەسـتییان جێی بایاخمانە" و بەڵێنەکانی بە" ئومێدو پێشکەوتن بـۆ ژیـانی میلیۆنـان عێراقیـی"[309] ، وەک فێڵێکـی زۆرزانانـە، گۆڕەوشـار دەنـرێ. ناوبـانگی

ئەمێریکا پێشتر بەخراپیی کەوتووەتە ژێر پرسیارەوە بەهۆی هەوڵە دیپلۆماسییە شکستخواردووەکانی لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا UN. ئێستاش لەژێر تاقیکردنەوەدایە لە عێراقدا. ئەگەر ئەمێریکا بەڵێنەکانی خۆی بەجێ نەهێنێ، لە دابینکردنی دیمۆکراسیی بۆ عێراق، کەواتە سەخت دەبێت، هیچ شتێکی تر ببینرێ، جگە لەزیادبوونی هەرچی زۆرتری هەستی ئەنتی ئەمێریکایی لە ئاستی جیهانییدا. لێرەدا، ئەو ئایدیایەی کە ئەمێریکا بەکردەوە دەتوانێ دڵ و هۆشی جیهانی عەرەب رابکێشێت، بەتەواویی بەبادا دەچێ. پێش دەستپێکردنی شەڕ زۆربەی شارەزایان پێشتر پێشبینییان کردبوو، کە بەکارهێنانی هێز دژی دەوڵەتێکی عەرەبیی موسڵمان، لەجەرگەی رۆژهەڵاتی ناڤیندا، تەواوی نەوەی گەنجانی عەرەب بەرەو پەڕگیریی دەرەتێنێ، لە کورتماوەدا. ئەمەش بێئەملاولا زیان بە ئەمێریکا دەگەیەنێت، لە شەڕی دژ بە تیرۆری جیهانییدا.
هەمیشە ئەگەرێکی زۆر دوور هەیە، بەدڵنیاییەوە، کە عێراقییەک لەسە هاوشێوەی نێلسن ماندێلا، وەک قەقنەس phoenix لەخۆڵەمێشەوە پەیدا ببێت و بیماری ئەو زامانە بکات کە کۆمەڵگەی پێوە ئالوودە بووە، سەرکردایەتی مارشی سەرکەوتنی عێراقییەکان بەرەو سەرکەوتن بکات. چانسەکان زۆر کەمن. بەهەرحاڵ، تەنانەت ئەگەر ئەمێریکاش خۆی لەبەرپرسیارییەتی دیموکراتیزەکردنی عێراق بدزێتەوە، فۆرمێک لە ستراکتۆری سەرکردایەتیی لەشوێنیدا بەجێبهێڵێت، بەڵام بەهیچ شێوەیەک روون نییە، ئەمە لەکوێوە دێت. ئەنجوومەنی حوکمی عێراق، ستراکتۆری هەیە، نوێنەرایەتیی گرووپ و باڵەجیاوازەکان لە عێراقدا بەبەرینیی دەکات. لای کەم بەسەرزارەکیی یەککرتوون لەدەوری پێداویستیی بوونی عێراقێکی دیمۆکراتیی فیدراڵ. بەڵام ئەم ئەنجوومە نیشانی دا، کە خۆبەخۆ زۆر بیروبۆچوونی جیاوازییان هەیە. رێککەوتنی سەرزاریی لە سەر بەکارهێنانی وشەگەلێکی وەک" دیمۆکراسیی" و "فیدراڵیزم"، ماسک دەخەنە سەر راستییەکی سەرەکیی، کە گرووپی جۆراوجۆر لەئەنجوومەنی حوکمدا، ئەم تێرمانە بە شێوازی رادیکاڵانەی جیاواز لێکدەدەنەوە. ئەگەر ئەنجوومەنی حوکمی عێراق نەتوانێ لەسەر رێککەوتنێکی واتادار لەسەر ئایندەی عێراق، لە هۆتێلی پێنج ئەستێرەیی ئاسایش پارێزراوی ناو

لەندەندا نزیک ببنەوە. پێ ناچێ گەیشتن بە ڕێککەوتن ئاسان بێت لەهەلومەرجی شێپرەوی بەغدادا.
سەبارەت بەو تاکانەی کە دەتوانن خزمەتی ئەوە بکەن و ببن بە "دەموچاو" ی پەژرێنراو بۆ داگیرکاریی ئەمێریکا. بە سادەیی کەسی هەڵسوڕاو نییە. تاکێک لەلایەن سونییەکان، شیعەکان و کوردەکانەوە بێتە پەژراندن. ئەحمەد چەلەبیی سەرۆکی INC لەڕووی دیمۆگرافییەوە بۆ ئەم لیستە دەبێت. بەڵام بەکردەوە لەناو عێراقدا نەناسراوە. ئەفسەری ناوداری سوپای پێشووی عێراق بۆی هەیە هەندێ خاڵی باشی تێدابێ. سوپای عێراق تا هەڵوەشاندنەوەکەی وەک بەڕێزترین ئینستیتیوشن لەچاوی خەڵکی ئاسایی عێراقدا مابووەوە. یەکێکە لە ئینستیتیوشنانەی لەڕووی مێژووییەوە خزمەتی بەیەکپارچەیی خاکی عێراق کردووە تا بە دابەشبوونی کۆمەڵگە دەگات.
سەرکردەیەکی لەم چەشنە بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەبێ عەرەبێکی سوننە بێ، لەبەرئەوەی ئەفسەری پلەداری بەرز لەناو شیعەکاندا کەمە. هەروەها لەبەرئەوەی ئەفسەرانی زۆروزەبەندی عەرەبی سوننە. سەرکردایەتیی شیعە ناپەژرێنن. ئەوەش روون نییە کە چۆن ئەو ئەفسەرانەی سوپا. کە خۆبەدەستەدانیان هەڵبژارد بەرامبەر هێزی هاوپەیمانان. تا ئەوەی بجەنگن( وا دەهێنرێتە پێش چاو. ئەوانەی شەڕیان هەڵبژارد. کۆتاییان پێ هاتووە لە هەر خۆپالاوتنێک بۆ پۆستی سەرکردایەتیی) لەلایەن عێراقییەکانەوە حوکم بەسەریاندا دەدرێ. بۆی هەیە وا سەیریان بکرێ کە ترسنۆک و خۆفرۆشن لەهەمبەر دەوڵەتی عێراقدا. یان وەک پاڵەوان کە بەرگرییان نەکرد لە ڕژێمێکی دڕندەو ستەمکار. لەهەردوو بارا، ئەگەر ئەمێریکا عێراق بەجێبهێڵێ و بیخاتە دەست سەرکردەی سەربازییەوە. گران لەسەری دەکەوێ. بەتایبەت ئەگەر ئەم قەوانە بە سەرکەوتنی دیمۆکراسیی بفرۆشێ.
لەپشت وردەکاریی ئەوەی سەرکردایەتی ڕژێمێکی بووکەشووشە دەکات، مەسەلەی زۆر بایەخدارتر دەرگیری چارەنووسی ئەم ڕژێمە دەبێتەوە لەکاتی تەواوبوونی داگیرکاریی ئەمێریکادا. لەگەڵ زۆر پرسیاری سەخت کە رووبەڕووی ڕێککەوتنی دەسەلات دابەشکردن دەبێتەوە، دابەشکردنی دەسەلات بە ئومێدی چارەیەک دەمێنێتەوە. هەروەها هیچ

بناغەیەک بۆ دیمۆکراسیی لەئارادا نییە. لەڕاستییدا تەنها دوو ڕێگەی بەرەنجام هەیە. یەکەمیان، خەبات بۆ دەسەڵات لەنێو گرووپە جیاوازەکانی عێراقدا، ببێتە هۆی یاساشکێنییەکی سەرتاسەریی، وێڕای ئەگەری شەڕی ناوخۆیش. دووەم، ڕژێمی عێراق، وەک هەر ڕژێمێکی تری عێراقی پێشوو خێرا تێگەیشت، کە دەسەڵاتێکی زۆردار و بەکارهێنانی هێز، دوو تۆخمی سەرەکیین بۆ حکومەتێکی سەقامگیر لەعێراقدا. ئەمێریکا بۆ دەستگرتن بە ڕژێمەوە لەدوورەوە یارمەتیی دەدات.

لەبەرامبەریشدا عێراق دەبێتە دەوڵەتێکی گوێ لەمستی ئەمێریکا . بگەڕێینەوە بۆ پاشەڕۆژی دەوڵەتی عێراق، ئەگەری سێیەم بەرەنجام- ئەوەیە کە ڕژێم خۆی تەرخان بکات لە دوور مەودادا دیمۆکراسیی بچێنێ- تا ئەوپەڕی رادەش سەرکەوتوو بێت- ئەمەش بەرەنجامێکی گونجاوە. وەک هەمیشە لەعێراقدا وابووە. ئەو بۆچوونەی کە عێراق دەتوانێ ڕێگەی خۆی بەرەو دیمۆکراسیی بدۆزێتەوە،80 ساڵە لەمێژووی عێراقدا بەبادا دەدرێ. ئەم بۆچوونە پێیوایە ڕۆنانی ئەو خشتە سەرەکییانەی بۆ سیستەمێکی دیمۆکراسیی سەقامگیر پێویستە، پێشتر شوێنی خۆیان لەعێراقدا گرتووە، کاتێ ئازادکرا لەژێر نێزەی ڕژێمێکی چەوسێنەردا. دیموکراسی بەدەردەکەوێ وەک دەوڵەتێکی سروشتیی بۆ خەڵکی عێراق. ئەمە فانتەسییە{ فەنتازیایە}. دیمۆکراسیی خۆبەخۆ پەیدا نابێ و بەدڵنیاییشەوە لەشەو و ڕۆژێکدا نا.

## ئەنجامگیریی: بیرکردنەوە لە ئۆڵتێرنەتیڤەکان

لە هەنووکەدا، ئەمێریکا دووچاری هەلومەرجێکی سەخت بووەتەوە. بەڵێنی دا دیمۆکراسیی بۆ عێراق بهێنێ، لەوێشەوە، بۆ سەرتاپای ڕۆژهەلاتی ناڤین. ئەمێریکا خۆی وەک هێزێکی داگیرکار دەبینێتەوە، کەپەرۆش نییە بۆ داگیرکارییەکی سەربازیی درێژخایەن، بەدڵنیاییەوە پێویستە بۆ ئەوەی ئەمێریکا بەڵێنەکانی خۆی بەجێ بگەیەنێت، ڕێگەچارەیەک هەڵبژێرێ. لەو سێ ڕێگەچارەیەی پێشتر باسکران، ڕێگەچارەی یەکەم نزیکترە لەوەی کە ئەمێریکا پێش بەرپاکردنی جەنگ بیری لێدەکردەوە؛ ڕێگەچارەی دووەم، ئەوەبوو، دەبووایە دیموکراسیی وەک چانسێک بۆ ڕزگارکردنی عێراق بدرایە، بەڵام ئەمەیان پێ ناچێ چ لەلایەن ئەمێریکا و چ لەلایەن خەڵکی

عێراقەوە بێتە پەژراندن: ڕێگە چارەی سێیەمیش زۆرتر ڕێگەی تێدەچێت کە بەدی بێت. ڕێگریی ئەوەیە. ڕێگەچارەی گونجاو بۆ عێراقێکی دیموکرات و سەقامگیر، لەڕووی سیاسییەوە مایەی پەژراندن نییە. لەکاتێکدا دوو چارەسەرییەکەی تر ڕەنگە کەرتوپەرتبوونێکی توندوتیژانەی عێراقی لێبکەوێتەوە. ئەمێریکا لە پرۆسێسی هەڵوەشاندنەوەی پاشماوەی ئینستیتیوتەکانی دەوڵەتی عێراقدایە. ئەگەر کار وا بڕوات. مەترسیی لەسەر تواندنەوەی ئەو" گلوو" ە دروست دەکات، کە بۆ هەشتا ساڵ دەوڵەتی پێکەوە نووساندبوو. لەم خاڵەوە. حیکمەتی تێدایە. ئەگەر بیر لە ئۆڵتێرنەتیڤێکی تر بکەینەوە.

## ڕێگەچارەی 4: دابەشکردنی عێراق بەبەرنامە

ڕێگەچارەیەک، کە بەدوای دابەشبوونی دەوڵەتی عێراقدا دێت. وەک ئەگەرێک نەخراوەتە ناو دیبەیتەوە. تا چەند ئەم ڕێگەچارەیە شت لەخۆ دەگرێ. لەشێوەی فۆرمگەلێکی بەڵێنکارییدا بوو کە ئەمێریکا دەست بە یەککگرتوویی خاکی عێراقەوە دەگرێ. ئەو بەڵێنە بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە درا کە تورکەکان دڵنیا بکاتەوە. لەوەی کوردستانی سەربەخۆ لەئەنجامی کێشەکەدا نایاتە دی. لەبەرامبەریشدا. تورکەکان دەبووایە ڕێگەیان بە ئەمێریکا بدایە بەرەی باکوور لە خاکی ئەوانەوە بکاتەوە. لە کۆتاییدا. تورکەکان سەبارەت بە خۆیان ئەو مامەڵەیان ڕەتکردەوە. وەک چارەیەک، بەبەرنامە دابەشکردنی عێراق. بەدوور لەئایدیالەوە. باشترە لە هەر ڕێگەچارەیەکی تر. لەهەنووکەدا لەژێر وردبوونەوەدا بێت.
ئەمەچۆن ڕوو دەدات؟ دیارترین ئەو نارەزایەتییانەی لەسەر دابەشبوونی عێراقە. ئەوەیە کە پێیانوایە چارەسەرییەکی سەپێنراو دەبێ. جارێکیتر، دەسەلاتی ئیمپیریالیستیی رۆژئاوا نەخشەی رۆژهەلاتی ناڤین. بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ستراتیژیی و ئابوورییەکانی خۆی، دادەڕێژێتەوە. ئەمە ڕەتکردنەوەیەکی گرنگە. لەبەرئەوەی ئەگەر بەڕاستیی دابەشکردنی عێراق دانرا. یەکلایەنە لەلایەن ئەمێریکاوە سەپێنرا. زۆر سەخت دەبێت. ئایا ئەم سنوورانە لەلایەن خەڵکانی ناوچەکە لەبەرچاو دەگیردرێن. ئەمەش چارەسەرییەکی فشۆڵە. چاوبەستنەکە لەوەدا نییە کە ئەم چارەسەرییە

بسەپێنرێ، بەڵكوو لە پێشكەشكردنی هەلێكدایە بۆ خودی عێراقییەكان، كە بڕیار لەسەر مەسەلەكە بدەن.
هێڵە سەرەكییەكانی ئەمە پێشوەخت جێی خۆی گرتووە. پلانی پێنتاگۆن بۆ دابەشكردنی عێراق بۆ سێ بەش، باكوور، نێوەڕاست و باشوور ئەوەیە كە چۆن پرۆسێسەكە دەستپێدەكات. چێكردنی سێ قەوارەی ئۆتۆنۆمیی لەژێر چاودێریی یەك دەوڵەتی دەستوپێ بەستراودا. ئەم قەوارانە دەبێ لەلایەن ئەو ستراكتۆرەری كە هەبووە و پێی لەسەر زەوییە بەڕێوە بچن. لەكەیسی باشووردا، واتای حوكمڕانییكردنی لەلایەن سەرۆك خێڵەكان، سەركردە ئایینییەكان و ڕێكخراوە ئیسلامییەكان لەچەشنی گرووپی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی و ئەلدەعوە. ئەگەری ئەمجۆرە لەفۆرمی دیمۆكراسیی لاوازە، بەڵام ئەوە زۆر گرنگ نییە. مەبەست ئەوە نابێ كە دامودەزگای دیمۆكراسیی بەسەر هیچ قەوارەیەكدا بسەپێنرێ، بەڵكوو ڕێگە بەهەر قەوارەیەك بدرێ، حوكمڕانیی خۆی بەپێی بەرژەوەندییەكانی بكات.
بەڕوونیی، لە كەیسی كوردستانی عێراقدا، حوكمڕانیی لەڕێی هەردوو لایەنە كوردییەكە ( یەكێتیی و پارتیی )، لەگەڵ كۆمیونیتیی توركمان و ئاشوورییەكاندا دەبێ. لەپراكتیكدا، ئیدارەی كوردستانی عێراق بەردەوام دەبێ هەروەك لە دەیەی پێشوودا هەبووە، یان شتێكی لەو چەشنە. بەواتایەكی تر، نزیكترین شت لە فەنكشنی دیموكراسییەوە ( هەرچەندە كێماسییدارە) لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا، دووچاری ئاڵوگۆڕ نابێ. ئامانجی بەڕێوەبردنی سێ ئیدارەی جیاواز، لەجیاتی یەك ئیدارەیی، دەقاودەق بۆ دووركەوتنەوە لە شێوازەكەی MacArthur بوو. ئەمێریكا وەك هێزێكی خۆتێهەڵقورتێن، كە لەپشت كورسی دەسەڵاتەوە دەبێ، زۆر گرنگە لە ڕۆڵی ملهوڕانەی كەمبكرێتەوە. ئیدارەی بەڕێوەبردنی دوای شەڕی عێراق، پێویستە گەشە بە دەسەڵاتی بدات، بەدوور لەدەستتێوەردانی سێنتەر بەپێی توانا. حوكمڕانیی عێراق زۆر ئاسانتر بەسێ بەش بەڕێوە دەبرێ، كەمتر چەوساندنەوەی تێدا دەبێ وەك لەوەی یەك قەوارەیی بێت.
كاتێك بارودۆخەكە دەڕەخسێ، هەر قەوارەیەك بڕیاری خۆی دەدا لە شتە چارەنووسسازەكاندا، نۆژەنكردنەوەو پێكەوەنانی پێوەندیی ئابووریی لەگەڵ نەتەوەكانی دەوروبەریاندا، دوو هاوپشكی سروشتیی لە باكوورەوە،

ئێــــران و تورکیـــــا. لـــــه نێوەڕاســـــتەوە ســــوریا و ئـــــوردن. لــــه باشووریشەوە دەوڵەتە میرنشینەکانی کەنداو. شیمانەی ئـەوە بکـەین کـە دانوسان لەسەر فۆرمێک دەکرێ بۆ دابەشکردنێکی یەکسان لـە بەروبوومـە نەوتییەکاندا ( وەک لە پرۆگرامی نەوت بەرامبەر خۆراکی کە UN بەڕێوەی دەبرد ). کەناڵـە سـەرەکییەکانی هـەناردەی نـەوتی عێـراق بەشـێوەیەکی سروشتیی بۆ سێ بەش دابەش دەکـرێن. لەچاڵـە نەوتـەکانی بـاکوورەوە. بۆڕییە نەوتەکان بۆ تورکیا درێژ دەبنەوە؛ لـە کێڵگـەکانی کەرکوکـەوە بـۆ باشووری رۆژئاوا. هەرچەندە بۆڕییـەکان بـەرەو سـوریا ( لـە هەنووکـەدا داخراون). لە کێڵگەکانی نەوتی باشوورەوە. رێگەی سەرەکیی بە کەنـداودا دەڕوات. ئامـانج. چێکردنـی پێوەنـدیی ئـابووریی سـەربەخۆیە لـە نێـوان هەرسێ قەوارەو وڵاتانی تردا. بۆ دوورکەوتنەوە لە قۆرغکردنی بڕیـاردان لـە ئیـدارەی نێوەنـد. بـەڵام ئەمـە کـاتیی دەبـێ. رێگـە بـە بنیاتنانـەوە و رێکخســـتن دەدات. بـــەبێ رووبەڕووبوونـــەوە و گرفـت لەگـەڵ دوایـین چوارچێوەیەک کە حکومەتی نێوەندیی بڕیاری لەسەر دەدات.
حوکمڕانییکردنی عێراق ئەوەی ناوێ. وەک شتێکی پیرۆز راسـتەوخۆ بـە کۆمەڵێ پرێسنیپی دەستورییەوە گەمارۆ بدرێ. حکومەت دەکرێ لە ئاسـتی هەرێمەکاندا رێکبخرێ. حکومـەتێکی مـڵ و هەسـتیار بێـت بـۆ جیـاوازیی ســـتراکتۆرە کۆمەڵایەتییـــەکان پێـــی لەســـەر زەویـــی بێـــت. فۆرمێـــک لەحکومـــەتێکی لاواز و دەســـتەپاچەی سـێنترالّیی. وەک چـــەترێک بـــۆ هـــەمووان. ئەمــە دەکــرێ بەئەنقەســت بێدەســەڵات بکــرێ و بــدرێ بــە کۆمیونیتیی عێراقییەکانی تاراوگە. یان لەڕووی دەستورییەوە ئەنـدازیاریی لــە ئاکــامی بنبەســـتە ئابوورییەکانــدا بکــات. وەک کۆپییــەکی تــەواوی دەستووری بۆسنیا.
سـەبارەت بـە هێـزی ئاسـاییش. کوردەکـان پێشـمەرگە هەڵناوەشـێننەوە. بەمپێیە هەر قەوارەیەک پێویستە رێگەی پێبدرێ. هێزی ئاساییشی خۆیـان رێکبخەن. جارێکی تریش. ئەم شێواز و هەلومەرجە رێـک لـەوەی بۆسـنیا دەچێ. بەڵام دابەشکردنی عێراق بۆ سێ قەوارە کۆتـایی ئامانجەکـە نییـە. پرۆسێسێکی کاتییە لـە بنیاتنانـەوە. کـە هـەر قەوارەیـەک دەتـوانێ ئاقـار بەگەشەی سروشتیی بدات. دانیشـتوانی هـەر قەوارەیـەکیش دەستنیشـانی ئەم رێکخستنانە بکەن. پاش ماوەیـەکی دیـارییکراو( بـۆی هەیـە دوو بـۆ

سێ ساڵ بێ). کاتی ئەوە دێت، کە عێراقییەکان خۆیان ئایندەی سیاسیی عێراق دەستنیشان بکەن.
یەکەمین پرسیار لە سەر ئەجێنداکە، ئەوە لەخۆ ناگرێ شێوەی سیستەمە سیاسییەکە چۆن دادەنرێ، بەلام گرنگترین بڕیار دەبێ. ئایا عێراقییەکان دەیانەوێ وەک ولاتێک پێکەوە بمێننەوە، ئەگەر وابوو، ئایا ئامادەن بۆ گەیشتن بەمە، لەسەر چیی رێکبکەون ؟ ئەم پێشنیارە پێویستی بە ریفەرێندەمە، بە دایەلۆگی کراوەو دڵسافییەوە لەنێوان عێراقییەکاندا بچێتە پێشەوە، ئایا بەراستیی هیچ ئایندەیەک بۆ دەوڵەتی عێراق هەیە. ریفەرێندەمەکە لە هەر سێ قەوارەکە دەبێ بکرێ، هەروەها ئەگەر زۆرینەی هەر قەوارەیەک دەنگیان بۆ جیابوونەوە لەعێراق دا، ئەم بڕیارە دەبێ بپەژرێنرێ.
باشیی ئەم هەنگاوە دەکەوێتە سەر ئەو پەرۆشییەی بە هەموو لایەنە سەرەکییە سیاسییەکان درا، بۆ ئەوانەی کە پێیان باشە یەکێتیی خاک پارێزراو بێت، ئامانجەکە ئەوە دەبێ کە بیبەنەوە لەدژی ئەوانەی لەعێراقدا ناحەوێنەوە، ئەمەش خواستی دەوێ بۆ داشکاندن و رێککەوتن لەسەر پرینسیپی گرنگ، بۆ گەڕانەوەی کوردەکان وەک بەشێک لەدەوڵەتی عێراق بۆ نموونە، لەسەر عەرەبی عێراقیی پێویستە کە رێگەیان پێبدەن حوکمڕانیی ئۆتۆنۆمییانەی خۆیان بکەن، هەروەک لە ماوەی 12 ساڵی رابردوودا کردوویانە، ئەمە شەڕێکە لەگەڵ دڵ و دەروونی عێراقییەکاندا دەرگیرە، هەروەک پێویستە وابێت.
لەم پرۆسێسەدا، سێ دەرئەنجامی لێ دەکەوێتەوە، یەکەم هەرسێ قەوارەکە پێکەوە لە دەوڵەتێکی یەکپارچەدا بمێننەوە؛ دووەم کوردەکان دەکشێنەوە، لەکاتێکدا عەرەبەکانی عێراق پێکەوە دەمێننەوە؛ سێیەمیش، سێ جۆرە دابەشبوون دێتە کایەوە، دەوڵەتی کوردیی لە باکوور، دەوڵەتی سێنترالی سوننە-شیعە و دەوڵەتی شیعە لە باشوور، لەسەر بناغەی مێژووی رابردوو، دەرئەنجامی یەکەم رێی تێدەچێ، بەلام کوردەکان داوای دڵنیایی زیتر دەکەن، کە لەقازانجیان دەبێ، وەک بەشێک لە عێراق بمێننەوە، دەرئەنجامی سێیەم پێی دەچێ دواهەمین هەنگاو بێ، بەلام ئەو دەرئەنجامەی ئەگەر رووداني زیتری هەبێ، دووەمە، لەم کەیسەدا دەوڵەتی عەرەب لەعێراق ( یان بۆی هەیە میزۆپۆتامیا)، هاوشانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی بگونجێن.

هەر سێ ئەم دەرئەنجامانە رێی تێدەچێ. باشیی و خراپییەکانی هەریەکەیان دەبێ لەبەرچاو بگیردرێن.

## عێراقی یەکگرتوو

ئەگەر هەرسێ قەوارەکەی عێراق پێکەوە بمێننەوە، کەواتە لەرووکاردا هیچ نەگۆڕاوە. عێراق هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە هەروەک هەبووە. بەڵام شتێکی گرنگ گۆڕاوە. بۆ یەکەمین جارە لە مێژووی عێراقدا، یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانە هەیە. کوردەکان بە ئازادانە دەچنە ناو دەوڵەتی عێراقی عەرەبییەوە. ئەو دەنگدانەی ئەمە بەرهەم دێنێ، دەتوانرێ وا دابنرێ لەمێژووی مۆدێرنی عێراقدا یەکەمین دەربڕینی راستیینەیە لەسەر ئایدێنتیتیی نیشتمانیی. ئەگەر شتی تر نەبێ، ئەم بەرەنجامە یەکەمین قۆناغ دەبێ بۆ پرۆسەیەکی دوورودرێژی سارێژکردنی برینە قووڵەکانی مێژووی عێراق. لەم قۆناغەدا، عێراق چانسی دەبێ باشتر لەسەردەمی حیزبی بەعس بەرێوەببرێ. لەبەر ئەوەی توخمەکانی تۆبزیی بۆ پێکەوەنان و مانەوەی پارچەکان، لابران. ئایا دەوڵەتێکی دیمۆکراتیی لەعێراقدا بەرهەم دێت، ئەمە پرسیارێکی کراوەیە. بۆی هەیە ئەم دەنگدانە پێش کۆمەڵی رەدەڵ و بەدەڵی پێویست بکەوێ، کە لە قۆناغێکدا دێنە پێشەوە. بۆ نموونە، وەک رێی تێ دەچێ، ئەگەر سوننەکان لەگەڵ مانەوەی عێراقدا بوون بە شێوەی هەنووکە، ئەو کاتە لەسەریانە کە مل بدەن بەوەی رۆژگاری باڵادەستییان بەسەر دەسەڵات و بڕیارەکانیدا کۆتایی پێهات. دەسەڵات دەبێ لەگەڵ شیعەدا پێکەوە بکەن.

خاڵی لاوازی ئاشکرا نییە لە دەستەوەگرتن بە یەکێتیی خاکی دەوڵەتی عێراقەوە. تورکیا بۆی هەیە گازەندە بکات سەبارەت بە ئاستی ئۆتۆنۆمی کوردەکان. بەڵام کاتی ئەوە هاتووە کە تورکیا چیتر خۆی لەهەلومەرجی سیاسیی عێراق هەڵنەقورتێنێ. ئەگەر ئەمە وەک هۆشدارییەکی ئەمێریکا وەربگیردرێ، با وابێت. ئەوەی لەمەوە بەرهەم دێت، بۆی هەیە دیمۆکراتیی بێت یان بەپێچەوانەوە. بەڵام سیستەمێکە لەلایەن خودی عێراقییەکانەوە پەسەند کراوە، نەک لەلایەن ئەمێریکاوە بەسەریاندا سەپێنرابێت. لای کەم لەکوردستاندا، ئەگەرێکی بەهێز هەیە، ئەگەر رێگەیان پێ بدرێ، ئۆخژنی ئەو پلەیە لەدیمۆکراسیی بکەن کە پێشتر هەیانبووە.

بەتێپەڕبوونی کات، دیموکراسییەکی پراکتیک دێتە کایەوە، ئەم ئەگەرەش پێشتر ئامادەیی هەیە.

### بەرەنجامی دوو دەوڵەت

ئەگەر کوردەکان بەڕاستیی هەلیان بۆ بڕەخسێ کە چارەنووسی خۆیان دیار بکەن، بەرەنجامی ئەم ئەگەرە، دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆیە لە باکووری عێراقدا. هاوشانی قەوارەی عەرەبیی لە باشووردا. بۆ ئەوەی ئەمە روو نەدات، دانیشتوانی عەرەب، دەبێ ئامادەییان بۆ ئاستێک لە لێبووردەیی بەرامبەر ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردەکان تێدابێت. کە پێشتر نەیانپەژراندووە. کوردەکانیش دەبێت متمانە بهێنن بە عەرەب کە بەسەر حکومەتی سێنترالدا زاڵ دەبن. ئەو پەیمانانە بەرنە سەر کەدەیدەن( دواتریش) کاتێ لەدەسەلاتدان، جێبەجێی بکەن. پێ ناچێ ئەم دووانە هیچیان روو بدەن، ئەوەی رێی تێدەچێ، ئەوەیە کوردەکان ئەوە هەڵدەبژێرن کە ماوەیەکی زۆرەخەون بەسەربەخۆییەوە دەبینن. ئەگەری دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان، زۆر مەسەلەی گرنگ دەورووژێنێ. بەلام بەویژدانەوە، کوردستانی سەربەخۆ چارەسەری گرفتەکان زێتر دەکات وەک لەوەی گرفت دروست بکات.

سنوورەکان دەکەونە کوێوە؟ ئەوە لەبەرچاو بگیردرێ. هیچ ئامارێکی باوەڕپێکراو لە ساڵی 1957 ەوە نەکراوە. تەخشانبوونی ژمارەی کوردەکان بەپێی ژمارەی عەرەبەکان لە باکووری عێراق نەزانراوە. هەروەها هەندێ شار لەچەشنی هەولێر و سلێمانیی بۆ نموونە، گومانی تێدا نییە کە شاری کوردیین. بەلام موسڵ بەتەواویی عەرەب بەسەریدا زاڵە. بەمپێیە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی، موسڵ لەخۆناگرێ. هەلومەرجی کەرکوک بە ئاشکرا ئاڵۆزیی پێوە دیارە. لەئەنجامی چەندین دەیە لەپاکتاوی ئێسنیکیی، لەکەرکوکدا عەرەبەکان رێژەیەکی گەورە پێک دەهێنن، ئەگەر زۆرینەش نەبن.

بەهەرحاڵ، دیدی عەرەب و کورد لەسەر گرنگیی کەرکوک جیاوازییان هەیە. بۆ کوردەکان کەرکوک ئۆرشەلیمە{ قودس}، بۆ رژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عەرەب، کرۆکی مەسەلەکە کۆنترۆڵکردنی کێڵگە نەوتییە زەبەلاحەکانی کەرکوک بووە. دەکرێ ئەم دوو مەسەلەیە لێک جوێ

بکرێنەوە لەسەر ئەوەی کەرکوک بەشێک بێت لە کوردستانی سەربەخۆ بەڵام مەرج نییە کۆنترۆڵی بەسەر بیرە نەوتەکاندا هەبێت. کەرکوک وەک شارێک دەبێ بەشێک بێ لە کوردستان، بەڵام نەوتی کەرکوک ( لای کەم بە بڕەکەی خۆی ) مەرج نییە بەشێک بێ . جگە لە لکاندنی کەرکوک بە کوردستانەوە، سنوورەکانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی جیاوازییەکی ئەوتۆی نابێ لەو سنوورە ئۆتۆنۆمییەی هەرێمی کوردیی کە پێشتر دامەزراوە.

* * *

ئایا دەوڵەتێ کوردیی دەتوانێ درێژە بەژیانی بدات؟ دەوڵەتی کوردیی لە باکووری عێراقدا، لەرووی دانیشتوانەوە بچووک دەبێ: لەنێوان 4 بۆ 5 میلیۆن خەڵک دەبێ. هەروەها دەروازە داخراو و گەمارۆدراو بە چەندین دەوڵەتی گەورەتر، بەهێزتر و بگرە دوژمنکاریش ( تورکیا، سوریا، ئێران و دەوڵەتی عەرەبیی لە باشووری عێراق). کوردستانی نەپارێزراو، لە دەوروبەرێکی وادا لە پێنج خولەک زیتر ناژێت. تاکە رێگە بۆ ئەوەی کوردستانی سەربەخۆ وەک قەوارەیەکی کردەیی بمێنێتەوە، چێکردنی پێوەندییەکی بەردەوامە لەگەڵ ئەمێریکا یان ئامادەبوونی هێزی سەربازیی نێودەوڵەتیی لە کوردستاندا. دامەزراندنی بنکەی سەربازیی لە کوردستاندا، هاوشانی گەرەنتییە بۆ پاراستن. بەمشێوەیە کوردستان بۆی هەیە تەنێ بەشی عێراق بێت. خەڵکەکەی بە خرۆشانەوە پێشوازیی لە هێزەکانی ئەمێریکا بکەن. لەڕووانگەی ئەمێریکاوە کوردستان شوێنێکی ئایدیالە بۆ چاودێرییکردنی دراوسێکان " سەرکێشەکان" ( ئێران و سوریا). بێئەوەی پێویست بەوە بکات کە هێزەکانی پێ بنێنە خاکی پیرۆز یان هەرێمێکی عەرەبییەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەمە قورسایییەکی سەخت دەخاتە سەر ئەمێریکا بۆ دوور مەودا. کەواتە ئەگەری چاودێریی ناوچەکە لە دەرەوەی کوردستان، وەک هەلێک بەوردیی لەبەرچاو دەگیردرێ.
لە باری ئابوورییەوە، پێشهاتەکان باشتر دەبێ وەک لەوەی پێشتر هەبوو. گەشبینیی هەیە. هەندێ رێککەوتن بکرێ لەگەل دەوڵەتی عەرەبیی لە باشووردا کە کوردستان لە چاڵە نەوتەکانی کەرکوک رێژەیەکی گونجاوی بەربکەوێ. لەدرێژماوەدا کوردستان بە فاکتەوە شوێنێکی باش دەبێت بۆ

ئـــەوەی ببێتـــە چـــەقی بازرگـــانیی لەناوچەکـــەدا. کەوتووەتـــە ســـەر دووڕێیـــانی گـــەورەترین ســـێ شارســـتانییەتەوە ( تـــورکیی، عـــەرەبیی و فارسیی )، سەخت نییە بۆ ئەوەی بهێنرێتە بەرچاو کـە کوردسـتان دەبێتـە بنکەیەکی بازرگانیی گرنگ لە ناوچەکەدا. لەسەرەتادا، بۆی هەیـە ئەگـەری دوژمنایەتی بەرامبەر ئەم دەوڵەتە تازە دروستبووەی کوردسـتان، بەتایبـەت لەلایەن تورکیاوە هەبێ.

بـە تێپـەڕبوونی کـات، هـەر سـاتێ کوردسـتان لـەڕووی نێودەوڵەتییـەوە بەڕاسـتیی ددانـی پێـدانرا، تورکیـا هـیچ چارەیـەکی تـری نییـە جگـە لـە کردنـەوەی دەرگـا بـەڕووی ئـەو شـەپۆلە بازرگانییـەی دەوڵـەتی تـازە دروستبوودا. بەساکاریی، ئەگەر تورکیا دەیەوێ پێوەندیی بازرگانیی لەگەڵ عێراقدا هەبێ، کەواتە نـاتوانرێ رێ لـە شـمەکەکان بگـرێ کـە بـە خـاکی هەرێمە کوردییەکەدا دەگوزەرێن. بوونی بنکەی سەربازیی ئـەمێریکیی، بـە نزیکـەی 30000 بـۆ 50000 هێـزی بیـانیی، کۆمـەک و هاوکارییـەکی گەورەی ئابووریی کوردیی دەدات.

لە باری سیاسییەوە، مەترسیی تەقینەوەی نێوخۆیی هەیە. پێوەندیی نێـوان هەروو باڵە کوردییەکە- ینک و پدک-، لای کەم هەمیشە دۆستانە نـەبووە. لەناوەڕاستی 1990 ەکانـدا بەدەستنیشـانکراویی، ئـەم پێوەندییـە گـرژە تەقییـەوەو بـوو بـە شـەڕی سـەربازیی، ئەوەنـدەی نـەمابوو بەیـەکجاریی ئـەزموونی کـورد لەگـەڵ دیموکراسـییدا پارەپـارە بکـات. لـە 1997 ەوە نـەیاریی نێـوان ئـەو دوو رێکخـراوە تارادەیـەک کـەمبووەوە و دەوڵـەتی دیفـاکتۆی کـوردیی لەلایـەن دوو ئیـدارەی جیـاوازەوە بـەڕێوە دەبـرا. بەڕوونیی، ئەگەر ئەنجامی دروستبوونی دەوڵەتی کـوردیی لـە بـەرپابوونی شەڕی نێوخۆوە بوو، ئەمـە دەبـێ بـە جـدیی بخرێتـە ژێـر پرسـیارەوەو ئارگیومێنتەکە بە قازانجی سەربەخۆیی وەرچەرخێنرێ.

کۆمەڵێ هۆکار هەیە بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات. یەکەم کۆمەکی نێودەوڵەتیی بەهێز، سـەقامگیریی جێکـەوت دەکـات و نـاهێڵی ئـەوە رووبـدات؛ دووەم، هەرەسی حکومەتی کوردیی یـەکگرتوو، بەشـێکی پێوەنـدیی خـۆیی بـوو، بەڵام لەلایەن خۆتێهەڵقورتاندنی دەرەکیی دەوڵەتانی دراوسێوە رۆڵی تێـدا بینرا. دووبارە ئەمێریکا دەتوانێ بازووی هێز نیشـان بـدات، بـۆ ئـەوەی ئەمە روونەداتەوە. سێیەم سەرکردەی ئەو دوولایەنە، بـارزانیی ( پـدک) و

تاڵەبانیی( ینک ). نیازێکی زۆر بەهێزیان هەیە کە ئەوە تێک نەدەن. وەک چانسێکی تاقانە بۆ کورد، لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا. مێژوو بەزەیی بەهیچیانـدا نایاتـەوە. ئەگـەر کێشـەی تایبـەتیی نێوانیـان رێگـە بـدات سەربەخۆیی کورد وێران ببێت. دواخاڵ، لـە 1997 ەوە. هـەردوو حیـزب هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ پێکەوەژیانی ئاشتییانە. نەک هەر لەگەڵ خۆیاندا بەڵکووو لەگەڵ ئەو ئێسنیک و کەمایەتییە مەزهەبییانەی لەناو کوردستانی عێراقدا دەژین. کوردستان لەڕووی پرۆسێسی جێبەجێکردنەوە دیموکراتیی نییە( هەردوو قەوارەکە. حکومەتۆکەی حیزبیین)، بەڵام لیبراڵ و خۆڕاگرن.

* * *

تورکیا چۆن وەڵام دەداتەوە؟ بەدڵنیاییەوە باش نـابێ. نیگـەرانیی تورکیـا خەخت لەسەر هەلومەرجی نزیکەی یـەک میلیـۆن ئێسنیکی تورکمـان، کـە کەوتوونەتە باکووری عێراقەوە( زێتـر لـە کـەرکوک و موسـڵدا). هـەروەها لەســەر ئەگــەری کاردانــەوەی کوردســتانی عێراقــی ســەربەخۆ لەســەر دانیشتووانە کوردە زۆرەکەی تورکیا دەکاتەوە. کوردەکانی تورکیا لەڕووی جیۆگرافییـەوە کەوتوونەتـە بەشـی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئـەو وڵاتـەوە. بەژمارەش نزیکەی 15 میلیۆن دەبن. ناوبەناو لە لە1920 ەکانەوە. دواتر بەبـەردەوامیش لـە 1948 ەوە کوردەکـانی تورکیـا بـە تونـدیی خـەبات دەکەن لەدژی حکومەتی سێنتراڵ. کە تەنانەت ئامادەنییە دان بە بوونیاندا بنێ وەک گرووپێکی ئێسـنیکی جیـاواز. " رێگـە چـارە"ی حکومـەت بـۆ کێشەی کورد لەسەر بەکارهێنانی دڕاندانەی هێزی سەربازیی وەستاوە. کە ئاراستەیەکە بـە کوشـتنی 30000 کـورد، پاکتـاوی نـەژادیی بەکۆمـەڵ و وێرانکردنی 3000 تا 4000 گوندی کوردیی لە 1948 ەوە لێی بەرهەم هاتووە.

گرتنـی عەبـدوڵا ئۆجـەلان- سـەرۆکی سـەرەکییترین هێـزی بـەرگریکاری کوردیی، پارتی کرێکارانی کوردستان - پی کەی کـەی- لەسـاڵی 1999دا ماوەیــەک ئــارامیی لەگــەڵ خۆیــدا هێنــا. ئۆجــەلان ئاگربەســتی لــە بەندیخانەکەیەوە راگەیاند و خۆی واناساند کە حەزی بـە چارەسـەرییەکی سیاسیی بۆ مافەکان و کێشەی کوردیی لە تورکیادا هەیە. ترسـی ئەنکـەرە لەوەوە دێ، کوردستانی سەربەخۆ لە عێراق. خەباتی چەکداریی لە تورکیادا

کلێپە بسەنێتەوە. ئەمەش هەڕەشە لە یەکپارچەیی خاکی دەوڵەتی تورکیا دەکات. ئەگەر ئەمە وابێ، ئەم ترسە ئارگیومێنتێکی بەهێزیی دژی دروستکردنی دەوڵەتی کوردیی لە عێراقدا لێ دەکەوێتەوە. وەک ئەندامێکی- ناتۆ- ش ماوەیەکی زۆرە تورکیا هاوپەیمانێکی ستراتیژیی ئەمێریکایە لە ناوچەکەدا. هەروەها سێکیولارە. کەمێک دیمۆکراسییە. پردێکی جیۆگرافیی و سایکۆلۆژیی گرنگە لە نێوان رۆژئاواو جیهانی ئیسلامدا.

تەقینەوەی تورکیا. بەئەندازەی کارەساتێکی تەواوە بۆ رۆژئاوا( و تورکیاش بەدڵنیاییەوە) لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا. لەگەل ئەوەشدا ئاسۆی دەوڵەتی کوردیی لە باکووری عێراقدا. ناسەقامگیرییەکی گەورەی لەتورکیا لێ دەکەوێتەوە. زۆر بێ بناغەیە. لەڕاستییدا. کەیسێکی بەهێز دەتوانرێ چێبکرێ کە دەوڵەتی کوردیی سەقامگیریی بۆ هەلومەرجی ستراتیژیی دەستەبەر بکات. لە زۆربەی سالانی نەوەدەکاندا بۆ نموونە. پارتیی دیمۆکراتی کوردستان بەجدیی هاوکاریی لەگەڵ هێزە سەربازییەکانی تورکیادا. بۆ تێکشکاندنی چالاکییەکانی پی کەی کەی لە کوردستانی عێراقدا کردووە. رێگەی تێ ناچێ هەردوو باڵە کوردییەکە ئەو سەربەخۆییە نوێیەی تازە دەستیان کەوتووە. بۆ یارمەتییدانی پی کەی کەی بخەنە مەترسییەوە. لەڕاستییدا. زۆر جێگەی بڕوایە. کاتێ کوردەکانی عێراق شتێکی بەرجەستە لەدەست بدەن( دەوڵەتێک). سوودی بۆخۆیان هەیە ئەگەر سەرلەبەر بۆ چارەسەری کێشەی پی کەی کەی هاوکاریی تورکیا بکەن.

لەناوبردنی پی کەی کەی وەک هێزێکی خراو. بۆی هەیە تورکیا لەسەر مەسەلەی کورد بەڕیشەیی بە هەڵوێستەکانیدا بچێتەوە. بێگومان رێگەچارەی هەڵبژێردراو بۆ ئەم مەسەلەیە- توندوتیژیی و درندایەتیی- شتێکی ئەوتۆی نەکردووە. جگە لەوەی ژانی زۆر قورسی بە دەوڵەتی تورکیا گەیاندووە. ژەنەراڵەکانی تورکیا توانیویانە قورسایی ناساغڵەمی خۆیان بەسەر حکومەتی بەناو دیموکراسیی و سیڤیلدا جێکەوت بکەن. بەفیڕۆدانێکی بەردەوامی خەزێنەی تورکیا بووە( نزیکەی 8 بیلیۆن دۆلار ساڵانە). هەروەها وایکردووە کە تورکیا. خراپترین ریکۆردی مافی مرۆڤ لەسەر زەویی تۆمار بکات.

ئەگەر هەروەک زۆرینـەی تورکەکان دەیانەوێ، ئاییندەی تورکیا لەگـەڵ ئەورووپا و ئەندامەتیی لە یـەکێتیی ئـەورووپادا دێتـەوە، کەواتـە بەسـاکاریی ئەمە روو نادات، تا ئەم گرفتانە چارەسەر نەکرێن. ئەمەش چارەسەرییەکی ئاشتییانەو سیڤیلیانەی دەرهەق بەکێشەی کورد دەوێ. ئامانجەکانی تورکیا لەسـەر کێشـەی کـورد شـتێکی بـێ بناغەیـە. تورکیـا پـاش هـەموو شـتێ هاوپەیمانێکی گرنگی رۆژئاوایـە- بـەڵام ئەمـە بـەو واتایـە نییـە. تورکیـا کارتی ڤیتۆی دیفاکتۆ لەسەر ئاییندەی عێراق بەدەستەوە بگرێ.

لە کاتێکدا ئەو دژوارییەی رووبەڕووی دروستبوونی کوردستانی سـەربەخۆ دەبێتەوە لە بـاکووری عێراقـدا. نـابێ لێـی کەمبکرێتـەوە. بـەڵکووو دەبـێ هاوسەنگییەک بکرێ لە بەرامبەر ئەو ئارگیومێنتە بەهێزانەی کە لە قازانجی ئەم پێشهاتەدا هەن. یەکەم، کەیسێکی مۆراڵیی تەواو هەیە بۆ ئەوەی کـورد بەدەوڵەت ببێ. هیچ کۆمەڵە ئێسنیکێکی تـر لـە رۆژهـەڵاتی ناڤینـدا. بگـرە لەجیهانیشـــدا بـــەدرێژایی چـــەرخی بیســـتەم ئەوەنـــدەی کوردەکانیـــان نەچەشتووە. پێوانە ستراتیژییەکانی هێـزە گـەورەکان لـە 1920 ەکانـدا. نەتـەوەی کوردیـان بەشبەشـکرد و بەسـەر خەڵکەکەیانـدا سـەپاند وەک کەمایەتیی بەردەوام لە دەوڵەتانی خەڵکی تردا بژین.

لەهەموو شوێنێک کوردەکان مامەڵەیان بەشێوەی هاوڵاتیی پلە دوو لەگەڵـدا کـراوە. هـەروەها لـە تورکیـا و عێـراق بەشـێوەی ئاسـتی ئاسـایی خـوار مـرۆڤیش مامەڵـەیان لەگەڵـدا کـراوە. هەڵوێسـتی رۆژئـاوا بەگشـتیی و ئەمێریکا بەتایبەتیی تا رادەیەکی زۆر گاڵتەئامێزانە بـوو. کـاتێ هەلومـەرج گونجـاو بووایـە لـەباری سـتراتیژییەوە، کوردەکـان هانـدەدران بـۆ بەگژداچوونەوەی دەوڵەتی سێنتراڵ. چـەکوتفاقیان پێـدەدرا بـۆ دریـژەدان بەشۆڕش؛ کاتێکیش هەلومەرج لەقازانجیان نەبووایە، بەتەنێ بەجێدەهێڵران بۆ ئەوەی چارەنووسی رەشی خۆیان دەستنیشـان بکـەن. بێگومـان، ئەمـە ئیـدارەی بوشـی دەسـتکۆتا نـەکرد لـەوەی کـە ئـازارو ژانـی کوردەکـان بەکارنەهێنێ تا دوا رادە، بۆ زەمینەی شەڕسازیی لـە 2003 دا. هـەروەک دیـاربوو، بـەکارهێنانی چـەکی کیمیـایی دژی کوردەکـان لـە 1988 دا پاکانەیەکی باشی دا بەشەڕ بۆ لابردنی سەدام، بـەڵام کـارێکی نـەگونجاو بوو، پاکانە بۆ ئەوە بکرێ ئایا کوردەکـانی عێـراق چیـان شایسـتەیە، کـە دەوڵەتی خۆیان شایستەیە.

دووەم، سەرەڕای نیگەرانیی هەندێ لایەن، گوایە دەوڵەتی کوردیی ئارامیی ناوچەکە تێک دەدات، پشت بەستوو بە بەڵگەکانی سەدەی بیست، سەختە ئەوە بهێنرێتە پێش چاو، چیی وا لەکوردەکان دەکات لەوە زیتر هاوکۆلکەی نائارامیی بن، وەک لەوەی پێشتر بوونە. کوردەکان لە تورکیا و عێراق بەتایبەتیی( لە ئێرانیش تا ڕادەیەک) هۆکاری نائارامیی نێوخۆیی بوونە. لە عێراقدا، یارمەتیی هێزە دەرەکییەکانیان داوە، وەک سوپایەکی یەدەک، بۆ ئەوەی سەقامگیریی لە حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق بشێوێنن. ئەمەش بەکەمترین زیان، وێڕای دەستگرتن بە ئۆتۆنۆمییەکەیانەوە، کوردەکان سەلماندوویانە لە کارکردندا هاوکارێکی باشن. دەوڵەتی کوردیی شتێک دەبەخشێتە کوردەکانی عێراق کە بزریان کردووە و هاندەرێکیش دەبێ بۆ سەقامگیریی لەناوچەکەدا. لەبری ئەوەی تێکی بدات. زۆر بەوردییش، نەبوونی دەوڵەتی کوردییە وای لەکوردەکان کردووە، لەناوجەرگەی رۆژهەڵاتی ناڤیندا هۆکارێکی پڕ لەمەترسیی بن.
سێیەم، ئەمێریکا لە عێراقدا بەشتێکەوە گیری خواردووە، کە شەڕی پارتیزانیی تەواوە. بوونی هێزەکانی ئەمێریکا پەرچەکردارێکی دوژمنکارانەی روو لەسەری لەلایەن عێراقییە ئاساییەکانەوە بەبەردەوامیی لێدەکەوێتەوە. ئەو بیرۆکەیەی کە عێراقێکی یەکگرتوو یەکەمین پوولی دۆمینەی دیمۆکراسییە، ئەوە لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا دەتوێ، گەشبینییەکی ئەوتۆی تێدا نەماوە. تەنها پارچە لەعێراقدا بتوانێ دیمۆکراسیی لەخۆبگرێ لەهەنووکەدا، کوردستانی عێراقە. بەسووربوون لەسەر ئەوەی کوردستان وەک بەشێک لە عێراقێکی یەکگرتوو بێت، ئەمێریکا قومار بە تێکشکاندنی هێزێکی سیاسیی راستیینەوە دەکات، کەهەوڵی دەدا، لەرۆژهەڵاتی ناڤیندا رزگاری بکات. هەنگاوێکی کەمتر بەرزخواز، بەڵام راستەقینەتر، بەکارهێنانی کوردستانی سەربەخۆیە وەک یەکەمین پوولی دۆمینە لە ناوچەکەدا بە توێپاندن دەدرێ. کوردستان دۆمینەیەکە کەمتر جێگەی بایەخە لەچاو عێراقدا، بەڵام لە ناوچەیەکدا کە ترادیسیۆنی دیمۆکراسیی نەبێ، موویەکیش لەبەراز بێتەوە هەر باشە.
دواجار، شایانی گوتنە، دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ، پێشوەخت بوونی هەیە، تەنێ ناوی نییە. کوردەکان دامودەزگای خۆیان هەیە، دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکەی خۆیاندا دەڕوات، سنوورەکانیان زانراوەو هێزی چەکدار

و ئامادەباشــی خۆیـــان هەیــە. حکومەتــە کوردییــەکان لــە هــەولێرو سلێمانیی هـەن. پێشـمەرگەکانی پـارتیی پاسـەوانیی شـەقامەکانی موسـڵ دەکــەن و کــەرکوکیش لەلایــەن پارێزگــارێکی کــوردەوە بــەڕێوە دەچــێ. ددانپێدانانی نێودەوڵـەتیی بـەم راسـتیینەیەی لەسـەر زەویـی هەیـە. تـەنها ئاشتیکە لەم گەمەیەدا دیار نەبێ. لـەم ئاسـتەدا. سـەختە ئەگـەر ئەسـتەمیش نەبێ. چۆن کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی ئاشتییانە بەدەوڵەتی عێراقـەوە دەلکێنرێتەوە.

* * *

بـۆ پاشـماوی عێـراق چیـی روودەدات؟ بەشـەکانی تـری عێـراق لـەڕووی ئێسـنیکییەوە تـا رادەیــەکی زۆر هۆمۆجینییەسـە{ چوونیــەک}. لــەڕووی جیۆگرافییەوە. شتێک دەبێ لـە میزۆپۆتامیـای کـۆن دەچـێ. کـە زۆرینـەی دانیشتوانەکەی کەوتوونەتـە " خـاکی نێـوان دوو رووبـارە" ەوە. لـەڕووی ئێسنیکیی و مێژووییەوە دەوڵەتی نوێی میزۆپۆتامیا زۆر لە دەوڵەتی کۆنی عێــراق گونجــاوتر دەبــێ . رەخنەئامێزانــە. لابردنــی کوردسـتان لــە هاوکێشــەکە. حــوکمڕانییکردنی میزۆپۆتامیــا زۆر ســاناتر دەکــات. سـەرچاوەی بـەردەوامی نائـارامیی بـۆ بـەکارهێنانی هێـز بـۆ پاراسـتنی یـەکێتیی خـاکی دەوڵـەتی عێـراق نامێنێـت. هـەروەها توانسـتی هێـزە دەرەکییەکان بۆ بەکارهێنانی کوردەکان وەک بریکـار بـۆ تێکـدانی بـاری ئارامیی حکومەتی سـێنترال. رادەماڵێـت. ئـەوەی کـە عێـراق بـە کۆمـەڵێ حکومـەتی میلیتانـت و پـڕ لەتونـدوتیژیی بـەڕێوە چـووە. تێنەگەیشـتن و بەقورسگرتنی مەسەلەی کوردبـووە. بـەلابردنی ئـەم کێشـەیە. هـەلێک بـۆ حوکمڕانییکردنی میزۆپۆتامیا دێتە پێشەوە لە حیزبی بەعس باشترە. ئەمە بـۆی هەیـە. یـان بەپێچەوانـەوە کـە زۆر لـە دیمۆکراسـیی نـەچێ. بـەڵام هەنگاوێکی باشە بەرەو ئاراستەیەکی راستوڕەوان.
لابردنی چوار تا پێنج میلیۆن کوردی سونیی لە عێراقدا. پاشماوەی عێـراق دەکەوێتە دەسـت زۆرینـەی شـیعەوە. ئایـا میزۆپۆتامیـا دەبێتـە شـوێنێک زۆرینەی شیعەی فەندەمێنتالیست بەدەستیەوە بگـرن؟ ئەمـە دەبـێ. بـەڵام دوورە. بەدەرلەوەش. ئەگەر عێراق بەرەو فەنـدەمێنتالیزم بـڕوات. مانـەوەی کوردسـتان. نـاتوانێ رێگـە لەمـە بگـرێ. بـەڵام بـەواتای کۆتـایی هـاتنی

ئـــەزموونی دیمۆکراســـیی ئازایانـــە لـــە بـــاکووردا دێـت. بەهـــەرحاڵ، پـێ ناچێ زۆرینەی شیعە - بەتایبەت ئەوانەی لەبەشەکانی سێنترالّی عێراقدان، ئامێز بۆ دەولّەتێکی فەندەمێنتالیستی دەستکراوە بگرنەوە. ئەمەو ئەگـەری بەرگرییەکی توند هەیە لەلایەن سوننەکانەوە سەبارەت بەم هەنگاوە. ئەگەر پرۆسێسـی بنیاتنانـــەوەی سیاسـیی عێـراق لەســەر بناغــەی هەرێمایــەتیی دابنرێتەوە. پاشەڕۆژی ئەم دەولّەتە خۆبەخۆ بەندە بەوەی ئەو گرووپانــەی کە دەیانەوێ دەولّەتێکی ئیسلامیی چێبکەن( بۆ نموونە ئەنجوومەنی بـالآی شۆرشی ئیسلامیی و ئەلدەعوە ). پێویستە ئەوە بزانن. ئەگەر ئەو ئامانجـە هاتە دی، بێگومان بەشی عەرەبیی لەدەولّەتی عێـراق دەبێتــە دوو قــەوارەی جیاواز. بــەرەنجامی ســێ دەولّــەت. گیروگرفتــی لەهەنــدێ رووەوە لەگەڵــدا دەبێ، بەلآم شتی باشییشی تێدا دەبێ.

## بەرەنجامی سێ دەولّەت

وردەکاریی ئەم ئەگەرە وەک شەڕەپشیلە وایە. پێچەوانەی هەرێمی کوردیی لەباکوور، هێڵێکی جیاکەرەوە نییە بەسروشتیی، سوننەو شــیعەکانی عێـراق لێــک جــوێ بکاتـــەوە. هێڵــی ســنووریی لەدەوروبــەری هێڵــی تــەریبی 33 ( رێکخرایـــەوە بـــۆ ئـــەدگارە سروشـــتییەکەی) دوو دەولّــەت بەژمارەیـــەکی یەکسان لەدانیشتوان (نزیکەی 10 میلیۆن ) دروست دەکات. لە باشـــووردا دەولّەتێـک زۆرینەی شیعە لە بەسرە و دەولّەتێک لە ســێنترالّدا لــە بەغــداد. تێکەڵەیەک لە سوننەو شیعە. یەکەمیان شارە پیرۆزەکانی کەربەلاو نەجەف لەخۆ دەگرێ، دووەمیشیان سێگۆشەی سوننیی، درێژدەبێتەوە لــە بــاکووری رۆژئاوای بەغدادەوە بۆ موسڵ. لەوێشـــەوە بــەرەو باشــوور تــا ســنووری ســـوریا. بەســـرە چاڵەنەوتـــەکانی باشـــووری بەردەکـــەوێت کـــە کێڵگـــەی زەبەلاحی رومەیلە ( دووەمین یـــەدەکی نـــەوتی عێـراق لەگەورەییـدا) لــەخۆ دەگــرێ. بەغــدادیش بەشـــی شـــێری لـــە چاڵـــە نەوتـــەکانی کـــەرکوک ( بەبەشکردن لەگەڵ کوردستاندا ) بەردەکەوێ، هەروەها هەندێ چاڵەنەوتی

بچووکی تـر لـه موسـڵ و هەنـدێ چـاڵی تـر کەدەسـتیان لێنـەدراوە لـە بیابانەکانی رۆژئاوادا. هـەردوو دەوڵـەتی عـەرەبیی: ژمـارەی دانیشـتوانی تەواو و سەرچاوەی ئابووریی تەواویان هەیە بۆ ئـەوەی خـۆبژێنن. بـەڵام هیچیان ئەوە هێزەیان نابێ کە هەڕەشە لە دەرودراوسـێکانیان بکـەن. یـان فێڵ و تەڵەکە بەکاربهێنن بۆ هێجەمۆنیی پەیداکردن بەسەر ناوچەکەدا.
سێ جۆرە نیگەرانیی لـە بـەرەنجامی سـێ دەوڵەتەکـەوە سـەر هەڵـدەدەن. یەکەم ئاسـۆی جۆرێـک لـە دەوڵـەتێکی ئیسـلامیی لـە باشـووردا. شـتێکی تایبەت و چاوەڕوانکراو دەبێت؛ دووەم ئەگەر ئەمـە رووبـدات. هـەلێک بـۆ ئێران دەڕەخسێ دەسەلاتی بەسەر باشووری دەوڵەمەنـد بەنەوتـدا بـڕوات یان هەڵیبمژێ؛ سێیەم کەرتکردنی هێزێکی سەرەکیی لەناوچەکەدا. ئێران لـە کەنداودا بێ رکابەر. دەوڵەتی باڵادەست دەبێت. لە دیدی ئـەمێریکاوە هـیچ کام لەم ئەگەرانە بەتایبەتیی سەرنجڕاکێش نین. لەهەمانکاتـدا. ئاسـانە بـۆ گەورەکردنەوەی مەترسییەکان کە لێرەدا دەرگیر دەبن. ئەگەری چانسـێکی زۆرهەیە جۆرێک لەدەوڵەتی ئیسلامیی لـە باشـووری عێراقـدا قـاچ بگـرێ. بێگومان ئەمجۆرە دەوڵەتـە دیمۆکراسـیی نـابێ. ئـارەزووی شـکاندنەوەی بەلای ئەمێریکاشدا نییە.
لەلایەنی پۆزەتیڤیی ئەم پەڕاوی تۆمارکردنەدا. "دەوڵەتی ئیسلامیی بەسـرە" لەرووی دانیشتوانەوە دەوڵـەتێکی بچـووک دەبـێ. توانـای دروسـتکردنی سەرئێشەی بۆ دەوڵەتانی تری ناوچەکە نییە. لەمەش گرنگتر. سـەرچاوەی فەندەمێنتالیزمی شیعە جیادەکاتـەوە لـە بەشـەکانی تـری عێـراق و هـەموو ئەگەری رەگ داکوتانێکی دەوڵـەتێکی ئیسـلامیی لـە عێراقـی یـەکگرتوودا رادەماڵێـت. هەنـدێجار پێویسـتە لاق ببڕدرێتـەوە بـۆ لـەش دەربـازکردن. ئێرانـی دراوسـێ بەدڵنیاییـەوە بەشـوێن نفـوزی خۆیـەوە دەبێـت و دوای گوتـاری رووداوەکـانی بەسـرە ( هـەروەک کردوویـەتی بەبـەردەوامیی لەسەرتاسەری عێراقدا) دەکەوێت. بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییـە کـە بەسـرە ببێتە بووکەشووشەیەکی ئەبستراکتی دەستی ئێـران. لـەڕووی مێژووییـەوە پێوەندیی نێوان پیاوانی ئایینیی بەڕەچەڵەک عێراقیی و پیـاوانی ئـایینیی بەباکگراوندی فارسیی. ململانێ بووە تا ئەوەی هاوکارییکردن بوو بێت.
هەروەک شەڕی ئێران-عێراق روونیکردەوە. ئایـدێنتیتی تایـەفیی نـاتوانێ ئایدێنتیتی ئێسنیکیی داپۆشێ لەپێوەندیی ئاڵۆزی نێوان شیعەکانی عێـراق

و ئێراندا. راپەڕینی 1991 بەڵگەی زیتری دا بەدەستەوە، کە کۆمەکی ئێرانییەکان بۆ ڕێکخراوە مەزهەبییەکان وەک ئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق کە ئێران دەیانبزوێنێ، لەناو عێراقدا کەمتر بوو. بەمشێوەیە هەموو جۆرە هۆیەک هەیە کە بڕوا بێنین، دەوڵەتی ئیسلامیی لە بەسرەدا، ئیشوکاری نێوخۆی عێراقییەکانە.
ئەو ئارگیومێنتەی گوایە دابەشکردنی عێراق، دەسەلاتی ئێرانییەکان والا دەکات لەناوچەی کەنداودا رووکەشانە رێی تێ دەچێ، بەلام لە بنەڕەتدا بەوشێوەیە نییە. هێزەکانی ئەمێریکا دەتوانێ لە دەرەوەی بنکەکانی کوردستان یان لە میرنشینەکانی کەنداوەوە وەک قەتەر و بەحرەیین، دەسەلاتی ئێران کۆنترۆڵ بکات. ئەم ئارگیومێنتە وای دەبینێ ئەو بالانسەی بە لۆژیکی هێزەوە جێکەوتکراوە لەلایەن ئەمێریکاوە، تا ئەمڕۆش سەرکەوتوو بووە. بەلام لەڕاستییدا، کارەسات بووە. لە کۆمەککردنی دیکتاتۆرێکی دڕندەی وەک شای ئێران تا ساڵی 1979، ئەمێریکا بووە هۆی هەلایگیرسانی شۆڕشی ئێرانیی. لەپاش 1979 ەوە، کۆمەکی سەربازیی و ئابووریی ئەمێریکا بۆ رژێمێکی دڕندەی هاوشێوە لەچەشنی سەدام، عێراق توانیتی ببێ بە گەورەترین هێزی سەربازیی لە ناوچەکەدا.
لە حەفتاکانەوە، ناوچەی کەنداو، بووەتە پەناگەی شۆڕشی فەندەمێنتالیستی ئیسلامیی، شەڕی وێرانکەری 8 ساڵەی نێوان دوو هێزی سەرەکیی ناوچەکە، داگیرکردنی کوەیت، هەردوو شەڕی هاوپەیمانان دژی عێراق، ئەمەش بۆ سەقامگیریی، ڕێکۆردێکی سەرنجڕاکێش نییە. زۆر بەوردیی لۆژیکی " دوژمنی دوژمنەکەم" ە بووەتە هۆی رقوبێزارییەکی قووڵ لەدژی ئەمێریکا لەناوچەکەدا. ئەم دیدە ستراتیژییە پانوپۆرە کە بووە بناغەی داگیرکردنی عێراق لە ساڵی 2003 دا نوێنەرایەتی ئەو تاکتیک و سیاسەتەی دەکرد، کە کۆمەکی دیکتاتۆرێکی بکوژی بۆ بالانسڕاگرتنی هێز لەبەرامبەر یەکێکی تردا دەکرد، شکستێکی ئابڕووبەرانەی بەسەردا هات.
دابەشکردنی عێراق بە نەخشەوە، دوورە لە چارەسەرییەکی ئایدیالەوە بۆ ئەو کۆسپانەی لەهەنووکەدا رووبەڕووی ئەمێریکا بوونەتەوە، کاتێ بەشوێن ئەوەدا دەگەڕێ، کە هەندێ نیزام بۆ ولات بگێڕێتەوە. بەلام

ڕێگـەچارەی بـاش بـەجێ نـەماوە. تـەنها خراپـەکان مـاون. ئـەمێریکا جەختی لەسەر ئەوەیە عێراق دیمۆکراتیزە بکـات و یـەکێتیی خاکەکەیشـی وەک دەوڵەت بپارێزێ. ئەگەر ئەمێریکا سوور بوو بەپابەندبوون بـەم دوو بەڵێنەوە، ئـەوەش ڕێگەیەکـە کۆتاییەکـەی بەکارەسـات دێـت. کـاتی ئـەوە هاتووە بیر لە ئۆڵتێرنەتیڤەکانی تر بکرێتەوە.

## کۆتایی

له 1ی مەی 2003 دا، سەرۆک بوش لەسەر کەشتیهەڵگری Abraham Lincoln بەپۆشاکی ڕێکوپێکی فڕۆکەوانیی دەریاوانییەوە، کە دروشمی " ئەرکەکە بەئەنجام گەیشت"ی لەسەر بوو، ڕایگەیاند، پرۆسە سەرەکییە جەنگییەکانی عێراق کۆتایی هات. سەد ڕۆژ دواتر، سەرۆک شیکردنەوەی خۆی لەسەر هەلومەرجی عێراقی داگیرکراو دا" زۆر پێشکەوتنمان لەسەد ڕۆژدا بەدەست هێناوە، من شادمانم بەو پێشکەوتنانەی کە بەدەستهاتوون."[310] هاوکات کۆشکی سپیی ڕێپۆرتێکی 24 لاپەڕەیی بڵاوکردەوە لەژێر سەردێڕی" ئاکامەکان لەعێراقدا: 100 ڕۆژ بەرەو ئاسایش و سەربەستیی" و تەپڵی سەرکەوتنی ئەو داگیرکارییەی ئەمێریکا ڕابەرایەتیی دەکرد ڕاگەیاند.

ڕیپۆرتەکە لە وردەکارییەکانیدا، هەندێ دەستکەوتی بەرچاوی ئەژماردبوو، وەک چاککردنەوەی تۆڕەکانی ئاو و گەیاندنەوەی بەئاستی پێش شەڕەکە، دامەزراندنی 150 بڵاوکراوە، دابینکردنی چاودێریی تەندروستیی گشتیی، بەگەشبینییەوە دامەزراندنی دیمۆکراسیی وەک " سەرکەشترین سەرکەوتن" لە عێراقدا هاتە ژماردن. گرفتی ئیدارەی بۆش بۆ سەرکەوتنەکان لەعێراقدا ( کە زۆربوون)، بەفاکتی ڕوونەوە کە شەڕ تەواو کۆتایی پێنەهاتبوو، دەشاردەوە، لەکاتێکدا نەدەکرا پشت گوێ بخرێ . ئەگەر شتێک هەبێ بگوترێ، ئەوەیە کە مەسەلەکە بوو بەکێشەیەک، لەوەی کە مارسی 2003 تێیدا بوو، زۆر مەترسییدارترە. بە دیدی نۆڤەمبەری 2003، پاش حەوت مانگ لە وتەکەی بوش( هەشت مانگ پاش تەواوبوونی دەقی ئەم کتێبە)، چارەنووس و پاشەڕۆژی هێزەکانی ئەمێریکا لە عێراق و ئایندەی سەقامگیریی لەخودی عێراقدا پێ ناچێ باش بێت.

دەبێ هێشتا گومان لەوە هەبێ، ئایا لەتوانای ئەمێریکا دا هەیە، سەرکەوتنی سەربازیی بەسەر هێزەکانی بەرگرییدا تۆمار بکات و بورجی بلێسەی دیموکراسیی لە دڵی ڕۆژهەلاتی ناڤیندا دابمەزرێنێ. نەبوونی ستراتیژییەکی ڕوون بۆ دەرچوون لەعێراق، هیچ لەگەشبینی وەزیری بەرگریی دۆناڵد رامسفیلدی کەمنەکردەوە، لەکاتێکدا بەوپەڕی توانای

نەشتەگەرییانەوە زامەکانی داگیرکاریی دەکردەوە. رامسفێلد گوتی"زۆر بەسانایی؛ ستراتیژی دەرچوونمان لەعێراق، سەرکەوتنە."[311] نەبوونی پێناسەیەکی روون بۆ "سەرکەوتن،" فۆرمەلەیەکی نادیار بەدەستەوە دەدات. لای کەم ( کەسێک گریمان بکا) کە سەرکەوتن لەلایەن هێزەکانی ئەمێریکاوە دەبێ تێکشانی بزوتنەوەی چەکداریی و پەرەسەندنی تونودوتیژیی لەخۆ بگرێ. بەڵام ئەگەر راگەیاندنەکانی ئیدارەی بوش ( پێش شەڕ و پۆست شەڕ ) بەناوەڕۆکەوە لەبەرچاو بگیردرێن، سەرکەوتن دەبێ لە عێراقدا چانس بەوە بدات کە دیموکراسیی فەنکشن بکات و مانەوەیشی لەدوای دەرچوونی هێزەکانی ئەمێریکا دریژە پێ بدات. بەدەستهێنانی ئەم دوو ئەرکە هەرچییەک بێ " سادە" نییە. هەروەک بە روونیی لەحەوت مانگی یەکەمی داگیرکارییدا بەدیاردەکەوێ.

## حوکمکردنی عێراق- ئەزموونی ئەمێریکا تا هەنووکە

عێراق لە ئێستادا لەلایەن دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانانەوە ( Coalition Provisional Authority-CPA ) بەسەرپەرشتیی باڵوێزی پێشوو ل. پۆل برێمەرەوە بەرێوەدەبرێ و لای کەم تا 30 ی جونی2004 دریژەی دەبێ. لێرەداو بەپێی پلانی هەنووکە پێویستە سەروەریی بدرێتەوە بە ئەنجوومەنی نیشتمانیی کاتیی { راگوزەر}TNA هەڵبژێردراو و CPA یش هەڵبوەشێنرێتەوە. بەپێی لای کەمی ئەمە لە ئێستادا. برێمەر بەردەوام دەبێ لەکۆنترۆڵکردنی تەواوی پرۆسەی بنیاتنانەوەدا. برێمەر، دیپلۆماتی خاوەن ئەزموون، بەخێرایی دووچاری ئەوە دەبێ، کە مێژووی عێراق چییە و چۆن یەکێکە لەسەخترین شوێنەکانی سەرزەویی بۆ حوکمکردن. سەرەڕای ئەمەش، پێشکەوتن لە بنیاتنانەوەدا کرا.
وێبسایتی CPA لیستی گرنگترین دەستکەوتەکانی ریزکردبوو. لە ئۆکتۆبەری 2003 دا بۆنموونە، CPA سەرپەرشتیی کردنەوەی سەرجەم نەخۆشخانەکانی عێراقی کرد کە ژمارەیان 240 نەخۆشخانە بوو، خەرجیی بۆ نەخۆشخانەکان زیادیکرد" بە بڕی 26 جار زۆرتر لەوەی سەردەمی سەدام،" لەسەروو 22 میلیۆن دەرزی کوتان لەمندالانی عێراق درا.[312] لەکەرتی پەروەردەدا، 22 زانکۆی عێراق و 43 پەیمانگای تەکنیکیی، وێرای هەموو قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندییەکان دووبارە

کرانــەوە. CPA. ئــەرکی دابەشکردنی 72 ملیۆن کتێبی (ناوی سەدامی تێدا نەبێ) لە کۆتایی ساڵی خوێندندا لە ئەستۆ گرت.
بەپێی ئیکۆنۆمیست تێکستی ئەو کتێبانە هەموو " ورووژاندن" ێکی تێدا دەرکرابــوو. لەوانــە" هەرشــتێک پێوەنــدیی بــە جوولەکــەکان و ئیســرائیل. شیعە. سوننە. کوردو هەرچییــەک رەخنــەی لــە ئــەمێریکا تێـدابووبێ."[313] دەرکرابوون. هەروەها هەموو شتێکیان سەبارەت بەمێژووی شــەڕی عێــراق و ئێــــران. شــــەڕی کەنــــداوی 1991 و دەســــەڵاتی حیزبــــی بــــەعس لێدەرهێنرابوو. چەند مێژووی مۆدێرنی عێراق بەتەواویی دەمێنێتەوە پاش ئــــەو هــــەموو لابــــردن و دووبارەنووســــینەوەیە. روون نییــــە. بــــەڵام " هەڵوەشاندنەوەی سەدامیزم-de-sadamization " لە ئاستی گــەنجانی عێراقدا بەباشی بەڕێوە دەڕوا. وێرای ئەم سەرکەوتنانە. برێمــەر دەتــوانێ ئاماژە بە دووبارە هێنانەوەی خزمەتگوزارییە سەرەکییەکان بدات. کــە لای کەم بۆ ئاستی پێش بەرپاکردنی شــەر گەڕێنرانــەوە. هــەروەها زیــادکردنی دەرهێنانی نەوت بۆ پتر لە 2 ملیۆن بەرمیل لە رۆژێکدا.
جێگەی داخە ئەم دەستکەوتگەلە پۆزەتیڤانە. لــەرووی سیاســییەوە بــەهۆی خراپ بەکارهێنانی داگیرکارییــەوە کــەمڕەنگ بوونــەوە. زۆرکــەس لۆمــەی ئیدارەی بوش دەکەن. کە شکستی هێنا لەوەی نەیتوانی پلانێکی دارێــژراو پێش داگیرکردنی عێراق بۆ پۆستشەڕ دابنێ.[314] لێکدانەوەی سانا ئەوەیە. کە عێراق شوێنێکە بەوپەڕی بێئومێدییەوە. بۆ حوکمردن ســەختە. هــەردوو ( ســەرەتا جەنــەڕاڵ جــەی گارنــەر و لــە مــەی 2003 ش بــەدواوە پــۆل برێمەر) دووچاری زنجیرەیەک گیرگرفت بوونە کە چارەسەر بۆیان ئاسان نییە. لای کەم سێ پلانی جودا لەیەکتر هــەبوو بــۆ پۆستشــەڕ لــە عێراقــدا دابنرێ. پلانی A لەلایــەن گارنــەرەوە سەرپەرشــتیی دەکــرا. پرۆگرامێکــی مامناوەندیی لەخۆ گرتبــوو بــۆ لەڕەگــەوە هەڵکێشــانی بــەعس( تــەنها دوو ریــزی هــەرە ســەرەوەی بەعســییەکان بگرێتــەوە). لــە ئینســتیتیوتەکانی دەوڵــەت. ســتراکتۆر و فەرمانبــەران و پیشــەوەران دەســتیان لــێ نــەدرێ. ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە بناغەیەکی سەقامگیر بــۆ بنیاتنانــەوەی ژێرخــانی فیزیکیی و کۆمەڵایەتیی عێراق درێژەی هەبێ.
بەربەســتی ســەرەکیی ئــەم پرۆگرامــە مامناوەندییــە. ژمارەیــەکی زۆری لەبەعسییە پلەبەرزەکان ناگرتەوە( زۆرتــر لەعەرەبــە ســوننەکان) کــە لــەناو

دەسەڵاتدا جێگەی خۆیان قایمکردبوو. "روو"یەکی عێراقیی دەبووایە بدرایە بەداگیرکاریی. ئەویش ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی بوو(لەلایەن گارنەرەوە دانران). مەبەستیش رێگەخۆشکردن بوو بۆ کۆنفراسێکی نیشتمانیی لە جونی 2003 تا بۆ دەستنیشانکردنی حکومەتی گواستنەوە. ماوەی کاربەدەستی گارنەر کورت بوو. بەهەرحاڵ بوو بەقوربانی ئەو شەپۆلە ئانارشیی و تاڵان وبرۆیەی کە عێراقی گرتەوە لەچەند هەفتەی یەکەمی کەوتنی رژێمی سەدامدا. بەشێوەیەکی گشتیی شکستی بەرایی ئیدارەی بوش لە ئەنجامی نەبوونی پلانێکی گونجاوەوە بۆ باروئۆخی پۆستشەڕ بوو. گارنەر لە دەستوبرێکدا لە مەی2003 لەکارەکەی دەرکرا. پۆل برێمەری دیپلۆمات کە بوو بەجێگرەوەی گارنەر. جەختی لە وەستانی پلانی A کردو پلانی B دانا. کە زۆر توندترو پانوپۆڕتر لەپێشوو بۆ لەرەگوریشە هەڵگەندی بەعسییەکان داڕێژرابوو. ئەمجارە چوار ریزی بەرز لە بەعسییەکانی گرتەوە( نزیکەی 100000 کەسی بەرکەوت) و لە ئینستیتیوتەکانی دەوڵەت دەرکران. سوپای عێراق سەرلەبەر هەڵوەشێنرایەوە. بەیەکجار. برێمەر ستراکتۆری دەوڵەتی عێراقی تەواو ئیفلیج کرد. بەلادانی هەموو ئەوانەی ئەزموونیان هەبوو. توانای پرۆفیشناڵیان هەبوو. هەروەها 350000 سەربازی بێچارەی تری خستە ریزی بێکارانی عێراقەوە.
لەئەرکی بنیاتنانەوەی ژێرخانی کۆمەڵایەتیی. ئابووریی و فیزیکییەوە. بۆ شەڕی ئەو یاخیبووانەی باش خۆیان رێکخستبوو. بەرگرییەکی پڕ لەتوندوتیژییان دەکرد. وێڕای ئەوەی برێمەر ئەرکی دروستکردنی دەوڵەتی عێراقیشی لەسەر ساجی عەلییەوە کەوتە ئەستۆ. لەکاتێکدا ئاسانە رەخنە لەم هەنگاوە بگیردرێ. لەراستییدا. هیچ چارەیەکی باشتری لەبەردەمدا نەبوو. بۆی هەبوو زۆرینەی عێراقییەکان بێزارییەکی بێوێنە بنوێنن لە هێشتنەوەی بەعسییەکان. لەدەسەڵاتدا. بەهەرحاڵ. کاروکردەوەی برێمەر. ئەوەندەی تر گۆڵمەزی پرۆسەی بنیاتنانەوەی ئاڵۆزتر کرد.
لەجێگەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی گارنەر. برێمەر بەوردیی دەستی برد بۆ ئەنجوومەنێکی بالانسداریی حوکمڕانیی(عێراق). مایەی رەنگدانەوەی فرە ئایینیی و فرە ئێسنیکیی بوو. وەک وێنەیەکی نموونەیی لە رێکخستن و دابەشکردنی دەسەڵاتدا. ئەنجوومەنی حوکمڕانیی عێراق و

توانســـتی نوانـــدنی تـــا هەنووکـــــە. پێشـــبینیی و نوقلانەیـــــەکی ominoوڵاتە یەکگرتووەکان   خراپی لە بەردەمدا کەڵەکە دەبێ. لە سبەی رۆژی دەوڵەتی عێراق، کە سەروەریی بۆ بگەڕێتەوە.

## ئەنجوومەنی حوکمڕانیی عێراق: بۆنوبەرامەی ئەو شتانەی بەڕێوەن

پێکهێنانی ئەنجوومەنی حوکم لە عێراقدا، رەنگدانەوەی ئـەو بایەخەگرنگـە بوو کە دەسەڵاتی هاوپـەیمانی کـاتیی دابـووی بەهـەموو گرووپـەکان، بـۆ دانیشـتن لـەدەوری مێـز بـەرێژەی بوونیـان لـە کۆمەڵگـەدا. هەوڵـدرا بـۆ بەشدارییکردنی زۆرینەی زلحیزبەکانی شیعە. بەمجۆرە حیزبی دەعوە دوو کورسـیی لـە ئەنجوومەنـدا بەرکـەوت. ئەنجوومــەنی بـاڵای شۆڕشـی ئیسـلامیی-عێـراق شـوێنێکی باشـی بەرکـەوت لـە ئەنجوومـەنی حـوکمی عێراقدا. بەنوێنەرایەتیی ئایەتوڵا محەمەد باقر ئەلحەکیم تـا تیرۆرکرنـی لـە نزارگـەی عـەلی لـە نەجـەف لەلایـەن تاوانبارانێکـەوە هێشـتا نـەزانراوە کێن( بەڵام گومان هەیە سوننە بن). کە لەلایەن برا گەنجەکەیـەوە ئایـەتوڵا عەبدولعەزیز حەکیمەوە جێگەی گیرایەوە.

کوردەکان زۆر بەباشـیی لەلایـەن بـارزانیی و تاڵەبانییـەوە نوێنەرایـەتیی دەکران. هاوشان لەگەڵ کەسایەتی سەربەخۆ مەحمود عوسمانی قاڵـەوەبوو. لەگـەڵ ئەسـتێرەی هەڵکشـاو، سیاسـیی کـورد سـەلاحەدین بـەهادین لـە یەکگرتووی ئیسلامیی( رێکخراوێکی وابەسـتە بـە برایـانی موسـڵمانەوە). ژمارەی نوێنەرەکانی شـیعە( چ ئەوانـەی دینیـی بـوون و چ ئەوانـەی زۆر سێکیولار بوون) 13 کـەس بـوون. نوێنـەرانی عـەرەبی سـوننە 6 کـەس بوون. کوردەکان 4 یان هەبوو. یەک تورکمـان و یـەک کلدوئاشـوورییش نوێنەر بـوون( سـەرەڕای ئـەوەی نوێنـەرە تورکمانییەکـە لەلایـەن حیزبـە سەرەکییە تورکمانییەکانەوە ددانی پێدا نەنرا).[315]

لای کـەم لەسـەر کاغـەز ئەنجوومـەنی حـوکمی عێـراق، جیهـانێکی بچووککراوەی کۆمەڵگەی عێراقیی بوو. کـەچیی هێشتا ئـەم ئەنجوومەنـە دەرگیری گرفـت بـوو. یەکـەم و لەهـەموویان زەقتـر، ئەنجوومـەن لەلایـەن دەسـەڵاتی هاوپەیمانانـەوە دانرابـوو نـەک لەلایـەن خـەڵکی عێراقـەوە هـەڵبژێردرابن. لـەباری پراکتیکـەوە، رێگەچارەیـەکی تـر نـەبوو بـۆ دەربازبوون لێی. هاوپەیمانان زۆر بەپەرۆشـەوە بـۆ ئـەوەی شـتێ دابنێن لەزووترین کاتدا، بۆ ئەوەی ئەو سەرنجە بدات بـە عێراقییـەکان کـەخۆیان بەشداریی دەکەن لە ئیشوکارەکانیاندا.

پرۆسەی هەڵبژاردن( لەپێشەوە بە ئامارێک، دواییش کۆمەڵی یاسـاو رێسـا بۆ جێبەجێکردنی) چەند مانگێک دەخایەنێ، ئەگەر چەند ساڵ نـەبات. بـۆ ئۆرگەنایزکردنی، تاکە چارەی واقیعی دەستەیەکی دیارییکراو بـوو. بـەڵام بەربەستی ئاشکرا، ئەوەبوو کە ئەنجوومەنی حوکم بەئاشکرا ناشەرعییەتی پێوە دیاربوو لەچاوی عێراقییەکاندا. وایان سەیر دەکرد کـە دروسـتکراوی دەستی هاوپەیمانانـە. دووەم، سـەبارەت بـە ئەنجوومـەنی حـوکم، شتێکی کەمیان لە حوکمڕانیی کرد، ئەمەش رەنگدانەوەی، بـێ توانـایی ئەنـدامانی ئەنجوومەنی حوکم بوو بۆ رێکنەکەوتن لەسەر هەرشتێ کە بایەخی هـەبێ، هەروەها رەنگدانـەوەی ئـەو راسـتییە تاڵـەش بـوو، کـە چـەقی قورسـایی دەسەڵات لە کوێیە. لەکاتێکـدا دەسـەڵاتی هاوپـەیمانان( لـەژێر رابەرایـەتی برێمەردا) خاوەنی دیفاکتۆی ڤیتۆ بوو بەسـەر بڕیارەکـانی ئەنجوومەنـدا، واتە ئەنجوومەن لەهەموو دەسەڵاتێک داشۆرابوو.[316]

سێیەم، لەکاتێکدا بەگومانەوە لە رووی دیمۆگرافییەوە نوێنەرایـەتی جڤـاکی عێراقیـی دەکـرد، ئەنجوومـەنی حـوکم لای کـەم خـاڵێکی گرنگیـان نوێنەرایەتیی ناکرد: ئەنجوومەن نەک هەرهەموویان کەسانی تاراوگە بوون و هاتبوونەوە، بەڵکوو زاڵیش بوون بەسەریدا. هەروەها دەبووایە هەر 25 کەسەکە وەک یەک بوونایە، هەندێکیان زۆرتر لەوانی تر شایسـتەتربوون. ئێلیتێکی 9 کەسی لە ئەنجوومەن دابڕدرا بۆ ئـەوەی سـەرۆکایەتی عێـراق بەنۆرە بکەن.[317] لەم گرووپە هەڵبژاردەیەدا، تەنها یەک نوێنەر( موحسین عەبدولحەمیـد) دەکـرێ بڵێـی بەڕاسـتیی" عێراقیـی عێراقییەکانـە." ئـەم لەبەرچاوگرتنەی ئەوانەی هەندەران لەلایەن هاوپەیمانانەوە دەکرێ جێگـەی تێگەیشتن بێ، وێڕای هەر شتێ، دوورخراوەکـان {نـەفیکراوەکان} چەنـد

لایەنێکی بەهێزیان تێدایە. لەلایەن هاوپەیمانانەوە ناسراون و باشتر تێدەگەن کەچۆن مامەڵە لەگەڵ ئەمێریکاییەکاندا بکەن.
لای کەم هەندێ لەدوورخراوەکان دەکرێ وا سەیر بکرێن، کەپرۆدێمۆکراتیکێکی جێگەی متمانەن و ساڵانێکیان لەرۆژئاوا بردووەتە سەر و کەمپەینێکی باشیان بۆ رووخانی سەدام کردبوو.[318] بەڵام سەرەڕای ئەوەی دوورخراوەکان لەچەشنی ئەحمەد چەلەبیی بۆی هەیە هەموو سیفاتێکی باش و چاکی تێدابێ بە قسە( لەروانگەی ئەمێریکاوە) بۆ ئەوەی رۆڵی سەرکردە لەحکومەتی عێراقدا بگێڕێ( بەتەواویی رۆژئاوایی بوو، شیعەیەکی سێکیولار بوو، سیاسییەکی لێزان و شارەزاش بوو) . بەڵام بە کردەوە لە عێراقدا نەناسرابوو. هاوکات بارکرابوو بەبۆچوونی سیاسییەوە لە ئەنجامی مامەڵەی لەدەرەوەی ئۆپۆزیسیۆندا. زۆرێک لە دوورخراوەکان، بە خۆتێخزاندنیان لە ئەنجوومەن، هاوپەیمانان ئەو رەوایەتییەیان لێسەندنەوە، کە بگوترێ ئەنجوومەنی حوکم بانگەشەی نوێنەرایەتی دەنگی راستەقینەی عێراقییەکان دەکات.
لەکاتێکدا ئاسانە رەخنە لەبرێمەرو دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان بگیردرێ، لەسەر شکستی ئەنجومەنی حوکمی عێراق، کە برێمەر تەنها ئەو گرفت و بەربەستانەی تاقیکردەوە کە هاوشانی داگیرکاری سەربازیی دەوڵەتێک لەلایەن دەوڵەتێکی ترەوە لێی کەوتەوە. ساتەوەختێ، داگیرکاریی خۆی بەهرەمەند نەبێ لە رەوایی داگیرکارییەکە لەچاوی خەڵکدا. لە هەر دەستەو تاقمێکیش وا دەڕوانن کەهێزی داگیرکار سەپاندوونی و شەرعییەتی نییە. بەڵام بەدڵنیاییەوە هەر داگیرکارییەک کە بەهرەمەند بێت لە رەوایی داگیرکردنەکە لەلایەن خەڵکەوە، پێویستیی بە حکومەتێکی کارتۆنیی خۆیی نییە کە رووی داگیرکار بێت.
شکستی ئەنجووومەنی حوکمی عێراق لە بەجێهێنانی ئەرکەکانیدا وەک "دەنگێکی عێراقیی". گرفتە قووڵەکانی تۆختر دەکردەوە. لەناوخۆدا. مایکرۆکۆزمی{ جیهانی بچووک-microcosm } ی جڤاکی عێراق بێئومێدانە دابەش ببوو. زۆرینەی ئەندامەکانی لە ئۆپۆزیسیۆنی تاراوگەی عێراقەوە هاتبوون- سەرقاڵبوون بە توندوتیژترین کێشەی تایبەتییەوە- هەروەها ئەنجوومەن بە راشکاویی لەسەر ئایدێنتیتیی ئێسنیکیی و تایەفیی چێکرابوو. شتێکی سروشتیی بوو کە ئەندامانی ئەنجوومەن بەپێی

بەرژەوەندییە ئێسنیکیی و تایەفییەکان هەڵسوکەوت بکەن. مەترسیی بەردەوام لە ڕێکخستنی ئەم دەسەڵات دابەشکردنە، کە ڕەنگدەداتەوە لە دابەشکردنی جڤاکدا لەئاستی دامودەزگا سیاسییەکاندا بێ. هەروەها کۆمەکی ئەو جیاوازییانە دەکات لە بری پێکهێنانەوەو ئاشتکردنەوەی دابەشبوونە جڤاکییەکان.
ئەمە بەتەواوەتیی لە بۆسنیادا روویدا. هەمان شتیش لەناو ئەنجوومەنی حوکمی عێراقدا روودەدا. ڕێگایەکی روون نییە لەئاست ئەم گرفتەدا؛ لەراستییدا تەنها ڕێگە دەبووایە حکومەتی عێراقی لەسەر بنیات بنرایە. دەبوو ڕێگە چارەیەک بدۆزرایەتەوە کە هەمووان بەیەکسانیی بەشداریی تێدا بکەن، بەپێی دابەشبوونە ئێسنیکیی و تایەفییەکان. بەڵام " نەکەوتنە سەرپێی" ئەنجوومەنی حوکمی عێراق، بەوشێوەیەی هەنووکەش، فۆرمێکی هیچکارەیە- تا زەمینەیەک بۆ گەشبینیی ئەوە خۆشبکات، کەهەمان سیستەم کاردەکات، ئەگەر لەئاستێکی نیشتمانییدا بکرایە. ئەو گرفتانەی دەرگیری ئەنجوومەن بوون، ڕەنگە هەمان گرفت بن کە دەرگیری عێراق بەشێوەیەکی گشتیی دەبن. ئائامادەیی نوێنەرە مەزهەبییەکانی شیعە بۆ پەژراندنی هەر ڕێگەچارەیەک جگە لەوەی دەربڕی باڵادەستیی زۆروبۆرییان بێ، هەروەها قیرسیچمەیی کوردەکانیش لەسەر فیدراڵیزمی ئێسنیکیی، هیچیتر نەبوون جگە لە ناتەباییەکی ئاشکرا کە ئەنجوومەنی حوکمی عێراقی داڕزاند.

## پلانی C: ستراتیژیی دەرچوون

ڕاوەستانی پلانی B لە پڕێکدا لەسەرەتای نۆڤەمبەری 2003 دا. تەکانی بە دوو بڕیاری چارەنووسساز، لەلایەن ئیدارەی بوشەوە دا. یەکەمیان، مانگی ئۆکتۆبەرو دوو هەفتەی یەکەمی نۆڤەمبەر، بەرزبوونەوەی رادەی توندوتیژیی زۆری دژی هێزە داگیرکارەکان بەخۆوە بینی، بەتەنها لە دە ڕۆژی یەکەمی نۆڤەمبەردا.. پتر لە 40 سەربازی ئەمێریکایی گیانیان لەدەستدا. کەوتنە گەڕان بەدوای ستراتیژییەکدا بۆدەرچوون، کە سەروەریی بگەڕێنێتەوە بۆ عێراقییەکان هەرچیی زووتر. دووەمیان، پلانی B کاتێکی دیارییکراوی بۆ گەڕانەوەی سەروەریی بۆ عێراق دانابوو، کە پێوەند بوو بە ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی حوکمەوە، بۆ ئەوەی قۆناغی

یەکـــــەم تێپـــــەڕێنرێ. ئەنجوومەنی حوکم لە 15 ی ێیسـەمبەردا. دوا کاتی بۆ دانرا. بۆ دەستنیشانکردنی میکانیزمێک بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ کۆنفراسێکی دەستووریی.
دواتر ئەم دەستووره نوێیـه بخرێتـه رێفەرێندەمـەوه. هـەڵبژاردن بکـرێ و سەروەرییش بگەڕێتـەوه بـۆ حکومـەتی هـەڵبژێردراوی عێـراق. هـەروەک پێشبینیی دەکرا. پلانی B قۆناغی یەکەمی تێنەپەڕاند. بەدەرککردن بـەوەی کێ کۆنترۆڵی نووسـینەوەی دەسـتوور بکـات. سـەرئەنجامیش کـۆنترۆڵی سیستەمی سیاسیی دەکات. پیاوی ئـاییینی. خـاوەن شـکۆ ئایـەتوڵا عـەلی سیسـتانیی. فەتوایـەکی دەرکـرد. داوایکـرد. کـە نوێنـەرەکانی بـۆ هـەر دەســـتوورێک دەستنیشـــان دەکـــرێن. راســـتەخۆ لەلایـــەن خەڵکـــەوه هەڵبژێردرێن. بۆی هەبوو ئەمە رێگە خۆشبکات بۆ دامەزراوەی مەزهـەبیی دەست بەسەر دیزاینگی دەستووردا بگـرێ.[319] بێگومـان ئـەم هەڵبژاردنـە جەماوەرییەی بۆ نوێنەرەکان دەکرێ. لە ناو تـەپوتۆزی شـەڕی گەریلاییـدا پێویستی بەئامارەو کاتیش دەخایـەنێت. ئەنجوومـەنی حـوکم لەسـەر ئـەم مەسەلەیە گیریخواردبوو. بۆ شکاندنی ئەم گێرمەوکێشەیە و تاودانی کـات. ئیدارەی بوش پلانیB وازلێهێناو پلانیC دانا.
گـۆڕینی لـەناکاوی ئـەم پلانـە. مایـەی پەژراندنـە. لەکاتێکـدا هەلومـەرجی ئاساییش زۆر بەخێرایی بەرەو خراپتـر دەڕۆیشـت. بـەڵام خەجاڵەتییـەک بوو بە دەموچـاوی برێمـەرەوه. کـەچۆن پاکانـەی بـۆ بکـات. لـە کۆتـایی سـێپتەمبەردا برێمـەر پلانـی B بـەوه وەسـفکرد" روون و ئاشـکراو ریاڵێتیکـە". هەنـدێ لەوردەکارییـەکانی بـەکورتیی گـوت. کـە پرۆسـەی گەڕانـەوەی سـەروەریی بـۆ عێراقییـەکان تێدایـە. " هـەنگاوی حەوتـەم. هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی هاوپەیمانانە. کەدوای هـەڵبژاردن دێـت. کـاتێ عێراق بوو بەخاوەنی حکومەتێکی هەڵبژێردراو. دەسەڵاتی هاوپەیمانان. بە خۆشییەوه پاشماوەی دەسەڵاتەکانی خۆی بە حکومەتی سەربەخۆی عێـراق دەدات."[320] بـەکورتیی دەسـەڵاتی هاوپـەیمانان. تـەنها کـاتێ دەسـەڵات دەدەنەوه. ئەگەر حکومەتێکی گەلیی هەڵبژێردراو بێتە کایەوه.
پلانـــی C پێشـــبینیی رووداوگـــەلێکی جیـــاوازی دەکـــرد. لـــە 28 فێبریوەری2004 دا. ئەنجوومەنی حـوکم" لـە مشـتومڕێکی نزیـک لەگـەڵ دەسەڵاتی هاوپەیماناندا" دەبووایە کلێشـەیەکی سـەلێمێندراوی لـە یاسـای

بنـــەڕەتیی Fundamental Law وەک دەستوورێکی کاتیی بۆ عێـراق دابنایـە. ئـەم یاسـای بنەڕەتییـە دەبووایـە ( لەنێوان بڕیارەکانی تردا) ڕەچەتەیەکی لەخۆ بگرتایە، کە مافـەکانی وەک ئازادییە ڕۆتینەکان و پاراستنیانی تێدا بووایە. " ڕێخکسـتنێکی فیـدراڵیی بـۆ عێـراق، کـە پارێزگاکـان و جیاکردنـەوەو دیـاریکردنی دەسـەڵاتەکانی قەوارەی سێنتراڵ و لۆکاڵییەکان " و ڕۆژی بەسەرچوونیان لەخۆبگرێ. بـە "هەڵبژاردن"ی ئەنجوومەنی نیشتمانیی کاتیی، ئەنجوومەنی حوکمی عێـراق خـۆی هەڵدەوەشـێنێتەوە.[321] ئـەو پرۆسێسـەی ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی نیشتمانیی کاتیی تێدا هەڵدەبژێردا، تا ڕادەیەک ئاڵۆز بوو.
هەریەکە لە 18 پارێزگاکەی عێراق کۆمیتەیـەکی ڕێکخسـتن لـە 15 کـەس پێک دەهێنن.( تێکەڵەیەک لە ئەنجوومەنی حوکم و نوێنەرە ناوخۆییەکان ) کە کۆنگرەی هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی پارێزگـا دەبێـت و پێکهـاتووە لـە " پیاوماقوڵانی هەموو پارێزگاکـە" . هـەر کۆنگرەیـەکیش دواتـر نوێنـەرانی ئەنجوومـەنی نیشـتمانیی کـاتیی دیاریدەکـەن بـەپێـی دانیشـتوانی هـەر پارێزگایەک لە کۆی دانیشتوانی عێـراق. ئەنجوومـەنی نیشـتمانیی کـاتیی دەبێ لە 31 ی مەی 2004 دا هەڵبژێردرێ، پێشبینی دەکرێ، " سەروەریی تەواوی دەسەڵات بۆ حوکمکردنی عێراق" لە 30 ی جونی 2004 بگرێتـە ئەستۆ. هەروەها دەبێ دەستووری هەمیشەیی لە نیوەی دووەمـی 2005 دا ئامادەبێـــت( ڕەنگرێـــژ دەکـــرێ لەلایـــەن نوێنـــەرە ڕاســـتەوخۆ هەڵبژێردراوەکانەوە) و هەڵبژاردنێکی تر لە 31 ی دیسـەمبەری 2005 دا بۆ حکومەتی نوێی عێراق لەخۆ دەگرێ.
وردەکارییەکانی پلانی C لەلایـەن ئەنجوومـەنی حـوکم و هاوپەیمانانـەوە پەژرێنرا. بەمشێوەیە بەعەقڵدا دەچێ، شیمانەی ئەوە بکـرێ کـە پەرۆشـیی هەیە لە هەردوولاوە بۆ ئەوەی پلانەکە بەسەرپێ بکەوێ. لەباری تیۆرییـەوە ئەمە چارەسەرییەکی گونجاوە. یاسـای بنـەڕەتیی بەدڵنیاییـەوە جێدەسـتی ئەمێریکای پێوە دیار دەبێ( دەسەڵاتی کـاتیی هاوپـەیمانان، مـافی ڤیتـۆی لەسەر بەندەکانی دەبێ)، بەڵام جۆرە گەرەنتییەک هەیە کە حـوکمی عێـراق هـەر بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو دەکـات. بـەپێی ئـەم پلانـە، دەسـتووری هەمیشەیی عێراق لەلایەن عێراقییەکانەوە دادەنرێ، بەمشێوەیە بـۆی هەیـە چانسی ئەوەی هەبێ کە شەرعییەت وەربگرێ.

پلانەکە خۆی لە تێوەگلان بە هەڵبژاردنی راستەوخۆو و کتوپڕەوە بەدوور دەگرێ، "هەڵبژاردن" ی ئەنجوومەنی نیشتمانیی کاتیی بەسێ قۆناغ بەڕێوە دەچێت، بێئەوەی راستەوخۆ خەڵکیی رۆڵی تێدا بێت. بەڵام لەبەر ئەوەی کورسییەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانیی راگوزەر دابەشدەکرێن بەشێوەیەک لەگەڵ رێژەی دانیشتواندا بگونجێ، هێشتا شیعەکان هێزێکی باڵادەست دەبن. گرنگترین شت لە روانگەی ئەمێریکاوە، پلانەکە سەروەریی لە قۆناغێکی زووتردا، وەک ئەوەی پێشبینیی دەکرا بگەڕێنێتەوە. سەروەریی تەواو دەگەڕێنرێتەوە بۆ حکومەتی گواستنەوە ( نەک بۆ حکومەتی هەڵبژێردراو لەلایەن گەلەوە). کلێشەی دەستووری هەمیشەیی لەدوای ئەوەی دەسەڵات درایەوە، نەک پێش ئەوە، ئەگەر هەموو شتەکان بەپێی پلانەکە رۆیشت، ئەمێریکا وەک هێزێکی داگیرکار رۆڵی خۆی لە جونی 2004 دا کۆتایی پێ دەهێنێ، بەمشێوەیە شیمانەی دەرچوونی پێشوەخت لەعێراق لەسەر پلانەکە بەندە.

بەسادەیی، چارەی باشتر بۆ عێراقییەکان نەمایەوە، پلانی C وەک هەر پلانێکی تر لە قۆناغی پێشهاتەکاندا. گەورەترین بەربەست لەبەردەمیدا بەئاشکرا، ئەو ئاڵۆزیی و سەرلێشێواوییە بوو کە هەیبوو. تەنها گەیشتن بە حکومەتی گواستنەوە پێویستیی بە پرۆسێسێک بوو کە سێ قۆناغی لەخۆ دەگرت، لەوانە هەڵبژاردنی نوێنەرەکان( بۆ رێکخستنی کۆمیتەکان) کە دواتر نوێنەرەکان دیاریدەکات( بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی پارێزگا) ئەمانیش لای خۆیانەوە نوێنەر هەڵدەبژێرن بۆ ئیدارەی کاتیی. ئەگەری ئەوەی مەبەست لە دابەشکردنی ئەم پرۆسێسە بەسەر سێ قۆناغدا، ئەوەیە کە یەک هەنگاو ئەو گرنگییەی نابێ بۆ بزواندنی مان و نەمانی خەباتی سیاسیی. بەڵام کەموکوڕیی ئەم پرۆسێسە لەوەدا بوو کە دووردرێژ و چەند قۆناغیی بوو، بۆی هەیە خاڵی جیاوازییەکان زێتر بکات و ئەگەری سەرهەڵدانی کێشەی سیایی لێبکەوێتەوە.

لەکاتێکدا گرفتی دیاریکردنی نادیموکراتییانە بەبەردەوامیی، ئامادەیی لە گرووپگەلی یەکەمدا هەبوو بۆ راگرتنی رووداوەکان . بۆ ئەوەی ئەم پلانە کارگوزار بێ، لەهەموو قۆناغەکانی پرۆسێسەکەدا، پێویستیی بە سازشکردن، رێککەوتن و ویست بۆ دانانی بەرژەوەندی گشتیی لەسەروو بەرژەوەندیی ئێسنیکیی و تایەفییەوە هەبوو. زۆر بەکەمیی ئەمانە پێناسەی

ئەنگاری مێژووی سیاسیی عێراق دەکەن. هەروەها ئەگەری تەنینەوەی کێشەی سیاسیی بەهۆی ماوەی دیاریکراوی پرۆسێسەکەوە لە ئارادا بوو. جێگەی بڕوا نەبوو، پرۆسێسی سێ قۆناغ لە سێ مانگدا (لە کۆتایی فێبریوەرییەوە تا کۆتایی مەی 2004) تەواو ببێ- ئەمانە خشتەگەلێکی زۆربەرزەفڕ بوون لە هەلومەرجی هەنووکەدا. ئەگەر بزوتنەوەی یاخیبووان کە تا دەهات توندوتیژتر دەبووەوە تێک نەشکێنرێ. یان لای کەم کۆنترۆڵ نەکرێ و ئەوساش پلانی سێ قۆناغەکە. زێتر پرۆسەیەکی سیاسیی ئەکادیمیی دەبێ.

## یاخیبوونی سونیی

لە نۆڤەمبەری 2003 دا هێزەکانی هاوپەیمانان رووبەرووی قەبڵاندنێکی کۆنسێرڤەتیڤانەی 30 پەلامار لەرۆژێکداو کوژراوێک لە هەر 36 کاتژمێریکدا دەبوونەوە. لەراستییدا نیوەی یەکەمی نۆڤەمبەر سەلماندی بۆ ئەمێریکا رۆژگارێکی خوێناویی بوو. 40 سەرباز کوژران لە دە رۆژی یەکەمی ئەو مانگەدا. هێڵی ستاندەرد بۆ ئیدارەی بوش- ئەوەبوو کە یاخیبووەکان پێکهاتوون لە ژمارەیەکی کەم لە لایەنگرانی" سەرسەخت" ی سەدام و کۆمەڵەیەکی پەراکەندە لە توخمی تێرۆریستە بیانییەکان.

لە ناووناوبانگی CIA کەمبووەوە. لەپاش بڵاوبوونەوەی ریپۆرتێکی دزەپێکراو. لە ناوەڕاستی نۆڤەمبەردا. ریپۆرتەکە قەبڵاندی کە سەرۆکی نێوەندی ئاژانسەکە لەبەغداد ئامادەیکردووە. ریپۆرتەکە ژمارەی یاخیبووەکانی بە 50000( بەبەراورد بە قەبڵاندنی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کە بە 5000 دایدنابوون) دانابوو. هەروەها گومانی جدیی ورووژاند لە توانستی هێزی هاوپەیمانان لەوەی یاخیبووەکان تێکشبشکێنن. سەرەڕای ئەوەی سەرچاوەی یاخیبوونەکان لەرووی جیۆگرافییەوە بە ( سێگۆشەی سوننیی. کە ناوچەکانی نێوان بەغداد و تکریت و فەللوجە دەگرێتەوە) دەستنیشانکرا. کەچیی یاخیبووەکان لە نۆڤەمبەری2003 دا توانایەکی سەرسوڕهێنەریان لە بەڕێوەبردنی چالاکیی کەم-وێنە و ئاستێکی باڵا لەوێرانکردنیان لەدەرەوەی ناوچەکەش لە ئەستۆ دەگرت.

ئایـــدیَنتیتی گرووپـــە بەشداربووەکان بەناڕۆشنیی دەمێنێتەوە، بەڵام روونە کە یاخیبوونەکان لەوە فراوانترن کە هەر بـە لایـەنگرەکانی سـەدام بناســرێن. وێبســایتی چــاودێریی دیمۆکراســیی لــەعێراق Iraq Democracy Watch لیستی بێپسانەوە لە گرووپە بەرهەڵستکارەکان بڵاو دەکاتەوە، کە هەنووکە بە 29 گرووپ گەیشتوون. لەکاتێکدا گرووپـی لایـەنگرانی بـەعس، وەک حیزبـی گەڕانـەوە و فیدائییـەکانی سـەدام دیارترینیانن، بـەڵام لیسـتەکە گرووپـی عەرەبـە ناسیۆنالیستەکان ( وەک ناسرییەکان)، یەکـە ئیسـلامییە رادیکاڵـەکان( وەک ئەنسـاری ئیسـلام و سوپای محەمەد) و گرووپی ناسیۆنالیستە عێراقییەکان( تیپەکانی بـەرگریی عێراقیی) یشی لەخۆ دەگرت.

لە راستییدا، یاخیبووەکان، گرووپگـەلێکی تێکەڵوپێکـەڵن، بـۆی هەیـە لـە هەلومەرجی نۆرماڵدا لەبری دۆستایەتیی، دوژمنایەتیی یەکتری بکەن. بـەڵام بۆ ئامانجێکی هاوبـەش و کـاتیی بـۆ دەرپەڕانـدنی هێـزە داگیرکارەکـان لەعێراقـدا، یـەکیان گرتـووە. لـە سـەروو ئەمانەشـەوە، ئـەوە دەزوولـە هاوبەشـانەی ئـەم گرووپانـەی پێکـەوە گـرێ دابـوو، زۆرینـەیان نـەک هـەموویان، لـە گرووپـی عەرەبـە سـوننەکان بـوون. ئەمـەش بـۆ هێـزی هاوپـەیمانان خواپێداوییـەکی تێکـەڵ بـوو. لایـەنی پـۆزەتیڤیی، ئـەوەی دەردەخست کە یاخیبوون هێشتا نەپەڕیوەتـە دەرەوەی کەمینـەی عـەرەبی سوننەوە. لایەنی نەگەتیڤییش ئەوەبوو کە بەشێک لە دانیشتووانی عێـراق، چەقی قورسایی کەمپەینی پڕلەتوندوتیژیی ئەمێریکا دژ بـە یاخیبووەکـان بەریان دەکەوێت.

بەدەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنەکانی چەکوشـی ئاسـن و گـەردەلوولی لاولاو ivy ی 1 و 2 لە نۆڤەمبەری 2003 دا، وڵاتە یەکگرتووەکان ئاماژەی بـە ئاستێکی بەرز لـە تـەقوتۆق کـرد، کـە هـەموو گـوڕی خـۆی لەسێگۆشـەی سوننیدا بەکار هێنـا. یـەکێک لەگرفتـەکانی ئـەم مامەڵەیـە ( وەک دانـەری ڕاپـۆرتی دزەکـراوی CIA دەستنیشـانیکردووە) ئەوەیـە، لـەڕووی مێژووییەوە بـەکارهێنانی هێـز بەدڕنـدەیی بـۆ تێکشـکاندنی یـاخیبوون دەرکـەوتووە کـە کاریگـەر نییـە، بـەڵکوو ئـەنجامی پێچەوانەیشـی لێدەکەوێتەوە. هەرچەندە توندوتیژیی کوێرانە زیاد بکات، بێزاریی خەڵکـە رەسەنەکە زیـاد دەکـات و ئاسـتی پشـتیوانیی خـەڵک بـۆ یاخیبووەکـان

دەچێتـــــــە ســــــەر. ســەرەکییترین کێشــە ئەوەیــە کــە عەرەبــە سوننەکان هیچی ئەوتۆیان بە کۆمەککردنی یاخییبووەکان لەدەست نــاچێ. پلانی C ( یان هەر پلانــێ بــۆ بەدیموکراسییکردنی عێـراق لەمبارەیـەوە) رێگەچارەیەکە بۆ بەرکـەنار خسـتنی دانیشـتوانی عـەرەبی سـوننە. بۆیـە سوننەکان هیچ پاڵنەرێکیان نییە کە بەشداریی لەسەرخسـتنی پلانــی C دا بکەن، بەڵکوو هەموو جۆرە پاڵنەرێکیان هەیە بۆ درێـژەدان بەبـەرگریی و پەکخستنی.

چەرمەسەرییەکی تر ئەوەیە، پەیامی باڵکێش و سنگ دەرپەڕاندن بە هێزی سەربازییەوە( تا ئەمێریکا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ) پێچەوانەی لۆژیکی پلانی C یە. وا دادەنرا کە پلانەکە بەشێوەیەکی بەرین( ئەگەر راست بێـت یــان چــەوت). رێگــە چارەیەکــە بــۆ دەرچــوونێکی پێشـوەختی هێزەکـانی ئەمێریکا. بەرپرسانی ئیدارە بەتونـدیی ئەمــەیان رەتکـردەوە. بـەگوێرەی دۆناڵد رامسفێڵد بێت، " هــیچ برِیــارێ بــۆ کشــانەوەی پێشـوەخت نییـە"، قسەیەک کە بوش دووبــارەی کـردەوە" ئێمـە دەمێنینـەوە."[322] بــەڵام زۆر دوورە لە راستییەوە. بناغەی ئەم راگەیاندنانە هیچ بەرچاوڕوونییەکی تێـدا بێ. ئەگەر رێڕەوی پلانی C لە رەوگەی خۆی دەرچوو، بۆی هەیە کە وڵاتە یــەککگرتووەکان هـــەموو دەســـەڵاتێکی ســـەروەریی بـــە ئەنجوومـــەنی گواســتنەوەی نیشــتمانیی. لــە 30 ی جــونی 2004 دا بداتــەوە. دەبــێ سەروەریی تەواو، مــافی دەرکردنــی ئــەو برِیارانــەی هــەبێ کــە هێزەکـانی ئەمێریکا لەعێراق دەربکات. بەمشێوەیە هێزەکانی ئەمێریکا تەنها لەکاتێکدا دەتوانن بمێننەوە ئەگەر لەلایەن ئەنجوومـەنی گواسـتنەوەی نیشـتمانییەوە بانگهێشت بکرێن.

شتێکی نالۆژیکییە ئەگەر یەکەمین کارێک کــە حکومــەتی عێراقــی خـاوەن سەروەریی پێی هەڵسێ، جەختکردنەوە لە مانــەوەی هەمیشــەیی هێزەکـانی ئەمێریکا لەوڵاتدا بێت. بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەمە رێکوپێکیی پلانی C یە بۆ ستراتیژی دەرچوون. ئەگــەر هێزەکــانی ئــەمێریکــا دەربچــن، نــەک لەبــەر ئــەوەی دەردەپــەڕێنرێن لەلایــەن یاخییبووەکانــەوە، بــەڵکوو لەبەرئــەوەی " بانگهێشتیان لێناکرێ" لەلایەن حکومەتی شەرعیی و سەربەخۆی عێراقـەوە، بۆ مانەوە. لە پراکتیکدا، گرنگ نییە کە ئارمانجە راستەقینەکانی ئیـدارەی بوش کامانەن، بــەڵکوو گرنــگ ئەوەیــە کــەچۆن ســەیری ئــەو ئارمانجانــە

دەکات. ئەگەر سەرنجەکە ئەوەبێ، کە ئیدارەکە بە شوێن دەرچوونێکی خێراوەیە. ئەوکاتە ئەو پەیامەی کەدەڵێ هێزەکانی ئەمێریکا سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. چەند کات و خەرجیی تێ بچێ. ئەوەندەش قسەیەکی قۆڕە.

## شیعە: ئامادەباشیی بۆ دەسەڵات

بەپێچەوانەی دانیشتوانی سوننەوە. دانیشتووانی زۆرینەی شیعە هەموو جۆرە پاڵنەرێکیان بۆ هاوکاریی، لای کەم لەهەنووکەدا. لەگەڵ پلانەکانی ئەمێریکادا بۆ پاشەڕۆژی عێراق هەیە. چێکردنی دیمۆکراسیی چەندین سەدە لەحوکمی سوننە ژێرەوژوور دەکات و تەواو بە دڵنیاییەوە حکومەتێکی بالادەستی شیعە بەدیدەهێنێ. ئایا ئەمەش دەبێتە هۆی رژێمێکی سیۆکراسی{ رژێمی ئاخوند} theocracy بەستایلی ئێرانیی یان لەسەر شێوەی دەوڵەتێکی ئیسلامیی میانڕەودا. پرسیارێکی کراوە دەبێ. دانیشتووانی شیعەی عێراق بەئاشکرایی دەردەکەوێ پێکهاتەیەکی چوونیەک نین. تا پێکەوە بەیەک دەنگی گرێدراو دەربڕیی لەخۆیان بکەن. بەڵام ئەوە روونە کە زۆرترین دەنگە بەهێزەکان لە ناو کۆمیونیتی شیعەکاندا. سەرکردە ئایینییەکانن و رێکخراوترین ( و پرچەکترین) گرووپی شیعە. پارتە مەزهەبییەکانن لەچەشنی ئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق و حیزبی دەعوە . گرووپی لەم چەشنە زۆر بەپەلە دەستیان بە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە کرد. کە لە رووخانی سەدامەوە هاتە دی. بەباشیی لە زۆرینەی شارو شارۆچکەکانی سێنتەر و باشووردا. خۆیان داکوتاوە.

دەنگی زۆر شکۆدار ئایەتوڵا سیستانیی. پیاوی ئایینیی لەنەجەف وەک کاریگەرترین دەنگ لە دوای سەردەمی سەدام‌لەعێراقدا دەرکەوت. بەڵام کەسانیتر کەمتر میانەڕەو. وایان لەخۆیان کرد کە دەنگیان هەبێ. لەمانە موقتەدا سەدر ناسراوترین و بەتواناترین کەسایەتیی و فیگەری رادیکالی شیعە. بنکەی دەسەڵاتەکەی دەکەوێتە شاری سەدرەوە لەبەغداد. بەڵام بزوتنەوەی سەدر سەرکەوتووبوو لە بلاوکردنەوەی پەیامەکەیدا لە ئاستی ناوەڕاست و باشووری عێراقیشدا. سەدرییەکان بەشدارییان لە ئاژاوەگێڕییەکانی کەربەلا لە جولایدا دژی مارینزەکانی ئەمێریکا کرد.

دواتــر خۆیــان لــه کــاری ئاژاوەچییـــەتیی بەســـرەش لەناوەڕاســـتی ئۆگەستدا هەڵقورتاند. دەسەڵاتی سەدر کاڵنەبووەوە وەک زۆر لەچاودێران پێشبینیان دەکرد. بەپێچەوانــەوە زیـادیکرد. تــەواوی رۆژهــەڵاتی بەغـداد، کوفە و سامەڕا ئێستا بوونە بەناوچەی باڵادەستی ســەدرییەکان، هــەروەها جێدەســتی لــە کەربــەلا، نەجــەف و بەســرەدا گەشــە دەکـات. ســەرەڕای ئەمانەش، لە پاییزی 2003 دا موقتەدا سەدر، دروســتکردنی میلیشـیایەکی تایبەت بەخۆی( سوپای مەهدی) کە ژمارەیان بە 10000 پیاو دەقەبلێنرا، ڕاگەیاند.

فاکتێک هەیە کە هێزێکی شـیعیزمی سیاسـیی لـە عێراقـدا دروسـت دەبـێ، پێویسـت ناکـات بـە چـاوێکی پـڕ لەترسـەوە سـەیر بکـرێ. بەهــەرحاڵ، شیعیزمی هەمەچەشـنی موقتـەدا. زۆر نیگـەرانی ئـەوەن کـە کـێ دەتـوانێ یەکێتیی خاکی عێـراق رابگـرێ، لەکاتێکـدا دەیـەوێ ڤێرژنێکـی شـیعیزمی کەموێنە و راستەقینە جێکەوت بێ. دوور لـە ئامـاژەو هەڵوێسـتە تـەباکانی ئایەتوڵا سیستانیی، بزوتنــەوەی ســەدر بەشـوێن سـەپاندنی دەســەڵاتێکی مەزهەبیی شـیعییەوەیە لەعێراقـدا. بـۆ کەمکردنـەوەی دەسـەڵاتی بیـانیی و ملکەچکردنی سوننە بۆ رابەرایەتییکردنی مەزهەبی شـیعیی.[323] ســەرەڕای ئەوەش، بزوتنەوەکە بەتایبەتیی لەسەر فیگەری کەسایەتیی سەدر بەند نییە. ئەگەر ئەو رابەرایـەتیی نەکردایـە. کەسـێکی کـەفوکولاویی تـر ئەرکەکـەی لەئەستۆ دەگرت. بۆی هەبوو زۆر توندڕۆتر بووایە و پابەندبوایە بە بـاڵی تونــدڕۆی ئایــەتوڵاکانی ئێرانــەوە. لەوانــەش ئایــەتوڵای پایەبــەرز کــازم ئەلحائیریی. رادیکـاڵ لەسـەر سـتایلی خومـەینیی. کـە داوای دامەزرانــدنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی توندوتیژ بۆ عێراق دەکات.

لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ Chronicles لە سانفرانسیسکۆ لە ناوەڕاسـتی نۆڤەمبەری 2003 دا Robert Collier. لەسـەر ئەنجوومـەنی حـوکمی عێراق دەڵێ" مەقاشی دەستی ئەمێریکایـە". پلانـیC شـی بـە " نابـەجێ" وەسف کردووە. Collier بـەوەرگرتن لـە دیپلۆماتکـارێکی رۆژئاواییـەوە لەسەر ئەلحائیریی ئاماژە بەوە دەکات. " ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ عێـراق. وەک ئەوەیە دەنکە شقارتە فڕێ بدەیتە سەر گازۆلین."[324] پرسیاری لێکرا کـەی دەیـەوێ بگەڕێتـەوە بـۆ عێـراق( کـە لـە 1974 ەوە لـە قـوم-ئێرانـە)، ئەلحائیریی بە دوقڵانە لێدانەوە بەوەڵام هات." لەکاتی گونجاودا".

## کوردەکان: کۆتایی ئۆتۆنۆمیی

لە سەرجەم، ئەو ماوەیەی دوای هەرەسی سەدام، کوردەکان ئۆتۆنۆمییەکەی خۆیان لە باکووری عێراق مشتومالتر کردووە، چاودێریی ئەو رووداوە پڕ لەئاژاوانەی باشوور بە تەنانەت زۆرتر لەنەوەدەکان، کەرتی بیناسازیی بەرەو ناوچەکە دەکشێن، لەلایەن هەردوو دەسەڵاتی کوردیی و دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانانەوە هاندەدرێن، بێکاریی لە چەقی شارەکاندا دەکرێ بگوترێ سفرە، لەئەنجامی زۆربوونی بیناسازییەوە، بەپێی ریپۆرتەکان بێ، دەستڕەنگینەکان و خاوەن تواناکان بەرەو باکوور دەکشێن، تا ئەوەی لە شوێنی خۆیان بمێننەوە، ژۆرنالیستMaggy Zanger جەخت لەجیاوازییە ئاشکراکانی کوردەکان و تەواوی عێراق دەکاتەوە، "ئەو خوێنرێژییەی لە سێگۆشەی سوننییدا هەیە، لە ڕێی کەناڵە عەرەبییەکانەوە لە دوورەوە ( لەکوردستانەوە) سەیر دەکرێ، لەکوردەکانەوە بەئەندازەی بینەران لە ئوردن و لەندەنەوە دوورە."[325] بەگوێرەی هەموو پێوانەو مەبەستەکان، کوردستان هەموو شتێکە، تەنێ هەر بەناو وڵاتێکی تر نییە.
نە بارزانیی و نە تاڵەبانیی، هیچ جۆرە گەرەنتییەکیان لە ئەمێریکاییەکی خاوەن دەسەڵاتەوە وەرنەگرتووە، کە ئەمێریکا دەست بە ناوچەی ئۆتۆنۆمییەوە دەگرێ و سەرەتای ستراکتۆری دیمۆکراسیی دەپارێزێ، کە بەتەواویی بەرجەستە بووەتەوە، لەراستییدا، پۆل بریمەر بە ئاراستەیەکی تەواو پێچەوانە دەڕوات و بەشوێن ستراتیژییەکەی خۆیەوە، ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، ستراکتۆرێکی سیاسیی لە عێراقدا دروست دەکات، کە خاڵیی بێت لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردیی، پلانی C بەئاشکرا جەخت لەدروستکردنی فۆرمێکی فیدراڵیزم لەسەر بناغەی پارێزگاکان نەک ئێسنیکیی دەکاتەوە.
پلانی C بەمجۆرە بۆ ئەوە دانراوە کە کێشەی سیاسیی لەنێوان کوردەکان لەسەرێکەوە لەگەڵ هەر لایەنێکی تردا لەسەرەکەی تردا دروست بکات، تاکە پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم کێشەیە بەردەوام دەبێ هەتا دانانی کلێشەی یاسای بنەڕەتیی(وا چاوەڕوان دەکرێ، وردەکارییەکانی "رێکخستنی فیدراڵیی" بۆ عێراق رێکبخات) یان شەڕی راستەقینە چاوەڕێی دانانی دەستوری هەمیشەیی دەبێ، لەهەردوو باردا، تا کاتێ

کوردەکان دەست بە هێزی پێشمەرگەوە بگرن- بەهەر نابەدڵییەکەوە بێ، بەهێزترین هێزی سەربازیی خاراوی خۆماڵییە لەهەنووکەدا- سەختە ئەوە پێشبینی بکەی حکومەتی سێنترال کە عەرەب بەسەریدا زاڵە، چۆن دەتوانێ بەبێ بەکارهێنانی زەبروزەنگ، کوردەکان ملکەچ بکات بۆ ئەوەی سەرکزبکەن. بتەوێ یان نا، رێگەیەکی ئاسان نییە، نکۆڵییکردن لە کوردەکان، لای کەم لەوەی پێشتر هەیانبووە. سەختە، خۆیشیان باش ئەمە دەزانن.

## (هەل)ەکان بۆ دیمۆکراسیی

ئەگەر یاخیبوون تێکنەشکێنرێ، یان لای کەم بەئاستێکی باش کۆنترۆڵ نەکرێ، ئەوە بەئاشکرایی، چانسی دیمۆکراسیی بۆ رەگداکوتان لەعێراقدا و لە کاتێکی زوودا نییە. دیارترین و پێوەندارترین پرسیار ئەوەیە ئایا عێراق دەتوانێ لەو دابەشبوونەی بەرێوەیە، دەرباز بێ. شەڕێ نێوخۆ بەئەگەرێکی زۆرەوە لەئارادایە، بۆی هەیە لە ئەگەر زیاتر بێ لەم کاتەدا. لەراستییدا ئەگەر هێزەکانی ئەمێریکا" بانگهێشت نەکرێن" بۆ مانەوە لەعێراقدا لە جونی 2004 دا. و یاخیبووەکان( زۆرترین سوننەن) رووی چەکەکانیان بکەنە شیعەی بالادەست بەسەر ئەنجوومەنی گواستنەوەی نیشتمانییدا. لەگەڵ مۆبەلایزبوونیMobilize کوردەکان لە باکوور بۆ پاراستنی قەوارەکەیان و ئارەزوویان بە دەستبەسەرداگرتنی کەرکوک، بە رامالینی تورکمانەکان و عەرەبەکان، ئەوسا بەلای لابەلای کێشەی ناوخۆیی لەگەڵ شەڕی تایەفی و ئێسنیکیی بە راستیی روودەدەن.

بەمشێوەیە ئاستی ئەو بەرەنگارییانەی ئەم چەرمەسەرییانە دەیهێنن بۆ ئیدارەی بوش، گەورەیە. لەنۆڤەمبەری 2003 دا جۆرج بوش لە قسەیەکدا لەبەردەم دەزگای خەلاتبەخشی نیشتمانیی بۆ دیمۆکراسیی National Endowرۆژهەلاتی ناڤینnt for Democracy دا خەختی لەسەر دیمۆکراتیزەکردنی عێراق کردەوە. سەرەرای دانانان بە " گەورەیی و سەختیی جێبەجێکردنی" ئەو گفتوگۆی ئەوەی کرد" شایەنی هەوڵەکانمانە، شایەنی قوربانییەکانمانە، لەبەرئەوەی دەرەسەرییەکان دەزانین. شکستی دیمۆکراسیی لەعێراقدا، تیرۆریستەکان لەسەرانسەری دنیادا دەوروژێنێ، مەترسیی لەسەر ئەمێریکاییەکان زیاتر دەکات، ئومێدی میلیۆنەها خەلک

لەناوچەکەدا بەبادا دەچێ. بۆیـــە عێراقـــی دیمۆکراســـیی ســـەرکەوتوو دەبێ."[326] ئەگەر عێراقی دیمۆکراسیی سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنـێ، ئـەوە دەسکەوتێکی مەزن بۆ ئیدارەی بوش بەدیدێت؛ ئەگەر نا، ئەوە رەنگدانەوە نێگەتیڤییەکانی لە عێراق و رۆژهەڵاتی ناڤیندا، بۆ چەندین دەیەی داهاتوو، هەستی پێدەکرێ.

## بەرگی دواوەی کتێبەکە

" ئەم کتێبە تاقیکردنەوەیەکی پڕ لە وروورژاندنە. خوێندنەوەی خۆشە و واقیعییە بـــۆ وڵاتێـــک کـــە هـــەرگیز ســـەرکەوتوو نـــەبووە. ئاندەرســـن و ستانســـفیڵد تێگەیشـتنێکی قـوول لەسـەر مێـژووی عێـراق و کرۆکـی تەنگوچەڵەمـەی عێـراق پێشـکەش دەکـەن- کـەس نایـەوێ عێراقیـی بێـت. ئایـدێنتیتیی ئێسـنیکیی، تایـەفیی یـان عەشـیرەتییان لاپەسـەندترە- هـەروەها جـەخت لەسـەر دروسـتترین رەچەتـەی دەرمان prescription بۆ ئایندەکـەی دەکەنـەوە؛ یـەکبوونی ئارەزووومەندانـە یـان دابەشـبوونی ئارەزووومەندانـــە. بـــەدەر لـــە گـــۆڕینی رۆژهـــەڵاتی نـــاڤین، عێراقـــی دیمۆکراتیی بۆی هەیە بەباشیی کەرت بێـت بـۆ دوو پێکهاتـەی عـەرەبیی و کـوردیی. ئاییندەی عێـراق روونـی دەکاتـەوە بـۆچیی لەمـەش خراپتـر بەرێوەیـە. ئـەم کتێبـە دەبێ دووبـارە ئـەو دیدەیتـە رێکبخاتـەوە. سـەبارەت بـەوەی لەعێراقـدا چیـی بکـرێ"

Peter W. Galbraith, Former Ambassador

" ئەمە کتێبێکە کە سەرۆک بوش و بلێری سەرۆک وەزیران- و هەرکەسێ بەجدیی بایەخ بە پاشەڕۆژی عێراق ئەدات- پێویستە بیخوێننەوە. باسە قایلکەرەکەی ئاندەرسن و ستانسفیلد لەسەر مێژووی خوێناویی عێراق، شکشت لە چێکردنی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی یان ئایدێنتیتیی یەکپارچەیی، هەروەها داخورانی erosion دامودەزگاکانی حکومەتەکەی سەدام، کۆمەکی ئەو گومانانەیان دەکات، کە عێراقێکی یەکگرتووی دیمۆکراتیی بەشێوەیەک لەشێوەکان لە خۆڵەمێشەوە دروست دەبێ. سەبارەت بە ڕق وکینەی نێوان کوردەکان و عەرەبەکان، شیعەو سوننەکان، هەروەها جیهانی هۆبزیی Hobbes لەبوژانەوەی عەشیرەتگەرییدا، دانەران پێشنیارێکی ساغڵەم دەکەن، بەوەی عێراقی یەکگرتوو ئەوە ناهێنێ کە داکۆکیی لێ بکرێ، بەڵکوو بۆی هەیە باشتر بێ ئەگەر دابەشکرێ. ئەم دیدە ورووژێنەرە، بەدڵنیاییەوە دیبەیتێک بەرهەم دێنێت، کەزۆر پێویستمان پێی هەیە.

Robert Springborg, MBI AL Gaber Professor of Middle East Studies, School of Oriental and African Studies, University of London

" ئەم کتێبە ڕێگەی قرنجاویی دەبڕێ، بە هەندێ تۆمەتبارکردنی تیژەوە دەرهەق بە ئیمپریالیستە پلانگێڕەکان و شیکردنەوە سامناکەکانی ڕژێمی بەعسی سەدامی، ئەو هێڵە چەوتانە هەڵدەداتەوە کە هەنووکە هەڕەشە لە هەڵوەشاندنەوەی عێراق دەکەن. کەس ناتوانێ لەوانەی ڕۆڵیان لە پێکەوەنانی ئەم حکومەتە شەقوشڕەدا هەبووە، بێ وەی بۆی دەرچن. جگە لە کوردە گەمارۆدراوەکان و شیعە بێزارەکان. ئاندەرسن و ستانسفیلد، دیدێکی گرنگ، لەسەر ئەوەی چۆن گەیشتووینەتە ئەم قۆناغە، هەروەها هەندێ ئۆڵتێرنەتیفی قووڵ لەبیروبۆچووندا بۆ داهاتووی عێراق پێشکەش دەکەن.

Dr. Rosemary Hollis, Head of Middle East Program, Royal Institute of International Affairs (London) .

## Notes:

1 Ray Wallace, "Is Iraq Even in the World?"(www.mirror.co.uk/printable_version.cfm?objectid=12391630&siteid=50143)

2 The Project for a New American Century (PNAC), Rebuilding America's Defenses. Strategy, Forces and Resources for a New Century, Washington D.C. PNAC, September 2000, p.14.

3 Mark Danner, "The Struggles of Democracy and Empire," New York Times, October 9, 2002, p.27.

4 John Lewis Gaddis, "A Grand Strategy of Transformation," Foreign Policy, November/December 2002, p.55.

5 Ibid., p.54.

6 "The National Security Strategy of the United States of America." Washington D.C.. The White House, September 17, 2002, introduction

7 Gaddis, p.55

8 "Polls Apart." The Guardian, November 11, 2002. (www.guardian.co.uk/Print/0,3858,4367628,00.html

9 Ibid.

10 بەغداد، بەسرە و موسڵ هەموویان چەند ویلایەتێکی پێشووی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بوون. زۆربەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بەشبەشکرا لەئەنجامی شکستەکانی دەورانی جەنگی جیهانی یەکەم. ئەوەی کەمایەوە بوو بە دەوڵەتی تورکیای ئەم سەردەمە. پاشماوەکەی لەلایەن فەرانس و بریتانیاوە دابەشکرا بۆ چەند ناوچەیەکی ژێردەستە(بڕوانە بەشی یەکەم).

11 بڕوانە بەشی حەوتەم بۆ ئەو بایەخە ستراتیژیانەی کە لە پشت بڕیاری لکاندنی موسڵەوەن بە عێراقەوە.

[12]بەشێوەیەکی زۆر سادە، پانعەرەبیزم ئەو باوەڕەیە کە دەوڵەتە عەرەبە جیاجیاکانی جیهان ڕۆژێک یەکدەگرنەوە و نەتەوەیەکی عەرەبی تاک و تەبا پێکدێنن.

13 Mark Steel, "Saddam Seems to Have Won Over his Floating Voters," The Independent, October 17, 2002, p.14

[14] زۆر لە خێڵە عێراقیەکان( بە خێڵەکەی سەدامیشەوە) لقی سوننی و شیعەیان هەیە.

[15] ئەمە بە دڵنیاییەوە دەکەوێتە سەر ئەوەی هێڵە سنووریەکان دەکەونە کوێوە، بەڵام پێشبینیکردنی دەوڵەتێکی باکوری زۆرینە کورد و، دەوڵەتێکی باشووری زۆرینە شیعە و دەوڵەتێکی ناوەندیی کە لە بەغدادا چڕببێتەوە بەڵام سێگۆشەی سوننیش لەخۆبگرێت، کارێکی سەخت نییە.

[16]لێرەدا ئەوەی کە لەم ڕیزبەندییە دەرچووە نوسینێکە لەلایەن Danel Byman کە تیایدا پێشنیاری ئەوە دەکات دەبێ ڕێگە بدرێت عێراق دابەشبێتەوە بۆ سەر پێکهاتەکانی خۆی (Daniel Byman, "Let Iraq Collapse," The National Interest, Fall 1996, pp.48-60).

[17] ئیمپراتۆریی عوسمانیی کە سەنتەرەکەی تورکیای مۆدێرن بوو، لە لوتکەی دەسەلاتیدا بەشی زۆری ڕۆژهەلاتی ناڤین و، بەلکانەکان و چەند بەشێکی ئەوروپای ڕۆژهەلاتیشی لەخۆگرتبوو

[18] شۆڕشی عەرەبیی یاخیبوونێکی دەستکردی بریتانیی بوو لەدژی ئیمپراتۆریی عوسمانیی لە ماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا بە سەرکردایەتی لۆرانسی عەرەبیی( Lawrance of Rabia)بەڵام جەنگاوەرەکانی عەرەبەکان بوون. ئەوەی کە لەژێر ئەم شۆڕسەدا بوو بەڵێنێکی بـریتانیا بە پێدانی سەربەخۆیی بە عەرەبەکان لەدوای وەستانی شەڕ، بەڵام ئەم بەڵێنە بەجێنەگەیەنرا

[19] فەیسەڵ لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە 1918 تا 1920 لە سوریا حوکمیکرد.لەو کاتەوە فرانسییەکان بۆ بەجێگەیاندنی ماندەیتەکەیان(انتداب) فەسیەڵیان لە سوریا دەرکرد تا خۆیان ڕاستەوخۆ حوکمی سوریا بکەن

